# بەسەرهاتە نەمرەکان

# لە فەلسەفەدا

هێنری تۆماس    دانا لی تۆماس

وەرگێڕانی

**دڵشاد کازم**



٢٠٠٦


ناوی کتێب: بەسەرهاتە نەمرەکان لە فەلسەفەدا

- نووسینی: هێنری تۆماس/ دانا لی تۆماس
- وەرگێڕانی: دڵشاد کازم
- نەخشەسازی ناوەوە: طـــە حسین
- بەرگ: هۆگر صدیق
- سەرپەرشتی چاپ: هێمن نەجات
- پیتچنین: ڕێدار جعفر
- تیراژ: (١٥٠٠) دانە
- ژمارەی سپاردن: (٦٠١)
- چاپی یەکەم: هەولێر ٢٠٠٦
- نرخ: (٣٥٠٠) دینار
- چاپخانە: چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە

زنجیرەی کتێب: -٨٥- (١٨٨)





**دەزگای توێژینەوەو بڵاوکردنەوەی موکریانی**

www.mukiryani.com

asokareem@ maktoob.com

2260311




# ناوەڕۆك





## هێنری تۆماس Henry Thomas

هێنری تۆماس بە تەمەنترین ئەندامی خێزانێکی ناودارە کە ناوەندێکی نووسەری "باوك و کوڕ" یان پێکهێناوە. ئەو لە پەوەردە و فێرکردن و نووسەریدا پێشینەیەکی درێژ و درەوشاوەی هەیە. بێرنار شۆی نووسەری ئینگلیزی لەبارەی پەرتووکەکەی ئەو بەناوی "مێژووی نەژادی مرۆڤ" نووسیویەتی "ئەم پەرتووکە لە سەرەتاوە تا کۆتایی سەرنجی راکێشام."

## دانالی تۆماس Dana Lee Thomas

ئەودەرچووی زانکۆی هارڤاردە. لە شەڕی جیهانی دووەمدا وەکو پەیامنێری لەشکری سێیەمی "پاتۆن" خزمەتی کردووە. گرووپی توماس لە ساڵی (١٩٣٨) ەوە دەستیکردووە بە نووسینی زنجیرە پەرتوکێکی مێژوویی بەناوی "ژیاننامەی نەمرەکان" کە زیاتر لە دوانزدە بەرگی لێ بڵاوبۆتەوە و بووە مایەی پێشوازی کردنی خەلك و چاپەمە نییەکان.







# پێشەکی

لە بەسەرهاتە دلبزوێنەکان، ئەو رووداوە فەلسەفییانەی کەئەم پەرتووکە روونکردنەوەیانی گرتۆتە ئەستۆی لە هەمووان سەرنجڕاکێشتر و شایانترن بۆ خوێندنەوە، چونکە هیچ گەشت و گوزارێك پڕ ئاشووبتر لە هەڵگەڕان بە لوتکەی حیکمەت و زانست و هیچ گەشتێك پڕهەیەجانتر لە فڕینەفیکری و فەلسەفییەکان نییە. بۆ ئەو کەسانەی کە خولیای بەسەرهاتە نهێنی ئامێز و رازدارەکانن، فە لسەفە لە هەمووشتێك نهێنی ئامێزترە.

ئێمە کێین و لەکوێوە هاتووین؟ ئافرێنەری ئێمە کێیە و هۆی ئافراندنی ئێمە چییە؟ ئەو پرسیارانەی کە هەردەم گیانی ئێمەیان لە (تاوتێ)دا هێشووەتەوە. ئەم پەرتووکە،ئەو کەسانەی کە زەینێکی رۆناك و دڵێکی پڕتامەزرۆیان هەیە بۆ تەماشاکردنی گەورەترین و سەرنجڕاکێشترین درامایی روحیی جیهان، بانگدەکات و ژیانی دراماتیك و تاسە بزوێنی گەورەترین بیریاران دەخاتە بەرنیگایان.

فەیلەسووفانی ڕاستین و پێشڕەو، خەلکانێکی وەهم پەرست و گۆشەگیر نەبوون کە هەردەم نغرۆی وەهم و فیکرەکانی خۆیان بن بەڵکو سەربازانێکی بێباك و پێرسانی دلێر و زیرەك بوون کە دژی ستەم و زۆرداری و ناڕەوایی بە سواژ و کێشمانەکێش هەڵسان هەروەك دەبینین، لەرێگەی حەق و راستی، هەژاری و زەلیلی و ئەشکەنجە و دوور خستنەوە و گاڵتەپێکردنی خەلکان و تەنانەت بەروویەکی کراوە پێشوازیان لەمەرگیش کردووە. بۆئەوەی حەقیقەت خەڵك زاناتر بکات و حیکمەت و زانست ئازادیان بکات.



لەو رووەوە، لەم پەرتوکەدا تەنیا بە روونکردنەوەی رووداوە گشتییەکان رانەوەستاون، بەڵکو بەسەرهاتی هەریەکە لەو گەورە پیاوانەمان کردووەتەوە تابەدیارکەوێت چۆن بیروڕایەتی تازە دیاریداوە، ئاسوە فیکرییەکان چۆن کراونەتەوە، سەهوە گەورەکان چۆن چاك کراونەتەوە و مرۆڤ چلۆن بە سەرکەوتنە مەعنەوییەکان گەیشتووە. لەگەڵ ئەوەدا کە هەوڵی ئەوە دراوە تا کردەوەکان بخرێنە بەرباس نە بکەرەکانیان، بەڵام روون کرنەوەی ژیانە پر لە رووداوەکانی فەیلەسووفای بەشی سەرەکی پەرتووکەکە پێکدێنێت. لەهەر بەشێکدا وێنەی دڵبزوێن و زیندووی بیروڕا و فیکرەیەك، لە چوارچێوەی بوونی ئەوکەسەی کە پێشکەش بە جیهانیانی کردووە، پیشانداوە. لە کێشانی ئەو وێنانەدا هەوڵدراوە تاریکی و سێبەرەکانیش وەکو رووناکییەکان دەربخرێن، چونکە تەنانەت فەیلەسووفەکانیش کە لەخەڵکانی ئاسایی بەرزتر و لە فریشتەکان نزمترن، هەندێ جار دەست لەکاری وادەدەن کە بەزەحمەت دەتوانرێ لەگەڵ پێوانە فیکرییەکانی ئەوانەدا هەڵبسەنگێنرێت. بەلاّم راستییەکەی ئەوەیە کە زۆربەی فەیلەسووفەکان هەوڵیانداوە زوڵمەتگای خاکی رووناك بکەنەوە و ئێمە بەرەو تەواوبونی مرۆڤی- واتە بەرەو ئەڤینداری حیکمەت و حیکمەتی ئەڤین- رێنمایی بکەن.





## (٥٠٠ ـ ٤٣٥ پ.ز)

# ئەمپیدۆکلس

**ئەو گیانە شەیدایەیە کە خۆی هەڵداوە**

**ناو گڕکانی ئەتناو یەکسەر سووتا**

مەرگی ئەمپیدۆکلس یەکێکە لە پڕ هەراترین ڕووداوەکانی دونیای کۆن. دەڵێن ئەو بازیدا بۆناو زارکی گڕکانی ئەتنا و خۆی سوتاند. چونکە ئەوخۆی بە خوا ناو بردبوو و لێهاتوویی خواوەندی ئەوەبوو کەخۆی بکاتە قوربانی گوناهی بەندەکانی. ئەم خۆکوژییە تازە دەرکەوتووەکان لەو ڕۆژگارەدا بە حەقیقەت دادەنا و لەو بڕوایەدابوون کە "لەشە مردۆکەکەی لە ئاگردا سوتاو گیانە نەمرەکەی بە هاوڕێیەتی کڵپە شەوقدارەکانی ئاگربەرە و ئاسمان هەڵکشا" بەڵام دواتر پەردەیان لەسەرئەم حەقیقەتە هەڵداو ئاشکرابوو کەئەم داستانە سەیر و دڕك ئامێزە کە نموونەیەکی ئەوپەڕی نامۆیی فەلسەفەو ژیانی ئەمپیدۆکلسە، دروستکراو و بریقەدارکراوی هەوادارانی ئەوە.

ئەمپیدۆکلس یەکێك لە کەسایەتییە سەیر و هەیەجانهێنەرەکانی مێژووە و فیکرەکان و کردەوەکانی وەکو تەقینەوەی چیای گڕکانی پڕ دەنگەدەنگ بەهەیبەتن.

ئەفلاتون گوتویەتی: (فەلسەفە ڕاز و نیازێکە کە تیایدا گیان گڕ دەگرێت.) بەهۆی ڕووناکی شیعرەوە خەڵوەتگای بیروخەیاڵ ڕووناك دەبێتەوە.شاعێرە یەکەمەکانی وەکو هۆمێروس و ئاشیل و بێژەری سروودەکانی هەموویان فەیلەسووف بوون. ئەمپیدۆکلس یەکێك بوو لە





فەیلەسووفە شاعیرەکانی دونیای کۆن. بەڵام ئەمپیدۆکلس لەهەمان کاتدا مامۆستای ئایینیش بوو. ئەمەش بەڕێکەوت نییە چونکە فەلسەفە نەتەنیا پەیوەندی بەشیعرەوە هەیە بەڵکو پەیوەندییەکی نزیکی بە ئایینیشەوە هەیە. ئایین فەلسەفەی دڵە و فەلسەفەش ئایینی مێشکە. ڕێبەرانی ئایینی بەدڵنیاییەکی تەواوەوە بانگەشەکەری ئاگاداربوونن لە نهێنی و هێماکانی بوونەوەران. فەیلەسووفەکانیش لەهەوڵی ئەوەدان تا لە کوێرە ڕێگەی نەزانیدا بگەنە ڕێگەیەکی عەقلانی، لەو میانەیەشدا شاعیر بە ئاورینگەکانی جارناجارێ سەکۆکە ڕووناك دەکاتەوە.

ئەمپیدۆکلس لەو سێیانە بەهرەیەکی تێری هەیە. پێغەمبەرێکی فەیلەسووفە کە بەرگی شیعر وەبەر فیکرە و بیروڕاکانی خۆی دەکات. لەگەڵ ئەوەشدا کە زانیارییەکی زۆرمان لەبارەی ژیان و شیعرەکانی ئەو نییە بەڵام لەوەی کە بەدەستمان گەیشتووە دەتوانین ئەو بەیەکێك لە بەسەرهاتخوازە گەورەکانی جیهانی ماددی و مەعنەوی دابنێین.

**ـ٢ـ**

ئەمپیدۆکلس کە لە (سیسلی) چاوی بەدونیا هەڵێناوە، یەکێکە لە باوکەکانی دیموکراسی. ئەو بڕوای بەمافەکانی خەڵك هەبوو و لە ستەمکردنیش بێزار بوو. ڕۆژێکیان بۆ ئاهەنگێك داوەتکرا. خانەخوێ کە ڕێبەرێکی سیاسی خۆپەرست و بەفێزبوو شەرابی پێشکەش بە هەموو مێوانەکان کرد: لەبەر ئەوەی هەندێکیان خۆیان لە خواردنەوەی شەراب لادا جامەکەی بە سەریا ندا کێشاو گوتی:(لەبەر ئەوەی نایخۆنەوە بۆیە دەبێت تیادا بخنکێن....) ئەمپیدۆکلس لەو ساتەدا هیچی نەگوت بەڵام ڕۆژی دواتر بەپێداگرییەوە پیاوەکەی ڕاکێشا دادگا و بە مەرگ مەحکومی کرد و دیاریکرد: "ناچارکردنی خەڵك بەوەی کە گوێڕایەڵی ئیرادەی تۆ بن، سەرەتای خۆپەرستی و ستەمکارییە و زۆرداریو ئۆتۆکراسی هێلکەیەکی ژەهراوییەکە دەبێت لەناو ببرێت."

خەڵك دەیانەویست بۆ پاشایەتی هەڵی بژێرن بەڵام قبووڵینەکرد و بە باشتری زانی کە هەر بە مامۆستایەتی بمێنێتەوە. ئەمپیدۆکلس بنیاتنەری قوتابخانەیەکی نوێیە لە پزیشکیدا و خەڵك لەو بڕوایەدا بوون کەئەو خاوەنی هێزێکی شیفابەخشە و چارەسەریی جادو ئاسا و ئەفسانەیی لەبارەیەوە نوسراون. دەڵێن گیانی بە ژنێك بەخشی کە مانگێك پێشتر مردبوو.

موریدەکانی وەکو خوایەك سەیری ئەویان دەکر، ئەویش خۆی بەو بڕوایە پشتئەستوور بوو کە توانیویەتی رزگارکەری مرۆڤ بێت بەرەو ژیانێکی بەرزتر. بەڵام رکابەرانی؛ بەتایبەت بەتواناکان و بەهێزەکان، ئەویان بە دووژمنی داب و نەریتە قایمەکانی وڵات دەزانی و هەولێکی زۆریان بۆ مردنی دا و لەبەر ئەوەی لەو کارەدا نەگەیشتنە ئامانج هەستان بەدوور خستنەوەی .

ئەمپیدۆکلس دوای ئەوە لە سیاسەتی خۆجێی دەستی کێشاوە و گۆڕا بۆ سەر کەشێکی دەروونی گۆشەگیر.

ئەمپیدۆکلس دەیگوت، بوون و نەبوون، ژیان و مەرگ بزووتنەوەیەکی بە ڕواڵەت بێ ئامانج و مەبەستن کە لەنێوان دوو جەمسەری (خۆشەویستی) و (نەفرەت)دا لە سووڕان دایە، بەڵام ئایا ئەم بزوتنەوەیە بە ڕاستی بێ ئەنجام بوو؟ ئایا یاسایەکی ئەزەلی و هەتاهەتایی دەسەڵاتی بەسەر سووڕی هەبونەوە نییە؟ ئەمپیدۆکلس وای دادەنا کە یاسایەکی وای بەدەستهێناوە و ئەویش لە پارچە هۆنراوەیەکی فەلسەفیدا کە لە بارەی سروشتەوە نووسیبووی بڵاویکردەوە.

## -٣-

ئەمپیدۆکلس لە بەرەبەیانێکی تەم و مژاوی و ئالۆزی فەلسەفیدا (لە دەوروبەری ٤٥٠ ساڵ پ.ز) ژیانی دەگوزەراند و لەبەر ئەوەی ئەو هۆیە زانستیانەی رێگەی ئەویان بەرەو حەقیقەت دەبرد لەبەردەستدا نەبوو، بە نیگایەکی تاریك و لێڵ سەیری جیهانی دەکرد. لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ بیردۆزی داهێنا لەبارەی جیهانەوە کە تاکو ئەمڕۆش بەشێك لەو بیردۆزانە لە بنەرەت و بناغەدا بەراست دەزانرێی. ئەمپیدۆکلس لەو تاکە پێشەنگانە بوو کە لەبارەی بیردۆزی گەردیلەیی، پێکهاتەی کیمیایی تەنەکان کە هۆی پەیدابوونی جیهانن، خەبات لە پێناو ژیان، شێوەی گۆڕانی ژیان، هەڵبژاردنی سروشتی و مانەوەی لەبارتر هەندێ ئاماژەی هەیە. ئێستا با نیگایەکی کورت بە فەلسە فەکەیدا بێنین:

ئەمپیدۆکلس دەیگوت: جیهان لە چوار توخم پێکدێت: خۆڵ و ئاو و باو ئاگر هەر ئەم چوار توخمە لە هەموو شتێکدا بەرێژەی جیاواز هەن. هەموو شتێك یەکبینە لە گوڕان دایە، لە دایك دەبن، گەشە دەکەن، دەپووکێنەوە و دەمرن و تەنیا ئەم توخمانەن کە پایەدارن. جەوهەر و





حەقیقەتی شتەکان هەرگیز ناپوکێنەوە و ئەوەی کە ئێمە بە مەرگ و نەبوون ناو دەبەین لەڕاستیدا جێگوڕکێ و شێوە گۆڕکێی  توخمەکانە.

ژیان بە گوێرەی ئەم وەسفە هەتاهەتایی و نەمرە نە لە مەرگەوە لە دایکدەبێت و نەش بەمەرگ کۆتایی دێت. چونکە ژیان بابەتێکی ئەرێنی و هەبوونییەوە ومەرگ بابەتێکی نێگەتیڤ و عەدەمییە. ئەوە شیاو نییە کە شتێك لە هیچەوە پەیدابێت یان بوونێك لە ناو بچێت.

کۆتایی بوون. نەبوون و عەدەم نییە. بەڵکو بوونێك بۆ بوونێکیتر دەگۆڕێت. مردن گوزەرگای عەدەم نییە بەڵکو پردێکە کە بە بوونێکی تر کۆتایی دێت. ئەمپیدۆکلس وەکو فەیلەسووفە رۆژهەڵاتییەکان بڕوای بە دوناودون هەبوو و دەیگوت" ئێمە دووبارە و دووبارە زیندوو دەبینەوە و بە هاوڕییەتی ئەو توخمانەی کە بوونمان پێك دێنن لەملا بۆ ئەملا دەگوازرێنەوە. ئەو شێوەیەی کە لە ژیانێکیتردا بەدەستدێنین بەستراوە بەو سیفەتەی کە لە ژیانی ئێستاییدا بەرجەستە بووە. کەسێك کە لە گوناهێك "دەستی خۆی ئاڵودەی خوێن کردووە دەبێت سیهەزارساڵ بە دوور لە بەخت چاکەکان ژیان بەسەر بەرێت و لە تەواوی ئەم ماوەیەدا بچێتە ناو جەستە و توێی جیاجیاوە و لەڕێگەی دژواری ژیانێك بۆ ژیانێکیتر دەرباز ببێت. ئەم ژیانە ناچاریانە و ئەم ماڵ بەکۆڵیە لە لەشێکەوە بۆ لەشێکیتر تا ئەوکاتە بەردەوام دەبێت کە ئێمە شەرانگێزی بە میزاجی نیان و شەڕخوازی بە ئاشتیخوازی و نەفرەتیش بەسەر خۆشەویستیدا زاڵدەکەین. تا ئەوکاتەی کە گیانمان بێئۆقرە و ناجێگیرە و لە لەشێکەوە بۆ لە شێکیتر دەگوێزرێتەوە هەرگیز رووی ئاسوودەیی نابینێت. "بابەتی بەهێز بۆ دەریا رەوانەی دەکات، دەریا تۆڕ هەڵدەداتە سەرزەوی، خۆڵ بەرەو خۆری سووتێنەر فرێدەدات و خۆریش لە ناو سوڕی بادا بەرەڵا دەکات. تەواوی ئەم توخمانە گیان قبووڵدەکەن و یەك لەدوای یەك دەیدەنەوە." ئەمپیدۆکلس وای دادەنا کە خۆی لە گرووپی ئەم گیانە وێڵ و بێئارامانەیە: من وەختێك لەشێوەی کوریژگەیەکدا بوومە، وەختێك لەشێوەی دەوەن و *لاشەیەکی تری باڵندەدا سەرم دەرهێناوە، چوومەتە ناو قالبی گیانلەبەر و ماسی. من دوورخراوە و دەرکراوی خواوەندم. چونکە بۆ "نەفرەت" ی نەگریس سەرم دانەواندووە.

* بریتی یە لە دەرچوونی گیان لە لاشەیەك و چوونە ناو

-٤-

ئەم ئاشکراکردنە ئێمە بۆلای یەکێ لە خاڵە بنەڕەتیەکانی فەلسەفەی ئەمپیدۆکلس رادەکێشێت.بە بڕوای ئەو "خۆشەویستی" و "نەفرەت" فەرمانڕەوای رەهانە و هەموو شتێك لە دەوری ئەم دوو سەنتەرە دەسوڕێتەوە. نەفرەت جیابوونەوەی لێدەکەوێتەوە و خۆشەویستیش یەکگرتن پێکدێنێت، ئەنجامی نەفرەت کە ناوەکەی تری دژمنییە جەنگ و وێرانییە و خۆشەویستیش کە دەتوانێ بەهاوڕێیەتی ناو ببرێت، بەرەو ئاشتییەکی بەسوود رێبەرایەتی دەکات. نەفرەت لە سەنتەر هەڵدێت و هەموو هەوڵی لەوەدایە کە ئێمە لە ناوەندی ژیان دەربکات بەلاّم خۆشەویستی لە ناوەندگەڕە و لە گەیشتن بە ناوەندا یارمەتیمان دەدات. سەرتاسەری مێژوو روون کردنەوەی ململانێ و کێشمانەکێشی ئەم دووهێزەیە. نەتەوەکانیش وەکو تاکەکان توخمە زیندووەکانیان هەیە کە بە هاوئاهەنگی لەگەڵ خۆشەویستیدا دێنە کایەوە، دەژین و دەپشکوێن. دوایی ناتەبایی و نەفرەت لێکیان هەڵدەوەشێنێتەوە و خۆشەویستی لە توخمە پەرتەوازە بووە کان نەتەوەیتر دروستدەکات کە وەکو هەموو تاکەکان، بەناچاری بۆ یاسای هەتاهەتایی لەدایکبوون، گەشە، پووکانەوە، گۆڕان و دەرکەوتنەوە لە قاڵبێکیتردا و لەدایکبوونی سەرلەنوێ ملکەجدەکەن. بەم شێوەیە هەموو پێکهاتەکانی جیهان لە مرۆڤ و گیانلەبەر و شارو ولاّت و نە تەوەکان بەردەوام پەیدادەبن،

شێوە گۆڕن و لە جلێکی نوێدا دەردەکەونەوە. گوایە هەردوو رکابەری خۆشەویستی و نەفرەت هەردەم سەرقاڵی قوماری هەتاهەتایی ژیانن.

ئەمپیدۆکلس دەڵێت، سەردەمی نەفرەتە "بەلاّم لە سەردەمی زێڕیندا مرۆڤ تەنیا ستایشکەری خۆشەویستی دەبێت". لە چەرخێکی شادیبەخشی وادا زەوی بە خوێن ئاڵوودەنابێت و مرۆڤ لە خواردنی گۆشتی گیانلەبەران کە بە نرخی ژیان تەواودەبێت بەتوندی دەسڵەمێنتەوە و هەڵدێت. ئەمپیدۆکلس لە بارەی ئەنجامی ئەم کێشانە کێشەکە لە نێوان خۆشەویستی و نەفرەت دایە لە نێوان گومان و دوودڵی بەرەڵڵامان دەکات. هەڵـبەتە دەبێت لە بیرمان بێت کە نووسینە بە قەبەکانی ئەو لەناوچوونە و تەنیا کەمێکی لەو هەموو بەرهەمەی گەیشتوتە دەستمان. بەلاّم هەر ئەو بەرهەمە کە مانەش بەچاکی ئەمە دەردخەن کە سەرکەوتنی کۆتایی بە خۆشەویستی






دەبڕێت. ئەو رایەی کە ئەمپیدۆکلس لە بارەی مرۆڤی تەواو و سەردەمی زێڕین دەریبڕیوە باشترین پێناسەری بیردۆزی فەلسەفی و "خەونەکانی پێغەمبەری" ئەون.

بەم شێوەیە دەبینین کە ئەمپیدۆکلس لەڕووی غەریزەوە لە بارەی شێوە گوڕین رایەکی هێناوە و لەو ریبەدا وەپێش داروین کەوتووە کە ٢٥٠٠ ساڵ دوای ئەو هاتووە. راستە کە ئەم بیردوزە لەو کاتەدا خاو و پێنەگەیشتوو و تاقینەکراوەبوو بەلاّم لەگەڵ ئەوەشدا پەرەسەندنی مرۆڤی لەرێگەی ئەزمونە سروشتییەکانەوە بە باشی ئاشکرا کرد (خوویاکرد ).

سروشت بوونەوەری جوراوجور دێنێتە بوونەوە کە ئەندامی ناتەواویان هەیە" هەندێکیان ملیان نییە و سەر یەکسەر بە لەشەوە نوساوە یان شانیان نییە و دەستەکان بەبێشان بە لەشەوە دەبەسترێن... پاشان ناچاریان دەکات کە یان خۆیان لەگەڵ دەورووبەر بگونجێنن یانیش لەناو بچن. تەنیا ئەو گرووپەی کە دەرەقەت هاتن و خۆیان لەگەڵ دەورووبەردا گونجاند دەتوانن درێژە بە ژیان بدەن. بەم رێگەیە گیانلەبەرە ناتەواوەکان بە تێپەڕبوونی کات تەواو دەبن و ئەم گیانلەبەرە تەواوانە بەرە بەرە بۆ پلەی مرۆڤ سەردەکەون و مرۆڤیش بەرەو خوایەتی هەڵدەکشێت. هەموو ئەم پەرەسەندنانەووە چەرخانانە بۆ دروستبوونی هاوئاهنگی و پێکەوە گونجانە تا ئەو بوونەوەرەی کە باشتر توانیویەتی لەگەڵ دەوروبەردا هەڵبکات بمێنێتەوە.

ئەمە پەرەسەندنێکی سروشتییە لە نزمترین جۆری ژیان بەرەو تەواوترین و بەرزترین جۆری ژیان. بەرزترین پلەکانی ژیان، ژیانی خواوەندەکانە، ئەو هێزەش کە مرۆڤ دەگەیێنێتە پلەی خواوەندەکان هێزی سروشتییە. مرۆڤ لە پەرەسەندنەکەی خۆیدا کە لە لەشێکەوە دەچێتە ناو لەشێکی ترـ لە ناو جەستەی شاعیران و فەیلەسوفان و خۆشەویستان بەدەردەکەوێت، هەروا زیاتر هەڵدەکشێت تا دەگاتە پلەی خوایەتی و (لە جێگەی خواوەندەکان نیشتەجێ دبێت و دەبێتە هاوبەشیان، لادراو لە کینەخوازی مرۆڤانە رزگاربوو، لە چارەنووس و بێبەری لە دەردوەنج).

ئەم وەرچەرخانە ـ بزاوتن لە قۆناغی گیانەوەری بۆ مرۆڤ و لە پلەی مرۆڤانەشەوە بۆ پلەی خواوەندێتی ـ جۆرە پالاوتن و پاکژکرنەوەیەکی پلەبەپلەیە.

ئەمپیدۆکلس دەڵێت": لە ژیانی هەنووکەییدا هەناسەی خۆت بپاڵێوە، تۆخمەکانی دووبەرەکی لەگیانت دوورخەرەوە، لە سوزە تێکدەرەکان فیکرە کینە خوازەکان خۆت لابدە، لە نەفرەت و چاوبرسێتی بەرامبەر بە ماڵی ئەوانیتر و خوێنرێژی خۆت دوور بخەرەوە و خۆت لە گۆشت خواردن لابدە" چونکە دەکرێ گۆشتی پیاوچاکانی خۆت بێت کە دە خۆی." ئاو لە (ئارێس) کە خوای شەڕە مەدەرەوە و رێز لە (ئافرودیت) کە خوای خۆشەویستییە بگرە. لە بەرامبەر مرۆڤ و گیانلەبەر و باڵندە دلۆڤانی بنوێنە. ئەگەر لەژیانی هەنووکەییدا بۆت دەست نەدات ئەوا لە ژیانی دیکەدا هەوڵبدە ببی بە مرۆڤێکی زانا و هەواداری کاری ئاشتیانە و پیاوێکی خاوەن حیکمەت کە باشترین سامانە. کاتێك گەیشتە ئەم قۆناغەی پاکژبوون و تەواوبوونی نەفسی سیفەتی گەشبینیت تێدا پەیدا دەبێت کە ئەمەش قۆناغی کوتایی تەواو بوونە. لەم قۆناغەدا توانای بینینی تۆ لە ئاسۆی سنووررداری چاوەکانت ژوورتر دەڕوات. چونکە (تەواوی ئەوەی کە لە ماوەی دە تا بیست خولی ژیانی مرۆڤیدا هەیە، دەبینی. ئەمپیدۆکلس لە شێوەی فەیلەسوفێکدا نە بەڵکو لە بەرگی پێغەمبەرێکدا رادەگەیێنێت "هاورێیانی من، دڵنیام کە ئەوەی دەڵێم راستە" و لەو بڕوایەدایە کە لەئاکامدا گەیشتۆتە پلەی پاکژبوونەوەی نەفس (خود) "لەگەشتی ژیانە جوربەجورەکانمدا کاتێك گەیشتومەتە قوناغی خۆپێنەگیراو هون هون گریام و شیوەنم گێڕاوە " و لەکۆتاییدا گەیشتووەتە جێگەیەکی شایان و گونجاو بەخۆی و جلی رووتی مرۆڤی فڕێداوە و لەرێگە پالاَوتن و پاکژبوونەوەی نەفسەوە گەیشتۆتە پلەی بەرزی خوایەتی. "ئیتر لەناو ئێوەدا خوایەکی نەمرم و لەناوچوون و نەمان زەفەرم پێ نابەن." بۆ هەر کوێیەك هەنگاوی دەنا موریدەکانی بە ئەڤین و رێزەوە پێشوازییان لێدەکرد. "خەڵکانێکی بێ هەژمار لە دووم دەکەوتن و دەیانپرسی کە بۆ چاکبوونەوەی جەستە و ئازادبوونی گیانیان دەبێت چ بکەن؟"

رۆژگاری ئەمپیدۆکلس بەم چەشنە بەرێوە دەچوو. خواوەندێك لەناو مرۆڤەکاندا ژیانی بەسەردەبرد، خەڵکی چارە دەکرد، فێریان دەکرد و سەرزەنشتی (نەزانی)ی دەکرد: "دەزانم کە و تەکانی من لە گوێی ئەو کەسانەدا بەداوی نەفرەتەوە گیریان خواردووە بایە." و دەپاڕایەوە کە لە کوشتن و خوێنرِ ێژی دەست هەڵگرن: " ئایا ئاگاتان لێ نییە کە سەرەڕای بانگە دڵێەکەی خۆتان کەوتوونەتە ئاوێزی یەکترەوە و یەکتر هەڵدەدرێنن؟" و رێگەی هەلاَتنیان لە "گەڕانەوەی چەرخی چارەنووس" پێپیشاندەدات. بۆ ئەوەی بتوانن لەئامادەبوونی پاسەوانی ئەزەلیی مرۆڤ



تێبگەن. "ئەو گیانە خاوێن و وەسف نەکراوە لە ژێر تیشکی فیکرە گرانبەهاکانی دادوەری و پێکەوە گونجان و نەرمە نیشکی و ئومێددا دەکرێتەوە و خۆی بەدەردەخات."

ئەمەبوو کورتەیەك لە فێرکارییەکانی یەکەم فەیلەسووفی شاعیری ئەوروپا. ئەمپیدۆکلس پێغەمبەری ئایینی تازەی دیموکراسییە و هەر ئەویش بوو کە رایگەیاند: ئێمە هەموومان لەیەك گەوهەر ئافرێنراوین. بەهۆی شەڕخوازی و شەڕانگێزی لە جەستەیەکەوە بۆ جەستەیەکی تر دەربەدەر دەبیت و لە ئاکامدا هێزی ئاشتی بەرەو رێگای راست رێبەرایەتیمان دەکات. سەرەنجامی ئەم رێگە درێژە بۆ هەمووان یەکسانە، هەموو بۆ ئەو سەرەتا و بنەڕەتە دەگەڕێی نەوە کە لێوەی هاتبووین. هەموو دەگەینە پلەی شاهیدەکان و پەیوەندی بە حەقەوە دەکەین.

بە گوێرەی ئەوەی رابورد، خۆکوژیە ئەفسانە ئامێزەکەی ئەمپیدۆکلس دەتوانرێ بە تەمسیلێکی ئایینی دابنرێت کە بەشێوەیەکی داخبزوێن و دیاریکراو پێناسەری ئەو بڕوایەیە کە ئازادی زادەی دەرد و رەنجە و چوونە ناو ئاگری تاقیکردنەوەش دەرگایەکە کە بەرەو ژیان دەکرێتەوە. ئەمپیدۆکلس لەکۆتاییدا دوورخرایەوە. ئەم دوورخستنەوەیە، دادگاییکردن و کوشتنی شەهیدان و ئازار و ئەشکەنجەی چاکەکەران، گشتیان رەفتاری خوڕانەگر و ناڕەوانە کە لە نەفرەتەوە ـ دژی خۆ شەویستی ئەزەلی و سەرکەوتوو ـ سەریان هەڵداوە.





# دادگایی کردن و مەرگی سوکرات ( ٤٦٩ ـ ٣٩٩ )

### ئیچ. جی. وێلز (H.G wells)

لە پەرتووکی سەردەمی ماشێندا دەمانخاتە سەر شاپەڕی خەیاڵ و بەرەو ئاینده زۆر دوورەکان بۆ گەشتوگوزار دەمانبات. هەرکاتێ بەم شێوەیە ڕێگەی ڕابردوو بگرینە بەر، دوای بڕینی دووریەك کە ماوەکەی ٢٤ سەدەیە، لە ساڵی ٣٩٩ پ.ز خۆمان لە یەکێ لە شەقامەکانی شاری ئەسینا دەبینینەوە.

لە ڕێگەیەکداین کە بە دادگا کۆتایی دێت ـ دادگا یەك بەم زووانە دادگاییکردنی سوکرات تیایدا دەستپێدەکات. شاری ئەسینا پێکهاتەیەکی سەیرە لە ناشیرینی و جوانی. کۆشکە مەرمەرتیەکان و پەیکەرە زێڕینەکان لە لایەکەوە چاو توشی سیحر دەکەن و لەلایەکی ترەوە مرۆڤ تا ئەژنۆ بە ناو قوڕ و لیت و زبڵدا ڕوو دەچێت. خەڵکی شاریش گیانێکی بە توندی دژیەکیان هەیە لە دروستکردن و نوێگەری و لەناوبردن بە یەکسانی بەهرەمەند بوونە. بەرامبەر بە یەکێتی و هاو ئاهەنگی خۆشەویستی دەنوێنن و لە هەمان کاتدا ژیانی ڕامیارییان بارگاوییە بە بێسەروبەری و پەرێشانییەکی بەردەوام. لەگەڵ خوادا دەکەونە چرپاندنێکی عاشقانە بەڵام هاوسێکانیان فریو دەدەن. نەتەوەیەکن لە دڕندە کارامەکان ـ کارامە لە هونەرەکەیاندا و دڕندە لە ڕەفتارکردن لەگەڵ یەکتر. دروستکردنی پەنجەیەکی کەم و کورت لە پەیکەرێکدا گوناهێکی گەورەیە بەڵام بڕینی پەنجەی دیلەکانی دوژمن بە کارێکی لە جێی خویدا و نیشتمانپەرستانە لە قەڵەمدەدەن.



ئەمانە ئەو خەڵکەن کە بۆ دادگا دەچن تا لەبارەی هوشمەندترین پیاوی چەرخی خویان حوکم بدەن. ئەم خەڵکە بە مێشکە درەوشاوە و دڵە ناسەقامگیرەکانیانەوە لە ژێر کاریگەری سۆز و هەستەکان لە وێنەی گڕێك بەدەم باوە گریان دەگرت. وە بیرخۆمان بێنینەوە کە هەر لەو چەند ساڵەی پێش گەورەترین پەیکەرسازی خۆیان بەناوی فیدیاس (phidias) یان بە تاوانی ساختەکاری بە مەرگ لە زینداندا حوکم دا.

بلیمەتی لە ئەسینای دێریندا خەلاتێکی ژەهراوی و ترسناك بوو. کاتێك هەنگاو دەنێنە ناو دادگا دەبینین دەستەی دادوەران لەشوێنی خۆیاندا نیشتوون. زیاتر لە پێنج سەد دادوەر ئامادە بوونە ـ کۆمەڵەیەکی زۆر کە گوایە زیاتر بەرپرسی دروستکردنی ئاشووب و بێئارامینە تاکو ئەرکداری لێکولینەوە و دادوەری.

دانیشتنەکە فەرمی بووە و سێ کەسی سکالاکەر ئامادەبوونە تا ڕوونکردنەوە و دەربڕینەکانی خۆیان دەستپێبکەن. تۆمەتبارەکە دەهێنن بۆشوێنی خۆی. ژاوە ژاو و هەیەجانێك لە ناو ئامادەبوواندا دێتە ئاراوە و تەنیا سوکراتە کە هەروا بێدەنگە. ئەم فەیلەسووفە بە لێکۆڵینەوە دیارترین کەسایەتی دادگایە، گەرچی هەفتاساڵ تەمەنیەتی بەڵام وەکو پیاوێکی چل ساڵان قایم و پەیت هەنگاو هەڵەێنێ.

پێشەکەی بەهۆی ئەوەی کە تەواوی تەمەنی خۆی لە ژێر ئاسماندا بە پەروەردەکردن هەڵساوە، زەیتونی و ڕەشتاڵە. حەکیمێکی گەرۆك و بێ پاداشت و مووچە. بەسەرە ڕووت و پێیە بەتیەکانی چەندە لە پیکەرێکی کورت و برۆنزی دەکرد. بەردێنێکی خولەمێشی، لوتێکی خڕ و سەرکوتراو، چاوانی ژیر و بەزەیی ئامێزلێوی ئەستوور و زەردەخەنەی دۆستانە و پڕ لەبەدگومانی، وەکو بوونەوەرێکی نیوە دێو و نیوە فریشتە مرۆڤی دەخستە ژێر کاریگەری خۆیەوە. نیگا تەشەنەکەرەکەی دەگەیشتە گشت ئامادەبووان ـ نیگای باوکێکی ئازاد کاتێك سەیری خێزان و منداڵە لاسارەکانی خۆی دەکات ـ ئەو منداڵە ساویلکە و هەڵچونبارانەی کە تەنیا بۆ فیتنەکاری گەشەیانکردووە و پێگەیشتوونە.

سوکرات کاتێك لە چیهرە ڕەنجکێشاوەکەیان ڕادەمێنێت بەزەییان پێدێت و وەبیری دێت کە ئەم خەڵکە چەرخێکی دەردەدار و ڕەنجهێنەری بەسەر بردووە سەردەمێك کە شەڕێکی درێژ و پڕزیانی لەگەڵ بوو.





بە دوای حکوومەتێکی دیکتاتۆری شۆڕشێك ڕوویداوە و هەنگاوەکانی دژە شۆڕش حکوومەتێکی هێناوەتە سەرکار کە سیاسەتمەداری خۆپەرست حوکمی لێدەکەن نەك خەڵکانێکی ژیر. سەرسوڕمان نییە ئەگەر هەمووان بەرامبەر بەیەك بەدگومان بن. ڕووداوە غەمبزوێنە کان بە ئەندازەی پێویست ڕوویانداوە کە تەندروستی عەقڵی مرۆڤ تێکدەدات.

هەرکەسێك بوێری بیرکردنەوەی هەبێت لە دادگادا ڕۆژێکی سەخت و نالەباری دەبێت. با پەلە بکەین دادگا دەستپێبکرد.

**ـ ٢ ـ**

سکرتێر دەستدەکات بە خوێندنەوەی بانگەشەنامە:

(سوکرات تۆمەتبارە بە تاوان لە دژی وڵات. یەکەم جار لەبەر ئەوەی کە خۆی لە پەرستنی خواوەندەکانی ئێمە لادەدات. دووەم جار بەهۆی تووشی گە ندەڵی کردنی لاوان و سزای ئەم دووانەش مەرگە.)

ئامادەبووان تۆشی سەرسامی دەبن. لاوێك بە ئاوازێکی قوشمەوە لە ژێر لێوەوە بە هاوڕێکەی گوت: "بۆیە سوکرات بە خوانەناس ناو دەبەن چونکە تەنیا بڕوای بەیەك خوا هەیە!"

سوکرات هەروا ئارام و بێدڵەراوکێ لە جێی خۆی دانیشتبوو. ئەو وەڵامی ئەو بانگەشانەی لەکاتی خۆیدا دەداوە. ئێستا باشتر وایە بێدەنگ بێت تا سکالاکەرەکان قسەی خۆیان بڵێن. سەردەستەی سکالاکەرەکان بازرگانێکی کەولفرۆشە بە ناوی ئانیتوس (Anytus) کە کینە و دوژمنایەتییەکی شەخسی لەگەڵ سوکرات هەیە. کوڕەکەی ئەو لە هەوادارانی ئەم فەیلەسوفە پیرەیە. ئانیتوس سوکرات بەوە سەرزەنشت دەکات کە کوڕەکەی ئەوی لە خشتە بردووە و لاوەکەی لە ژیانی خۆشگوزەران و سودمەند دوور خستۆتەوە. ئەو دەیەویست ئەم مامۆستا گەندەڵکار و خراپکارە ناچار بکات کە مەراقی کوڕەکەی بۆ کاری کەولفرۆشی بگەڕێنێتەوە.

بەڵام مەبەستی بنەڕەتی ئەمە نەبوو. سکالاکەرەکانی تریش مەراقیان بوو سوکرات لەناوبەرن. دڕکی سەرڕێگای خاوەن هێزەکان بوو. کاتێك سکالاکەرەکان هەندێك بەڵگەنامە لە دژی ئەو بە دادگا دەدەن و وێنەی سەراوژێری ئەو لە بەرگی پیاوێکی ئاشووبکاردا دەناسێنن، ئەم ڕاستییە بە چاکی خۆیان دەبێت. پیاوێك کە ئازادانە بیروراکانی خۆی لە ناو





خەڵکدا بڵاو دەکاتەوە ـ ئەو بیروراکانەی کە ئاکاری لاوان توشی گەندەڵی دەکەن و ئاسایشی پیرەمێردان تێك دەدەن ـ.

هەروەها هەستدەکەین کە ئەسینایییەکان مەیلی ئەویان نییە کە پێداگری بکەن لەسەر مەحکوومکردنی سوکرات بە مەرگ. گەرچی دوزنامە لەسەر حکوومدانی سوکرات، سکالاکەرەکان لە دەربڕینەکانی خۆیاندا ڕێگاکانی هەڵهاتن بۆ فەیلەسووفە کە بە ئاوەڵایی دەهێڵنەوە و بە تەواوەتی دیارە ئەگەر فەیلەسووفەکە سوود لەو ڕێگایانە وربگرێت ئەوان خۆشحاڵ دەبن" ئەوان لە هەوڵی ئەوەدان کە زمانی ببەستن نەك ئەوەی کە لە ژیان بێبەری بکەن.

یاساکانی ئەسیناش بۆ کارێکی وا لە هەر ڕوویەکەوە ئامادەیی هەیە. ئانیتوس لە کۆتایی قسەکانیدا پێشنیاری کرد بە دەستەی دادوەران کە هەرکاتێ سوکرات داوای کرد سزاکەی سوك بکەن و ئەم پێشنیارە لەگەڵ فیکری ئەسینییەکان گونجاو بوو. بەم شێوەیە سوکرات لە دیاریکردنی چارەنووسی خۆیدا خاوەن را بوو و دەیتوانی لە بری مەرگ داوابکات کە دووری بخەنەوە و ئەگەری ئەوە هەبوو کە دەستەی دادوەران داواکاری ئەو قبوڵبکەن. بەڵام سوکرات چ دەکات؟

**ـ ٣ ـ**

بەرلەوەی سوکرات بە بەرگریکردن هەستێت، بێدەنگی بەسەر هەمووان، زاڵبوو، لە گەڵ ئەوەدا کە فیکرمان لای شێوەی بەرگریکردنی سوکراتە، جێی خۆیەتی چاوێك بە هێڵە بنچینەییەکانی ژیانی ئەودا بێنین. بۆ ئەوەی شێوازی ژیانی ئەو لە رابردوودا، ڕێنماییمان بکات و بتوانین تەخمین بکەین کە لە بەرگریکردن لەخۆیدا چ دەکات.

وا دیارە گفتوگۆی تەماشاکەرانی ئێمە لەم ڕێگەیەدا هاوکاریمان دەکات. کەواتە با گوێ بۆ قسەکانیان رادێرین. پیرەمێردێك بە لاوێك دەڵێت: "من لە شەڕی دژی سپارتەکان لەگەڵی بووم. خۆڕاگری ئەو سەرسوڕهێنەر و موعجیزە ئاسا بوو. زستان زۆر دژوار و سامناك و زەوی بە بەفر و سەهۆڵ داپۆشرابوو. هەموومان قاچمان لە (تاتی)دا پوشاندبوو. بەڵام سوکرات بەپێی پەتی بەرێوە دەچوو. گوایە دەیەویست پێیەکانی بەر ڕووی خۆڵەکە بکەون و هەروا کە دەرۆیشت گۆرانی دەچڕی" لاوەکە وتی: "بەڵێ، گوایە هیچ شتێك پەرێشان و نارەحەتی ناکات. سەرما،

برسێتی، ماندوویێتی، دژوێن و هەڕەشە. ئەو هەموو ئەمانە بێ پیتە پێکردن یان بەزەردە خەنەوە قبوولدەکات" نەفەری سێیەم ئاشکرا دەکات: "لەگەڵ ئەمەشدا هەمیشە شەرابەکەشی بە دەستەوەیە.من هەرگیز کەسێکی وەکو ئەوم نەبینیوە."

بێژەرێکی تر کە پێدەچێ میسری بێت دەڵێت: من لەبارەی گەعدە هاوڕێیانەکەی سوکرات کە زۆر بەناو بانگە، زۆر شتم بیستووە. مەبەستم ئەو میوانداریییەیە کە تیایدا سوکرات دەخوات و دەخواتەوە و تا بەرەبەیان لەگەڵ هاوڕێیانی باسی ئەڤینی دەکات."

پیاوە پیرەکە خۆی بەناو قسەکانیدا دەکات و دەڵێت: "مەبەستت ئەوەیە کە سوکرات تا بەرەبەیان بەئاگایە؟بەڵێ خەو گشت میوانەکانی دەبردەوە .شەراب بۆ ئەوان گەلێك بەهێز بوو.بەڵام سوکرات دوایین پێکی بەناوی ئاپۆلۆ (Apollo)ی خواوەندی ڕووناکی هەڵدەدا و بۆ فێرکاری بەرەو شەقامەکان بەرێدەکەوت..."

یەکێك لە موریدەکانی سوکرات دەڵێت :"من هەمیشە بیستوومە کە ئەو تاقە شەوخوونی ئەم شارە بووە" یەکێکیتر لە تەماشاکەران سەرێکی بە نیشانەی ڕاستی قسەکان هەژاند و گوتی: "بەهۆی ئەمەوەیە کەئەویان ڕاکێشاوەتە دادگا."

"سیاسەتوانان رقیان لەو کەسەیە کە بە گوێیاندا بچرپێنیت کە ئەوان لە بری باشتر کردنی باری خەڵك و وڵات لە خەودان و خەوی زێڕین دەبینن". بێژەری یەکەم درێژە بە گفتوگۆیەکە دەدات: "ئەو هەرگیز لە ماوەی ژیانیدا خۆی بە دەست زۆردارانەوە نەداو هیچ کاتێك خۆی لە دەربڕینی بیرۆکەکانی لانەدا " پیاوە میسری ئاساکە دەپرسێت: "ئێستا لەم دادگایەدا کەژیانی لە مەترسیدایە دەبێت چ بکات؟"

"هەمان ئەو کارەی کە هەمیشە دەیکرد. کاتێك هەردووکمان سەرباز بووین چەندین جار بۆ رزگاریی سەربازانیتر خۆی دەخستیە مەترسییەوە. مەترسی هەرچەند گەورە بووایە و بارودۆخەکەش هەرچەندە دژوار بووایە دڵنیا بووین کە سوکرات بەرەو پێش دەڕوات.."

کاتی پشۆ رووی لە تەواو بوونە و بەم زووانە داوا لە سوکرات دەکرێت کە دەست بە قسان بکات بەڵام سوکرات لەحاڵی خووەوەیەو بە مستێکدا روو چووە. پیرەمێرد لە بن گوێی هاوڕێیانیدا وتی :"ئەمە یەکێ لەحالەتە سەیرەکانی ئەوە. کاتێك کە لە سوپایەکدا بوو شەو و



رۆژێکی تەواو لەکاتێکدا کەلەناو فیکرەکانی خۆیدا نغرۆ ببوو، بەپێوە راوەستابوو، من ماوەیەکی درێژ لێی رامام،تەنانەت ئەندامێکیش نەدەجوولا." "ڕێك وەکو ئێستا. سەیرکە، گوایە لەم بێدەنگی و کپییە ڕەهایەدا لەگەڵ کەسێك لەپەیوەندی دایە ."

یەکێ لەقوتابیانی سوکرات دەڵێت:"رەنگە داوای هاوکاری لە خوا بکات تا رێگەی پیشان بدات و بلێت کە چ بکات." پیرەمێرد قسەکەی بەڕاست دادەنێت و دەڵێت: "ئەمە هەمان ئەو بابەتەیە کە رۆژێك بۆ منی ئاشکراکرد. من بە سوحبەت لێم پرسی کە لەکاتی تەنگانەدا، گوایە لە جیهانی سەروو پەیام وەردەگرێ؟! ئەو بەدەم زەردەوە وتی: "قسەکەت تەواو ڕاستە هاوڕێی ئازیزم. من گوێ لەبانگی خواوەندی دەگرم تابزانم دەبێت چ بکەم یان باشترە بڵێم تابزانم چ کارێك نەکەم ." یەکێك لەژێر لێوەوە گوتی: "نازانم ئەم بانگە ئەمرۆ چ پێی دەڵێت." پیرەمێرد وەڵام دەدا تەوە

-٤-

کاتێ پشو بە سەر چوو. ئەو تەماشاکەرانەی کە کاتێ پشو هۆلەکەیان جێ هێشبوو گەڕانەوە جێی خۆیان. سەروك فەرمانی دانیشتنەکەی راگەیاند و رووی لە سوکرات کرد. فەیلەسووف بە ملێکی قیت و سەر و سەکوتێکی ئارام و دیار هەستایە سەرپێ و بە دەنگێکی قایم بەڵام ئارام کەوتە قسە. دەنگێك کە نە کینە و بەرەنگاریخوازی شوێنەواری بە سەرەوە بوو نەش ترس و نادڵنیایی. دەربڕینەکانی بریتی بوون لە بەرزترینی ئەو قسانەی کە دەکرێ لە دەمی پیاوێك بێنەدەر. لەم قسانەدا نە بەرگری لە رەفتاری خۆی دەکات و نەش دەبێتە دەستەودامەنی لێبوردن. بەڵکو زیاتر بە پشتگیری کردن و سەلماندنی بڕوا و بیرو باوەڕی خۆی هەڵدەستێت. بڕوا بە داد لەو رووداوەدا کە بۆی روویدابوو و بیروبڕوای بەم حەقیقەتە ئاکارییە کە هیچ خراپەیەك هیچ کاتێك بە پیاو چاك ناگات، نە لە ژیاندا و نە لە دوای مەرگ. با گوێ بۆ قسەکانی رادێرین. سوکرات روو لە دادوەران و ئەندامانی دادگا دەکات و دەڵێت: "کەمتر روو لە سوکرات بکەن و زیاتر روو لە حەقیقەت بکەن. سکالاکەرانی من وا خۆ بە حەقزانانە و کاریگەر دوان کە من خۆم لە بیرکرد بەڵام راستییەکەی ئەوەیە کە یەك قسەی حەق لە زاریان دەرنەچوو. ئەوان ئێوەی ئاگادارکردەوە کە نەبن بەشکست خواردووی رەوانی دەربڕینەکانی من بەڵام ئێوە خۆتان دەگەنە ئەو راستییەی کە من قسەکەرێکی لێهاتوو نیم. نە وتاربێژێکی قسە





ئاگرینم نه دادوەرێکی قایلکەر بەڵکو پیاوێکی سادەمە کە بە شوێن دادەوەیە. لەو رووەوە داخوازیم ئەوەیە کە ئەگەر شارەزای زمانی دادگا نەبم هاوکاریم بکەن. لە ماوەی حەفتا ساڵ لە تەمەنمدا ئەمە یەکەم جارە کە بۆ دادگا بانگ کراوم. تکام ئەوەیە کە رێگە بدەن بە زمانی خۆم بدوێم. بایەخ بە شێوازی قسە کردنم مەدەن، بەڵکو چاو لەو حەقیقەتە ببڕن کە لە قسەکانمدا شاردراوە تەوە و راستی ئەمەیە کە من بێگوناهم و لەو تۆمەتانەی دراوە تە پاڵم بێبەریم."

پاشان سوکرات هەڵدەستێتەوە بە رەفزکردنەوەی یەك بە یەکی تۆمەتەکان. خەڵك ئەوەیان بە خوانە ناس داناوەو بانگەشەی ئەوە دەکەن کە ئەو خۆی بە عاقلتر لەوەدەزانێ کە بڕوا بە خواوەندەکان بکات. "بەڵام من بە هیچ شێوەیەك عاقڵ نیم و دەزانم کە هیچ نازانم. رەنگە ئەمە بێت کە ئێوە بە عەقڵ دایدەنێن. چەندە زۆرن ئەو کەسانەی کە تەنانەت نازانن کە نازانن." ئەمە گورزێکی زیرەکانە بوو لە دژی خۆ پەرستی و بە فیزی سکاڵاکەرەکان. سوکرات پەی بەوە دەبرد کە ئەم قسانە دەکرێ ژیانی ئەو زیا تر بخە نە مە ترسییەوە بەڵام ئەو لە فیکری رزگار. کردنی خۆیدانییە. بەڵکو بە تەمایە حە قیقەت سەربخات. "ئەمە تەنیا ئامانجی منە لە ژیانادا. من لە هەموو جێگەیەك ئەوەم وەبیر فەرمانڕەوایان هێناوەتەوە کە ئەوان دەبێت رێورسمی ولاتداری فێربن، هەروەك کە پینە دۆزێك رێگەی نووژەن کردەنوەی پێلاوی فێربووە. هەرچە ندە ئەم کارانەی. من کە خۆی لە خۆیدا. عیبادەتە لە رێگەی خوادابە بێ سوود و بێ کەڵك دابنێن. من بواری ئەوەم نەبووە کە بپەژێمە سەر ژیانی خۆم و وەك دەبینن لە بەرئەوەی هە موو تەمەنی خۆم لەم رێگەیەدا خەرج کردووە لە کۆتا ییدا هەژار و خزانم. "

بۆ بەر پەچیدانەوەی تۆمەتی یەکەم هەرئەمەندە بەسە. سوکرات بێبڕوانییە بەرامبەر بە خواوەندەکان بەڵکو بەپێچەوانەوە بڕوادارێکی راستینەو دادەوەری فێری خەڵك کردن بە ستایشی خواوەند دەزانێت.

پستەپستێکی بەردەوام لە چەشنی ویزە ویزی ئەو زەرەردەواڵانەی کە دارێکیان ئاخینتە هێلانەکەیان، سالۆنەکەی لە خۆ پێچاوە. سوکرات بەدەست ئاماژەوی کرد کە بێدەنگی بن. هەموو بێدەنك دەبن. سوکرات بۆلای تۆمەتی دووەم دەچێت و یەکێك لە سکاڵاکەرەکان لەسەر کورسی شایەتەکان دادەنیشێت و ئەمە خۆی لە خۆیدا زۆر سەرنجراکێشە کە تۆمەتبار و دادوەر و سکاڵاکەر بخاتە بەرپرس و بێژەوە.



ئەم سکاڵاکەرە شاعیرێکە بەناوی مێلێتوس (Meletus). ئەویش دوژمنایەتی شەخسی لەگەڵ سوکرات هەیە. چونکە فەیلەسووف گاڵتەی پێکردووە و گوتویەتی کە ئەو تەنیا هەندێك وشەی هۆنیوەتە سەریەك و حیکمەتێکی قووڵ لە گوتەکەیدانییە. ئێستاکەش ئەو بەهەمان ئەو تورەییەوە کە خۆی رستووە دەیخاتە داوەوە. ئەو شاعیرەکەی بۆ شوێنێك رادەکێشا کە ئەوە ئاشکرا بکات کەوا هەموو کەسێك لەئەسینادا توانای چاکسازی لاوانیان هەیە جگە لە سوکرات کە دەرەقەتی ئەم کارە نایێت. دیارە کە ئەم قسەیە پووچ و بێواتایە کە وێنا بکرێت هەموو خەڵك عاقڵن و تەنیا سوکرات نەزانە. لێرەدایە کاتێك کە دەنگی پێکەنین سالۆنەکە لەخۆی دەپێچیتەوە و سوکرات ئاوها درێژە بە ئاخاوتن دەدات:

"لە بارەی تۆمەتی مێلێتوس تێر قسەم کردووە و چاك دەزانم کە چ هەستی دوژمنانەم لە دژی خۆم ورووژاندووە. هەروەها ئاگاداریشم کە ئەم هەستە دژمنانەیە بەهۆی ئازادی قسەکردن و راشکاوی من لە دەربڕینی بیروڕاکانمدا پەیدا بوونە و لەوەدایە بەرە و لەناوچوونم بەرێت. بەڵام ئەمە مێلێتوس یان ئانیتوس نییە کە مەحکوومم دەکات ـ ئەگەر مەحکووم ببم ـ بەڵکو ئیرەی و ریسوایی دونیایەکە زۆرێك لە پیاوچاکانی لە نیعمەتی ژیان بێبەری کردووە و دیسانیش بێبەری دەکات و ئەو ترسەش لە گوڕێ نییە کە من دوا کەس بم."

بەم شێوەیە سوکرات حوکمی مەحکوومکردنی خۆی بەدەستی خۆی ئەرێ کرد و بچووکترین ترسیشی نە خستەوە دڵەوە"" پیاوی چاك نابێ بیر لە ژیان یان مەرگ بکاتەوە بەڵکو دەبێت بە دوای ئەوە بێت کە ئایا کردارەکانی راستن یان هەڵەن. بەلای ژیان لە مردندا نییە بەڵکو لە ریسوایی و ناو زڕان دایە." ئایا ئەمە دلێری و هێز و توانای روحیی سوکرات نییە کە ئەوی لە قسەکردن لەبارەی مەرگەوە ـ ئەو مەرگەی کە هێندە لێی نزیکە ـ ئەوەندە بێباك کردووە؟ با گوێ بۆقسەکانی رادێرین بۆ ئەوەی خۆی وەلامدەرەوەی ئێمە بێت."هیچکەس نازانێت. رەنگە ئەو مەرگەی کە وەکو دوژمنێکی خراپکار و زیانکار لێی هەڵدێین، بەراستی خەلاتێکی گەورە بێت. ئەگەر بمکوژن خۆتان رەنجاندووە نەك من. چونکە ئێوە کە ژیانم لێدەستێنن زیاتر لە من، کە چیتر زیندوو نیمە، ئازار دەچێژن. ئێوە پیاوێك لە خۆتان دوور دەخەنەوە و لەناوی دەبەن کە بوێری ئەوەی هەبوو کە ئێوە بۆ کارە چاکەکان هانبدات."





دەنگی زۆرباشە و ئافەرین گوتن خۆنەویستانە لە هەندێك کەس بەرزبووەوە. بەڵام سوکرات جارێکیتر داوای بێدەنگی لە خەڵك کرد "تکا دەکەم قسەکانم مەپچڕێنن تا بتوانم کۆتاییان پێبێنم ... هاوشارییە ئەسیناییەکانم هەروەك دەزانن من هەرگیز لە مەترسی نەترساوم و دوو جار یەکێکیان لە سەردەمی دیکتاتۆری و ئەویتریان لە سەردەمی دیموکراسیدا ئەرکی گشتیم گرتۆتە ئەستۆ. هەردوو جار سەرۆکەکانم بە هۆی ئەوەی کە چە ند کەس لە باشترین هاوشارییەکانی ئێمەی مە حکوم کرا بوو رە خنەو سەرزە نشت کردووە چونکە هەروەك پێشتریش گوتم هیچ شوانێك نابێت لە کەم بوونەوەی پەزەکەی هەست بە خۆ زلزانی و سەربڵندی بکات.

ئەی خەڵکی ئەسینا ئەمانە ئەو بابە تانەن کە من بۆ گوتنم هەبوون. من بە هیچ شێوەیەك داوای لێبوردن ناکەم. من ئافرێنراوێك نیم لە بەرد و دار بەڵکو لە خوێن و گۆشت ئافرێنراوم. خێزانێکم هەیە کە لە ژنێك و سێ منداڵ پێکدێت. ئەوانم بۆ دادگا نەهێناوە نەوەك هەستی بەزەیی ئێوە ببزوێت، ئەوی من دەمەوێت بەزەیی نواندن و نەرمی نواندن نییە، بەڵکو عەدل ودادە مەکەونە ژێر کاریگەری هەست و سۆزەکان بەڵکو گوێ بۆ با نگی و یژدان هەڵخەن، ئەرکی ئێوەیە کە یاسا جێبە جێ بکەن من بڕوام بە یاسای خواوەندی هەیە ـ بەواتایەکی تر بەرزتر لەوەی کە سکاڵاکەرەکانم وێنا دەکەن. من کارەکەم بۆ ئێوە و خوا بەجێ دەهێڵم تا بەوکارە هە ڵسن کە چا کەی من و ئێوەی تێدایە.

ـ ٥ ـ

دادگاکە کۆتایی پێهات. دەستەی دادوەرەکان دەنگی خۆیاندا. لە ناو تەماشاکەراندا گفتوگۆیەکی گەرم لە ئارادایە. رای کۆتایی چ دەبێت؟ دوورخستنەوە؟ زیندانی هەتاهەتایی؟ مەرگ؟

پێویست ناکات ماوەیەکی درێژ چاوەروان بین. دەنگەکان خوێنرانەوە و ئەنجامەکە راگەیەنرا. ٢٢٠ کەس دەنگیان بۆ بێگوناهی ئەویان دا و ٢٨٠ کەسیش بۆمەرگی.

سوکرات چۆن مامەڵە لەگەڵ ئەم رایەدا دەکات؟ بە گوێرەی یاسای ئەسینا ئەو دەتوانێت داوای پێدا چونەوە بکات.



کاتێك سوکرات جارێکیتر کەوتە قسان وتی: "ئەی خەڵکی ئەسینا. ئێوە منتان مەحکووم بە مەرگ کرد و من لە هەندێك لایەنەوە پێی غەمبار نیم. وێنادەکەن کە من چ پێشنیارێك بکەم؟ دیارە ئەوەی کە شایانی منە و بۆمن دوای تەمەنێك خزمەت و بەخشینی هەموو ئەو شتانەی کە خولیایان بووم چ پێشنیارێك دەتوانێت بە جێ بێت؟ بۆ هاوکاری کردنی خەزێنەی گشتی و بۆ ئەوەی خەرجێکم نەهێنابێتە ئاراوە، دەتوانم پاشماوەی تەمەنیشم بکەم بەقوربانی جێبەجێ بوونی فەرمانی ئێوە. ئەمە ئەو سزادانەیە کە من بۆ تاوانەکەی خۆم پێشنیار دەکەم."

ژاوەژاو و دڵەراوکێ دادگای لەخۆگرت. لە هەر لایکەوە دژوێن و جنێو دەبارێن. چاوەکان مۆڕو مستەکان هەرەشە ئامێزبوون. هاوارەکانی" ریسوایی گەورە "، "دلێریەکی ئێجگاربەرز"، "خواوەندێکمان لە ناوە و ئێمە قەسدی گیانی ئەومان هەیە." لە سەرتاپای سالۆنەکە دەگیشتە گوێ بەلاّم سوکرات جارێکیتر داوای بێدەنگی لە خەڵك کرد؛ "چەند قسەیەکی تریشم لەگەڵ ئێوە هەیە."

کاتێك ژاوەژاو و حەشاماتەکە هێور بووەوە سوکرات ئاوەها کەوتە ئاخاوتن: "من داوای دوورخستنەوەم نەکرد چونکە بۆ هەرکوێیەك کە بڕۆم دەبێت لە دەربڕینی حەقیقەتدا سوورم. بۆیە هەرکاتێك چەند ساڵێتر نەتوانن بوونی تەحەمول بکەن من بۆمردن ئامادەم... "

"بۆدەبێت لە مەرگ بترسم؟ وەرن با لە روخساری مەرگ بروانین و بزانین چ تێیدا پە یدا دەکەین. لە دوو بار بەدەر نییە یان بێهۆشی و خەوێکی شیرین و بێخەون یانیش گەشتێك بۆ دونیایێکی تازە ـ شوێنێك کە لەگەڵ شەریفترین و ئاقڵترین خەڵکانی سەردەمی رابردوو دەبێت بە هاودەم و هەڤاڵ کەواتە لە هەردوو باردا داواکارم لێتان کە بە شادی و ئومێدەوە رووبەرووی مەرگ ببنەوە.

بەلاّم لەبارەی سکاڵاکەرەکانم. گەرچی ئەوان نیازێکی باشیان درحەق بە من نەبووە، ئازاریشیان بە من نەگەیاندووە. ئەوان لە حوکمدانیاندا تووشی چەوتی بوونە لەو رووەوە چاو پۆشی لەگوناهەکەیان دەکەم هەروەك خواوەندیش لێیان دەبوورێت چونکە خواستە خراپەکەیان زادەی جەهل و نەزانییە..."





"ساتێ لێك دابڕان هاتووە و هەریەکەمان دچێتەوە سەرڕێگەی خۆی، من بەرەو مەرگ و ئێوەش بەرەو ژیان، تەنیا خواوەندی زانا دەزانێت کە کامەمان چارەنوسێکی چاکتری دەبێت."

سوکرات بۆ زیندان دەبەن تا لەوێ چاوەڕێی مەرگ بکات و ئێمە تا کۆتایی ئەم رووداوە لە ئەسینا دەمێنینەوە.

رێك چەند رۆژێك بەر لە جێبەجێ کردنی حوکم، پڕوپاگەندەی سەیر دەماودەم دەگێڕدرێنەوە: سوکرات نیەتی هەڵهاتنی هەیە. کۆمەڵێك لە هاوڕێکانی ئامادەکارییەکانیان دابینکردووە. لە نێو خەڵکی گشتیدا پڕوپاگەندەی ئەوە هەیە کە دادوەران و پاسەوانانی زیندان لە هەر پێهەڵسانێك بە رزگارکردنی ئەو چاوپۆشی دەکەن. بەڵام خەڵك لای خۆیان وایان داناوە کە کاتێك کریتۆ (Crito) ی هاوڕێی سوکرات چووە لای و پیلانەکەی بۆ گوت سوکرات بێ ئەم لاوئەولا خۆی لە هەڵهاتن لادا.

"من بە گوێرەی یاسای وڵاتەکەم حوکمدراوم و دەبیت مل بدەمە بەرێ. ئەگەر کارێك جگە لەمە بکەم بۆ هاوبیرەکانم دەبمە نمونەیەکی یاساشکێن." بەم شێوەیە ئەم فەیلەسووفە لەخۆ بردووە رژدە لە سەر ئەوەی کە بەرەو مەرگ هەنگاو پێش بنێت و مەرگیش رێك مانگێك دوای ئەم دادگاییکردنە هات. هاوڕێکانی لە هەموو ئەو ماوەیەدا لە زینداندا لەگەڵی بوون. سوکرات سەرلەبەیانی رۆژی وادە پێدراو ژن و منالەکانی ناردەوە ماڵ و وتی:

"نامەوێت لە دواساتەکانی ژیانم گوێم لە نالە و شیوەن بێت."

لەو بارەشدا سوکرات کەمتر لەوانیتر لە ئاشووب و هەیەجاندا دەژیا و لەگەڵئەواندا باسی لە نەمری گیان دەکرد و لە سەرلێوی گۆڕ وەسیەتنامەیەکی ئومێدبەخشی بۆ زیندووەکان دەنووسی.

لەم وەسیەتنامە ئومێدبەخشەدا دەبێت سوکرات بە باوکی گیانیی سێنت پاول (saint paul) دابنرێت. بڕوای ئەو بە نەمریی گیان بنەمای بیروڕای مەسیحیەتە کە چوارسەد ساڵ دوای ئەوە راگەێنرا. سوکرات لە زینداندا دەیگوت کە لەش زیندانی گیانە و گیانیش زیندانییەکی یەکبینە چاو لە رێی ئازادییە:



رۆژی وادە پێدراو بە گورجی دادێت. جامی شەوکەران لەکاتی خۆرئاوا بووندا دەدنێ. قسەکانی ئەو، لەم کاتەدا دڵنیاکەر، ئارام، بێ پەلە، قایم و مکومن. ئەو بابەتەکانی خۆی بە شێوەی جۆرا و جۆر دەردەبڕێت تا هاوڕێکانی بەباشی وەریبگرن.

لەش وەکو ئامێرێکی مۆسیقایە و گیان وەکو ئاوازێکە تیایدا دەژەنرێت.

ئەم ئامێرە تێك دەشکێت و لە ناو دەچێت بەڵام ئاواز هەروا دەمێنێتەوە بەراستی روح کاتێك بە تەواوەیی گیان دەگرێت کە پاك و خاوێن ببێتەوە و لە لەشی ناتەواو و گڵاو رزگاری بێت. کەواتە کاتێك داوەکانی تەمەن لێك دادەبڕێن دەبێت خەم نەخەینە دڵانەوە. ئەمانە داوە دەزووی بێنرخن. دەبێت دڵمان بەوە خۆش بکەین کە گیان ئەخیرەکەی ئازاد دەبێت و بەرەو لای خوا دەگەڕێتەوە. "تەنانەت هێزەکانیش کاتێك رووبەڕووی مەرگ دەبنەوە خۆشترین ئاوازەکانی خۆیان دەخوێنن. چونکە ئەوان بە هەستەوە غەریزەکانیان ئاوازی ئاپۆلۆ (Apollo) ی خواژنی مۆسیقا دەبیستن. ئایا دەبێت بڕوای من، بڕوای فەیلەسووفێك لە هێزەکان لاوازتر بێت؟" ئیتر ئاوازی سوکرات رووی لەکپییە. ئاوا بوون نزیك دەبێتەوە. پاسەوانی زیندان هەنگاوی دەنێتە ناو زیندانەوە: "ئەی سوکرات لێم ببورە کە گوێڕایەڵیکردنی فەرمانی سەرپەرشتکارانی کاروبار دەبێت ئەم پەرداغەی ژەهر بدەمە دەست شەریفترین و خانەدانترین پیاو."

هەرکە رووی لە سوکرات وەرگێڕا؛ قوڵپی گریانی ناو گەرووی دەتەقێ و هون هون لە پرمەی گریان دەدات. لەم ساتەدا هەموو خۆیان ون کردووە و تێکشکاون جگە لە سوکرات کە دەپرسێت:

"ئەم شین و شەپۆڕە چییە؟ من ژنەکانم ناردە دەرەوە تا رووبەڕووی دیمەنێکی وا نەبم. کەواتە ئارام بن و ئۆقرە بگرن."

هاوڕێکانی بە بیستنی ئەم قسانە، لە شەرما خۆیان لە گریان لادەدەن. سوکرات پێکی ژەهرەکە هەڵدەدات و دەکەوێتە پیاسە. زەردەخەنەیەکی گەرم لە سەر لێوانی نیشتووە.بە هێواشی دەست لە شانی هەریەکە لەهاوڕیکانی دەدات و بە گوێی هەریەکەیان قسەیەکی خەمرەوێن دێنێتە سەرزمان.

ژەهر کار لە لەشی دەکات و ئیتر توانای ڕێکردنی نییە. بەرەو گۆشەیەك دەخشێت و خۆی دادەپۆشێت. کریتۆ لەژێر لێوەوە دەڵێت! "کاتێك ژەهر گەیشتە دڵی ئیتر حسابی تەواوە." لە ناکاو سوکرات رووپۆشەکە هەڵدەداتە لایەك. ئەو بۆ هاوڕێکانی پەیامێکی تریش هەیە: "هێی کریتۆ من کەڵەشێرێکیش قەرزاری ئاسلپیوس (Ascelepius) م، تکات لێدەکەم ئەم قەرزەشم بدەیتەوە."

ئەمە دوایین سپاس و ریز لێگرتنی سوکراتە بۆ خوای دەرمان چونکە ئاسلپیوس خوای دەرمان ئەوی لە تاوە نارێکەکانی ژیان راپسکاندووە. کریتۆ وەڵامی داوە: "ئەم قەرزە دەدرێتەوە ئایا داوا کاریت هەیە؟" ئیتر هیچ دەنگێك لێنایێت. ژەهر گەیشتۆتە دڵ. کریتۆ دەموچاوی دەبەستێت.

❊ ❊ ❊

دەمی سوکرات بەسترا، بەڵام قسەکانی هەروا زیندوو و نەمرن: "خراپە و بێعەدالەتی بە دڵسۆزی و دوژمنیش بەلێبوردن وەڵام بدەنەوە. دوژمنەکانی خۆتان لەبەر خاتری نەزانیان سزا مەدەن. فێریان بکەن بۆ ئەوەی لە تاریکی نەزانی رزگاری ببێت."







# خەباتی ئەفلاتون لە ڕێگەی داد دا

**(٤٢٧ ـ ٣٤٧ پ.ز)**

ئەفلاتونیش وەکو سوکرات، لە ناوەندێکی پڕئاشووبی سیاسی و بە خستنە ناو مەترسیی ژیانی خۆی، هەڵسا بە پڕوپاگەندە کردن بۆ فەلسەفە. وەرن لەو ساتەوە کە دوای شەهیدبوونی مامۆستاکەی لە ئەسینا. هەڵهات، شوێنی کەوین.

سوکرات مامۆستاو موراد و پێشەوای ئەو بوو. لەگەڵ ئەمەشدا ئەفلاتون لەڕووی جەستەیی و دەروونییەوە بەرادەیەك نەخۆش و لاواز بوو کە نەیتوانی "خانەدانترین و ئالترین پیاو" لە دوا ساتەکانی ژیانیدا ببینێت و دوای شەهیدبوونی سوکرات بۆی دەرکەوت کە ئیتر لە ئەسینا لە ئازاری خەڵك بە دەر نییە.

ئەفلاتون لەم کاتەدا پیاوێك بیست و هەشت ساڵانە. لە مردن باکی نییە بەلاّم هە ڵگری پە یا مێك بۆ جیها نییان کە بە ئەرکی خۆی دەزانێت بە پڕوپاگەندە کردنی هەڵسێت. وکارە ناتەواوەکەی مامۆستاکەی کۆتایی پێ بێنێت. ئەو خۆی بە ئەرکدار دەزانێت کە وەسیەتنامە بەڕاستی بارگاوی بوو و نەنوسراوەکەی سوکرات لە توێی وشە گیاندارەکانەوە بە گوێی جیهانیان بگەیەنێت و بەو هۆیەوە بە دڵخوازی خۆی بەرەو تاراوگە دەچێت تا هەم زیاتر بتوانێت حیکمەت بەدەستبێنێت و هەمیش دەرفەتێکی پێویست بۆ تەواکردن و فراوانکردنی فیکرە سەرەکییەکەی خۆی ـ خەبات لەڕێگەی عەدالەتدا ـ پەیدا بکات.

خۆشبەختانە بۆ ئەم کۆچە ئامادەییەکی تەواوی هەبوو. لە بەر ئەوەی لە بنەماڵەیەکی خانەدان بوو. لەشێکی بەهێز و مێشکێکی درەوشاوە و کیسەیەکی پڕی هەبوو. دووجار لە





سەر داواکاری خۆی خزمەتی سەربازی کردبوو دووجاریش بوو بە قارەمانی زۆرانبازی. ناوە ڕاستینەکەی ئەریستۆکلس (Aristocles) بوو، بەلاّم بە بۆنەی بەرین بوونی سینگەوە، یەکێ لە هاوڕێکانی ناوە خواستراوەکەی ئەفلاتونی پێ بەخشی و هەربەم ناوەوە لە جیهاندا ناوبانگی دەرکرد.

ئێستاکە ئەم وەرزشوانە بەهێزە ئامادەیە پێ بەڕێگاوە بنێت و خۆی بە سەرزەمینە نهێنی ئامێزەکاندا بکات، لەگەڵ بیری گەورە پیاوانی ئەو ڕۆژگارە تێکەڵبێت و نهێنییەکانی ژیان و کێشەکانی ڕەوتار و کرداری مرۆڤ هەڵبێنێت. بەلاّم لە تەواوی قۆناغەکانی گەشتەکەیدا، سوکرات ئەستێرەی ڕێنمایکەری ئەوە و خۆی وەهای گوتووە: "سوپاس بۆ خوا کە بە یۆنانی لەدایك بووم نەك دڕندە، بە ئازادی ئافرێنراوم نەك کۆیلە، بە پیاو ئافرێنراوم نەك ئافرەت و بەرزتر لە هەمووی ئەمانە لە سەردەمی سوکراتدا چاوم بە دنیا هەڵێناوە."

ـ ٢ ـ

بۆماوەی نزیکەی دوانزە ساڵ شوێن پێکەی بزر دەکەین. بەلاّم دیمەنە جۆراوجۆرەکانی سەفەرەکانی لە بیرکردنەوەی ئەودا شوێنەواری ڕووناکیان بەجێهێشتووە. لە ئاسۆوە بەرینەکەی فیکرەکانی بۆمان دەردەکەوێت کە ئەو دەبێت بۆ میسرو سیسلی و ئیتالیاو ڕەنگە تەنانەت بۆ هیندستان و ئەو ناوانە سەفەری کردبێت. لەکاتی گەڕانەوە لەو گەشتەدا ئەفلاتون ئیتر ئەسینایی نییە. بەڵکو کەسێکەکە مولکی هەموو جیهانیانە و ڕێزێکی بەجێ لە دابە کونەکانی فیرعەونەکان دەگرێت، بەچاوی ڕێزەوە دەڕوانێتە ڕێوڕەسمی نوێی سیاسیی ئیتالیاو بەچاکی دیارە کە لە شەوق و زەوقی عیبرییەکان بۆ داد و ئەڤینی هیندییەکان بۆ ئاشتی شتی زۆری فێربووە.

بەڕاستی زەینی ئەو وەکو شیشەیەکی ساف و شەفاف، ئەو فیکرە بەرز و پرسە لە چارەسەرنەهاتووانەی کە زەینی فەیلەسوف و سیاسەتوانەکانی سەرتاپای جیهانی بەخۆە خەریککردبوو، لە خوو گرتبوو و دەیداوە و هیچ بابەتێك لەلاپەڕەی دەرەوشاوەی زەینی بەدوور نەمابوو.

پێوانەیەکی و دوو هێندەییەکانی ئاکاری، خاوەندارێتی هاوبەشیانەی ژنان، منداڵان وسامان، ئازادی لە دەربڕیندا، ئازادیی لە پەرستندا، ئازادی لە خۆشەویستیدا، زەوجینی دەوڵەتی، چاکسازیی نەژاد، سنوردارکردنی وەچەخستنەوە، دابینکردنی یەکسانی نێوان ژن و پیاو، سوشیالیزم، دیموکراسی و هەوڵ و تەقەلای مرۆڤ لە هێنانەدی برایەتی، ئەمانە گشتیان ئەو بابەتانە بوون کە لەزەینی ئەودا چەسپیببوون.

هەموو ئەم مینا کە فیکریانە، بەشێك لە کەرستە خاو و سەرەتاییەکانی فەلسەفەکەی ئەو بوون و دەیەویست لەم کەرەستە فیکریانە حکومەتێکی کۆماریی نوێ ـ حکومەتێکی ئاسمانی لەسەر رووی زەوی ـ بنیاتبنێت. دەبێت بزانێن کە پەرتووکی "کۆمار"ی ئەو تەنیا زنجیرە بیردۆزێکی بێگەرد نەبوو. بەڵکو ئەفلاتۆن پەلەی بوو تا ئەوەندەی بویّ بەرگی پراکتیکیان وەبەر بکات.

ئەفلاتۆن دەیزانی کە لە شاری سپارت  کە هێندە لە ئەسیناوە دوور نەبوو، هەندێ لەو بیردۆزانە کەوتوونەتە قۆناغی پراکتیکییەوە. سپارت رێگەی لە هاتنەژوورە وەی گەشتیاران دەگرت بۆ ئەو شارە. بەلاّم ئەفلاتۆن توانی مۆڵەتی چوونە ژوورەوە بۆ ناو ئەو شارە بەدەست بێنێت ـ ئەو شارەی کە دیتوانی راستەوخۆ هەندێ نمونەی پراکتیکی ناتەواو لە بیرۆکەکانی "کۆمار" بەدەستەوە بدات.

گەرچی ئەنجامی ئەم ئەزمونە هێندە دڵخۆشکەر نەبوو، ئەفلاتون بەرامبەر بەحکوومەتی سپارت کە نموونەیەکی پراکتیکی مارکسیزمی ٢٣٠٠ ساڵ دواتری کارل مارکس بوو، رایەکی تێکەڵ لە ئافەرین و بێزاری هەبوو. ئەفلاتۆن سەیریکرد کە خەڵکی سپارت ژیانێکی هاوبەشیانە (ئیشتراکی) یان هەیە. هەموو لە ساڵونە گشتییەکاندا خواردن دەخۆن، چونکە نایانەوێت لە شارەکەیاندا کەس شەو بەبرسێتی بخەوێت. سامان و هەژاری بێسنووربوونییە. هەموون بەشی خۆیان لەسامانی گشتی هەیە و بەم شێوەیە پشتگیری لەهەموو کەسێك دەکرێت. هەرکەس بەقەد کارامەیی خۆی بەشەکەی دەبات و هەرکەس بەقەد پێویستییەکانی یارمەتیدەدرێت. هیچ کەسێك بۆی نییە ببێتە خاوەنی زێڕ و زیو و بەردە گرانبەهاکان. سکە لەئاسن دروستدەکرێت. چونکە کانزایەکە کە ناتوانرێ برێکی زۆری لێ لە سەریەك کەلەکە بکرێت.



بەم جۆرە لە ناو خەڵکدا چەند پلەیەکی یەکسانی بەرقەرارە بەلاّم جۆرە یەکسانییەکی بێگیان و درندانە. تاکە پیشەیان شەڕوانییە، لە ساوایان تەنیا بەهێزترینیان مافی ژیانیان هەیە و ئەوانیتر لە هەمان کاتی مناڵیدا دەخنکێن.

ئەو منالاّنەی کە بەزیندوویی دەمێننەوە لە سەربازخانەکاندا فێردەکرێن نەلە خوێندگەکانەوە فێردەکرێن کە گوێڕایەڵی سەرکردەکانیان بکەن و لەگەڵ دونیادا بکەونە شەڕ.

بەکورتییەکەی سەرتاپای شار سوپایەکی چەکدارە و هەر بێگانەیەکیش دوژمنێکە بەهەموو هێزیەوە. سپارتییەکان هیچ جۆرە هاتووچۆیەکی دۆستانەیان لەگەڵ ولاّتە هاوسێکاندا نییە و ناچنە ناو هیچ کۆمەڵگایەك بۆ هێنانەکایەی یەکێتی جیهانی یان تەنانەت یەکێتی یۆنان. هاندەری ئەدەبیات و زانست و هونەر نین و جگە لە هونەری زاڵبوونی عەسکەری بایەخ بە هیچیکە نادەن. لەو رووەوە شارە کە لە پشت پەردەیەکی ئاسنیندا بە حەسارداوی ماوەتەوە و چەکێکی لە کۆڵ کردووە، یەکبینە چاوەڕێیە تا ئاگری دووبەرەکی بنێتەوە و لەگەڵ نەتەوەکانیتردا بکەوێتە شەڕ بەو نیازەی کە دونیا بخاتە سەر شێوەی سپارت. ئەفلاتوون بۆ بناغەی. دانانی شارە بالاکەی خۆی ئەم شارەی کردە خالّی دەستپێکردن. خالّە بالاکانی لێوەرگرت و هەڵەکانی لابرد یان چاککردنەوە. چونکە لەو بڕوایەدا بوو  کە شارەبالاکەی ئەو نەك تەنیا دەبێت ئەوەندە بەهێز بێت کە بتوانێت بەرامبەر بە دوژمن بەرگری لەخۆی بکات، بەڵکو دەبێت هێندەش شەریف و بەشکۆ بێت کە بتوانێت دوژمنەکانی بێنێتە ناو گرووپی هاورێکانییەوە.

## - ٣ -

ئێستاکە ئەفلاتوون لە شارە ئەسلییەکەی خۆی دەبینین. لە ژیانە پڕ رووداوەکەی ئەودا ئارامیەك هاتووتەکایەوە. جۆش و هەیەجانێك کە لەکاتی شەهیدبوونی سوکراتدا زیادبوو و نیشتبووە بیرکردنەوەی، وەکو پێشوو هێندە ترسناك نییە. ئەفلاتوون ماوەیەك کاتی خۆی بۆ فێرکردن و نوسەری تەرخان دەکات. قوتابییەکانی فێردەکات، زەینی خۆی بریقەدار دەکات و بناغەی نەخشەبنەرەتی و پێشەکییەکانی بونیاتنانی فەلسەفەکەی کە دابینکردنی داد و گشتاندنی خێرخوازی نێوان خەلکە، دادەنێت.





سەردەمی فێرکاری ئەو، سەردەمی ئارامیی بەر لە زریانە. زەحمەتی و دژواری بێهەژمار لە ڕێگەدانە کە لە ئاییندەدا ڕووبەڕوویان دەبێتەوە. ئەفلاتوون لەباخەکانی دەوری شار قوتابخانەیەکی کردەوە کە بە ئەکادیمیا ناوی دەرکرد. لێرەدا، لەژێر درەختەکانی زەیتوندا و لە پاڵ هاژەی ڕووباردا، بەدژواری کەوتەکار و ئەو نەخشە جۆراوجۆرانەی کە لە دامەزراندنی جیاندا بەکار هاتبوون بۆ قوتابیانی خۆی ڕوون دەکردەوە. ئەم نەخشانە لەڕوانگەی ئەوەوە چەندین بەشی هاوئاهەنگ بوون کە لە یەکەیەکی گونجاودا کۆ ببوونەوە. ئەفلاتوون هەندێك جار ئەم هاوئاهەنگی و ڕێکەوتنەی بەجوانی ناو دەبرد و هەندێك جاریش بەچاکە. بەلاَم هەمیشە ئەم جوانی و چاکەیەی بەداد ناودەبرد. ئەمەیە ناوەڕۆکی قسەکەی و هەر لەسەر بنچینەی ئەو قسەیەیە کە شارە بالاَکەی خۆی بناغەرێژ کردووە.

"کۆمار" بەرزترین بەرهەمی ئەفلاتوونە. بەرهەمەکانیتری ئەو دەتوانرێ بە نەخشە سەرەتاییەکانی ئەم بەرهەمە گەورەیە ـ ئەم شارەبالاَیە و کۆمەڵگای ڕاستی و بالاَیی ـ دابنرێت.

جێی خۆیەتی ئێستا کە چاوێك بە "کۆمار"ی ئەفسانەی ئەفلاتووندا بێنین کە یەکێکە لەدیاردە گەورەکانی بیری مرۆڤی.

ـ ٤ ـ

لەقوتابخانە نمونەییەکانی ئەوەوە دەست پێدەکەین. یەکەم بابەت کە لەقوتابخانەدا دەمانخاتە ژێر کاریگەرییەوە ئەوەیە کە دەبینین منداڵەکان یەکتر بە خوشك و برا بانگ دەکەن. لە مامۆستا دەپرسن: ئایا ئەمە ڕێورەسمێکی تایبەتە لە ناو قوتابییەکاندا؟ ئەمە حەقیقەتێکی پایەدارە،"ئەم منداڵانە بەڕاستی خوشك و برای یەکترن." و لەبەرئەوەی پەی بە سەرسامی ئێمە لەو وەلاَمە دەبات ئەوها بۆمان ڕوون دەکاتەوە: "هەموو ئەو منداڵانەی کە لە کۆمەڵگای ئێمەدا دێنە بوونەوە بەرهەمی پەیوەندی گشتییە. باشترین پیاوان لەگەڵ باشترین ئافرەتان دەخەون و پیاوانی ناوەندی لەگەڵ ژنانی ناوەندی و هەروا تا دوایی. ئەم بارە، هەروەك دەزانی هەمان ئەو شێوازەیە کە خاوەن مالاَتەکان بو ئاژەڵەکانی خۆیان بەکاریدێنن. هەولێ ئێمە لەوەدایە کە باشترین جۆری مرۆڤ بەرهەمبێنین هەروەك خاوەن مەڕ و مالاَتەکان هەولدەدەن باشترین جۆری ئاژەڵ بەرهەمبێنن." مامۆستا ئێستێك دەکات تا هەناسەیەك هەڵکێشین پاشان درێژە بە بابەتەکە دەدات: "لەکۆمەڵگای ئێمەدا زەواجی تاکی یان خێزانی



تایبەتی بوونی نییە. هەر کە منداڵ چاوی بەدنیا هەڵهێنا لە باوەشی خێزان دادەبڕێت و دەدرێتە دەست داییینگە (هەتیوخانە.) بەم شێوەیە دایك و باوك منداڵی خۆیان و منداڵی خزمانی خۆشیان ناناسنەوە."

ئایا ئەم کارە لە بەزەیی و میهرەبانی بە دوور نییە؟ـ

بە پێچەوانەوە. ئەم کارە بە بڕوای ئێمە تەواو مرۆڤانەیە. لەم کۆمەڵگایەدا هەستیخاوەندارێتی منداڵ، کە هێندە مایەی ئازاری منداڵەکانە لە کۆمەڵگاکانیتردا، بوونی نییە. هیچ کەسێك ناتوانێت لەخۆبایی بێت بەوەی کە منداڵی لە منداڵەکانیتر ژیرتر و زیرکترە. هەموو خەڵك بەچاوی منالّەکانی خۆیان سەیری منالاَنی شار دەکەن. کەواتە تێبینیدەکەن کە برایەتی جیهانی لای ئێمە مەسەلەیەکی تیۆری نییە بەڵکو حەقیقەتێکی کردارییەـ

شێوەی پەروەردە و فێرکردن لە کۆمەڵگای برایەتی جیهانی ئێوەدا چۆنە؟

شێوازی ئێمە ئامانجی بەرەو پێشبردنی باشترین کەسەکانە. تا تەمەنی بیست ساڵی گشت منداڵەکان یەك شێوە خوێندنیان هەیە. وەرزش بۆ بەهێزکردنی لەش، مۆسیقا بۆ دروستکردنی هاوئاهەنگی لە بیرکردنەوەدا و ئایین بۆ بەهێزکردنی گیان.ـ

دوای ئەمە؟ـ

لە تەمەنی بیست ساڵیدا، منالاَنی ئێمە یەکەمین ئەزمونی گرنگ کە باشتر وایە بە قۆناغی پالاَوتن و هەڵبژاردن ناوی ببەین ئەنجامدەدن. ئێمە ئەوان دەخەینە بەر جۆرە جیاوازەکانی ڕەنج و دژواری و خەبات. ئەو کەسانەی کەلە بەسەربردنی ئەزمونەکەدا سەرناکەون لە چینی ژێرتر واتا لەڕیزی بازرگانان، جوتیاران، کرێکارانی کارگەکان و سکرتێرەکاندا جێدەگرن. هەروەك دەبینن چینەکانمان لە سەر بنچینەی بۆماوە و لەدیکبوون بنیات نەنراون، بەڵکو لەسەر بناغەی نرخی واقعی مرۆڤەکان قایم بوونە.

لەگەڵ ئەو کەسانە چ دەکەن کە لە ئەزموونەکەدا گەیشتوونەتە ئارەزوویان؟





مۆڵەتیان پێدەدەرێ درێژە بە خوێندنیان بدەن. پاشان قۆناغی "پالاوتن و هەڵبژاردن"ی دووەم دێت. ئەوکەسانەی کەلەم ئەزموونەدا سەرناکەون لە چینەکەیتر، واتە لەگرووپی یاریدەدەرانی هێزی جێبەجێکردن و سەربازان بۆ بەرگریکردن لەولآت، جیدەگرن.

ئەی ئەوانەی کەلەم ئەزموونەشدا بە سەربەرزی دەرچوون؟

ئەو کەسانە کە مسۆگەر تەخمین دەکەی ژمارەیان کەم بێت، بۆماوەی پێنج ساڵ فەلسەفە دەخوێنن و مەبەستی سەرەکی لێی تێگەیشتن لە نموونەکان یان حەقیقەتە نەگۆڕەکانە کە نموونەکانی جیهانی ماددینە.

بیردۆزی ئەفلاتوون لە بارەی نموونەکان بابەتێکی زەحمەتە لەگەڵ ئەمەشدا هەوڵدەدەم بە چەند نموونەیەك تارادەیەك روونی بکەمەوە چونکە دەچینە سەر ئامانجە بنچینەییەکەی ئەفلاتوون کە ئەویش بەرقەرارکردنی دادە.

لەروانگەی ئەفلاتوونەوە جیهانی ماددی نمونەیەکی ناتەواو یان تارماییەکە لە نمونە تەواوە خواییەکان. هەرشتێك لەزەویدا تارماییەکە لەوەی کە لە ئاسماندا هەیە. حەقیقەتی مرۆڤ بۆ نموونە حەقیقەتێکە وەکو رووناکی خۆر کە زەوی رووناك دەکاتەوە بەلآم ئەو کەسانەی کە ئێمە بە ژن و پیاو ناویان دەبەین ئەو سێبەرە توخمانەن کە بەهۆی رووناکی خۆرەوە کەوتبێتە سەرچەند ئەشکەوتێك. دیواری ئەشکەوتەکە تەواو وشکبکەنەوە ئیتر هیچ شوێنەوارێکی رووناکیدانەوە بە جێنامێنێت واتە کەسەکە دەمرێت. بەلآم حەقیقەتە مرۆڤییەکەی ئەو ـ درەوشاوە ترین و رسەنترین بەشی ئەو ـ هەروا زیندوو و نەمر دەبێت.

بەم شێوەیە هەموو ئەوانەی کە لەم جیهانەدا هەستپێکراون سێبەرە کاتییەکانی زەمانن. بەلآم نمونە لێکراوەکانی فیکر، گەوهەری نەمری هەتاهەتایینە. ئەم نموونە خواییانە، وەکو نۆتەکانی ئاوازێك، هاوئاهەنگییەکی تەواویان لەگەڵ یەکتر هەیەو هەر ئەمانەن کە ژیانە جۆراوجۆرەکان دێننە کایەوە. ناوی ئەو هاوئاهەنگییە نموونەییە و ئەو سازگارییە تەواوە لە ئاکاری فەردیدا، لەمامەڵەکردنی لەگەڵ جیهان و لە وابەستەییەکەی بە هاودەمییەکانی مرۆڤی و پەیوەندییەکەی لەگەڵ شار و ئەو ئەستێرەکان، خودی عەدالەتە.



ئەمە ئەو فەلسەفەیەی کە بەو گرووپە هەڵبژێردراوەی ژن وپیاو، کە بە سەرکەوتوویی دووەمین ئەزموونیان بڕیوە، دەگوترێتەوە. پێنج ساڵیان پێویستە تاکو واتای ئەم هاوئاهەنگییە لە گشت بوارەکاندا، بەتایبەت لەوەیدا کە ژیانە کردارییەکەی ئێمەدا بەکاردێت، باش تێبگەن

ـ ئەی پاشان؟

لەم کاتەدا ئەوان لە لوتکەی فەلسەفەوە بۆ ساردوای رکابەری و رۆژێنی ژیان دەنیشێننەوە. ئەم کەسانە ئێستاکە سی و پێنج ساڵ تەمەنی هەریەکیانە. بۆماوەی پانزە ساڵ لە سەریان دەکرێت کە فەلسەفەکەی خۆیان بخەنە قۆناغی کردارییەوە و لە رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ زریانەکانی کینە و نەفرەت و پلەپەرستی، ئیرەیی و شەڕخوازی و چاوبرسێتی و چاوچنۆنکی کەلە هەولی رۆژانەی مرۆڤدا بۆ پێشکەوتن گرێ قورس لەسەر دڵ دادەنێن، هەولێکبدەن و خۆیان تاقیبکەنەوە. کەسانێکی کەم کە بنچینە ئەخلاقییەکانیان قایم و مکوم مایەوە و لە بۆتەی دوایین تاقیکردنەوەدا بێگەرد و بێخلت هاتنەدەرەوە خۆبەخۆ فەرمانڕەوایی هەڵدەبژێردرێن. شاری بالآ دەبێت لەژێر چاودێری ئەو پیاو وژنانەبێت کە خاوەن مێشکی بەهێز و دڵی نەرمن.

ئەم فەیلەسووفە فەرمانڕەوایانە، کە فێرکردن و پەروەردەکردنێکی چاکیان بینیوە و تاقیکردنەوەی زەحمەتیان تێپەڕاندووە تەنها کەسانێکن کە دەتوانن ئێمە لەگەڵ یەکتردا لە ئاشتیدا و لەگەڵ خەڵکانیتردا لە هاوئاهەنگی و رێکەوتن دا بهێڵنەوە.

ئەمەیە ئەو رێگایەی فێرکردن و پەروەردەکردنە سەرسوڕهێنەرەی کە لە کۆماری ئەفلاتووندا تێبینی دەکەین. واچاکە سەیرێکی کاروبارە سەیرەکانی ئەم ولآتەش بکەین.

دەبینین لە هەموو شوێنێك مووچەی کافی دەدرێت و دادوئینساف رەونەقێکی بەجێیان هەیە. بازرگانەکان بە قازانجێکی کەم قایلن و کرێکاران داوای موچەی زیاد ناکەن. لەگەڵ تاوانباراندا وەکو نەخۆشە دەروونییەکان مامەڵە دەکرێن و دەنێردرێنە نەخۆشخانەکان تا لە ئازاری خەڵك بەدووربن و نەخۆشییەکەیان چارەسەر بکرێت. ماوەی سنورداری و مانەوەیان لە نەخۆشخانەدا پەیوەندی بە رای دادوەرانی دادگاوە نییە بەڵکو بە دادوەرێتی زانستیانەی پزیشکەکانەوە بەندە. ئەم تاوانبارانە تاکو تەواو چاك نەبوونەتەوە لە نەخۆشخانەدا چاودێری دەکرێن. لەم کۆمارەدا، دادوەر نییە و یاسای درێژدادڕاو و جۆرا و جۆریش نییە. ئەفلاتوون لەوبڕوایەدایە

که: "هەرچەندە یاسای درێژدادراو و جۆراوجۆر دابنرێت زەمینە بۆ فریوکاری یاسا شکێنەکان دابینتردەکرێت." خەڵك فێربوونە کە چۆن چاودێری کردارەکانی خۆیان بکەن تا پێویستی بەچاودێری پۆلیس نەکات. هەرکەسێك سەربەستە لەوەی کە بەوکارە هەڵستێت کە حەزی لێیەتی، تەنیا بەو مەرجەی کە نەبێتە موزاحمی مافەکانی ئەوانیتر. بە بڕوای ئەفلاتوون: ئەمەیە مانای تەواو و راستی عەدالەت. بە واتایەکیتر لە جیاتی ئەوەی کە خەڵك دوژمنکارانە و شێوەیەکی دژە ئاشتیانە دەست بە گەلەکۆمە بکەن و ددان لە یەکتر بکرۆشن، دەبێت لە نێوان خولیا هاوبەشەکانی خۆیاندا جۆرە هاوگونجان و سازگارییەك دروستبکەن.

-٥-

ئەمەیە ئەوخەوە خۆشەی کە ئەفلاتوون دەبینێت" شارێك کە تیایدا داد و جوانی و حیکمەت و برایەتی و خێرخوازی دەسەلاتدارە. بەلام ئەفلاتوون کەسێك نییە کە تەنیا دڵی بە خەوی خۆشەوە خۆش بێت و دەیەوێت لەدروستکردنی ئەم شارە خەیاڵییەدا هەنگاوێکی پراکتیکی بنێت لەوڕووەوە گۆشە خەلوەتەکەی قوتابخانە بەجێدەهێڵێت تا ترسناکترین بەشی ئەو ئەرکە بێپێشینەیەی کە گرتووتە ئەستۆی بخاتە قۆناغی جێبەجێ کردنەوە.

بۆیە بەپشت ئەستورییەوە پێشنیارێك پێشکەش بە(دیونیسوس) (Dionisus) ی پاشای سیراکوس (لە سیسلی) دەکات تاکو مۆڵەت بدات بۆئەوەی لەم جەنگە لە پڕ لە کێشمانەکێش و دوژنکارییەی دونیا، کۆمارێکی ئاشتیئاسایش بەخش بناغەڕێژ بکات.

ئەفلاتوون ئەسینا بە کەمترین دلڕەنجان بەجێدەهێڵێت. ئەو بە چاکی شارەزای وەرچەرخانی دڵی مرۆڤە. دیۆنیسوس شەیدای حەقیقەتی رووتە (پەتییە)و دیارنییە کاتێك رووبەڕووی ببێتەوە. چۆن وەریدەگرێت. ئەفلاتوون لە پەرتووکی کۆماری خۆیدا وادەگەیەنێ کە فەیلەسووفە فەرمانڕەواکان دەبێت لە هەموو مولکەکەی خۆیان، جگە لەوەی کە زۆر پێویستە، چاوپۆشی بکەن. نابێت خانووی شەخسییان هەبێت و بۆ نەهێشتنی پێداویستییە پێوستەکان نەبێت هیچ کرێ و موچەیەك وەرنەگرن. ئەوەی کە شایانی ئەوانە بەدەستهێنانی تایبەتمەندییە پەسەندەکانە و سروشتە چاکەکانە نەك کۆکردنەوەی کانزا گرانبەهاکان. دەبێت هەرهێندە لە خواردن وخواردنەوە بەسیان بێت کە جەستە و رۆحیان پێویستی پێیەتی. ئەو فەرمانڕەوایەی کە وەکو



فەیلەسووفەکان پەروەردە نەبووە یان ئەو فەیلەسووفەی کە ژیانی فەرمانڕەواکانی تاقی نەکردۆتەوە چۆن دەتوانێت بگاتە پلەیەکی بەرز و بڵند.

لە کۆماری ئەفسانەیی ئەفلاتووندا تێبینی دەکەین کە پەنجا ساڵ پەروەردەکردنی دژوار پێویستە تا ژمارەیەکی کەم لە سیاسەتوانانی خاوەن ئەزمون و تەواو پەروەردە دەبن. ئاشکرایە کە ئەفلاتوون بەزەحمەت دەتوانێت دیۆ نیسوس، کەلە منداڵییەوە لە کۆشکدا گەورە بووە و دەبێت خاوەنی سۆزە زۆردەمدەمی و گۆڕانبارەکان بێت و لە توانای خۆیدا بەفیز و خۆپەسند بێت، لە قالبی فەیلەسوفێکی فەرمانڕەواداجێبکاتەوە. بەلام ئەفلاتوون بڕیاری وایە بە هەر نرخێك بێت شانسی خۆی تاقیبکاتە وە و دەیەوێت بەلە ناو مەترسی خستنی ژیانی خۆی بەم کارە هەڵسێت و فەرمانڕەوا وەکو فە یلەسووفێك پەروەردە بکات.

ئێستاکە با ببینین چ روودەدات. دیۆنیسوس سەرتا بەڕوویەکی کراوەوە ئەفلاتوون وەردەگرێت ولە نێو هەمەوواندا گەورەیی و رێزی پێدەبەخشێت و زۆر خۆشحاڵە بەوەی کە راوێژکارێکی ژیری لە دەربارەکەیدا هەیە بەلام زۆر پێێ ناچێت کە زەحمەتییەکان رووەی تێدەکەن.

دیۆنسوس ئەفلاتوونی بەراوێژکاری خۆی هەڵبژادبوو تا پشتگیریکەری بێت نەك ئەوەی رەخنەی لێبگرێت و وای دادەنا کە هەوەسی بۆ دروستکردنی شارە بالاکەی ئارەزوویەکی دوور و درێژە کە خۆی پێوە سەرگەرم کردووە و بەجیددی داینەدەنا. دیۆنسوس بەڕاستی خوازیاریی کۆمارێك نەبوو کەتیادا ناچاربێت لە هەموو نازناو و ئیمتیازەکانی پاشایەتی چاوپۆشی بکات، هەروەها نەیدەویست ئیمتیازی وابدات بە هیچ یەکێ لەوەزیرەکانی کە بتوانێت لە کاروبارەگرنگەکانی ولاتدا خۆ تێهەڵقورتاندنێکی کاریگەری هەبێت. بۆیە ئەفلاتوون وتی: "من خۆشەویستیم هەیە بەرامبەر بە ئامانج و مەبەستە ویستراوەکانی تۆ بەلام بیروڕاکانتم پێ قبوولنییە." لەو رووەوە کاتێك ئەفلاتوون پێشنیاریکرد کە لە بنچینەی ولاتەکەیدا گۆڕانکاری گشتی بکات، قسەکانی بیست و زەردەخەنەیەکی لەڕووی بەدگومانییەوە خستە سەرلێو. کاتێك ئەفلاتوون ئامۆژگاری لێکرد کە ولات بە یەکجاری سەروبن بکات و بەیەکجار دڵ نەخاتە دوو هەرجۆرە بەرتیل و دزییەك، پاشا نێوچەوانی وێکهێناوە و دواجار کاتێك فەیلەسووفەکە پێی لەسەر ئەوە داگرت کە دەبێت (شاش خۆی بداتە بەر ئەنجامدانی تاقیکردنەوەیەك تا ئاشکرابێت کە بۆکارەکەی خۆی شایستەیە یان نە،





رووگرژی پاشا بۆ هاوارێکی نارەزایی دەربڕین گۆڕا کە: "ئەمە ئیتر ناپاکییە لەگەڵ پاشا!". وەزیرە دەمارگرژەکانیش بوونە هاودەنگی و گوتیان: ".... یاخی بوونە "راپەڕین) دژ بە حکوومەت." هێندەی پێنەچوو کە حەشاماتی خەڵك هاتەدەنگ و ئەفلاتوون بینی کە خەڵکی گشتی گوێ بۆ کەسانێك رادەدێرن کە دەنگی بەرزتربێت.

فەیلەسووف زیندانی کرا. ئایا تاوانێکیتری هاوشێوەی ئەوەی کە بۆ مامۆستاکەی روویدا بوو، روودەدات؟

موریدەکانی بۆ هەرکارێك ئامادەنە. ئەرکی سەرەکییەکەی ئەو تەواو بووە.

ئەو بیروڕای پەیوەست بە دروستکردنی کۆمارێکی تەواوی پیشکەش بە جیهانیان کردووە و ئەوە لە ئەستۆی ئەوانیتردایە کە بەرگی پراکتیکی لەبەربکەن. ئەو وای دادەنا کە ئەم کارە ئەنجامدەدرێت. سەرەتاکانی برایەتی تاکەکانی مرۆڤ دابینکراون. تەنیا کەمێك کات پێویستە. ئەفلاتوون خۆی لەقەرەی مردن داوە بەلاَم سزاکەی ئەو لەمەرگ سامناکترە. شا دەست دەداتە جێبەجێکردنی نەخشەیەکی سادە کە هەم سروشتە قۆشمەکەی ئەو رازی دەکات و هەمیش گیرفانی پڕدەکات. ئەو بڕیاردەدات کە ئازاد ـ بیرکەرەوەترین پیاویجیهان بە کۆیلایەتی بفرۆشێت. بەم جۆرە ئەفلاتوون کەبە خانەدانی لەدایك ببو بوو بە خولام.

ـ ٦ ـ

ئەو پیاوەی کە ئەفلاتوونی بۆ نۆکەری کڕی خۆشبەختانە ستەمکارییەکەی لەهی دیۆنیسوس کەمتر بوو، بۆماوەیەك کردی بە پەرستیاری منداڵەکانی و بەنەرمی مامەڵەی لەگەڵدا کرد بەلاَم ئەوی بەچاوی کەسێك دەبینیّ کە خواوەند بۆکارە پەسنەکان ئافراندبێتی.

ئەفلاتوون لەو بڕوایەدابوو کە: "هەر ژیانێك نموونەیەکی هەیە." و بۆئەوەی کە نموونەی ژیانی خۆی لەهەر روویەکەوە سەیربکات ناچاربوو هەروەك لە دانیشتنی پاشاکاندا شەرابی خواردبۆوە، لەسەر خوانی کۆیلایەتیسش دابنیشێت، چونکە بەم رێگەیە پەی بەمانا دروست و رێگەکەی عەدالەت دەبات. واتە پەروەردەکردنی ئەوەی کە باشە لەخراپترینی ئێمەدا و لەناوبردنی ئەوەی کە خراپە لە لای باشترینی ئێمە و رێکخستنی پلە پەرستییەکانمان بۆ هاوگونجان لەگەڵ ئاشتییەکی خۆگر و نەمردا.



ـ٧ـ

ئەفلاتوون بە یارمەتی و واسیتەکردنی هاوڕێیانی لەقەیدوبەند رزگاری بوو و توانی دوارۆژەکانی تەمەنی بەیادەوەرییە ئارامەکانی ژیانێکی زریاناوی بەرەو کۆتایی بەرێت. قوتابییەکانی بۆدوورترین خاڵەکانی جیهان نارد و ئەوان کە ئیلهامیان لەزانستی ئەو وەرگرتبوو قەڵیان بۆپڕوپا گەندەکردن بۆ حەقیقەتێك هەڵماڵی کە لەژێر بینای هەر چاکسازییەکی گەورەی کۆمەلاَیەتی و رامیاریدا هەیە.

"ئەوسا کە فەیلەسووفەکان دەبن بە فەرمانڕەوا یان فەرمانڕەواکان تواناو رۆحی فەلسەفی بەدەستدێنێن، تەنیا لەوکاتەدایە کە نژادی مرۆڤ لە بەلاَو کێشەکان رزگاری دەبێت و دەکەوێتە ناو رووناکییەوە."





# ئەرستۆ (٣٨٤ ـ ٣٢٢ پ.ز)

## ئەو فەیلەسووفەیکە تووشی تۆمەتی سیخوڕی هات

-١-

له ماوەی سێ نەوەی یەك لەدوای یەك، یۆنان سێ گەورەترین فەیلەسووفەکانی دونیای کۆن ـ سوکرات، ئەفلاتوون، ئەرستو ـ ی پێشکەش بە جیهان کرد و هەرسێکیان بەهۆی فیکرە و بیروڕاکانی خۆیان توشی ئازاری خەڵك بوون.

ئاشێل (شاعیرە گەورەکەی یۆنان) نووسویەتی کە: مرۆڤ تەنیا لەژێر رووناکی دەردوڕەنج و دژواریدا تێدەگات و لەبیری کردووە ئەوە بۆئەم گوتارە زیادبکات کە ئاسایی ئەمە مامۆستاکانن کە گیرۆدەی دەردوڕەنج دەبن نەك قوتابییەکان.

- ٢ -

ئەرستۆ لەساڵی ٣٨٤ ی پ.ز لەشاری ستاگیرا (stagira) هاتۆتە دونیا کە داگیرکراوی یۆنان بوو و دووسەد میل لە باکوورەوە دووری ئەسینا بوو. بەڵام زۆربەی سەردەمی مناڵی خۆی لەشاری پێلاّ (pella)ی پایتەختی مەکەدۆنیا بەسەربرد. باوکی پزیشکی دەرباری ئامینتاس (Amyntas)ی باوکی فیلیپ و باپیری ئەسکەندەری گەورە بوو. ئەرستۆ و فیلیپ لەسەردەمی منداڵیدا هاوکایە بوون. فیلیپ پلەپەرستی و لووتبەرزیی شازادەکان و سروشتی منداڵانی وێڵگەڕی پێکەوە هەبوو و وەکو گیانلەبەرە درندەکانی دارستانەکانی مەکەدۆنیا کە بەشوێن خۆراکدا بەم لاو بەولادا وێڵن، خاوەنی سۆزە سەرکەش و نائارامەکان بوو.





ئەرستۆ فێربووکە چۆن خۆی کۆنترۆڵ بکات تا ژیانی لەمەترسی بەدووربێت وچەندین جار بینی بووی کە لەشۆڕشە شەقامییەکان و ([1])دوێلە دەرباریییەکاندا چەند زۆربوون ئەوکەسانەی کەبەهۆی سەرسەختی لە گفتوگۆدا و زیادەڕۆیی لە مشتومڕکردندا سەری خۆیان بەبادا کەواتە ئەرستۆ گەیشتبووە ئەو ئەنجامەی کە سنگ فراوانی و خۆکۆنترۆڵ کردن یەکەمین نیشانەی سەرەوەری و باشترین هۆکاری مسۆگەرکردنی درێژی تەمەنە. ئەم وانەیەی حیکمەتی کرداری لە تەواوی ماوەی ژیانیدا لەبەر چاو نەدەچوو.

فەلسەفەی ئەرستۆ، هەروەك دەیبینین، لە یەکێ لەسەردەمە زریاناوییەکانی مێژووی کۆندا هەنگاوی نامەیدانی بوونەوە و گەشەیکرد ـ ئەو سەردەمەی کە ترسی ئەوە هەبوو لافاوی خوێن هەموو جیهان بداتە بەرخۆ.

با بگەڕێینەوە بۆ روون کردنەوەی ژیانی ئەرستۆ. لەتەمەنی هەژدە ساڵیدا مەکەدۆنیای بەجێ هێشت تا لە ئەسینا بچێتە ئەکادیمیای ئەفلاتوون. لێرەدا مامۆستا و قوتابی بە توندی بوون بە دڵبەستەی یەکتر بەلاّم ئەم یەکێتیی و یەکبوونە بێ شەڕ و کێشمانە کێشی عاشقانە نەبوو و بۆیان دەرکەوت کە مشتومڕی فەلسەفیانە بێ ئەوەی پێویستی بەئاگر هەبێت، گەرمییەکەی دڵخواز دروستدەکات. بەم شێوەیە ئەم دووانە دونیایان هەروا وازلێناو دەستیانکرد بەباسە حیکمەتی و فەلسەفییەکان. ئەفلاتوون بۆ مەلەکردن لە زەریای ژیاندا گەڵێك پیربوو و ئەرستۆش گەلێك لاو. ئەرستۆ چەندین ساڵ لە ئەکادیمیادا وەکو قوتابی مایەوە. لەبەرئەوەی ئەفلاتوون دوای چەندێك دونیای بەجێ هێشت، ئەرستۆ خۆی بەئاوارە بینیەوە. هاوڕێیەکەی ئەو لەگەڵ فیلیپ کە لەوکاتەدا پاشای مەکەدۆنیا بوو رێگەی لەمانەوەی زیاتری ئەو لەئەسینا دەگرت. چونکە فیلیپ ئازادی هەموو دەوڵەت ـ شارەکانی یۆنانی خستبووە مەترسی. ئەرستۆ لەگەڵ ئەوەشدا کە لە هەرجۆرە هەنگاونانێکی دوژمنکارانە دژبە ئەسینا تاوانی نەبوو ناچار بوو لەو شارە دەرچێت بەلاّم هیچ شوێنێکی نەبوو. ستاگیرای زێدی بەیەکجاری لەئاگری شەڕدا سووتا بوو و لەگەڵ رووی زەوی تەخت ببوو. رەنگە ئەرستۆش وەکو ئەفلاتوونی مامۆستای دەستی بە پاشایەك رابگات کە بەشوێن پیاوێکی ژیر دەگەڕێت. ئەرستۆ پیاوێکی وای

١. duel: شەڕی سینگ بە سینگ بۆ قەربووکردنەوەی سووکایەتی و گەڕاندنەوەی شەرەف کە کاتی خۆی باوبوونە بەلاّم ئێستا ڕاوەستاون و. کوردی ـ

دەستكەوت. ئەویش هێرمیاس (Hermias)ی هاوپۆلی: جارانی بوو کە لەو کاتەدا دەسەڵاتداری یەکێ لە شارە بچووکەکانی ئاسیای بچووك بوو. کەوابوو رووی لە دەربارەکەی کرد و هێرمیاس، بەپێچەوانەی دیونیسوس بەهێژایی و رێزەوە مامەڵەی کرد و تەنانەت زڕکچی یا بە گوتەیەکیتر خوشکەکەی بە جەهیزیەیەکی گەورەوە لێی مارەکرد. سێ ساڵ لە رۆژگاری فەلسەفی و ئەڤینە راستینەکەی، زیاتر لەوەی چاوەڕێ دەکرا، بە ئارامی دەربازبوو.

بەڵام هەرزوو بارودۆخەکە سەراوژێر بوو. فیلیپی پاشا، کەوتە یادی هاودەم و هاوکایە و بڕیاری سەردەمی منداڵییەکەی. لەبارەی ژیانە درەوشاوەکەی ئەرستۆ شتگەلێکی بیستبوو و لای وابوو کە ئەو دەتوانێت پەروەردەکارێکی باش بێت بۆ کوڕە سەرکەش و دڕندەکەی کە ئەسکەندەری ناوبوو. بۆیە داوای لە ئەرستۆ کرد کە پەروەردەکردنی منداڵەکەی بگرێتە ئەستۆ. و ئەرستۆش ئەم داواکارییەی پەسەندکرد.

ـ٣ـ

ژیانە سەرلەنوێکەی ئەرستۆ لە دەرباردا لەجاری یەکەم زریاناویتربوو. چونکە لەم کۆشکەدا سێ‌دڕندەی گلاو کۆببوونەوە: فیلیپی پاشا کە لە بەڕێوەبردنی ئیمپراتۆرییەتدا بلیمەتییەکی بەجێی هەبوو بەڵام لەبەڕێوەبردنی خێزانەکەیدا بێتواناو داماو بوو" ژنەکەی پرەنسیس ئۆلێم پیاس(olympias) شێتێك بوو کە بۆ ئازاردانی هاوسەرەکەی بانگەشی ئەوەی دەکرد کە ئەسکەندەری کوڕی هی مێردەکەی نییە بەڵکو بەرهەمی نوستنی ئەوە لەگەڵ منداڵی یەکێ لەخواوەندەکان؛ ئەسکەندەر کە منداڵێکی سێزدە ساڵان بوو بەڕاستی ئەم ئەفسانە دڵگیرەی کە لەبارەی خواوەندی خۆی بوو بەجیدی وەرگرتبوو بڕوای پێکردبوو و لەگەڵ پاشاو شاژندا وەکو نۆکەرانی خۆی رەوتاری دەکرد. بەڵام بەچاوی رێزەوە دەیڕوانییە پەروەردەکاری خۆی. فەیلەسووف چەندین جارناچار ببو کەخۆی لەو کێشمانەکێشە دژوارانە هەڵقورتێنێ کە لەنێوان ئەسکەندەر و دایك و باوکیدا رووی دەدا و رۆڵی ناوبژیکاری بگێڕێت. لە یەکێ لەمیواندارییە دەربارییەکاندا کە باوك و کوڕ لە تاو مەیخواردنەوەوە سەرخۆش و بێئاوێز ببوون، فیلیپ هێرشی کردە سەر ئەسکەندەر کە دژوێنی پێدابوو بەڵام لەسەرخۆشیان ئەوەندە گێژببو کە نەیتوانی خۆی بەپێوە بگرێت و کەوتە سەرزەوی. لەئەنجامدا ئەسکەندەر گیانی رزگاربوو بۆ خوێنڕێژی و پووچکارییەکانی داهاتووە زیندوو مایەوە.



ئەمەبوو ئەو دەوروبەرەی کە ئەرستۆ ناچاربوو تیایدا ژیانی بەسەربەرێت و بەفێرکردن هەڵسێت بەڵام سەرەنجام ئەم چەرخە کورتە چەند ساڵانیە کۆتایی پێهات.

فیلیپ ئامادەی لەشکەرکێشان بوو بۆ ئێران کاتێك ـ دەڵێن بە ووژاندنی راستەوخۆی ژنەکەی "ئۆلیمپیاس"و ئەرێ کردنی کوڕەکەی ئەسکەندەر ـ کوژرا.

لەرێوڕەسمی ناشتنی فیلیپدا، ئۆلیمپیاس پێداگری کرد لەسەر ئەوەی کە دەبێت لەبارەی کوژەری پاشا هەمان ئەو ریورەسم و رێز لێگرتنە ئەنجامبدرێت کە بۆ پاشا کوژراوەکە رەچاوکرابوو.

دوای مەرگی فیلیپ، ئەسکەندەر بوو بەخاوەنی تان جوتەخت و بێدواکەتن مۆلەتی بە ئەرستۆدا کە کۆتایی بە خزمەتەکەی بێنێت. چونکە ئیتر کاتی بیرکردنەوەی نەبوو و دەبێت لەوە بەدواوە هەموو کاتەکەی بۆشەڕ و پەیکار تەرخانبکات.

ئەسکەندەر بۆ مامۆستای جارانی وەها نوسیبوو: "من باڵایی زانستی بەسەر فراوانکردنی هێز دەخەم." بەڵام ئەم قسەیە لەرووی فێرکاری و ریاکارییەوە بوو. ئەسکەندەر ئارەزوومەندی خۆی بۆ فەلسەفە بەشێوەیەکی گشتی و بۆ مامۆستاکەی بەشێوەیەکی تایبەتی بۆیە دەرخست چونکە کوڕەمامی سوکرات کە کالیس تێنس (callisthenes) ی ناوبوو گوللەباران کردبوو لە پای ئەوەی کە خۆی لە پەرستنی ئەو وەکو خودا لادا بوو.

ـ ٤ ـ

لەگەڵ ئەمەشدا، ئەسکەندەر لەرێگایەکەوە لە تەواوبوون و بەهێزبوونی فەلسەفەی ئەرستۆدا یارمەتیدەر بوو و برە پارەیەکی زۆر و زەبەندی پێبەخشی. بەشێوەیەکی ئاسایی ئەسکەندەر دۆڕاوی دەستی سۆزە سەرکەش و ئامانجە توندڕەوەکانی خۆی بوو و دەستی لەهەرکارێك بدابایە لایەنی زیادەڕۆیی و بەفیڕۆدانی سامانی دەگرت. ئەو بڕیاری دابوو کە ببێ بە گەورەترین فاتح، بێبەزەییترین کوژەر و دەستبڵاوترین پیاوی مێژووی جیهان.

ئەرستۆ، کاتێك کەبەهۆی ترسی گیانی خۆی هەڵدەهات. ژیرانە سوودی لەو شێتەدەستبڵاوە وەرگرت و پارەیەك بەبڕی چوارملیون دۆلاری لێوەرگرێت و گشتی بۆلێکۆڵینەوە فەلسەفی و زانستیەکانی خۆی خەرج کرد. ئێستاکە دەبینین کە مامۆستا و قوتابی دەستیان داوەتە کاری ترسناك و سەرسوڕهێنەر:ئەسکەندەر بەتەمایە لەهەموو شوێنێك مەرگ بلاوبکاتەوە و ئەرستۆ





بڕیاری وایە نهێنی ژیان بەدەستبێنێت. مێژوونووسە سۆزیارەکان لەڕادەبەدەر کاتیخۆیان خەرجی ئەسکەندەر کردووە و کەمتر بایەخیان بە ئەرستۆ داوە. ئەم جۆرە نووسەرانە ئەسکەندەری فاتحیان وەکو نموونەی کەسێکی زۆرگەورە و شەریف و خاوەن تایبەتمەندی پەسندکراوەکان ناساندووە و ئەویان بە بنیاتنەری شارەکان وکاولکاری نەژادە دڕندەکان و یەکخەری نەتەوەکان و تاکەکانیمرۆڤ ناو بردووە. ئەمانە ئەو شارە کە مانای کە ئەسکەندەر درووستی کردوون بەئاوتاو روونیان کردۆتەوە، بەلام ناوی لەو شارە زۆرانەیان نەبردووە کە لەئاگری ستەمی ئەودا سووتاون. ئەوەی کەدەڵێن جەنگەکانی ئەسکەندەر تۆوی شارستانیەت و رۆشنبیری یۆنانی لەجیهانی کۆندا بزواندووە، گوتەیەکی چەوتە. ئەمە حیکمەتی ئەرستۆ بوو کە پەڕجۆی دەکرد. ئەسکەندەر جادەی نێوان نەتەوەکانی بە ئێسکە پەیکەرەکانی مرۆڤ داپۆشی و ئەرستۆ بەهۆی گەوهەری بیرۆکە نەمرەکانی خۆی رێگاکانی باش لێك حاڵی بوونی نێوان نەتەوەکانی هەموارکرد.

ئەمانە فەیلەسووفەکانن کە گەورەترین رووداو خوازی مێژوونە نەك جەنگاوەران، چونکە فەیلەسووفەکانن کە بێکوشتن و تالاّن جیهان داگیردەکەن و هەوڵدەدەن بێ ئەوەی نەفرەت و دوژمنکاری بێننە کایەوە لە مەعریفەو زانستدا یەکێتییەك بێننە ئاراوە. بەهەرحاڵ ئەم کارە لە ئەستۆی ئەرستۆدا بوو کە هەزار دانە سەربازی زانست و مەعریفە کۆبکاتەوە و ئەوانی بە دوورترین خاڵەکانی جیهان نارد تا لەبارەی جۆرە جیاوازەکانی بوونەوەرە زیندووەکانی سەر گۆی زەوی لێکۆڵینەوە و توێژینەوە ئەنجامبدەن. ئەم سەربازانە زانیاریان لەبارەی گیاکان، گیانلەبەرەکان، چیرۆکەکان، فیکرە و بیروباوەڕ، بەبەردبووەکان و گابەردەکان دابینکرد و ئەرستۆ ئەم زانیارییانەی بەشێوەیەك کە قابیلی تێگەیشتن بێت لە ئینسکلۆپیدایایەکی فەلسەفی، وێژەیی، زانستی، خواناسی و هونەریدا کۆکردەوە. ئەمە یەکەمین هەوڵە لەڕێگەی دروستکردنی هاوکاری فیکری لە سەرتاپای جیهاندا.

ئەرستۆ هەستا بە دامزراندنی باخچەیەکی گیانلەبەران و مۆزەخانەیەکی مێژووی سروشتی و قوتابخانەیەکی نوێ لەفەلسەفەدا، لەئەسینا کردەوە. ئەرستۆ دەساڵ زیاتر لەوێ رانەوەستا بەلاّم لەم ماوە کورتەدا ژمارەیەکی زۆر پەرتوکی پێشکەش بەجیهانی زانست و وێژە کرد کە بەقسەی پرۆفیسۆر(Fuller) پەرتووکی "ژیانی ئەرستۆ" ئیستاش لە یەکێك لەبەرزترین بەرهەمە





فیکریەکانی مرۆڤ دەژمێردرێت. ئەم پەرتوکانە کە ژمارەیان دەگاتە هەزار، هەندێ لێکۆلینەوە لە هونەردا و بیرۆکەی سەرووی سروشتییەکان و ئاکار و زانستیان تێدایە و لەگەڵ ئەوەشدا ژمارەیەکی کەم لەوکتێبانە گەیشتوونەتە ڕۆژگاری ئێمە دەتوانرێ بگوترێ تەنانەت هەرئەم ژمارە کەمەش کۆمەڵەیەکی تەواوە لەفیکرەکانی مرۆڤ.

ئەرستۆ بە واتای تەواوی وشە، ئینسکلۆپیدیایەکی گەڕۆك بوو. هەردەم کاتی بەڕێوە دەڕۆیشت قوتابییەکانی خۆی فێردەکرد یان کتێبێکی دادەڕێشت بۆیە قوتابخانە فەلسەفییەکەی بە"گەڕۆك" ناوی دەرکرد.

واباشە هێدی هێدی بەشوێن ئەم فەیلەسووفە بێئۆقرەیەدا بەڕێکەوین و گوێ بۆقسەکانی رادێرین لەگەڵ قوتابییەکاندا لەبارەی رازی خواو ئەخلاق.

خانەخویەکەمان پیاوێکی پەنجاسالاّن و ردبینە و بەهۆی تامەزرۆی لەڕادەبەدەری بۆخواردنە باشەکان، ورگ زلە. لاڵە پەتەیە و لەبەرامبەر گێلیدا بێتاقەتی دەنوێنێت. وشەکان باش بلێڤ ناکات و مرۆڤ لەناکاو دێتە سەرخۆ و دەزانێ کەئەم فەیلەسووفەش بەهەرحاڵ مرۆڤێکە وەکو خەڵکیتر. شێوەی جل لەبەرکردنی مەیلی مرۆڤی بۆ قۆزی و رێك پۆشی پێشاندەدا کەخۆی لەئەنجامی ئەوەوە بوو کە ئەرستۆ گەلێك زوو چوو بووە ناو دەربارە پڕشکۆوەکەی پاشایەتی.

دەنگی نەرم و ڕەفتاری بە ئەدەبە. ئەرستۆ پیاوێکی تەواوی گەڕۆك کە فێرماندەکات لەزریانەکانی ژیان، لە پلەپەرستی، ئیرەیی، کینەخوازی و شەهوەتەکاندا رادەی ناوەند رابگرێن. ئەو لەڕاستیدا بەرهەمی ئەزمونەکانی خۆی دەلێتەوە.

تەنانەت ئێستاکەش لەناو بەدگومانی مەکەدۆنیاکان کە بەچاوی یۆنانییەك لێی دەڕوانن و بەجێگەی بڕوای دانانێن و بەدگومانی یونانییەکان  کە ئەو بە مەکەدۆنییەکی باوەڕپێنەکراو دەناسن، رادەی مامناوەندی و میانەرەوی لەدەستنەداوە. باگوێ بۆقسەکانی رادێرین:

- ٥ -

ئەرستۆ دەڵێت ژیان لەنزمترین گیانلەبەراندا تا بەرزترین جۆریان کە مرۆڤە، هەوڵ و تەقەلایەکە بەرەو بالاّیی و تەواو بوون. (جێی خۆیەتی وەبیربخەینەوە کەئەم بڕوایە، بیردۆزی داروین لەبارەی وەرچەرخان، بەشێوەیەکی ئالۆز وەبیردێنێتەوە) بەو شێوەیەیکە نوتفە دەبێتە

کۆرپە و کۆرپەش دەبێتە منالّ و منالّیش دەبێتە مرۆڤێکی دلێر و پێگەیشتوو و تا پلەی خوایەتی بەرز دەبێتەوە. بەگوێرەی ئەم وەسفە خوا کۆتایی تەواوبوونە و کۆتایی ژیان. سەرەتای هەر جولە و سەرچاوەی هەر ئومێدێکە.

دەپرسین ئەم خوایە چییە؟ ئافرێنەرمانە یان دەسەلاّتدارمانە؟ پەروەردگارێکی بەجەبرە یان باوکێکی میهرەبانە؟ دواجار حەقیقەتەکەی چییە؟

وەلاّمی ئەرستۆ کەمێك ترسێنەرە، دەلّێت:"خوا هیچ کامێك لەوانە نییە کە دەلّێت. ئەو ئەڤینداری مرۆڤ نییە بەلّکو دلّبەر (معشوق)ی مرۆڤە. راوەستاوێکە کە جیهان لەوەوە لەجوولّەدایە.

ئەم پێناسەیە روون و سادە نییە. بەلاّم ئایا ئەم پێناسە دلّگیرە، وەسفی خودی ئەرستۆ نییە کە گەیشتۆتە کاملبوونی خواوەندی و کۆتاییە پەسەندەکەی بالاّیی؟

زیاتری ئەو وەسفانەی کە فەیلەسووفەکان ولەخوا گەرەکان لەبارەیخوایەتی کردوویانە لەڕاستیدا وەسفێکی جوانی خودی خۆیانە. هەروەك سپیوزا دەلّێت: ئەگەر سێگۆشەیەك بتوانێت قسە بکات ئەوا خوا بە سێگۆشەیەکی تەواو وەسفدەکات. کاملبوون، لە دیدگای وردبینی ئەرستۆدا بریتییە لەو هێزەی بتوانرێ بەو هۆیەوە تەماشاکەری خەبات و هەولّی مرۆڤی بێت بێئەوەی تیایدا بەشداری بکرێ و زیانی پێبگەینرێ. تێگەیشتنی ئەرستۆ لە خوا لەڕاستیدا بەرجەستەکردنی هەمان ئارەزووە ناخییەکەی ئەوە کە دەیەوێت بێجوولّە بێت و مرۆڤ لەرێگەی بەدەستهێنانی بیرۆکە هێژا (بەرز)و کردەوە شەریفەکان بخاتە جوولّە و لێگەڕێن. بزوێنەرو ئەنگێزەی خودی ئەو لەم جولّە و لێگەڕانەدا ئەڤینی خوایە کە بینەر و شایەتە فەلسەفییەکەی کاملبوونی ژیانە.

کەواتە خوای ئەرستۆ وەکو وێناکردنە نموونەییەکەی لەبارەی خۆی، عەقلی بێگەردە و لە تەماشاکردنی تێکۆشان و خەباتی مرۆڤ لەرێگەی بەدەستهێنانی کاملی چێژ وەردەگرێت.

ئەرستۆ لەو بڕوایەدایە کە مامناوەندێتی و میانەڕەوی رێگەی مرۆڤ لەگەیشتن بەقۆناغی (کاملی) نزیك دەکاتەوە. لێرەشدا ئەرستۆ ئەنجامی ئەزمونەکانی ژیانی خۆی دەردەبرێت، چونکە ئەو چارەنووسی داغهێنەری هەست و سۆزە توندڕەوەکان و دەستدرێژیخوازی



لەڕادەبەدەری ئەسکەندەری بەچاو بینی بوو و ئاگاداری بێهەستی و بێغیرەتی لەڕادەبەدەری جیهانیان بوو کە چاوەڕێن ببن بە کۆیلە و دیل.

بۆیە گەیشتە ئەو ئەنجامەی کە هیچکامێك لەم زیادەڕۆییانە بۆ مرۆڤ سوودبەخش نییە. سەلامەتی کەسان و نەتەوەکان لەپاراستنی مامناوەندێتی دایە.

هیچ شتێك بە زیادی جێگەی پەسند نییە. بەواتایەکیتر بالاّیی مرۆڤ لەپاراستنی رادەی ناوەندی لەنێوان زیادەڕوویی و رەزیلی. ئازایی، بۆنموونە، نێوانی نەترسی و ترسنۆکییە. بەخشندەیی سنووری نێوان دەستبلاّوی و رەزیلییە، کۆنەپارێزی نێوانی زرشەرمی شەرمنی، نەفسبەرزی رادەی نێوانی خۆهەلّکیشان و خۆ بە هیچزانی و هاوڕێتی نێوانی رووپامایی و شەڕخوازییە. دەبێت وەبیر بخەینەوە کە ئەم بیردۆزانە لە مێشکی کەسێك دەلاّندوویانە کە هەولّیدەدا بەو چەرخە ناتەندروست و نەخۆشە، تەندروستی ببەخشێت هەوالّەکانی کوشتار و خوێنڕێژییەکانی ئەسکەندەر جارجارە دەگەیشتە گوێی ئەرستۆ چونکە لەو رۆژگارەدا هەوالّەکان گورج بلاّودەبونەوە.

لەگەلّ ئەمەشدا ئەو پەنابەرانەی کە لە ئاسیاوە دەهاتنەوە، هەندێ چیرۆکی سەرسوڕهێنەریان لەبارەی ئەم شێتە مەگەدۆنیاییە دەگێڕایەوە. ژیانیئەسکەندەر وەکو گەردەلوولێکی سامناك و پڕ لە هەوەسکاری بوو. شانشینێکی دەبەخشی بە هاوڕێکەی و پاشان لەناو شێتایەتی سەرخۆشیدا مێشکی دەپژاند. یەکێك لەئەفسەرەکانی رێنمایەکانی پزیشکی بەکارنەهێنامرد ئەسکەندەر پزیشکەکەی بەتاوانی گەمژایەتی ئەفسەرەکەی لە سێدارەدا و پاشان بۆ داپۆشین و قەرەبووکردنەوەی ستەمکارییەکەی تەواوی خەلّکی شارێکی خستە بەردەمی شمشێر. کاتێك سەماکەرێك کە ئەوی سەرگەرم کردبوو، داوای مەشخەلّێکی لێکرد تا لەکاتی گەڕانەوەدا رێگەکەی پێ رووناك بکاتەوە، ئەسکەندەر ئاگری لە تەختی جەمشید بەردا و هاواری کرد:"وەرە ئازیزەکەم، ئەم ئاگرە رێگەکەت باش رووناك دەکاتەوە."

ئەمە بوون ئەو چیرۆکانەی کە ئەرستۆ لەبارەی قوتابیی جارانی دەبیست و دەلّێن بە بیستنیان نارەحەت دەبوو و دەگریاو دەیگوت: ئەسکەندەر تەنیا دەتوانیت ئەم دونیایە داگیر بکات.





هەندێ لە پەنابەران ئەوەیان گەیاندووتە گوێی ئەرستۆ کە ئەسکەندەریش هەندێ هەواڵی ناخۆشی لەبارەی ئەوەوە بیستووە. لەمانەش ئەوەی کە فەیلەسووف پڕوپاگەندەی بۆ بیروڕای ترسناك کردووە دژی دەستدرێژی کردنە سەر ئاشتی و لە وسفکردنی جۆری حکومەتەکاندا بیروڕای ئەو هادیاری دەکات کە: "خراپترینی حکوومەتەکان، حکوومەتی دیکتاتۆرییە." ئەسکەندەر ئەم تێڕوانینانەی بە هەوڵێك دژ بەخۆی دەزانیێ و واباو بوو کە بڕیاری داوە دوای حەسانەوە لە ولاّتگری کاری ئەرستۆ یەکلا دەکاتەوە.

بەلاّم ئەرستۆ هەروا لە سەرڕێگەی خۆی دەڕۆیشت و خەریکی فێرکردنی بەرزترین جۆری حکومەت و باشترین شێوازی ژیان بوو. ئەرستۆ دەیگوت حکوومەتی نموونەیی ئەوەیە کە ئامانج و نیازی فەرمانڕەواکانی ئاسایش و رازی بوونی خەڵکانبێت. شێوەی حکومەت هێندە گرنگ نییە. ئەوەی کە بایەخدارە موراڵ و خۆڕاگری سەرانی حکوومەتە.

ئەرستۆ لێکۆڵینەوە و خوێندنەوەەیەکی تەواوی لەپێکهاتەی ١٥٨ دەوڵەت ـ شاری جیاوازدا کرد و گەیشتە ئەوئەنجامەی کە لە زۆربەی ئەم دەوڵەت شارانەدا، کەموکوڕی گشتی نەبوونی پسپۆڕیی رامیارییە. بە بڕوای ئەو بایەخدانی تەواو بە تەواوی چینەکان و خولیاکانی ئەوان کارێکی پێویستە و بڕوای وابوو کە هۆی لەناوچونی حکوومەتی بەهێزەکان، بۆ نموونە، لەوەدایە کەبازرگانەکان گوێ بە خواستەکانی کرێکاران نادەن و لەناوچوونی حکوومەتی دیموکراسی لە بەر ئەوەیە کە کرێکاران بایەخ بە خولیاکانی بازرگانان نادەن.بە کورتی حکوومەت کاتێك گەندەڵ دەبێت کە هەموو فەرمانڕەواکانی لە فیکری خۆیان دابن و کاتێك چاك و شایستە دەبێت کە هەمووی سەرفی مسۆگەرکردنی خۆشگوزەرانی و شادومانی زیاتر، بۆ دانیشتوانێکی زیاتر بکرێت. ئەرستۆ دەیگوت" مەبەست لەبوون شادی و شادومانییە نەك دەستدرێژیو ستەمکاری و دڵنیاترین رێگای گەیشتن پێی، هەبوونی ژیانێکی عەقلانییە و دروستکردنی تایبەتمەندێتی خۆ کۆنترۆڵکردن وخۆ گرتوویی لە تەواوی کردەوەکان و فیکرەکاندا یان بە واتایەکیتر: هەبوونی ژیانێکی ماقوڵ و ئارام.

ئەرستۆ ئامۆژگاریدەکات کە: بەڕادەیەکی مامناوەندی بە شوێن بەدەستهێنانی ماڵ و سامانەوەیە. هاوڕێی وابەدەست بێنە کە راستگۆ و ئەمەکدار بن نەك لەژمارەدا زۆربن.



بیرەکەت پەروەردە بکە و زەینەکەت فراوان بکە: "ئاسایشی تەواو لە مەشقە بێدەنگ و ئارامەکانی زەیندایە."

بەگوێرەی ئەم وەسفە شادی و خۆشبەختی لەڕوویەکەوە، هاو واتای نەرمی و نیانییە. پیاوی نموونەیی ئەرستۆ کەسێکە کە بەتوندی ئامەزرۆی خزمەتکردن بێت بەوانیتر و خۆی لە پەسەندکردنی خزمەتی کەسانیتر لابدات؛ "روومەت گرتن نیشانەی گەورەیی و قبووڵکردنی نیشانەی پەستییە."

پیاوێکی بالاّ هەرگیز هەست بە تۆڵە سەندنەوەو کینەخوازی ناکات و ئەو ئەزیەت وئازارە لەبیر دەکات کە خەڵکانیتر پێیان گەیاندووە. هیچ شتێك لە بێعەدالەتی و گەورەکردن و ئافەرینبێژیی یان سەرزەنشتی نابەجێ و ناڕەوا لەڕێگە لاینادات. بە خراپە باسی کەس ناکات تەنیا بە ئامادەبوونی خۆی نەبێت پشت لە خۆشی و ناخۆشی ناکات.

بە ویقار و ئاسودەییەوە خۆشبەختی یان چارەڕەشی قبووڵدەکات و بە شادی ئەوانیتر بە قەد شادیی خۆی شاگەشکە و خۆشحال دەبێت.

رێنماییە ئەخلاقییەکانی ئەرستۆ لەم چەند وشەیەدا کورتدەبێتەوە:" ئەوەی دوژمنی ئەوانیترە، خراپترین دوژمنی خۆیە و ئەوەی کە دۆستی خەڵکە باشترین دۆستی خۆیە."

لە فەلسەفە رەوشتییەکەی ئەرستۆ وەکو "دەستەگوڵی بۆنخۆشی بن پێکەوتوو " رەخنە گیراوە، بەلاّم وەلاّمی ئەرستۆ بۆ ئەم رەخنەیە رەنگە ئەمەبێت کە:"هەر وایە کە گوڵەکانی وەنەوشە کە سادە و دیار و بەرپێ کەوتوون بەلاّم زیندوون، ژیانیان هەیە. هەموو ئەو دیاردانە کە لە سروشتدا بە شێوەیەکی دووبارە پەیدا دەبن گیرۆدەی هەمان ئەم بێنرخییەن. هەڵهاتنی رۆژانەی خۆر، دەرکەوتنی پەرجۆئاسای ئەستێرەکان لەکاتی شەودا، هەستانەوەی زەوی لەوەرزی بەهاردا و گەرمای دوستایەتی مرۆڤی لە دونیایێکدا کە سەحنەی شەڕ و کێشمانەکێشە." کاری واقیعی ئەرستۆ رێکخستنی یاسا کردارییەکانی هاوڕێتی بوو بەشێوەی کۆمەڵەیەکی رەوشتی و ئەگەر ئەم رێنماییانە ئەمڕۆکە فڕێدرا و ژێرپێخراون هێچ شتێك لە حەقیقەتەکەیان کەم نابێتەوە.

فەلسەفەی ئەرستۆ لەسەردەمی خۆیدا هێندە بەشۆڕشگێڕانە ناسرا کە نوتفەی لەناو چوونی خۆی لەگەڵ خۆیدا هێنا. بڕوای قایمی بە میانەڕەوی و مامناوەندێتی ئەوی خستە نێوان دوو ئاگری لەناوبەر. یەکێك لەودوو ئاگرە،ـ نەفرەتی ئەسکەندەر ـ بەمەرگی ئەو فاتحە بەهۆی پووچەڵکاری و مەیخواردنەوە، لە یەکرا کوژایەوە. بەلاّم ئاگرەکەی تر بەدگومانی ئەسینایییەکان ـ زیاتر لەپێشوو گڕی سەند ئەسینایییەکان ئەویان بەوە تۆمەتبار دەکرد کە زانیارییە نهێنییەکان بۆ ئانتیپاتەر (Antipater) ـ جێگری ئەسکەندەر ـ دەنێرێت و کاتێك سەلمێنرا کە ئەم تۆمەتە ناڕەوایە، دەستیان دایە فێڵە کۆنەکە و ئامادەکارییەکانی گیرخواردنی ئەوی بەناوی "بێڕێزی بەرامبەر بە خواکان" دابینکرد.

ئەرستۆ خۆی شوێنی لێدان لایدا و گوتی:"من ئەو بوارە بە ئەسینایییەکان نادەم کە جارێکیتر دەستی خۆیان بەخوێنی فەیلەسوفێك رەنگین بکەن." و هەڵهات بۆدورگەی ئوبوا (Eubea). بەلاّم ئەویش شوێنێکی ئەمن نەبوو. هەموو شوێنێك نەفرەت، بەدگومانی، کینە خوازی، ئێرەیی، دەستدرێژیو چاوبرسێتی و چاوچنۆکییەکی لەڕادەبەدەر دایگرتبوو. ناسپاسی و بێئەمەکی لەسیفەتە دیارەکانی خەڵکانی ئەوێ بوو ئامانجێکی ئاسان کە جیهانخۆرە بەڕەلاّکان دەستی بۆ دەبەن. ئەوەی کە لێدانێك بە سەریدا بکێشێت وەلاّمی خواستی خەڵکی گشتیی داوەتەوە. فەیلەسووف هەموو ئەوانەی لەو خۆراکەی کە کەوتبووە دەستیان بێبەش کرد و چەند مانگێك دوای هەڵهاتنی لە ئەسینا ئەو گیانەی کە لە چەنگی خەڵکی راپسکاندبوو داوە دەست ئافرێنەرەکەی. ئەرستۆ لە مردنیشدا ـ وەکو ژیان ـ دەستی لە میانەڕەوی هەڵنەگرت و دلێرییەکی بەدوور لە درندەیی یان ترس و باك لەخۆی دیاریدا“" لەبەرئەوەی مۆڵەتی زیاتر بۆ فێرکردن نییە، ئیتر هۆکارێکیش بۆ بەردەوامی ژیان نامێنێتەوە."







# کنفوسیوس ( ٥٥١ ـ ٤٧٩ پ. ز)

## ئەو سیاسەتوانەی کە بەشوێن ولاٚتێکدا دەگڕا

ئەمە بەسەرهاتی ئەو فەیلەسووفەیە کە مالْو حالْی نەبوو و لە سەرتاپای تەمەنیدا مالْبەکۆلْ و دەربەدەر بوو، بەلاٚم دوای مەرگی بووە مایەی گەورەیی نواندن و ڕێزلێگرتن لەلایەن هەموو نەتەوەکانەوە. ئەمە چیرۆکی یەکێك لە سەیرترین پیاوانی مێژووە. پیاوێکی بێ‌دین کە ڕەوایی بە یەکێك لە گەورەترین ئایینەکانی جیهان بەخشی. خوانەناسێك کە بۆ پلەی خوایەتی بەرزبووە.

وردکارێك[*] وتوویەتی مێژووی چین دەکرێ لەدوو وشەدا کورت بکرێتەوە:"لەکنفوسیوسەوە بۆ کنفوسیوس."

بەر لە کنفوسیوس سەرتاپای چین گێرودەی بێتەکووزی بوو و ئێستاش کە حیکمەتی ئەو لەبیر چۆتەوە پەشۆکاوی و بێسەروبەری دەسەلاٚتی بەسەر ئەم سەرزەمینەدا سەپاندووە.

ـ ٢ ـ

چەندین سەدە بەر لە داروین، چینییەکان بڕوایان بەجۆرە شێوە گۆڕینێکی نائاشکراو و نەگەییویان هەبوو. ئەوان لەو بڕوایەدا بوون کە چەند ملیۆن سالْێك بەسەر تەمەنی جیهاندا تێپەڕیوە و جۆری مرۆڤی لە مێرووەیەکی وردی وەکو ئەسپێوە بە هێواشی بۆ شێوەی مرۆڤ گۆڕاوە.

[*] ئەو کەسەی کە تێبینی شتی ورد دەکات. و. کوردی



کنفوسیوس ئەم بابەتەی لەکاتی منالْیدا بیستبوو و لەبەر ئەوەی کە مێژووی چینی خوێند مافی خۆی بوو بڕوابکات کە بیردۆزە جیددییەکەی سەرچاوەی نەژاد لە سەر هەندێ هۆکار بەنەدە. هەر لاپەڕەیەکی کە دەخوێندەوە ڕووبەڕووی کردەوە نامرۆڤییەکانی تاکەکانی مرۆڤ بەرامبەر بە یەکتر دەبۆوە. بۆ نموونە دەخوێنیێتەوە کە ئیمپراتۆرێك، سێ‌هەزار یاخییی لە دەریاچەیەکی دەستکرددا لە شەرابدا نغرۆکرد. زۆردارانی‌تر دیلەکانی خۆیان ناچار دەکرد ئاسنی گەرم و سووتێنەر بەدەستەوە بگرن یان لە سەر ڕێسمانێکی تەڕکراو بەرووندا بڕۆن کە بەسەر چالْێکی پڕ لە ئێزنگی گڕ گرتوودا راکێشرابوو و مێوانەکانی خۆی داوەت دەکرد کە تەماشای ئەم " ئەسپێ برژاوانە " بکەن کەبەناو گڕە سەرکەشەکانی ئاگردا ڕۆ دەچوون.

یەکێك لە فەیلەسووفە گەورەکانی چین بەناوی تێنگ شیە (**Teng –shih**) کە وێڕا بوو جیاوازی نێوان حەق و ناحەق دیاربکات، سەری خۆی لە دەستدا. لەکاتی شەهیدبوونی ئەم فەیلەسووفەدا، کنفوسیوس کە پیاوێکی لاو بوو، لەسالْی ٥٥١ پ.ز هاتە دنیاو باوکی پلەی ژەنەرالْی هەبوو. کنفوسیوس لە تەمەنی سێ سالْیدا باوکی لەدەستداو هەروا کە تەمەنی هەلْدەکشا ڕۆژ لە دوای ڕۆژ زیاتر و زیاترلە عەسکەرایەتی دوور دەکەوتەوە. ئەو بڕیاری دابوو ببێتە مامۆستای هونەرەکانی ئاشتی. گوایە ئاگای لەو حەقیقەتە نەبوو کە لە پیشەی مامۆستایەتیی ئاشتیدا، لەگەلْ جیهانێك دەکەوێتە شەڕ و جەنگ.

کاتێك دەستیکرد بە کاری مامۆستایەتی تەمەنی بیست و دووسالْ زیاتر نەبوو لەوکاتەدا تازە ژنی هێنابوو و ببووە خاوەنی کوڕێك بەلاٚم پاشان لەهاوسەرەکەی جیابۆوە چونکە ئەو بەهۆی کەمی داهاتی مێردەکەی لە زیادبوونی ئەندامانی خێزانەکە خۆی لادەدا. بۆیە بەتاقی تەنیا درێژەی بە خەباتەکەی داو لە بەر ئەوەی توانای ڕێکخستنی ژیانێکی ڕێکوپێکی نەبوو، لەسەر گالیسکە لەشارێکەوە بۆ شارێکی‌تر بەرێدەکەوت، قوتابییەکانی خۆی، بە هەژار و دەولْەمەندەوە، لەخۆی کۆ دەکردەوە. لەوانەی کە توانای ماددیان هەبوو مانگانەیەکی کەمی وەردەگرت و لە وانی‌تریش بە وەرگرتنی بڕێك برنج یان پارچەگۆشتێك قایل دەبوو و یانیش هیچی وەرنەدەگرت. کاژێرە بۆشەکانی بۆ مۆسقا و تیرئەنازی تەرخان دەکرد، کنفوسیوس بلوێر ژەنێکی لێهاتوو بوو. ئەویش وەکو ئەفلاٚتوون نموونەی تەواوی حکوومەتی لە ئاهەنگە هاوگونجاوەکانی ئاوازە مۆسیقاییەکاندا پەیداکرد.





بەلاَم کنفوسیوس رۆحێکی بێئۆقرەی هەبوو. نەیدەتوانی تەنیا بە فێرکردن و ژەنینی بلوێر قەناعەت بێنێت. ئەو خوازیاری دونیایەکی نوێ بوو کە بە دڵ و گیان تێیدا خزمەتبکات. بۆیە چووە سەردانی لاووتسە(Lao-tse[*])ی ژیری پیری چینی و نهێنی ژیانێکی باشتری لەوی پرسی.

لاووتسە ئەم نهێنییەی لە چەند وشەدا بەگوێیدا خوێند کە دەتوانرێ وەکو ئامۆژگاری و وتاردانی مەسیح دابنرێ لەسەرچیا: "خۆت لە شەڕ و جەنگ لابدە تا کەس توانای شەڕکردنی لەگەڵ تۆنەبێت... پاداشتی خراپە بەچاکەبدەرەوە... لەگەڵ چاکەکار و خراپەکارندا چاکە بکە تا هەموو فێری چاکەبن... لەگەڵ هاورێکاندا یەکڕەنگ بەو لەگەڵ ئەوانەش کە یەکڕەنگ نینە، گیانی و یەکڕەنگ بە تا هەموو کەسێك یەکڕەنگی و گیانی بوون بکەنە پیشەی خۆیان نەرمی بەسەر توندوتیژدا سەر دەکەوێت... هیچ شتێك لەجیهاندا لەئاو نەرمتر نییە لەگەڵ ئەمەشدا لەڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ گلاَوی و دژوارییەکاندا هیچ شتێك توانای بەرگەگرتنەکەی نییە."

لەگەڵ ئەوەشدا کە کنفوسیوس عاشقی ئاشتی بوو، ئەم فەلسەفەیەی لە رادەبەدەر بێگیان و نەرم بینییەوە. دواجار ئەویش کوڕی سوپاییێك بوو و دەیویست ئەگەر لە مەیدانی جەنگیشدا نەبێت ئەو لە بواری دەروونی و مەعنەویدا جەنگاوەرێك بێت. ئەو جیهانی پڕ لە ستەم و بێعەدالەتی دەبینی و هەستی دەکرد کە خۆبەدەستەوەدانێکی پەتی بەرامبەر بە ستەمکاری، هیچ ئەنجامێکی نابێت.

کاتێك گەڕاوە لای قوتابییەکانی وتی: لەگەڵ ئەوەشدا کە ستایشی لاووتسە دەکات بەلاَم سەری لە بیردۆزەکانی ئەو دەرناچێت لەبارەی کاروباری دونیا."من نازانم مەلەکان چۆن دەتوانن بفڕن، ماسییەکان چۆن دەتوانن مەلەبکەن و ئاژەڵەکان چۆن دەتوانن رابکەن. مەلەکان رەنگە بە گوللە بپێکێنرێن، مەلەکەرەکان گیرۆدەی قولاَپ بن و ئاژەڵەکان بکەونە تەڵەوە. بەلاَم نازانم ئەژدەها چۆن بە سەر باوەوە دەچێتە ناو هەورەکان و لەوێوە بۆ ئاسمان هەڵدەکشێت... من تەنیا دەتوانم لاووتسە لەگەڵ ئەژدەها بەراورد بکەم"

[*] فەیلەسووفیکی چینیە لە سالآنی ٦٠٠ ساڵ پ. ز



کنفوسیوس بڕیاریدا کە فەلسەفەکەی خۆی لە هی لاووتسە جیا کاتەوە و وای بە باشتر زانی کە لە فەلسەفەدا لە جیاتی باسکردن لەبارەی پرسە ئاڵۆز و تەمومژاویەکانی ئاکاری تیۆری بە روونکردنەوەی پرسە کردارییەکان هەستێت. کنفوسیوس قوتابییەکانی فێردەکرد کە: "لەگەڵ خەڵکی نەرمونیان بن، بە میهرەبانی رەفتاربکەن و لەگەڵ ستەمکاران بە عەدالەت، بەواتایەکیتر چاکە و خراپەی ئەوان بە پاداشتێکی شیاوی کردەوەکەیان وەلاَم بدەنەوە.

- ٣ -

لەبەرئەوەی کە کنفوسیوس، بەگوتەی خۆی، خۆی لادا لەوەی کە لەبەرامبەر ستەمکاردا "وەکو گیاییێك لەبەرامبەر هەڵکردنی بادا" سەر دابنوێنێت، بۆیە کێشەکان ڕوویان تێکرد. ئەو دەیوت؛ لەو رووەوە سیاسەتی کردووە بە پیشەی خۆی تا "بەرامبەر بە ستەم بەربەستێك دروستبکات"

پاشای ناوچەی لو (Lu)ی زێدی کنفوسیوس، کە لەبارەی ناوبانگە چاکەکەی لە ناو هەوادارەکانیدا زۆر شتی بیستبوو ئەوی بە وەزیری داد دامەزراند.

کنفوسیوس کرداریانە پیشانیدا کە شایستەی بەدەستهێنانی پلەیەکی ئەوهانییە. ناوچەی لو پڕ لە دز و جەردە بوو. نوێنەری خاوەن پیشەکان لێیان پرسی چارە چییەو چ دەبێت بکرێت؟ کنفوسیوس وەلاَمی داوە:"تەنیا رێگەی کۆتایی پێهێنانی دزی وازهێنانە لە قازانجخوازی چونکە هەرچەند کەمتر قازانج بکەن کەمتر دەتوانن کەلوپەلێك بۆ دزیکردنی ئەوانیتر بکڕن!". ئاشکرایە وەلاَمێکی ئەوها لەگەڵ میزاجی بازرگانەکەدا ناگونجێت.

رۆژێکیان پیاوێك بۆ سکالاَکردن لە کوڕە لاسارەکەی چووە لای کنفوسیوس و ئەو بڕیاریدا کە باوك و کوڕ سێ مانگ زیندانی بکرێن و دیاریکرد:"باوکێك کە لە پەروەردەکرنی کوڕەکەیدا کێماسی بکات بە قەد ئەو کوڕەی کە خۆی لەجێبەجێکردنی ئەرکەکانی لادەدات، خەتابارە) پیاوێك لە لای ئەو ژنە بێڕەوشتەکەی سکالاَکرد و ئەو گوتی: "لەبەرامبەر توندوتیژیەکەی ئەو نەرم بە و قسە تاڵەکانی ئەو بە تاڵی جواب مەدەوە چونکە ئەگەر وا بکەی دوو زریانی دژبەیەك هەڵدەکەیکە ژیانت کاولدەکەن."ـ





بەلاّم ئەگەر ژنەکەم ئازاری پێگەیاندم چ بکەم؟ تەمێی بکەو ئازارەکی لە بیرەخۆت بەرەوە. زیان و ئازادی لە بیرکراو وەکو زریانی بەفری ساڵی بەرتەرە کە ئیتر ناتوانێت قاچت لە سەرمادا وشکبکات.

چەندین جار کاتێك خەڵك بۆ سکالاّکردن لەیەکتر هاتنە لاّی پێیانی دەگوت "کێشەی هەموومان ئەوەیە کە لە هاوسێکانمان چاوەڕێ دەکەین کە رەفتارێکی باشتر لەوەیان لەگەڵ ئێمە هەبێت کە ئێمە لەگەڵ ئەواندا هەمانە."

کنفوسیوس جەختی دەکرد کە گەورەترین گوناهەکان تورەیی و غەزەبی "پیاوی تورە پڕی ژەهرە و ژیانی خۆی ژەهراوی دەکات." ئەوعەدالەتەی کەکنفوسیوس لەپێناو بەرقەرارکردنیدا خەباتی دەکرد، جۆرێکی تازەبوو.

پاشای ناوچەی لو نەیدەتوانی ستایشی ئەوجۆرە عەدالەتە بکات و بەباشتری دەزانی هەمان دەستوری کاری کۆن بەکاربێنێتت و روو لە بەرتیلخوازی و شەڕ و عیشوەگەری (خۆشگوزەرانی) وەرنەگێرێت. هەر لەو کاتانەدا هەشتا ژنەسەماکەری جوانیان وەکو خەلاّت بۆ دەربار نارد و پاشا لەبەر دەرگای جوانیدا سەری رێزی دانەواند و بالاّیی و خواترسیی لە دەرباری خۆی دەرکرد.

کنفوسیوس جارێکیتر بوو بە گەرۆکێکی بێماڵ و حاڵ "من ئێستا لەهەموو شوێنێك، لەباکوور، باشوور، رۆژهەلاّت و روژئاوادا دەژیم. بەهۆی هەر بایەکەوە بۆلایێك رێدەکرام بەلاّم لە دەروونی خۆمدا پەناگەیەکی ئاسوودەبەخشم هەیە."

- ٤ -

کنفوسیوس لەگەڵ هاوڕێکانیدا وەکو عیسای مەسیح، لە شارێکەوە بۆ شارێکیتر دەچوو. هەنگاوی بنابا هەرشوێنێك مژدەبەری شادی و خۆشی بوو بەلاّم خەڵك لەبرێ نان، بەردیان بەرەولای فرێ دەدا (تێدەگرت). یەکێك لە موریدەکانی بەم شێوەیە وەسفیکردووە: "ئەو وەکو ناقوسێکی زەنگ لێداو پەیامەکانی خوای دەگەیاندە گوێ خوازیارانی." بەلاّم کنفوسیوس خۆی کەمتر بەشوێن دۆزینەوەی نهێنییە خواوەندیەکانەوە بوو و زیاتر لە هەمووشتێك بایەخی بە رەفتار و رەوشتی خەڵك دەدا. یەکێك لە موریدەکانی لەو بارەوە داوای روونکردنەوەی لێکرد و





ئەو وەلاّمەی بیست کە سەیری زەوی بکە نەك ئاسمان. "زۆر بیر لە عیبادەتی خوا مەکەرەوە کە نازانی خواستی چییە بەڵکو دەست بە خزمەتکردنی خەڵك بکە کە دەزانی کێشەکەیان چنەو چییان دەوێت."

خەڵکی ئاسایی ئارەزووی بوون و خاوەن دەسەلاّتەکان لێی دەترسان و کەسێکیان بەکرێگرت تا بیکوژن. کنفوسیوس بێ بایەخدان هەروا بەرێگای خۆیدا دەرۆیشت. هەندێ لە موریدەکانی لەترسی گیانیان لیێ دوورکەوتنەوە چونکە "هەمدەمێتی ئەویان بەترسناك" دەبینی. یەکێك لە شوێنکەوتووانی کە دواتر بۆخۆی زاهیدی کردە پیشە و پەنای بۆ کونجی دوورەپەرێزی برد، ئامۆژگاریکرد کە ئەویش ئەم رێگەیە بگرێتە بەر و دەیگوت: "ئاناراميەو بێتەکووزی لە سەرتاپای جیهاندا، وەکو لافاوێك لە هەڵکشاندایە کێ دەتوانێت بەری لێبگرێت. لەجیاتی ئەوەی لەشارێکەوە بۆ شارێکیتر وێڵ و سەرگەردانبی بۆچی بەیەکجار لەخەڵك خۆت دوورناخەیەوە و دوورەپەرێزی ناکەی؟"

بەلاّم کنفوسیوس سەری دەهەژاند و ئاشکرای دەکرد کە: "ئەگەر تێکەلاّویم لەگەڵ خەڵکدا نەبێت ئەی لەگەڵ کێ هەستم و دانیشم؟) کنفوسیوس نە سەروکاری لەگەڵ گیانلەبەراندا هەبوو و نەش لەگەڵ فریشتەکان، بەڵکو لەگەڵ کوڕانی جۆری خۆی پەیوەندی هەبوو. ئەو هێشتا چاوی لەوە بوو کە حکومەتێکی نەخۆش لەفیکری چارەسەری خۆیدا بێت. بەلاّم هەرگیز حکوومەتێکی وای دەستنەکەوت. نەخۆشی لە هەموو شوێنێك مێشکی فەرمانڕەواکانی داگیرکردبوو و لە شوێنێکی زۆرکەمی ئەم جیهانە نەبێت (رەنگە لە هەندێ نوقتەی دووردەست و دابڕاو) لە عەدالەت هیچ نیشانەیەك نەدەبینرا. رۆژێك لەگەڵ موریدەکانی بە چیایەکی بەردیندا هەڵدەگەڕا پیرەژنێکی بینی کە لە سەر گۆڕێك دانیشتووە و هونهون دەگرییێت. لیێپرسی: هۆی ئەم شیوەنە چییە؟ ژنەکە وەلاّمی داوە: "باوکی مێردم لەناو چەنگی بەورێکدا گیری خواردو کوژرا پاشان مێردم و کوڕم توشی ئەم بەلاّیە بوون."

ئەی بۆچی لە شوێنێکی ئاوا ترسناکدا دەژی؟ـ

لەبەر ئەوەی لێرە دەسەلاّتدارە ستەمکاران پەیدا نابن...

کنفوسیوس رووی لە موردییەکانی کرد و وتی:( (منالاّنم، بیخەنە مێشکتانەوە، دەسەلاّتدارێکی ستەمکار لە بەورێك ترسناکترە."

بەم شێوەیە کنفوسیوس درێژەی بەسەرچلی خۆیدا لەبواری حیکمەت و فەلسەفەدا و ئازار و هێرشەکانی مرۆڤەکان و گیانلەبەرەکانی تورەی بەنرخی گیان کرێ و خۆی بەو پەرێ راستگۆییەو بێداتاشین بەم جۆرە وەسفدەکرد: "من بەرادەی کافی ژیری و هۆشم هەیە، بەلاّم نە بەرادەی ئەوەی کە حەزم لێیەتی".

کنفوسیوس قوتابییە تەمبەڵەکانی هیچ کاتێ بە بەکارهێنانی دار تەمێ نەدەکرد و پرسیارە گێلانەکانی بە هات و هاوار وەلاّم نەدەدایەوە. کاتێك کنفوسیوس لە بیابانێکدا رێگەی لێ ون بوو، رێبوارێك لەکاتی سەرەدانی و قوتابییەکانیدا ئەوی ئەوها وەسفکرد: "پیاوێکم بینی چەشنی چیایەکی خۆراگر کە روخساری وەکو سەگێکی وێڵگەڕو ئاوارە، بێچارەو بەدبەختبوو."و کاتێك یەکێ لە قوتابیانی بە ئامادەبوونی ئەو ئەم وەسفکردنەی هێنایە سەر زمان، کنفوسیوس بە دەنگی بەرز پێکەنی و هاواریکرد: "چەندە وەسفێکی تەواوە!"

ئەو خۆی بە "سەگێگی ئاوارەی بێئازار" دادەنا کە خەڵك لووڕەلووری ئاگادارکردنەوەکەی خراپ تەعبیردەکەن و بە نەڕەیەکی پڕلە تورەییان دادەنا لەکاتێکدا کە ئەو بەرامبەر بە کەس هەستی بە تورەیی نەدەکرد و لە بنچینەوە بواری ئەوەی نەبوو کە هێرش بکاتە سەر راو بیردۆزەکانی فەیلەسووفەکانیتر و بڕوای وابوو کە "مشتومڕ و نیقاش تورەیی دێننە ئاراوە و مرۆڤی تورە توانای تێگەیشتنی حەقیقەتی نییە...)

گەرچی وارێدەکەوت چەند شەو و رۆژێك بێخواردن بمێنێت، هەرگیز دەستی لەبەر کەس پان نەدەکردەوە و داوای یارمەتی لە کەس نەدەکرد. ساڵەها عومری کرد و تەندروستی لاوێتی هەروا پاراست.

کنفوسیوس کەسێکە کە "لە تاو شەوقوزەوقی بۆ بەدەستهێنانی زانست خواردنی لە بیرکرد و لە پای شادیی گەیشتن بە کاملی، غەم ودەردی لەبیرکرد و بەهۆی ئەو ئەڤینە لێوانلێوەی کە بەرامبەر بەژیان هەیبوو هەستی بەهاتنی ساڵانی پیری نەدەکرد."

- ٥ -

بەلاّم کنفوسیوس لەوکاتەدا خۆی لە کاروباری دونیاییدا بەدۆڕاو دەبینیێ: "پاشا ستەمکارە و خەڵکی گشتی نەزانن و قسەکانی من لە پارچەکانی بەفر دەکەن کە بە سەرڕووی ئارامی



دەریادا بکەونە خوارەوە، ئەو ئیتر پێی لەسەر لێواری قەبربوو و لەوە پیرتر و نەخۆشتر بوو کە بتوانێت بکەوێتە گەشت و گەڕان و برسیتروهەژارتر بوو لەوەی کە بتوانێت سوود لە ئاسایش و ئاسوودەیی وەربگرێت. ئەو لە هەمان کاتدا بێئارامتر و بێئۆقرەتر بوو لەوەی کە چاوەڕوانی مەرگ دابێت. لە هەمان رۆژگاردا کە قاچێکی خستبووەنێوگۆڕەوە گەورەترین رووداوی سەردەمەکەی روویدا. کنفوسیوس لە تەمەنی ٦٩ ساڵێدا هەڵسا بە نووسینی پەرتوکێکی پیرۆز بۆ نەوەی دواتر کنفوسوس لەم پەرتوکە پیرۆزەدا هیچ بابەتێکی تازە و دەست لێنەدراوی باس نەکرد "بابەتە گرنگەکانیش تائیێستا گوتراون" تاکە کاری گرینگی ئەوە بوو کە گوڵبژێری فیکرە پێشینەکانی هەڵبژارد و بۆ نەوەی دوا رۆژ کۆی کردنەوە و ئەم بیرۆکانەی ئەوها لەگەڵ خەیاڵە دڵبزوێنەکان و حیکایەت و دەربرینە دڵگیرەکاندا تێکەڵ کرد کە لە چەشنی گەوهەرێك کە لە بەر تیشکی رووناکی رابگرن، شەوقێکی دڵنشینی هەبوو.

کنفوسیوس زنجیرە رێسایەکی بۆ خەڵك و زنجیرە ئەرکێکی تەشریفاتی بۆ هێنانە کایەوەی رێکوپێکی فەردی داناو دەیگوت هەرکارێك لە ژیاندا هاوڕێی رەچاوکردنی تەواوی هەندێك دابونەریت و رێورەسمە: "لەگەڵ هەژارترین کەسدا هێندە بەرێزەوە رووبەڕوو بەوە کە گوایە لەبەرامبەر سوڵتانی.،، ئەو شوێنکەوتووانی فێردەکرد کە تەنانەت کوختێکی لارێتیش بە چاوی کوشکێکی شاهانە سەیربکەن.

رێنماییەکانی کنفوسیوس خەلاّتی گرانبەها بوون کە بەهەرزانی دەست هەوارادرانی دەکەوتن و هەستی رێز لەخۆگرتن و رەوچاوکردنی رێزی ئەوانیتر تیایاندا بەهێز دەکرد؛ "لەگەڵ خۆت یەکڕەنگ و بەامبەر بە هاوسێکان خێرخوازبە."

ئەمەبوو کورتەیەك لە هەڵبژاردەی رێنماییەکانی کنفوسیوس. لەبری پەروەردەکردنی هەستی بێشەخسیەتی و خۆ بەهیچزانی، تۆوی نمونەییەکی "خۆپەسەندیی بەکۆمەڵ"ی لە ناخیاندا پەروەردە کرد و بەم جۆرە خۆپەسندیی هۆشیارانەی بە "کاردانەوە" پێناسەکرد ـ بیردۆزێك کە دەتوانین بەشێوە نێگەتیڤەکەی ئەم (رێسای زێڕین)ە وەربگرین کە دەڵێت: "لەگەڵ ئەوانیتر وەها رەفتار بکە کە تۆ لێیان چاوەڕێی." وبڕوای قایمی بەوە بوو کە هەرکاتێ تاکەکانی مرۆڤ تەنها بۆماوەی یەك سەدە رەچاوی ئەم یاسایە بکەن توندوتیژی و تەعەدا و هەروەها رەنجان و نارەزاییەکان ئەم جیهانە چۆڵدەکەن؛ "چاکەخوازیی خۆت بەرامبەر بەخەڵك زیادبکە تا بەم





شێوەیە سەرمایەیەك لە چاكەخوازی و نیەتچاكی بۆ خۆت پاشەكەوت بكەی. چونكە بە درێژایی رۆژگار هەموو ئەم چاكەیانە بە چاكە خەلاَتدەكرێن."

بەكورتی ئەم دوو بنچینەیەی ئازادیخوازی لەلایەن كنفوسیوسەوە بۆ جیهانیان بە میرات ماوەتەوە و دەیگوت:"بە سەقامگیر بوونی ئەم بنچینانە هەموو جیهان دەگۆڕێت بۆ یەك دەوڵەت... خەڵك بە یەكڕەنگی تێكەڵاَیەتیان لەگەڵ یەكتر دەبێت و نەمامی ئاشتی جیهانیی پەروەردە دەكەن... هەرپیاوێك لە ئەمنیەتدا دەبێت و هەر ژنێك دەگات بە مافەكانی خۆی پیلانە ئەهریمەنەكان هەرەسدێنن و لەناو دەچن. دەستی رێگرو ناپاك و دزان كورت دەبێت... ئەمەیە ئەو قۆناغەی كە من بە(تێگەیشتنی تەواو)م ناو بردووە، دەرككردن و لێك تێگەیشتنی تەواو لە نێوان تاكەكانی نەتەوەكاندا." كاتێك پرسیار دەكرێ؛ "ئەم قۆناغە كەی دێت؟" فەیلەسوف بیریدێتەوە كەچۆن دەرباری (لو) دەریان كرد، بە دەم زەردەخەنەوە دەڵێت: "كاتێك كە پاشا بەقەد بەدەوی و جوانی بەرامبەر بە بالاَیی و لەخواترسان خۆشەویستی دەردەبڕێت."

- ٦ -

بەلاَم ئەو هەرگیز رووبەڕووی پاشایەكی ئەوها نەبووە. پەرتووكە پیرۆزەكەی نووسی بەلاَم "لە بێچاودێریاندا بە چەشنی گیا وشك بوو." كنفوسیوس، پیرەمێردی شەیدا و شكست خواردووی، لەوپەڕی دەستكورتی و هەژاریدا ماڵئاوایی لە دونیاكرد. خەڵكانێكی زۆر قسەكانی ئەویان بیست بەلاَم ژمارەیەكی كەم مەراقیان لێدا كە ئەوانیش وەكو رۆژگارە سەرەتاییەكانی مەسیحییەت، بەهۆی هەبوونی بڕوا و بیروباوەڕ، گیرۆدەی ئەشكەنجە و ئازار بوون.

یەكێك لە پاشاكانی چین فەرمانیدا كە پاشماوەی پەرتووكەكانی كنفوسیوس لە ئاگردا بسوتێنن. كۆمەڵێك لە هەوادارەكانی هەندێ دانەی لەم پەرتووكانە شاردەوە و پاشا بڕیاریدا كە ئەم كەسانە لەگەڵ پەرتووكانیاندا بە یەكجار بسوتێنن. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، ئایینی كنفوسیوس وەكو مەسیحییەت درێژەی بەژیانی خۆیداو لەئاكامدا بوو بە یەكێك لە ئایینەكانی جیهان. پەرستگاكان بە ناوی ئەوەوە دامزران، قوربانیەكان لەبەر پێیدا پێشكەش كران بەلاَم هەر ئەوانەی كە قوربانیان بۆ سەردەبڕی و ناوی ئەویان بەرز رادەگرت، خودی ئەویان لە یادكرد و بۆ چەندین دەستە دابەش بوون ولەسەر راڤە و تەعبیری وشەكانی ئەو لەگەڵ یەكتر





بەشەڕهاتن و كاریان گەیشتە جەنگ و كێشمانەكێش و ئێستاشی لەگەڵدا بێت جیهان زیاتر لە سەردەمەكەی. كنفوسیوس لە"تێگەیشتنی تەواو" ی ئەو نەگەیشتووە.

ئایا كنفوسیوس شكستی خوارد؟ رەنگە قسەكانی بەرناردشۆ* (Bernard shaw) باشترین وەلاَم بن:"نەعیسای مەسیح و نەش كنفوسیوس شكستیان نەخواردووە بەڵكو تا ئەمڕۆكە كەسێك پەیدانەبووە كە هێندە پاك و خاوێن بێت كە بتوانێت لەڕێگەی ئەواندا هەنگاو بنێت."

* گەورە نووسەری ئینگلیزی (١٨٥٦ ـ ١٩٥٠)

# دیۆجێنیس (٤١٣ ـ ٣٢٣ پ.ز )

## فەیلەسووفی سواڵکەر

چەند ساڵێك دوای مەرگی سوکرات، یەکێك لە موریدەکانی بە ناوی ئانتیس تێنێس (Antisthenes) لە پۆلدا سەرقاڵی فێرکردن بوو کاتێك لە ناکاو ژاوەژاوێك لەپۆلەکەدا هاتە ئاراوە. سواڵکەرێکی لاوی نەناسراو خۆی بە ژورەکەدا کردبوو و سووربوو لەسەر ئەوەی کە دەبێت بێتە رێزی قوتابیەکانی ئانتیس تێننس. هاوارە پڕ لە تورەییەکان لە هەموویان بەرزبووە و کەوتنە گاڵتەپێکردنی: "برۆ دەرەوە سەگی گڕوو"،"لێرە جێی سواڵکەران نابێتەوە"، "بینێرنە شوێنێك کە شایستەی ئەو بێت."، "با لەبەرچاومان ون بێت". هەوڵی مامۆستا، کە دەیەویست بە گەردەنیشەوە سواڵکەرەکە بیکاتە دەرەوە،سوودی نەبوو ـ

ئەوان بەسەگ بانگم دەکەن. زۆرچاکە منیش وەکو سەگ عەو عەوە دەکەم بەلاّم زەوقێکی لەڕادەبەدەرم بۆ فەلسەفە هەیە دەمەوێت تاقی بکەمەوە.

مامۆستا بێسوود هەوڵی دەدا ئەو لەوێ دووربخاتەوە چونکە سواڵکەرە کە پێداگری لەسەر پاراستنی ئەو مافە دەکرد کە بۆ خۆی قایل بووـ

هەکارێك دەتەوێت بیکە، هەرچەندت دەوێت لێم بدە، هیچ دارێك هێندە ژوار نییە کە بتوانێت لێرە دەرم بکات.

لاەوەکە لەوێ ماوە و هەموو ئەویان بە"سەگی فەیلەسووف" یان فەیلەسووفی سینیك ناو نا. چونکە "دانی خۆی بە رێورەسمو دابونەریتو رێساکان پێشان دەدا و سەگئاسا دەوەڕێ.



ئەم لاوە راشکاو و رەخنەگرە، لە دێۆجێنیس بترازێ کەسێکیتر نەبوو فەیلەسوفێك کە"چاوپۆشی کرد لە هێژایی و رێز تا پیاوێکی رێك و راست بێت.

ـ ٢ ـ

لەنێوان دیۆجێنیس ئانتیس تێنێسی مامۆستاییو سوکراتی مامۆستای لایەنی هاوبەشی زۆر هەبوو. هەرسێکیان لەسەر ئەو بڕوایە رێککەوتبوون کە بناغە و بنچینەی حیکمەت خۆناسینە. بەلاّم ئانتیس تێنێس هەنگاوێك لە سوکرات زوورتر رۆیو دێۆجێنیس، هەروەك دەیبینین، چەندین هەنگاو لە ئانتیس تێنیس زوورتر رۆیشت. سوکرات وتبووی "خۆت بناسە"

ئانتیس تێنیس رایگەیاند: "تێبکۆشە تابە خۆناسین بەسەر خۆتدا زاڵ بی." و ئەم ئەسحابە بتپەرستە کە لە رووی خۆناسینەوە دەسەلاّتێکی تەواوی بەسەرخۆیدا هەبوو، لە هەندێ رووەوە وەکو تۆلستۆی بوو. ئەو کەسەی کە تا کاتی شەهیدبوونی سوکرات لەرێزی خانەدانەکاندا بوو، دواجار پشتی لە داب و نەریتو یاساکانی کۆمەلاّیەتی کرد و رووی لە ژیانی سادە و بێڕەوش و چاکەی پەتیکرد.

چەشنی کرێکاران جلی لەبەر دەکرد، تێکەلاّوی خەڵکی ئاسایی دەبوو و فەلسەفەیەکی دەگوتەوە کە هەموو لێی تیدەگەیشتن. فەلسەفەیەك کە لەسەر بنچینەی گەڕانەوە بۆ سروشت (ئەم قەلەمڕەوە ئاسمانییە لەسەر زەوی ) بەندبوو.

ئەم فەلسەفەیەی مەسیحییەت کە چوارسەدساڵ بەرلە مەسیح خونچەکانی بوونەوە" خەڵکی بۆ وازهێنان لە خولیا ماددییەکان و بەدەستهێنانی بالاّییە مەعنەوییەکان بانگ دەکرد. هیچ شتێك قابیلی خاوەندارێتی تایبەتی نییە.دەبێت خاوەندارێتی گشتی و یەکێتیەکی رۆحی بێتە کایەوە، ئاغایەتی و کۆیلایەتی لەناو بچن، ژیانی خۆشگوزەرانی و پڕئارایشت بۆ کەمینە و برسێتیو نەداری بۆ زۆرینە، ریشەکێش بکرێت و ئەو یاسایانەی، کە بەسوودی خاوەن هێز وبەزیانی بێهێزەکانە، رەفز بکرێنەوە بەم جۆرە بیروباوەڕانەوە، ئانتیس تێنێس هیچ کێشەیەکی بۆ وەرگرتنی دیۆجێنیس وەکو قوتابی نەبوو. لەگەڵ ئەوەدا کە دێۆجێنیس راشکاوێتیی زاراوەیەکی تایبەتی پێشاندا، مامۆستاکەی پێیخراپ نەبوو کە بیروڕاکانی خۆی بەشێوەیەکی





ئالۆز و کەموکورت، لە زمانی قوتابییەکەیەوە گوێ لێی بێت. تەنانەت قوتابییەکانیتریش کە هاوپۆڵ بوون لەگەڵ ئەم فەیلەسووفە سینیکە خۆشحاڵ بوون.

دیۆجێنیس هیچ نرخێکی بۆ ئەدەبیات دانەدەنا. دەیگۆت:"بۆچی کاتی خۆتان بە خوێندنەوەی رەنج و دژوارییەکانی ئۆدیسا، بەفیرۆ دەدەن و لە رەنجەکانی خۆتان بێئاگادەبن" گاڵتەی بە شەوق و زەوقی خەڵك دەکرد بۆ مۆسیقا:"بۆچی ئەو کاتانەی کە دەبێت سەرفی هاوگونجان و ئاسودەیی گیان بکرێت، بە خەریك بوون بە ئامێرە مۆسیقاییەکان بەفیرۆ دەدەن؟" گاڵتەی بە ئامۆژگاریکەر و وتاردەران دەکرد: "ئەوان خەڵك بە تاوانی بێعەدالەتی سەرکۆنە و مەحکووم دەکەن لە کاتێکدا کە خۆیان خاوەنی ئەو سیفەتەنە." گرنگتر لە هەمووان ئەوەیە کە دیۆجێنیس پێی لە سەر گۆڕان و بەدلکردنی نرخەکان دادەگرت و بۆ کردنەوەی بیروڕاکەی تەعبیرێکی دڵگیری هەبوو: "وەرن با سکەی بە رەونەق بگۆڕینەوە."و ئەم سکە ساختەیەی دەمارگیری و لووتبەرزیی مرۆڤ لە رەونەق بخەین. نیشانەکانی رێورەسم و دابەکۆمەڵایەتییەکانو ئەو نازناو و ناونیشانانەی کە پیاوان دەخزێنێتە قالبی سەردار و پاشاکان و هەموو ئەوانەی کە مۆری شەرەف و زانایی و خۆشبەختی و دەولەمەندییان لە سەر دراوە، هەر هەموویان کانزای بێبەها و تەزویر و بێسوودن.

هەستیاری دیۆجێنیس بەرامبەر بەم سکە تەزویرانە هۆیەکی هەبوو. باوکی کە پیاوێکی بانك بوو بەهۆی"گۆڕانکاری نارەوا (تصرف) لە سکەدا" زیندانی کرابوو و خودی ئەو لەشاری سینۆپ لە بەستێنی دەریای رەش کەلەزێدی بوو، بەتۆمەتی هاودەستی لە تاوانێکدا دوورخرایەوە. ئەم بەدگومانییە گوایە بێبنەما بووە چونکە دیۆجێنیس بە سووکایەتی و بێبایەخی سەیری ئەو پارە و خۆشیانە دەکرد کە بەو هۆیەوە دابیندەکرێت و لەو رووەوە کەلەزێدی دوور دەکەوتەوە هیچ داخێکی نەبوو. کاتێك بەرپرسانی چاکەکاری ئەویان مەحکووم کرد کە؛ "دەبێت سینۆپ بەجێ بهێڵی" ئەویش بێ دواکەتن وەڵامی داوە: "منیش ئێوە بەمانەوە لەسنۆپ مەحکووم دەکەم!"

دیۆجێنیس لەوە بەدواوە بوو بە گەڕۆکێکی ئاوارە کە رەگەزنامەیەکی جیهانی هەبوو. ئەو، بارە کۆمەڵایەتییەکەی خۆی بەیەکجاری لەدەستدا بەڵام لەبری ئەمە ئەو شتانەی دەستکەوت کە بۆ ئەو نرخێکی زیاتریان هەبوو؛ گەشت وگەڕانێکی دڵئاسوودە، خەوێکی ئارام و ئاسوودە،





حەسانەوە لە دەستی دز و رێگر، چونکە شتێکی وای نەبوو کە قابیلی دزین بێت، بەرزتر لە هەموو ئەمانە ئەوە بوو کەدیۆجێنیس ئازادیی تەواوی خۆی بەدستهێنا: "ئەرستۆ کاتێك نانی بەیانی دەخوات کە شا پێی خۆشبێتو دیۆجێنیس کاتێك ئەمەدەکات کە دیۆجێنیس پێیخۆشبێت!" ئەو خۆی لە بەرگێکی شڕوکۆن دەپێچا:"کاتێك رووبەرووی کەسێك دەبمەوە کە جلێکی رزاوەی لەبەردایە، ئەمە چاوی منە کە چێژ وەردەگرێت نەك چاوی ئەو. چونکە من جلە گرانبەهاکانی ئەو دەبینم و ئەو پۆشنە پارچەپارچە بووەکەی من"

شەوێکیان مشکێکی بینی بۆ ئەملا و ئەولا رادەکات "بێ پێویستی بە هەبوونی جێیخەو و بێترسان لەتاریکی" لەو رووەوە بڕیاریدا ژیانی ئەو بگرێتە بەرخۆی؛ "تا ئەوکاتەی کە من و ئەو گیرۆدەی قەیدوبەندی چارەنووس ببێن، سەرتاپای دونیا، بە خەیاڵێکی ئاسوودە، بەسەرپێ وەردەدەین."

بەم شێوەیە دیۆجێنیس باری خولیاو دڵگیرۆدەیی لە کۆڵی ئەو کەسانە کرد کە مەیلی راکێشانیان هەبوو. و خۆی کولەپشتییەکی لەکۆڵ کرد و وتی: "ئەمەی کە لەکۆڵم کردووە هەمووشتی منە."

دیۆجێنیس، بەم تایبەتمەندییانەوە هەنگاوی خستە ناو رێگای بەسەرهاتی بێخەموخەیاڵی و بەرەڵاییەوە. ئەو بیروڕا فەلسەفییەکانی خۆی بە خواردنێکی نەمرونەژی دەگۆڕیەوە. "لاریم نییە کە بە سواڵکەرناو ببەن بەڵام ئامادەم کەلەبەرامبەر پارچە نانێك، گوتەیەکی پڕلە حیکمەت بڵێم."

کاتێك هەوا خۆش بوایە لەهەوای کراوەدا دەخەوت"چ بنمچێك چاکتر لە ئاسمان دەستم دەکەوێت و چ بالیفێك لەپارچە حەسیرێك نەرمتر و چ زینەتێك لەگوڵ و درەختەکان دڵبزوێنترە؟"

لەگەڵ ئەوەشدا کە دیۆجێنیس هەردەم لە سەفەردا بوو، ئەسینای کردبووە ناوەندی کارەکەی خۆی. لە شەقامەکانی ئەم شارەدا بۆ ئەو بێکارانە قسەی دەکرد کە بەنیازی گاڵتە و رێشخەند لێی کۆدەبوونەوە بەڵام سەرەنجام بە بیرکردنەوەدا رووەدچوون. زەوقێکی زۆری لە هاودەمی و تێکەڵاویەتی بوو و چەندەزۆر دەبینرا کە خەڵکی لەرێگەی تیاترو قومارخانەکاندا دەدواند. لە یەکێ لەو بارانەدا کەسێك لێیی پرسی کە ئایا دەخوازیت تەماشاکەری تیاترۆ بێت؟

نە.، پێم باشە خۆم لە شەڕ و کێشمانە کێشدا بم.

ئەو کەسە پێکەنینی هات و پرسی"شەڕوکێشمانە کێش لەگەڵ کێ؟"

لەگەڵ شادی و ڕەنجەکانی خۆم. من زۆرانبازی لەگەڵ حەزەکان و تکادەروونییەکان و سەرکوت کردنیان پڕهەیەجانتر دەبینم و لەو بڕوایەدا بوو کە گەورەترین چێژ بەزەلیل لەقەڵەمدانی هەموو چێژەکانە. کاتێك لێیان پرسی کە بە چ ڕێگەیەك باشتر دەتوانین بەسەر دوژمندا زاڵبین وەڵامی داوە: "بە ڕەفتارێکی دۆستانە چونکە خۆتان دەزانن کە دۆستایەتیدرمە." لەژێر ئەم جلە شڕ و لە پشت ئەم زمانە تەنزایە، یەکێ لە گەرمترین و پڕخۆشەویستیترین دڵەکانی دونیای کۆن شاردراوەتەوە.

ـ ٤ ـ

دیۆجێنیس بە هەمان ڕادە کە لەگەڵ گێلایەتی و بلحیدا سەرسەختی دەنواند، بەرامبەر بەگێل و نەزان هەستی بە دلۆڤانی و میهرەبانی دەکرد. ئەو دەیەویست کە مرۆڤەکان لەڕێگەی وەدەست خستنی بالآیی و زانستدا بە خۆشبەختی و کامەرانی بگەن و بڕوای وابوو کە ئەو ژیانەی حیکمەت و زانست ڕێنماییکەری بن" ئاسایش و ئازادی وسادەیی لەگەڵ خۆی دێنێت.

ئاسایش ـ مەبەستی لە ئاسایش ئەوە بوو کە "خۆت لە پێشتر ئامادە بکە تا سووکتر هەست بە لێدانەکانی چارەنووس بکەی"و دەیگوت هەرچەند کەمتر لە دونیا چاوەڕێ بکەی، کەمتر گیرۆدەی نائومێدی دەبێ و هەرچەند کەمتر سامان پاشەکەوت کەی کەمتر لەدەستی دەدەی. پۆرگی (porgy) خولیای دیۆجێنیس بۆ ئەم تایبەتمەندییە ئەوها وسف دەکات: "من لە هیچەوە بڕێکی زۆرم بەدەستهێناوە و هەر ئەم هیچەش بۆ من زیادە.". ئاسایش بەهۆی ماڵ و سامانێکی زۆروزەوەند بەرهەم ناهێت بەڵکو بەوە بەرهەم دێت کە بەشتێکیکەم قایل بین. داوای کەمتر بکە تا ئومێدی گەیشتن پێی زۆرتربێت. داوای زۆربوون بکەن تا هەستی تێنوێتی تۆ هەرگیز کز نەبێت. لەم جۆرە فیکرەدا، دیۆجێنیس لەگەڵ نووسەرانی پەرتووکی چاخی دێرین هاوڕایە: "ئەوەی کە بە بڕێکی کەم قایلە زیاتر لە هەمووان هەیەتی." قایلیو ڕەزامەندی نێزیکترین ڕێگەن بۆ گەیشتن بە ئاسایش. زیادەخوازی و چاوبرسێتی ڕێگەی درێژ و پڕ ڕەنجن کە کۆتاییان نییە. سەوزەی باخی هاوسێ لەو دیوی پەرژین سەوزتر دەنوێنێت بەڵام کاتێك لێی



نزیك دەبیتەوە ئەو هەروەك سەوزەی باخەکەی خۆت بە بێ تەڕوتازەیی دەبینی و دیسان سەوزەکانی دوورتر پاراوتر دێنە بەرچاو و بۆ لای خۆیان ڕاتدەکێشن.

هەمیشە لە پەشوکاوی و برسێتی و ترسدا ژیان دەکەی و هیچ جۆرە نیشانەیەکی شادومانی و ئاسوودەییێت لا نابێت."لەو ڕووەوە، دەبێت ڕابردوو لەبیر بکرێت و خۆ لەگەڵ ئەوەی کە هەیە بگونجێنرێت. هەرکاتێك بە ڕوویەکی کراوەوە ڕووبەڕووی دژوارییەکان ببینەوە دەتوانین لەناو دنیای پڕلەئاشووبدا لە ئەمن و ئەماندا بین و بەسەلامەتیدەربچین" ئازادی لەم بارەدا لەو ڕەنجانە ڕزگارت دەبێت کە خۆت بۆ خۆت هێناوتە ئاراوە.

دیۆجێنیس دەڵێت: تەواوی ڕەنجەکان سەرچاوەی ڕوحی و دەروونییان هەیە. بە واتایەکیتر، ئەوە پێشهاتەی نەخۆش نییە کە دەترەنجێنێت. بەڵکو هۆی سەرەکی هەستی بەزەیی و دڵسۆزییە بەرامبەر بە خۆت. کاتێك خۆشەویستەکەی خۆت لەدەست دەدەی خەم و ڕەنجی تۆ لە بەر خاتری ئەو نییە. بەڵکو بۆ خۆت دەردەداری. ئەو تۆی لەدەست نەداوە بەڵکو تۆ ئەوت لەدەست داوە. کەواتە ئەگەر ترس و خۆف بخەیتە لایەکەوە بەئاسانی دەتوانی خۆت لەگۆڕانەکانی چارەنووس و هەوراز و نشێوی قەدەر ڕزگار بکەی. مەبە بە کۆیلە و دیلی نیگەرانییەکانی ئایندە و خەمەکانی ڕابردووی خۆت. ئەوەی بووە، بووە و ئەوەش کە دەبێت ببێت، دەبێت. لەبەرامبەر چارنووس و خەڵك، سەربەخۆیی و ئازادی خۆت بپارێزە.

ڕۆژێکیان ئەسکەندەری گەورە چووە سەرەدانی دیۆجێنیس کە لەژێر هەتاودا ڕاکشابوو و گفتگۆیەکی سەرنجڕاکێش لەنێوان ئەو دوو فاتحە گەورەیە یەکێکیان فاتحێك بوو کە بەشوێن داگیرکردنی دونیایی بوو و ئەویتر بە تەمابوو بەسەر گیانیخۆیدا زاڵبێت ـ دا ڕوویدا.

دیۆجێنیس: ئەی سەرداری گەورە، گەورەترین ئارەزووی تۆ ئێستاکە چییە؟

ئەسکەندەر: یۆنان بخەمە ژێر کۆنترۆڵمەوە.

دیۆجێنیس: دوای ئەمە؟

ئەسکەندەر: ئاسیای بچوك داگیربکەم.

دیۆجێنیس:ئەی پاشان؟





ئەسکەندەر:دەسەڵاٚت بەسەر دونیادا بسەپێنم.

دیۆجێنیس: ئەی دوای ئەمە؟

ئەسکەندەر: پشو بدەم و چێژ وەربگرم.

دیۆجێنیس: بۆچی هەرئێستاکە پشونادەی و چێژ وەرناگری؟!

دەڵێن ئەسکەندەر سوپاسی ئەو ئامۆژگارییەی دیۆجێنیسی کردو لێی پرسی:ـ

ئایا هیچ خزمەتێکم لەدەست دێت کە دەرحەق بە تۆ بکەم؟ـ

بەڵی. تکا دەکەم سێبەرەکەتم، لەکۆڵ بکەرەوە کە بووەتە بەربەستێك لەنێوان من و رووناکی خۆر!

ئەسکەندەر بەوقسەیە کەوتە پێکەنین و وتی: ئەگەر من ئەسکەندەر نەبووما حەزم دەکرد دیۆجێنیس بم نەك کەسێکیتر. دیۆجێنیس بێدواکەوتن وەلاٚمی داوە:

ئەگەرمن دیۆجێنیس نەبووما حەزم دەکرد هەر کەسێکیتر بووما‌یە جگە لە ئەسکەندەر!

لە دڵی دیۆجێنیسدا ترس و سام جێیان نەدەبووە. چونکە هیچ شتێکی نەبوو تا ترسی لەناوچوونی هەبێت ـ جگە لەژیانیـ و لەو بارەیەوە دەیگۆت:"ژیانی من لەرۆژی لەدایکبوونمەوە ناسەقامگیر و خۆنەگر بووە. کەواتە فەرقی چییە قەرزەکەی خۆم ئەمڕۆ بدەم یان سبەی؟"

هەستی دڵنیایی و بێبەریبوونە لەترس و پەشۆکاوی ئایندەکە ئازادییەکی تەواوی بە دیۆجێنیس بەخشیوە.

"پیاوی ژیر بایەخ بەماڵ و سامانی دونیایی نادات و بە وەرگرتنی سیفەتەکانی وەك بالاٚیی، رەزامەندی، پابەندبوون بە رێورسم و یاسا حاکمەکان و وەرگرتنی هەر رەنگێك دڵنیایە."

هەروەك یەکێ لە نووسەرە هاوچەرخەکانی دیۆجێنیس، لەبارەی شەرحی حالی ئەوەوە نووسیویەتی:ـ تەنانەت سوکراتیش بۆ رایە ناعادیلانەکەی دادگای ئەسینا سەری دانەواند و وتی: "من گوێ رایەڵی یاسادەکەم و بەحەزەوە بەرەو مەرگ دەچم." هەرئەم خۆ بە دەستەوەدان



بە یاسا حاکمەکان لەبڕی یاسا ئەزەلییە خواوەندییەکان خۆی جۆرە کۆیلایەتی و دیلێتییەکە بەڵام دیۆجێنیس بەپێچەوانەی خەڵکی ئاسایی، وتاردەر، دەریاوان و سەردار و پاشاو تەنانەت سوکراتیش ئازادییەکی تەواوی هەبوو. چونکە هەموو ئەوانەی بەکۆیلە و دیلی شەهوەت و ماڵ و سامانی خۆیان دەبینی لە کاتێکدا کەخۆی لە هەموو ئەم دڵبەندییانە ئازاد و ئاسوودە بوو. هەنگاوێکی سەرووتری، نابوو و ببوو بە ئاغای تەواوی خۆی. بەبڕوای ئەو ئەم بەسەرخۆدا زاڵبوونە تاکە ئازادییەکی قابیلیبایەخ ونرخ بوو.

سادەیی:- دیۆجێنیس لەو بڕوایەدا بوو کە نزیکترین رێگەی گەیشتن بە شادمانی و خۆشبەختی، رێگە سادەکەی ئاسایش و ئازادییە- ئاسایش کە بەرهەمی قەناعەت و رەزامەندییە و ئازادی کە بە تێهەڵدانی گشت دڵبەندییەکان دەستدەکەوێت. دیۆجێنیس تەنها بە فێرکردنی بنگەهەکانی فەلسەفەکەی خۆی رانەدەوەستا بەڵکو ئەوانی بەژیانی رۆژانەی خۆی پێشاندەدا و دەیگۆت: خۆشبەختی و شادومانی، وەدەست خستنی ئارەزووەکانەو هەرچەند. ئەم ئارەزووانە سادەترو ئاسانتر بن ئومێدی گەیشتن پێیان زیاترە.

هەبوونی ژیانێکی سادە نەك تەنیا لەڕووی جەستەییەوە بەڵکو لەڕووی دەروونیشەوە سوودبەخشە چونکە ئەو توانایییەت دەست دەکەوێت کە بەهۆی حەقیقەت و دادەوە رووبەڕووی دونیا ببیەوە. "بۆ درۆ بکەم بۆ ئەوەی پارە دەستبخەم؟ بە پیاهەڵگوتن و سەنگلێنان هەڵسم تا شکۆو گەورەییم دەستکەوێت؟ من پێویستیم بەو سکە ساختەیە نییە."

بەم جۆرە دیۆجێنیس لە شەقامەکانی ئەسینادا بەرێدەکەوت و دەستی دەرۆزەیی لەبەر ئەم وئەو پان دەکردەوە، بە هێزەکانی بەقسەی بریندارکەر ئازار دەدا و بە گوتنی حەقیقەت رۆژگاری بەسەر دەبرد.

رۆژێکیان بە تۆمەتی تێکدانی ئارامی و ئاشتی توش بوو. دادوەر لێی پرسی تۆ کێی؟

سیخوڕ.....

وەلاٚمە سەرسوڕهێنەرەکەی خۆی بەم شێوەیە روون کردەوە:

من لە بارەی گەوجی و چەوتییەکانی دونیا سیخوڕی دەکەم.

هەندێك جار بەنیوەڕۆ چرا بەدەست لەدەوری شار دەگەڕاو دەیگوت: لەدێو و درنج بێزارم و ئارەزووی بینینی مرۆڤ دەکەم!

زۆربەی جار برسیبوو بەلاَم لەگەڵ ئەمەشدا هەر بەپێکەنین ڕووبەڕوو دەبۆوە و دەیگوت: "سەگ و فەیلەسووفەکان گەورەترین چاکە ئەنجامدەدەن و بچوکترین پاداشت وەردەگرن."

کاتێك ئەویان بینی کە بەرە و پەیکەرێك دەستی دەروزەیی درێژکردووە کەسێك لێی پرسی مانای ئەم کارە چییە و دیۆجێنیس وەلاَمی داوە:"پڕۆڤە دەکەم کە چۆن ڕووبەڕووی دڵەبەدینەکان ببمەوە."!

ئەم سادەیی و ژیانە بێڕەونەقە خۆ دەرخستن نەبوو. بەڵکو بە قسەی ئەپیکتێتۆس شێوازی زانستی پیاوێك بوو کە"لەو پەڕی دلۆڤانیو خۆڕاگریدا باری هەژاریو دەستکورتی بە ڕوویەکی کراوە لەبەرخاتری بەرژەوەندی گشتی لەکۆڵنا."

دیۆجێنیس لەو باوەڕەدا بوو کە: ئاسوودەیی و ئارامییەکی لە رادەبەدەر گەورەترین نەفرەتە. لە ئەفسانە کۆنەکانی یۆناندا هاتووە کە خواوەند (پرومتە)ی تەمیٚ کرد چونکە ئاگری بۆ مرۆڤ هێناو ئەم تەمیٚ کردنە بە پێی عەدالەت بوو. چونکە ئاگر ژیانێکی رازاوە و تەمبەڵی و بەدبەختیەکانی تری ژیانی شارستانی بە شوێن خۆیدا هێنا. کاتێك کەسێك بەپێچەوانەی رای ئەو دەیگوت کە مرۆڤ بەپێچەوانەی گیانلەبەرانی دڕندە "لاواز و ڕووت بوو و پێویستی بە گەرمای دەستکرد هەبوو" وەلاَمیدەداوە: "بۆق هەرچەندە لەشی مووی کەمترە لە هی مرۆڤ بەلاَم دەتوانێت بە ئاسانی لەساردترین ئاودا بژیت."و ئەوەشی دەخستەسەر کە هەموو ئەمانە بە خۆوە بەندن.

دیۆجێنسیش وەکو دیۆجێنیسە ئەمریکاییەکەی سەدەی نۆزدەهەم، هێنری تۆر و (Henry Thoreau) لە کاری دژوارەوە گەیشتە ئەم گیانە سەختە. ئێپکیتێۆس وتوویەتی: "ئەم سینیکە نەفس چاکە، لەوپەڕی فشاری هەژاری و دەستکورتیدا خۆی بەخۆشحاڵترین کەس دەبینی." هەژاران خۆشبەختن چونکە جیهانیان بۆ بە ویراسی دەمێنێتەوە.

یەکێك لەو حیکایەتانەی کە لە زمانی دیۆجێنیسەوە دەگێڕنەوە لە وێکچووندا هێندە لە یەکێك لە تەمسیلەکانی ئینجیل دوورنییە: "ئەو خەلاَتانەی کە بە منیان دەدا هەڵم دەسەنگاندن،





هەرکاتێك هی ئەوانە بووایە، کە سوودیان لە ڕێنماییەکانی من دەکرد، وەرمدەگرتن، بەپێچەوانەوە ڕەفزم دەکردنەوە چونکە ئەوەم بەڕەوا نەدەبینی خەلاَتێك لەکەسێك قبوولبکەم کە هیچ شتێکیلە من وەرنەگرتووە... لەگەڵ کەس نەدەبوومە هاوخوان مەگەر ئەوەی داخوازی خزمەتی لیٚ بکردمایە وەکو پەیامنێری ئاشتی و ئارامی... "ڕۆژێکیان چوومە ماڵی لاوێکی دەوڵەمەند و لە ژوورێکدا پەزیراییم لێکرا کە هەموو دیوارەکانی بەو وێنانە داپۆشرابوون کە وا لە چوارچێوی زێڕین گیرابوون. سەروسەکوتێکی وام بۆ خۆ دروستکرد کە بەباشی دەریدەخست کە بۆ خەڵکی ئەم ماڵە و کەلوپەلە گرانبەهاکانی هیچ ڕێز و نرخێکم نییە... لاوەکە وتی ڕەفتارەکەتان وا دەنوێنێت کە من بەمرۆڤێکی ڕەزیل و نەزانی پەتی دەبینی بەلاَم پێشانت دەدەم کە منیش لە ئێوەمە. لەڕاستیدا ڕۆژی دواتر هەموو ماڵی خۆی بۆ خێزانەکەی بەجیٚ هێشت. عەبای خۆی تاکرد و کۆڵەپشتەیەکی لەکۆڵ کرد و بەشوێن من کەوت."

- ٥ -

بەم شێوەیە دیۆجێنیس هەوادارانی خۆی لە خۆ کۆدەکردەوە. فەلسەفەی کسۆکی لە سەرتادا هەرجۆرە پەیوەندییەکی خزمایەتی ڕەفز دەکردەوە. خۆدی دیۆجێنیس نەژنی هەبوو نە منالّ، دەیگۆت:"سینیکێکی ڕاستیخزمی هەموو خەڵکە. هەموو پیاوان بە کوڕو ژنەکانیش بە خوشکەکانی خۆی دەزانێت. ئەو خزمەتکاری خوایە کە باوکی هەمووانە!"

تەنیا خزمەتکاری خواوەند نەك کەسێکیتر. ڕۆژێك لەکاتی گەڕۆکیدا بووە دیلی دزانی دەریایی. کاتێك ئەویان بۆ بازاڕی کۆیلەفرۆشان برد و کەسێك بۆ کڕینی هات ئەو ڕووی لە کڕیارەکە کرد و گوتی: "ئەی نۆکەر وەرە ئاغایەك بکڕە!"

دەڵێن دزانی دەریایی هێندە بەو قسەیە کەیفیان هات کە قەیدیان لە پیٚ کردەوە و بۆ ماڵەوە بردیان. دیۆجێنیس ماوەیەك مامۆستایان بوو و ئاشکرای دەکرد: "بۆ من چ جیاوازییەکی هەیە مامۆستای ڕێگرانی دەریایی بم یان دزانی کۆمەلاَیەتی" سەرەنجام لە بەرامبەر زانستەکەی ئازادەییەکەیان پیٚبەخشی.

دیۆجێنیس بۆ ئەسینا گەڕاوە و چەندین ساڵ کەوتە سکەلێدان (سکەی نویٚ)ی فەلسەفەی سینیکی. وا دیار بوو کە بای سەرسەخت و هەوای تورە لەگەڵ بوونی ئەودا سازگاران چونکە هەشتاو نۆ ساڵ ژیا.

دەڵێن دیۆجێنیس لە هەمان ئەو ساڵەدا ماڵئاوایی لە جیهان کرد کە ئەسکەندەر تیایدا کۆچی دوایی کرد. لە ئەفسانەدا هاتووە کە دیۆجێنیس و ئەسکەندەر لەکاتی دەربازبوون لەڕووباری ستیکس (styx)دا پێك گەیشتن.

دوای سلاوکردن ئەسکەندەر گوتی:"باشە ئێمە دیسان بەیەك گەیشتین... دوو دانە فاتح و خولاٌم."

دیۆجێنیس وەلامی داوە: "بەلێ ئێمە پێك گەیشتینەوە. دیۆجێنیسی فاتح و ئەسکەندەری نۆکەر! تۆ نۆکەری شەهوەتەکانی خۆت بووی و منیش ئاغای خۆم بووم."

لە کۆتایشدا کاتێك بۆ رێگەی نەمری هەنگاویان نا ئەمە دیۆجێنیس بوو کە رێگەی دەبڕی نەك ئەسکەندەر.







# ئۆپیکۆر (٣٤٢ ـ ٢٠٧ پ.ز)

## فەیلەسووفی چێژخوازی

رێمی دو گورون (Remy de Gourmon)ی نووسەری فەرەنسی دەڵێت: "چێژخوازی هونەرێکی دڵگیرە کە تەنیا ژمارەیەکی کەم لێی ئاگادارن". ئامانجی تویژینەوە فەلسەفییەکەی ئۆپیکۆر ئەوە بوو کە ئەو هونەرە دڵگیرە بخاتە بەردەستی هەموو تاکەکانی مرۆڤ.

ئۆپیکۆر لەو بڕوایەدا بوو کە بەهەشت لە زەوی دایە نەك لە ئاسمان لەو رووەوە هێزی بیرکردنەوەی مرۆڤی لەرێگەی دۆزینەوەی ئەم بەهەشتەی سەر زەوی خستە گەڕ. ئەو فەیلەسووفێکی خوانەناسە کە کۆمەڵێك لە نووسەرە مەسیحییەکان بە چاوی قەدیس سەیری دەکەن و لەرێزی مرۆڤە پاکەکان دایدەنێن و هەندێکیتریش هەنە کە بە شەیتانێکی بێ کەلك و خۆشگوزەران دەزانن و سیفەتی ئۆپیکۆری بەو هۆیەوە لە زمانە ئەوروپاییەکاندا هاوواتای سۆزیارو شەهوەتپەرست. باوکە پێشینەکانی کڵێسا فەلسەفەی ئۆپیکۆر وەکو "داوەتکردن بۆگلاۆی و ناپاکی" مەحکووم دەکەن. لە ناو لەخواترسەکانی یەهودیشدا ئۆپیکۆری بەواتای خوانەناس و بێقیمەت و پەست و گاڵتەباز و گاڵتەجاربوو. تەنانەت لە ناو زۆر لە هەوادارانی ئەویشدا ئەمرۆکە ئەو کەسانە هەن کە چێژی پەتی و ناسکی ئۆپیکۆر لەگەڵ چێژە جەستەییەکانی جیهانی ماددی تێکەڵکردووە.

ئەو پیاوە کێیە کە هێندە هەواداری هەیە و کەمتر لە ئۆپیکۆرەکان بەشوێن خۆشگوزەرانی و چێژە جەستەییەکاندا بوو و هێشتا فەلسەفەکەی بەباشی دەرك نەکراوە؟





ئۆپیکۆر لە رۆژگارێکدا چاوی بە دونیا هەڵێنا کە نەوەی سەردەمی ئەو وەکو نەوەی هاوچەرخ، کەوتبووە سەرنشێوی کەوتنەخوارەوەیەکی دەردناك و پلەپەرستی ئەسکەندەر دونیای راکێشابووە ناو دەریای خوێن. لە ئەنجامی شەڕ و خوێنرێژییەکانی ئەسکەندەرەوە، ئەم پیاوە لاوە بەدژواری دڵی بە ژیانەوە بەستبوو. رێك وەکو نەوەی لاوی هاوچەرخ کە دوای دوو جەنگی جیهانی شەیداو و ئۆقر لێبڕاوی ژیان و چێژەکا نینە.

قوتابخانە فەلسەفییەکان بۆ دوایین رادەی بێ ئەلهایی و نائومێدی نائەوێدی دابەزیبوون. گومانکەرەکان لەبارەی خواکان و نرخەکانی ژیان هەندێ مەسەلەیان دەخستەڕوو. سینیکەکانی رەگی هەرجۆرە پلەپەرستی و دڵبەندییە مرۆڤییەکانیان وشك کردبوو و ئەویان بە نەخشێکی بێئاو و رەنگ وەسف دەکرد کە دوای پەرتەوازە بوونی هەورەکان و لەناوچوونی پەلکەزێڕینە لە زەیندا بەجێ دەمێنێت. گرووپی رەشبینەکان هەنگاوێك زوورتر رویشتبوون ودەیانگوت ژیان، تەنانەت لە ساتەکانی خۆشی و خۆشبەختیدا، خەوێکی تاڵ و ناخۆشە و چەند باشترە کە زنجیرەی ئەم خەوە پەرێشانە زووتر لێك راپسکێت و لەناو بچێت.

یەکێك لەو فەیلەسووفە رەشبینانە بەناوی هێجێزیاس (Hegesias) هەموو ژیانی خۆی لەو رێگەیەدا سەرف کردبوو تا قوتابیانی خۆی فێربکات کە باشترین کار بۆ لاوان خۆکوژییە و ئەوەی سەرنجراکێش بێت ئەویە کە خۆی لەتەمەنی هەشتاساڵیدا بە مەرگی سروشتیمرد! کاتێك لێیان پرسی کە بۆچی خۆی کار بەو شتە ناکات کە دەڵێتەوە، وەلامیداوە کە ئەودەبێت زیندوو بمێنێت و ئەوانیتر فێربکات کە مەرگ چەندە چێژبەخشە!

بە پێچەوانەی ئەم گرووپە کە ژیانیان بە یەکجاری نەفیدەکرد، گرووپێکیتری فەیلەسووفان هەبوو کە بە چێژگەڕاکان ناوبراون.

ئەمانە ژیان قبووڵدەکەن و بە نەشئەیەکی مەستیهێنەر دەزانن کە بەهۆی ئازادی لە بەهرەمەند بوون لە چێژەکانی ژیان دێتە بەرهەم و دروشمیان ئەمە بوو کە بخۆ، بخۆرەوە و خۆش بە. رنگە سبەی ئەسکەندەرێکیتر سەر هەڵبنرێت و بڵێت بمرە!





له رۆژگارێكی ئەوها پەشۆكاودا بوو كە ئۆپیكۆر ساڵە سەرەتاییەكانی تەمەنی بەسەر دەبرد. نێردراوانی دەرد و رەنج و رێبەرانی چێژ و شادی تێدەكۆشان تا رێنمایی خەڵك بكەن كە چۆن خۆیان لەگەڵ ئەو دونیایەدا بگونجێنن كە كەس سەری لێ دەرنەدەچوو.

فیكرەكانی لاوان كە نە بە هۆی كوشتارەكانی ئەسكەندەر لە ئەشكەنجە و ئازاردابوون و نە سام و ترسێكیان لە شەڕەكانی ئایندە هەبوو، لەژێر پێی ئەو كۆمەڵەیەدا تۆپئاسا بۆ ئەملاوئەولا تور هەڵدەدران كە ژیانی رەبەنایەتییان گرتبوو بەرخۆ و شاپیان لە هەموو دڵبەندییەكانی ژیان هەڵدابوو، هەروەها لەژێر پێی هەندێكیتریش كە شەوق و زەوقێكی شێتانەیان لە بەدەستهێنانی چێژەكاندا هەبوو. شێوازی مرۆڤدۆستی، بێئەوەی ئایین و مەزهەبێك لەئارادابن، رەونەقی گرتبوو چونكە خوا كۆنەكان فریویان دابوون و خوا تازەكانیش كە شایانی ستایش بن هێشتا لە جیاتی ئەوان پالیان نەدابووە.

ئۆپیكۆر وەكو هەر لاوێكی بیریاری سەردەمی خۆی، بڕیاریدا كە دونیای تەم و مژاویی تار رووناك بكاتەوە و ئاسمانەكان پڕ لە خوانوێكان بكەن ئەو لە ولاتێكدا بەو كارە هەستا كە جگە لە پەشۆكاوییە گەورەكانی سەردەمی ئەسكەندەر، پەشۆكاوی و بێ سەروبەرییەكی زۆری تری هەبوو.

ئۆپیكۆر لەشاری سامۆس (samos)ی یەكێ لە دورگە یۆنانییەكانی دەریای ئیجە هاتەتۆتە دونیاوە. باوكی مامۆستای قوتابخانە بوو و دایكی. پزیشكێكی درۆیین بووكە بانگەشەی ئەوەی دەكرد كە وا خەڵك بە یارمەتی تەسلیم وجادوو دەرمان دەكات. بەم شێوەیە ئۆپیكۆر هەر لەسەردەمی منداڵیەوە خۆی لەنێوان دوو جەمسەری دژبەیەكی نیزامە عەقلانییەكان و خورافاتە ئایینییەكاندا بە گرفتاری بینی. گرنگتر لە هەموو شتێك ئەوەبوو كە ئۆپیكۆر لەگەڵ سەرگەردانییەكی لەوەسف نەهاتووی شەڕدا گەورەبوو و لەكاتی مەرگی ئەسكەندەردا (٤٢٣ پ.ز) تەمەنی تەنیا هەژدەساڵ بوو.

له كۆچبەرییەكدا كە بەهۆی* سەركەوتنەكانی ئەسكەندەرەوە روویدا، ئۆپیكۆر لەگەڵ دایكوباوك و سێ براكەی لەشاری سامۆس هاتە دەرەوە، و بووبە پەنابەرێكی سەرگەردان كە

* فتوحات، ولاتگیری





له ولاتێكەوە بۆ ولاتێكی دەربەدەر بوو تا سەرەنجام ئەستێرەی خۆشبەختییەكەی لە ئەسینا دەرەوشاوە. لەوێ خانوویەكی بچوك و باخێكی كڕی و داوای لە هاوڕێیانی كرد تا لەگەڵ ئەو لە یەك شوێندا بژین تا پێشانیان بدات كە چۆن دەكرێ لە دونیای پڕ لە ئاشووب و شەڕو كێشمانەكێشدا، لە ئاشتی و ئارامیدابژی. بە تێپەڕبوونی كات ئەنجوومەنی برایەتییەكەی فراوان دەبوو و هەریەكێك لە ئەندامەكان تێدەكۆشا تا بەپێی توانا لە بودجەی گشتیدا بەشدار بێت. ئەمە یەكێك لە هەوڵە یەكەمینەكانە كە بە رێگەی دروستكردنی ژیانی هەرەوزی و هاوبەشایەتیدا لە جیهاندا ئەنجامدراوە. ئەم كۆمەڵەیە بەرەبەرە مولكەكەی فراوانكرد تارادەیەك كە"باخی ئۆپیكۆر" ناوبانگێكی بەجێی وەرگرت. ئەم باخە كەتیایدا كۆمەڵێك وەكو یەك خێزان كۆ ببونەوە، لە دوورگەیەكی ئارامیبەخش دەكرد كە لە زریانەكانی ژیان بە دوورمابێت. دوژمنانی ئۆپیكۆر كەوتنە بە خراپە باسكردنی ئەنجوومەنی براكانی ئەو و لەرووی سەرسەختی و گاڵتەوە بە "كۆمەڵیخراپكاران" یان ناو دەبرد و سەبارەت بە كات بەسەربردنی ئەو هاوڕێیانەی چەندین چیرۆكیان دەگێڕاوە. بەلاّم ئەم چیرۆكانە لە حەقیقەت بێبەریبوون و زۆربەی ئەندامانی ئەنجومەنی براكان، خەڵكانی میانەڕەو و لەخواترس (دوورەپەرێز) بوون و ژیانێكی بێسەررەقی و سادە و فیكرێكی بەرزیان هەبوو و بە دوور لە ئیرەیی و نەفرەت، هاوكاری یەكتریان دەكرد. ئۆپیكۆر فێریانیدەكرد: "ئەو چاكەیەی كە بۆ ئەویتر بە رەوا دەبینی بۆخۆت دەگەڕێتەوە... ئەو خزمەتەی كە ئەمڕۆ بە هاوسێكەت دەكەی هەر سبەی بە تۆ دەگات."

بەلاّم ئامانجی گشتی ئەم ئەنجومەنەی برایەتی، تێگەیشتنی شادیو چێژبوو و هەر ئەم ووشەیەی چێژبوو كە ناوی ئۆپیكۆری بە بەدناوی و شەهوەتبازی برد. خەڵكی جیهان لەنێوان چێژی كاتی و حەزی جەستەیی لەگەڵ شادی بەردەوام و خۆشبەختی مەعنەوی جیاوازیان نەدەكرد و جیاكاری نێوان ئەم دووانەیە كە بنچینەی مەغزای فەلسەفەی ئۆپیكۆر پێكدێنێت. با ئەم فەلسەفەیە هەندێك لە نزیكەوە بخەینە بەر لێكۆڵینەوە.

- ٣ -

ئۆپیكۆر یەكێك لەسەركەشە دەروونییەكانە كە لە بری ئەوەی خەونەكانی خۆی تەعبیر بكات و بخاتە قۆناغی جێبەجێكردنەوە، كردارەكانی خۆی لە خەودا دەبینێ.

به برِوای ئەو زۆربەی کێشەکانمان لە چالاکی بێئامانجەوە پەیدا دەبن. لەتیاترۆی ژیاندا باشتر وایە کە تەماشاکەر بین نە یاریکەر (ئەکتەر) فێرببین زەردەخەنە بۆ دەرد و ئازارەکانی خۆمان بکەین. هەوڵبدەین هەموو ناڕاحەتییە دەروونییەکان سووك بکەینەوە.

بەم شێوە دەبینین کە چێژخوازی و خۆشبەختی لە فەلسەفەی ئۆپیکۆردا دەگۆڕێت بۆ هەڵهاتن لە دونیا و بە فشە وەرگرتنی رەنج و دەردەکانی. بە برِوای ئەو لە دونیادا گەندەڵی لە باشی زیاترە و خراپەش لە چاکە پترە. نەوەی مرۆڤی لەگەڵ رنجوخەم سازگارترە وەك لەگەڵ شادی و خۆشحاڵی. دەروچکەکانی لەشمان بە رووی دەردوخەمدا کراوەترن وەك بە رووی خۆشگوزەرانیدا.

سووتانەوەیەك کە بەهۆی ئازارەوە پەیدادەبێت کاریگەرییەکەی قووڵترە لەو خۆشیەی کە لە ئاوازی شادی و شاگەشکەییەوە پەیدادەبێت. کەوابوو ئەرکی ئێمە ئەوەیە کە هاوسەنگییەك بێنینە کایەوە، لە توندییەکەی کەم بکەینە ئەمەیان هاوسەنگ بکەین. ئۆپیکۆر ئەم هاوسەنگیەی بەوشەی ئاتارسیا (Ataraxia) دەردەبڕی کە دەتوانرێ بە ئەرخەیانی و ئاسوودەیی تەرجوەومە بکرێت: "لێگەڕێ با گیانەکەت، وەکو گوڵ شەنەکەمان، لەشێوەی دورگەیەکی ئاسوودەیی و ئاشتیدا بێت لە ناو ژیانە زریانا و بیەکەتدا." ئەمەیە ئامانجی کۆتایی فەلسەفەی ئۆپیکۆر کەتیایدا گوڵشەنی کەیف و خۆشگوزەرانی بەرگی کرداری لەبەرکردبوو و والت ویتمەن(walt Whitman) لە یەکێك لە هۆنراوەکانیدا باش وەسفیدەکات:

"ئاغای هەمووانم و زاڵم بەسەرخۆمدا لەناو کاروباری بێواتاو ناماقوڵدا، ئەرخەیان و ئارام لە ناو سروشتدا راوەستاوەم. پیشە و هەژاری و ناوچاکی و ریسوایی و کەم وکوڕییەکانی خۆم، لەوەی بە هزرەمدا دێت، بێبایەختر دەزانم. لە هەرکوێیەك بم، لە رووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ پێشهاتە خۆش و نەخۆشەکاندا و لەبەرامبەر شەوی تار، زریانەکان، برسێتی، قەشمەری و گاڵتەپێکردن، رووداوە نەخۆشەکان و بێمورادییەکان وەکو گیانەوەر و بەرد و دار خۆڕاگر دەمێنم و هاوسەنگی خۆم دەپارێزم."

رەنگە ئۆپیکۆر بەرامبەر ئەم هۆنراوەیە کە کورتە و پوختەی بیرورا فەلسەفییەکانی ئەو دەردەبرێت، نارەزاییەکی هەبێت. چونکە ئەو دەیوت وەرن با بەهەستی ماقوولانەی مرۆڤی رووبەرووی ژیان ببینەوە نەك بە بێهەستی و بێشعوریی گیانەوەری یان رووەکی.





ئەم بیردۆزە ماقووڵە لەبارەی ژیان بۆمان ئاشکرادەکات کە شادی و چێژ، لەناوبردنی دەردوئازارە! "شادییەکەی ئەمڕۆ لە یادەوەریی رنجەکەی دوێنێدا حەشاردراوە." بەستنی ئەمن بۆ کەسێك چێژبەخش و شادی هێنەرە کە هەر ئەوکات لە زریانێکی ترسناك ژیانی رزگاربووبێت. بەم جۆرە دەبینین کە باغی ئۆپیکۆر لەڕاستیدا لەگیان و رۆح دایە نەك لە جیهانی ماددی.

لەم باغەی ئۆپیکۆر وێنەیەکی رووناك و زیندوومان لەناو مەنزەمە بەناوبانگەکەی لۆکرێتیوس* بەناوی "لە سروشتیشتەکاندا" رەنگی داوەتەوە. فەلسەفەی ئۆپیکۆر کە بونیادی بنەڕەتی ئەم هۆنراوەیەیە، لە زاری (** جۆرج سانتایانا)وە ئەوها وەسف دەکرێت:

"رەنگە بەرزترین فیکر بێت کە هەتا ئێستا خۆی بە مێشکی مرۆڤدا کردووە" ئەم فیکرە کە بەوپەڕی کوتیەوە هاتە دەربڕین هەڵهاتنێکی فەلسەفیانەیە لە دەردە و رەنجەوە بەرەو رزگاربوون لە ترس و سەراسیمەیی کۆتایی ژیان لەرێگەی رامان لە سروشتەوە.

زۆربەی دەردەکان، بەتایبەت ئەگەر توند بێت، ماوەکەی کورتە. ئەگەریش ماوەکەی درێژ بێت دەتوانرێ بە بەکارهێنانی رێکوپێکی دەروونی کورت بکرێتەوە. دەبێت لەبیرمان بێت کە هەرجۆرە خەم و رەنجێك، هەرچەندێك تاڵ و ناخۆش بێت، خەوێکی شرینی بەدواوەیە. دەتوانرێ یەکبینە بەهۆی خۆ لادان، لە زۆربەی بەلاو زەحمەتییەکان بە دوور بێت نابێت. هێزی خۆمان لە خەباتکردن دژی شەپۆل و بایەکاندا بفەوتێنین. بەڵکو گەلێك ژیرانەترە کە لە پەنایەکی ئەمندا لەرۆخی دەریاوە مرۆڤ سەیری کێشمانەکێش و تەقەلای ئەوانە بکات کە چەقیونەتە ناو دەمی زریانەوە. بەڵام نابێت تەماشاکەرێکی پەتی و بێ عیلاقەش بێت. بەڵکو دەبێت پەناگە ئەمنەکە بکرێت بە پەناگەی رزگاربووان و سەرۆی "ژیانێکی پڕ لە جوانی و ئارامی" یان پێبدرێت.

"ژیانێکی ئارام هەڵبژێرە. بە ئەندازە بخۆ و بخۆرەوە و لە قسەکردن لەگەڵ هاوڕێیە دەمبەخەندە و شادەکان بەهرە وەربگرە."، "ئەوە زۆر گرنگترە کە بزانی لەگەڵ چ کەسێك هاوخوان و

---

* Lucretius شاعیری گەورەی رومی (٩٨ ـ ٥٥ .پ.ز)

** Goarge Santayana فەیلەسوفی هاوچەرخی ئیسپانیایی (لەدایکبوی ١٨٦٣)

هاوپیاڵەی لەوەی کە چ دەخۆی و چ دەخۆیەوە." ئەم ژیانەزاهیدانە و هاوڕێیانەیە نە تەنها دەبێتە هۆی تەندروستی جەستە بەڵکو تەندروستی گیانیش دابیندەکات. چونکە "مەحاڵە بەبێ ژیانێکی ژیرانە و ڕووناك و تەواو شادومان بێ یان ژیرانە و تەواو و بە ئینسافدارییەوە بژی بێ ئەوەی شادومان بی."

بەم جۆرە ژیانی شادمانی ئۆپیکۆری بە تەنیا هەڵهاتنێکی خۆپەرەستانە نییە لە ژیان، بەڵکو تێکۆشانێکی هاوئاهەنگە بۆ کەمکردنەوەی(تا)ی جیهان و هێوربوونەوەی دەردەکانی. ئۆپیکۆر زۆربەی جار بەناوی "کۆمەڵی پیرۆزی ئێمە" گوزارشت لە قوتابخانەکەی خۆی کردووە و ئەندامێتی ئەم کۆمەڵگەیە واتای لە خۆبردوویی هاودەردییەکی پیرۆز و بەشدارییەکی بەردەوام لە شادیدا دەگەیەنێت.

بەلاّم ئۆپیکۆر لەوباوەڕەدایە کە" لەو شوێنەی کە ترس و سام سێبەری لێکردووە، جیگەی شادی نابێتەوە. کەواتە یەکەمین مەرجی ژیانێکی شادیبەخش بە لەناوبردنی (ترس لە مردن) دەزانێت. ڕێنماییە ئاینییەکانی ئەو ڕۆژگارە دەیان وت کە کۆتایی ژیان دەستپێکی دەرد و ڕەنجی حەقیقییە. بەلاّم بەبڕوای ئۆپیکۆر: بڕواداری بە سزادانی گیان دوای مەرگ، گەورەترین دوژمنداریی مرۆڤایەتییە. جیهانی ڕۆحەکان (تارماییەکان)، لە یۆنانی دێریندا، وەکو دوژەهی دانتی* (Dante) مۆتەکەیەکی ترسناك بوو.

ئەفسانەکانی فەرمانبەرە توندڕەو و میزاج توندەکان لە دۆژەهدا کە ئەمرۆ لەڕوانگەی خوێنەرانەوە لە ئەفسانەی پەریان دەچێت، لەسەردەمی ئۆپیکۆردا بریتیبوون لە پێشبینییە واقیعییەکانی ئەو ئەشکەنجە و ئازارەی کە چاوەڕێی مرۆڤی دەکرد. ئۆپیکۆر بۆ هەموو ئەوانەی کە لەو پێشبینیانە ڕەنجیان دەچێشت و لە (تاوتوێ) دابوون بانگەوازێکی کرد: "دڵتان خۆشکەن. هیچ ژیانێکیتر لە گۆڕێدا نییە. گیان دوای لەبەریەك هەڵوەشانەوەی لەش، ئیتر نابێتە دیلی ئەشکەنجەو ئازار. مەرگ کۆتایی مۆتەکەو ترس و ڕەنجەکانە." بەلاّم چ لەو ترس و سامە گەورەیە بکەین کە هێشتا ڕەگ و ریشەیەکی قووڵی لەناو دڵدا هەیە؟ ئایا وێناکردنی هەنووکەیی ئێمە لەبارەی لەناوچوونی ڕەها کە وەکو بیرێك دەمی داپێچرابۆوەو هەستەکەی

* Dante گەورە شاعیری ئیتالیایی (١٢٦٥ ـ ١٣٢١ ز)



جارانمان لەبارەی نغرۆ بوون لە "چڵکاوی نەبوون"دا خۆی لەخۆیدا گەورەترین هۆی پەشۆکاوی پەرێشانی ئێمە نییە؟

ئۆپکۆر دەڵێت، "هەرگیز، بۆچی لەبارەی لەشیکی بێگیان هەست بە پەرێشانی و پەشۆکاوی بکەین کە لە بنەڕەتدا هیچ هەست و دەرك کردنێکی نییە؟ ئایا لەو (نەبوون)ەی کە بەر لە دایك بوون هەبووتان هەست بەترسی و سام دەکەن؟

ژیان لەچاو خەوی هەتاهەتایی و ئەزەلی، خەونێکە کە تەنیا یەك سات دەخایەنێت و هەمیشە خەوی بێخەون لەو خەوە دڵگیرترە کە بە خەون پەشۆکاو بووە.

جگە لەمە تەنانەت درێژخایەنترین خەونەکان، بە بەراورد لەگەڵ زەمەندا، ساتێکی کورتخایەن پتر نییە، ئایا هیچ کاتێ ئەوت لێ ڕوودواە کە دوای چەند کاژێر خەوی ئاسوودە ئەو هەستەتان لا خولقابێت کە تەنیا بۆ یەك سات چاوت لێك ناوە؟ خەوی مەرگ، ئەو ساتەتێپەڕەی سڕی و بێهەستییە ـ چ شەوێك بێت و چ یەك ملیۆن ساڵ ـ لە ناو دەمی قایمی مەرگدا ئاگات لە بوونی خۆت نییە و ئەو شتەش کە ئاگات لێنەبێت بۆ تۆ بێ بایەخە. هیچ پەیوەندییەك لەنێوان ژیان و مەرگدا نییە. ئەی ئیتر داخ و خەم بۆچییە؟ کەواتە هەوڵبدە کە لە ژیان، کە وەکو ڕۆژی سەما زەوقهێنەر و شادیبەخشە و کەوتووتە مەودای نێوان دوو خەودا، سوودێکی کافی وەربگری. هەموو بوونەوەرێك لەڕاستیدا بریتییە لە سەمای سروشت. لە بۆشاییە کۆتایی نەهاتووەکەی سەمای گەردەکاندا. ئەم دەربڕینە بۆ یەکێ لە دڵبزوێنترین بەشەکانی فەلسەفەی ئۆپیکور ڕێبەریمان دەکات کە هەمان بیردۆزە ناسراوەکەی گەریلەیە و ئۆپیکۆر ئەوی لە زانای گەورەی یۆنانی، دیموکرات* قەرز کردووە.

بیردۆزی ماددی بوونی جیهان و ئەوەی کە هەموو بوونەوەر و ئەستێرە و هەسارەکان دەکەونەبەر ئەو گۆڕانکارییە بەردەوامانەی کە لە گەردیلەکاندا ڕوودەدەن، هەر ئەوەیە کە سنتیانا دێنێتە سەرزمان کاتێك کە فەلسەفەی ئۆپیکور وەکو گەورەترین قوتابخانەی فیکری لەمێژوودا ناودەبات. ئەی هۆی ئەم هەموو جۆراوجۆرێتی و شێوە جۆربەجۆرانە لەزەوی و ئاسمانادا لە بوونەوەربێ هەماژەکاندا چیە؟ بوون و لەناوچوونی ئەوەندە هەسارەوئەستێرە و

* Democritus فەیلەسوفی یۆنانی(سەدەی پێنجەمی بەرلەزایین)





هەوروتاڤگە وئۆقیانوس و گیانەوەر و مەل وماسی ومرۆڤ چ هۆیەکیان لەپشتەوەیە؟ بەبڕوای ئۆپیکور هەموو ئەم وەرچەرخانانە بەهۆی بەریەککەوتنی وردیلەکانی ئەتۆمەکانەوە دەبێت جوولەیەکی بەردەوام دان. ئەم ئەتۆمانە بچوکترین وردیلەی ماددین وله وشەی یۆنانی ئەتۆمۆس (Atomos)ەوە وەگێڕاوە کەبەمانای (بەشی لەدابەشبوون نەهاتوو) دێت. بەبڕوای ئۆپیکۆر، کە زانستی نوێش پشتگیری لێ دەکات، کائینات لە وردیلە لە ژمارە نەهاتووەکانی ئەتۆم دروستبووە کە ـ وەکو رووبار ـ یەکبینە لە بۆشاییەکی بێکۆتاییدا لە سوڕاندان. ئەم وردیلانە هەموویان لەسەر یەك رەوگە لە جوڵەدا نین بەڵکو لەکات و شوێنی نادیاریکراودا مەیلی ئەوەیان هەیە کە خۆیان لە رەوگە دیاریکراوەکەوە بۆ دەرەوە فرێ بدەن و هەر ئەو حەز و لادانەی وردیلکەکانە کە جیهان دەخاتە سەما، بەریەك کەوتنیئەم وردیلکانەیە کە گۆڕانە بەردەوامەکان لە سرشتدا دێنێتە کایەوە.

ئۆپیکۆر دەڵێت: سروشت لە مادده بترازێ هیچیتر نییە. تەنانەت گیانی مرۆڤیش لە مادده پێکهاتووە. بەڵام ئەتۆمەکانی گیان لە ئەتۆمەکانی لەش ناسکتر و سووکتر و نەرمترن و گیانیش وەکو لەش، دوای مەرگ لێك هەڵدەوەشێتەوە. ئەوەی دەمێنێتەوە هەر ئەتۆمەکانن کە قابیلی لەناوچوون نین. ئەو وردیلانەی کە بوونی ئێمەیان پێکهێنابوو لە بۆشایدا پەرتەوازە دەبن تا جارێکی تر رتێکەڵی یەکتر ببنەوە و جۆر و شێوەیەکی تر دروستبکەن.

هەموو ئەم جۆر و شێوانە کە لە سروشتدا لەشێوە لەژمارە نەهاتووەکاندا دەبینرێن، بەبێ نەخشەیەکی پێشین هاتونەتە کایەوە.

ئۆپیکۆر بڕوای ئەوەیە کە دونیای ئافرێنراو هیچ ئافرێنەرێکی نییە. هەر بەو جۆرەی کە شار و وولاتەکان نەخشەدانەری پێشینان نەبووە.

پاشان لەخۆی دەپرسێت:ـ چۆن دەکرێ جۆرە هاوشێوەکانی ژیان روون بکرێتەوە؟ بزاوتن لە جۆری نزمەوە بەرەو جۆری بەرز، لە کوێوە پەیدا دەبێت. لە هەوڵێکدا کە ئۆپیکۆر بۆ وەلامدانەوەی ئەم پرسیارە ئەنجامیدەدات، لە بیردۆزی داروین ( دووهەزار ساڵ دوای ئەو) نزیك دەبێتەوە و رادەگەیێنێت کە پەیدابوونی جۆری مرۆڤ بەهۆی وەرچەرخانەوەیە. بەریەك کەوتنەکانی وردیلەکانی ئەتۆم بەدرێژایی سەدەیەك لەدوای یەکەکان، بەهۆی رێکەوتێکی پەتییەوە، بووەتە هۆی پەیدابوونی بوونەوەری زیندوو و لەو بوونەوەرانەش، ئەوانەی کە لەگەڵ



دەوروبەری خۆیان گونجان، مانەوە و ئەوانەش کە نەیانتوانی لەگەڵی هەڵکەن لەناوچوون. بەڵام ئۆپیکور لە بارەی سەرچاوەی ژیانەوە هیچ زانیارییەکمان ناداتێ و هەروەها پێمان ناڵێت کە ئەم گونجان و نەگونجانەی بوونەوەران لەگەڵ دەوروبەردا واتای چییە. ئەم درزە قووڵە لە فەلسەفەی ئۆپیکۆردا لەوەوە پەیدابووە کە ئەو لە تێگەیشتن و روونکردنەوەی دونیای ماددیدا، خۆی لە قبوڵکردنی بوونی هێزێکی بە تەدبیر لایداوە.

بایبگەڕێینەوە بۆ بیردۆزی وەچەرخانەکەی: گۆی زەوی سەرەتا رەق و بێگیان بوو. دوایی وردە وردە گیاو دەوەن و گوڵ لە سەری رووا رێك وەکو ئەو خۆری و پەڕەی کە لە لەشی ئاژەڵ و باڵندەکاندا دەردەکەوێت. (سەر دەر دێنێت). پاشان ژیان هاتە کایەوە. بەڵام چۆن و بۆچی؟ هەندێك ئافرێنراوی زیندوو ئەندامی ناتەواویان هەبوو کە بە شێوەیەکی پەتی ئەنجامی هەوەسدارییەکانی سروشت بوو لە کردەوە ئەزموونییەکانی ئەودا. ئەو بوونەوەرانەی کە تەواو نەبوون لەناوچوون تا ئەوەی کە سەماو خولانەوە بە رێکەوتەکانی وردیلەکان، بە پەیدابوونی جۆری مرۆڤ دوایی هات کە توندوتیژ و ترسناك و سامناك، وەکو گیانەورانیتر، لە دەشت و ئەشکەوت و دارستانەکاندا دەستی بە ژیان کرد. ئەم بوونەوەرە خاوەنی تایبەتمەندیەك بوو کە توانای قسەکردن و بیرکردنەوەو بەزەیی و دڵۆڤانی پێبەخشی و تێگەیشتنێکی ناسك و کۆچەرایەتی بەهەشت و ئاسمانی پێبەخشی.

لێرەدایە کەئەم حەکیمە خوانەناسە، پێویستی بە هەبوونی خوا دەبێت. ئەو هەوڵیدا جیهانێکی خالی لە بوونی خواکان بئافرێنێت بەڵام نەیتوانی بەبێ ئەوان بژیت و لەئەنجامدا بوو بە پیاوێکی زۆر دیندارو هەوڵیدا لاسایی ژیانی خواوەندەکان بکاتەوە و رێرەوی ژیانی بۆ ئەولا وەرگێڕا.

بڕواهێنان بە بوونی خواکان، لەگەڵ بیردۆزە تەواو ماددییەکەی ئەودا هیچ جۆرە گونجانێکی نەبوو. بەڵام ئۆپیکۆر بەهۆی ئەو تێگەیشتنە تایبەتییەی کە لەبارەی جیهانەوە بەدەستهێنابوو، بەوپەڕی سادەییەوە دەیگوت؛ خواکانیش لەئەنجامی سەمای وردیلەکانەوە پەیدابوونە. بەڵام وردیلەکانی ئەوان لە وردیلەکانی گیانی مرۆڤیش ناسکتر و نەرمترە و لە بەهەشتدا کە باخێکی ئاسمانی، وەکو باخی ئۆپیکۆ ر تێدایە ژیانێکی شادیبەخش بەسەردەبەن. ئەوان وێنەی گەورەی مرۆڤن لەباشترین شێوەیدا و لە ئاسوودەییەکی بەهەشتیدا، دروستبووی هاوڕێتییەکی گشتییە،





بەهرەمەندن و بێبەرین لە گەوجییەکان و کێماسییەکان و بەدبەختییە مرۆڤییەکان؛ "هیچ نالەیەکی دەردەداری مرۆڤی خەڵوەتی هاودەمی و ئاسوودەییە نەمرەکەیان تێك نادات".

- ٤ -

ئامانجی بنچینەیی ئۆپیکور لە بەسەرهاتە پڕ لە روداوە فەلسەفیەکەی ئەمەیە: دروستکردنی گوڵشەنێکی پیرۆز و پڕ لە رووناکی و دۆستایەتییە لە دونیایەکدا کە سەرتاپای کینە و دوژمنداری دایگرتووە. ئامادەکردنی ژیانێکی ئارام و چێژبەخشە لەکۆمەڵگایەکی دۆستانە و دوور لە خۆپەسندی. "هاوڕێتی(دۆستی) لەشادی و چێژ جیاناکرێتەوە، هەر وەك کە شادی ناتوانێت لە دۆستایەتی جیا بێتەوە."

ئۆپیکور چەندین جار هاوڕێیەتیی وەکو قەڵغانێك ناودەبات کە لە هێرشە دژوارەکانی چارەنووسدا مرۆڤ دەخاتە ژێر پەنای خۆی: "هاوڕێەتییەکی راستین بئافرێنە. ئایینێکی لێدروست بکەو بە ستایش کردنی هەڵسە." چونکە "هاوڕێیەتی شتێکی شیرین و پیرۆزە. هەستی دۆستایەتی واقیعی تاکە خەڵاتێکی خەمرەوێنە کە لەم دونیا پڕلە فرمێسك و دوو دڵیەدا، لەگییان و دڵماندا هەیە ئەگەر دژواریەکانی ژیان بتوانێت بە مەرگ بمانبەستێتەوە ئەوا شادی و چێژی دۆستایەتی دەتوانێت بە ژیانەوە گرێمان بداتەوە."

ئۆپیکۆر کاتێکی زۆری خەرجی نامە نووسین دەکرد بۆ دۆستان و منالآنی خۆی و تامەزرۆی ئەوەبوو کە ئەوان لە دونیایەکی "بێبەری لە خۆپەرەستی" دا گەورەبن، دونیایەك کە پاداشتی عیشق و خۆشەویستی بۆ خودی ئەوان دەگەڕێتەوە.سەرتاپای ژیانی بە قسەی ئاسوودەیی بەخش و کردەوەی بەخشندانە بارگاوی بوو و لەو شێوازە دۆستی ئامێزە شەوق دەبرد.

ئەو زانیارییە ئەڤینئامێزانە کە رەگیان لە دڵی داکوتا بوو لە بەرگەگرتنی بەلآو ڕەنجەکاندا تەحەمولی پێ بەخشیبوو. ئۆپیکۆر بەهۆی نەخۆشییەکی پڕ دەرد و رەنجەوە مرد و لەگەڵ ئەمەشدا، رێك بەرلەمردن بۆ یەکێك لە هاورێکانی نووسی: " ئەمرۆ دوایین رۆژی پیرۆزی ژیانم بە سەر دەبەم. نەخۆشی میزڵدان بە دژواری ئەشکەنجەی داوم و هێندە لە تاو دەردەوە دەتلێمەوە کە لەش ئیتر توانای بەرگەگرتنی نەماوە. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا و



سەرەڕای هەموو ئەم ئازار و ئەشکەنجەیە، بەیادی ئەو فیکرە و قسانەی کەلەڕابردوودا هەمانبوو دڵم خۆشە."

یادەوەرییە شادیبەخشەکانی رابردوو و نەبوونی هیچ ترس و سامێك لەدوارۆژ بەهەرحاڵ دەبووە هۆی دڵخۆشی ئەو. ئۆپیکۆر دوای بەسەربردنی تەمەنێك بە شادومانی و خواردنێکی سادە و دڵێکی پڕلەخۆشەویستی و یەکڕەنگی، بە ئارامی چاوی لێکنا تا بە خەوێکی خۆش و بێنیگەرانیدا رۆبچێت.





# سانت پۆلس (٣ـ٦٨ ز)

## ئەو کەسەی کە پاش کوێربوونی

## بینایی بۆ چاوەکانی گەڕاوە

ئەم بەسەرهاتە بە یەکێك لە گەشتە ئێجگار دراماتیکەکانی مێژوو دەستپێدەکات. ئەکتەری سەرەکی ئەم درامایە پیاوێکە بەناوی ساوڵ(Saul) خەڵکی تەرسوس (Tarsus)ە کە حاخامێکی لاو و دەمارگیرەو پلەدارانی دەوڵەتی ئۆرشەلیم فەرمانیان پێداوە کە بەدوو شوێنکەوتووانی مەسیح لە دیمەشقدا بکەوێت و دادگاییان بکات. ساوول بڕیاریدا "ئەم گیا ژەهراوییەی مەسیحای درۆزن" لە ڕەگ و ریشەوە دەربێنێت و لە هەر جێگایەك ئەسەرێکی لێی بینی لەناوی بەرێت.

سەفەرکردن لە ئۆرشەلیمەوە بۆ دیمەشق، گەشتێکی درێژو بڕستبڕ بوو و ساول و هاوڕێ دەمارگیرەکانی زۆربەی ئەم ڕێگەیەیان بەپێ بڕیبوو. ساول کە لە بێ خەویاندا و بەهۆی زریانە زیخاوییەکانەوە چاوەکانی خوێنیان تێڕژا بوو، هەروا لەژێر هەتاوی گەرمی نیوەڕۆدا کە لەسەری دەدا، لە دیمەشق نزیك دەبووە. لەشی بەهۆی هێرشە یەکبینەکانی مەلاریاوە بێ هێز و لاواز ببوو و هێندەی نەمابوو کە لە تاو گەرماو ڕۆیشتن بە سەر زیخە سوتێنەرەکاندا بە یەکجاری لەپەل و پۆ بکەوێت تەپوتۆز هێندە چاو و لوت و دەم و سییەکانی داگرتبوو کە کەوتبووە باری دڵەکوتە. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، مۆرالێکی بەهێزی هەبوو کە بەرەو پێشەوەی دەبرد فەرمانبەریەکی گرتبووە ئەستۆ و دەیەویست سەرزەمینی پیرۆز لە تۆوی گەندەڵکاریی فیکرەو بیروڕا تازەکان پاك بکاتەوە. بەم جۆرە ساول لەژێر هەتاوی گەرم و زریانەکانی زیخدا خۆی



گەیاندە دەروازەکانی دیمەشق. لەوێدا ئیتر هامۆنی بەجێهێشتبوو و هەنگاوی دەنایە یەکێ لە ناوچە جوان و دڵگیرەکانی ئاسیا، باخی عەدەن کە یەکەمین ژوانگەی مرۆڤ و پەروەردەگار بوو.

بەڵام لەناکاو تاریکییەکی گەورە ساول دادەگرێت و لەسەرزەوی تەختییدەکات. هاوڕێیانی بە ترساوی نەوشتانەوە سەری. چاوە بێ ڕوونیەکانی ساول دەکرێنەوە و لێوەکانی وەك ئەوەی بیەوێت جدیترین وتەکانی بێنێتە سەرزمان، دەجووڵێن چەندساتێك پێدەچێت تا ساول تەواو دێتە سەرخۆ و گوێی لە قسەی هاوڕێیانی بێت:ـ

ساول چت بەسەرهات؟

ئەوم بینی.

کێت بینی؟

مەسیحا

مەسیحای درۆزن.

نە، مەسیحای ڕاستین، عیسای مەسیح.

یەکێك لەهاوڕێکان لەژێرلێوەوە دەڵێت:" ساول تێناگات چ دەڵێت." بەڵام ساول ئەم وتانە دەبیستێت و دەڵێت:(نە، هاوڕێکەم، ڕاستیت دەوێ ئێستا دەزانم چ دەڵێم.)

بەڵام لەوەی بینی بوو لەمەزیاتر هیچی کەیانی پێنەگوت. ڕنگە ئەگەر بشیگوتبا بڕوایان نەکردبا، چونکە ئەوەی کە ڕوویدابوو تەنانەت بۆخۆشی قابیلی بڕوایێ کردن نەبوو. ڕووناکییەکی ئەبلەق کەر تاریکاییەکە شەق دەکات و لەوبەینەدا پێشەوایەکی‌ئایینی، داپۆشراو بە جبەیەکی سپی، بەسەر و ڕوویەکی درەوشاوە و چاوانی خەماوی بەدیاردەکەوێت و دەستەکانی خۆی بۆلای ئەو درێژ دەکاو دەڵێت:ـ

ساوڵ بۆچی نیازی ئازاردانت هەیە؟

ئەی‌گەورەم تۆکێی؟

من عیسای مەسیحم.





من دەبێت چ بکەم؟

برۆ بۆ شار، لەوێ بۆت بە دیار دەکەوێت کە دەبێت چ بکەی. ساول لەترسی ئەم دیمەنە، بەترس و لەرزەوە، لەسەر زەوی تەخت دەبێت. هاوڕێیانی یارمەتی دەدەن تا بە پێوە رابیبگرن یەکێك لەوان دەڵێت: " چاوەکانی هیچ نابینن." بەڵام ئەمجارەش ساول قسەکەی دەبیستێت و سەری دەهەژێنێت و دەڵێت:"بەپێچەوانەوە ئەمە یەکەمجارە کە بەم چاکییە دەبینم."

* * *

لەبارەی حەقیقەتی ئەوەی کە بەر لە وەژوورکەوتن بۆ شاری دیمەشق هاتە فکری ساول جیاوازییەکی رای گەورە هەیە. بەڵام ئەم دژیەکییە کاریگەرییەکی ئەوەندەی نییە، ئەم بینینە چ واقیعی بێت و چ وەهمی مێشکێکی ماندوو و هیلاك، بۆ ساول راستییەکی زیندوو و بە شکۆ بوو و بۆ ئەو راستی تێدا بوو و ئەوی، کە تائەوپەڕی لەخەڵك هەڵدەهات و لێیان بێزاربوو، بۆ یەکێ لە مرۆڤدۆستە پلەبەرزەکان ئاوەژووکرد.

ـ ٢ ـ

ساول ئەو ناوە بووکە لە کاتی لەدایکبوون لێیان نابوو. بەڵام هاوکایە نایەهوودییەکانی بە پۆلس بانگیان دەکرد کە لە زمانی لاتینی دامانای پیاوی بچووك دەگەیێنێت. ئەو منداڵێکی جوان بوو و زەینێکی رووناکی هەبوو. باوکی کە پەیڕەوی ئیمپراتۆری روم و یەهودییەکی دیندارببوو، کوڕی بۆ خوێندنی مێژووی پێغەمبەرانی بەنی ئیسراییل، هەروەها خوێندنەوەی بارەکانی فەلسەفە هاندەدا.

ساول دەیەویست پیشەی مامۆستایەتی هەڵبژێرێت بەڵام ئامۆژگاری پیشەوا ئایینیەکانی کەنیسە، کە دەیانگوت:(لەوەی کە دەیڵێیەوە چاوەڕێی قازانج مەکە) قبوول کرد و بەکاری رەشماڵدروونەوە خەریك بوو. ئەویش وەکو خەڵکی پیرۆزی فەلەستین پێی خۆشتر بوو مووچەی رۆژانە لەئارەقەی نێوچەوانی دابینبکات و فیکرەکانی بێکرێ و مووچە لەجیهاندا بلاوبکاتەوە.





تەرسوس، یەکێك لەشارەکانی ئاسیای بچووك و ناوەندی بازرگانی و بەریەککەوتنی فیکرە و بیروڕاکان بوو. سیسر* و لە سەردەمی فەرمانڕەوایەتیەکەی لەسەر سیسل، لەم شارەدا دەژیا و هەر لێرەدا بوو کە ئانتۆنی** داوەتی کیلۆپاترای*** کرد تا بە بەلەمێکی زێڕین کە سەولی سیمینی هەبوو، بۆ ئەوێ بچێت. نووسەران ئەم شارەیان بە "دەروازەی خۆرهەڵات و خۆرئاوا" ناو ناوە. شارێك کە شوێنی یەکتر بینینی ئەدەبیات و فەلسەفەی زانست و ئایین و هونەر بوو و ساول لە سالآنی لاوێتیدا فیکرە بەرەونەقەکانی ئەو شارەی بۆخۆی راکێشا. بەڵام شەوق و زەوقی راستەقینەی ساول لە فێرکردنی تەوراتدا بوو کە ئەوی بە "ئیلهامەکانی پێغەمبەر لەرابردوو و موژدەی هاتنیمەسیحا لە ئایندەدا" دەزانی. لە پانزە سالیدا چووە ئۆرشەلیم و لەوێ، لە مەیدانی کەنیسەکاندا، لەبەرامبەر گامالیل (Gamaliel)ی پەروەردەگاری گەورەدا، کڕنوشیبرد و دەستی بە فێربوون کرد. رەنگە ئەم قوتابییە پانزەساڵانە لەبارەی ئەو منالە نەسرانییە* هەندێ مەسەلەی بەرگوێ کەوتبێت کە پێشەوا ئایینییەکانی یەهوودی بەپرسیارەکانی خۆی تووشی زەحمەت و سەرگێژە کردبوو بەڵام عیسای مەسیح و ساول هیچ کاتێ رووبەڕووی یەکتر نەبوونەوە. دوای چەندساڵ ساول لە ئۆرشەلیمەوە بۆ زێدەکەی گەڕاوە و لە زانکۆدا دەستی بە درێژەپێدانی خوێندن کرد. کاتێك لێی دەرچوو بە جەستەیەك کە لە بەردەم دڕکەکانی نەخۆشیدا بوو و دڵێك کە لە لەخۆبردوویی و فیداکاریی لەرێگەی ئافرێنەر (خالق)دا وەکو چیای گڕکان بڵێسەی دەدا، بۆ ئەو ئەرکە ترسناکەی کە لە ژیاندا هەیبوو، ئامادەبوو.

بەرلەوەی کە ساول رێگای خۆی بدۆزێتەوە، ئەم فیداکاری و لەخۆبردووییە، ئەوی بۆرێگای سەیر راکێشا. یەهودییە دەمارگیرەکان گرووپێکیان پێکهێنابوو و لەگەڵ شوێنکەوتووانی عیسا کەوتبوونە دژایەتی. ساولیش پەیوەندی بەو گرووپەوە کرد لەرۆژی شەهیدبوونی ستێفین (Stephen)دا لەوێ ئامادەبوو. ئەو کەسانەی، کەستێفێنیان بەنیازی لەناوبردن بەردباران

---

* Cicero وتاردەری گەورەی رۆمی(١٦ ـ ٤٣ پ.ز)

** Anthony سەرداری رۆمی ( ٨٣ ـ ٣٠ پ.ز )

*** cleopata شاژنی میسر( ٦٩ پ.ز تا ٣٠ز)

* پەیوەندیدار بە شاری ناسرە کەزێدی حەزرەتی عیسابووە(وەرگێڕ)

دەکرد، تکایان لێکرد چاودێری جبەکانیان بکات. ساول ئەو شەهیدەی سەیر دەکرد کە نووری خودایی لەنێوچەوانیەوە تیشکی دەپرژاندو دەنگی دەبیست کە دەیگوت "ئەی خوای گەورە لەم گوناهەی ئەوان ببورە." ساول ئەو شوێنەی بە هەیەجانێکی دەروونی و پەشۆکاوییەکی زۆرەوە جێهێشت. چونکە بێگومان بوو لەوەی کە ئایینەکەیان باتلەو خێرکردنەکانیشیان ناحەقن؛، لەوبڕوایەدابوو کە دەبێت ئەوان لەناوببرین بەلاّم پێی سەیربوو کە چ مەسەلەیەك بووەتە هۆی ئەوەی کە ئەوان بەو شەوق و زەوقەوە بە پیری مەرگەوە بچن و بەو تاسەوە لەناخی دڵەوە بۆ بکوژانی خۆیان داوای لێبوردن بکەن؟ ئایا بۆی هەیە بیروڕایەکی باتل تۆوی چاکە لە دڵی مرۆڤدا بپەروەڕێنێت؟ تا زیاتر لەو بارەیەوە بیری دەکردەوە، سەرسوڕمان و سەرسامییەکەی فرنیادی دەکرد و ترس و سام بەسەر بوونیدا زاڵدەبوو. لەو رووەوە لەڕاستیدا بەنیازی لەناوبردنی گومان و دوودڵی خۆی، بوو بەداوخواز(خۆخواز)ی راوەدوونانی نەسرانیان و لەڕاستیدا بە لێدانی قامچی لە شوێنکەوتووانی عیسا، ویژدانیخۆی تەمێ دەکرد.

ئەمەبوو مۆرالی ئەو لەکاتی سەفەرکردن بۆ دیمەشق. ساول کە چەند کەس لە هەوادارانی لەو گەشتەدا هاوڕێیەتییان دەکرد، فەرمانی پێدرابوو کە پێشەوایانی تیرەی نەسرانی دەستگیر بکەن و رەوانەی ئۆرشەلیمیان بکەن. بەلاّم لە دەروازەی دیمەشقدا کەوتە سەر دووڕیانێك و لەو کاتەدا کە کوێربوو و چاوی بیناییان بەدەستهێناوە. لەم ساتە بەولاّوە هیچ گومانێکیلە پێغمبەرایەتی عیسادا نەبوو. بەلاّم نەیدەزانی کە لەئاییندەدا چ ئەرکێك لە ئوەستۆیدایە. ئەم رستەیە هاتەوە فکری:"لەشاردا بۆت ئاشکرا دەبێت کە پێویستە چ بکەی."

هاوڕێیانی ئەویان بۆ شار برد. لەوێدا چەند رۆژێك نەخۆش و بێبەش لە نیعمەتی بینایی، نوێنراو بە هاوکاری و چارەسەری ئەو خەڵکەی کە ئەو بەدوای ئازاردانیانەوە بوو، نیعمەتی تەندروستی بەدەست هێناو بە سەرسوڕمانەوە پرسی:ـ

بۆچی هێندە میهرەبانن؟

خواوەند پێمانی فەرموەوە کەخراپە بەچاکە وەلاّمبدەینەوە.

چاکە لە بەرامبەر خراپەدا؟ ئایا لەگەڵمدا ئەمە هەمان ئەو فەرمانە نییە کە پەروەردگاری گەورە(گامالیل) دەیگوتەوە؟ ئایا ئەو حالەی کە بۆی دروستبوو، خۆی نیشانەی ئەوە نییە کە





دەبێت پڕوپاگەندەکەری ئەم بیروڕا تازەیە بێت لەسەرتاپای جیهاندا؟ ئانانیاس (Ananias)ی پزیشکی وەلاّمیدایەوە:

راست دەکەی کوڕم تۆ دەتوانی پاداشتی خزمەتەکەی ئێمە بەوە بدەیتەوە کە خۆت بۆ خزمەتکردنی پەروەدگار تەرخان بکەی.

ـ ٣ ـ

ساول سەری بەرەو بیابان هەڵگرت تا تاك و تەنیا لەگەڵ خوا بکەوێتە رازونیاز و کاتێك گەڕاوە بڕیاریدا کە لاوازی و بێتوانایی خۆی بۆ بورجێك لە هێز بگۆڕێت.

ئەم سەرچڵی و پەیامبەرییەی کە پێی سێپێردرا، ئەوی دەیان هەزار کیلۆمەتر بۆ ئەم لاوئەولا راکێشا و رووبەڕووی موسیبەت و بەلاّی لەبڕواکردن بەدەر کردەوە. پێنج کەڕەت کەوتە بەر لێدانی قامچی. سێ جار بەدار بەستیانەوە. جارێك بەردباران کرا و کەوتە باری مەرگەوە. چوارجار توشی تێکشکانی کەشتی هات و لە یەکێکیاندا خۆی بە پارچە تەختەیەکەوە چەسپاندو ٢٤ کاتژمێر لەسەر رووی ئاو ماوە. لەو ماوەیەدا کە خەریکی پڕوپاگەندە بوو، چەندین جار کەوتەزیندان و چەندەها مانگی بە قەید و بەند و زنجیر لە کونجێکی زینداندا بەسەربرد. جگە لەمانە، رەنجێکی زۆری لە برسێتی و تێنوێتی و سەرما و نەخۆشی چێشت و کەوتە بەر تانە و لێدان و دژوێنی ئەو کەسانەی کە بۆ فێرکردنیان تێدەکۆشا. ئەو، هەموو ئەم ئەشکەنجانەی وەکو کرێ و مووچەی خۆشەویستییەکەی بۆ خوا و پاداشتی دەردی عیشق، بەنرخی گیانی دەکڕی. سەربازێك بوو کە لە تەواوی ماوەی ژیانیدا ببوو بە کرێ وەرگرێك تا لە بەرقەرارکردنی ئاشتی و پاکیدا لە خۆبردوویی بنوێنێت. لەماوەی دوو سەدەدا جیهان دوو فاتحی گەورەی بەخۆوە بینی: سزارو ساووڵ. سزار لافاوێکی خوێنی بەرپاکرد کە لە ئەوروپاوە بۆ ئاسیا شۆڕ بووە. ساول بۆ گێڕاندنەوەی ئەم لافاوە بۆ شوێنی خۆی، رووبارێکی لە عیشق و خۆشەویستی خستەگەڕ کە لە ئاسیاوە بۆ ئەوروپا رەوان بوو.

ئەو جەنگاوەرە خۆپەرست و بەفیزە، بەسواری ئەسپەوە رێگەی بڕی و ئەم یاوەرە بێفیز و بێتوانایە، بەپێی پیادە رێی بەدواداگەرانی دەبڕی. ئەم راوچییە، کە خۆی لەناکاو گیرۆدە بوو و ناوی خۆی لەو کاتەدا بۆ پاوڵ گوڕیبوو چەند رۆژێك دوای گەڕانەوە لە بیابان، کۆچکردن بەرەو

کابەی عیشقی لەدیمەشقەوە دەستپێکرد. بەم شێوەیە دۆستەکانی ئەویان خستە ناو سەبەتەیەك و شاردراوە و لەو دیو حەساری شارەوە دایان بەزاند و ئەو گیانی خستە سەر لەپێ دەستی و بەپێخواسی سەرەتا بۆ ئەنتاکییە رایکرد ـ شارێك کە شوێنکەوتووانی مەسیح یەکەمین جار خۆیان لەوێ بە عیسایی ناوبردووە. پاشان رووی لە قوبرس کردو لەوێ بە پڕوپاگەندەکردن بۆ عیسایەتی خەریك بوو وەکو ئایینێك کە مەسیحی و یەهوودی بە باوەشێکی کراوە قبوولْدەکات. پاشان رووی لە شاری لیسترە(Lystra) کرد. ئەو شوێنەی کە خەڵکەکەی سەرەتا ئەویان وەکو خوای بت پەرستان پەرستی. کاتێك وتی منیش ئادەمیزادێکم وەکو ئێوە، بەردبارانیان کرد. لەوێوە بۆ شاری ئێفێس(Ephesius) کەوتە رێ. لەوێش بازرگانەکان لێی کۆ بونەوە و دەنگە دەنگیان بەرپاکرد چونکە ئەو رایەخی نوشتو و تەلسیم و پەیکەری تێکدا کە بەناوی دایانای خواژنی نێچیر (راو) بەرپایان کردبوو. سانت پۆلس بۆ شارەکانی تریش لە ئاسیا و ئەورووپا و دورگەکانی دەریای ناوەڕاست سەفەریکرد و لەهەموو شوێنێك نانی بۆجەستە و ئاسایش بۆ گیانیخەڵك بە خەڵات برد. چەندەها جار لەتاو نەخۆشییەوە لەپێ کەوت و لەکاتی قسەکردندا زمانی شکا. تەنانەت دوژمنەکانیشی لە سەرسەختی و خۆڕاگرییەکەی ئەو و ئەو سەرکەوتنەی کە دەستیدەکەوت سەریان سوڕدەما. بەڵام ئەو هیچ بایەخی بە سەرکەوتنەکەی نەدەدا و بۆفێرکردن و وانە وتنەوە هیچ کرێ و مووچەیەکی قبوولْنەدەکرد. لە بەامبەر ئەو چاکە و بەخشندەییەی کە دەیکرد چاوەڕێی سوپاس و قەدرناسی نەدەکرد و خۆی بەتەواوەتی بۆ کارەکەی تەرخان کردبوو. کاتێك بواری هەبووایە، دەستی بەکاری رەشماڵدروون دەکرد تا پێویستییەکانی خۆی پڕبکاتەوە و کاتێك هەوادارانی لێیان دەپرسی کە چۆن دەتوانێت خۆی لەگەڵ ئەو هەموو دژوارییە بگونجێنێت، دەیگوت: "من تەنیا کەماسیی ئەو ئەشکەنجە و ئازارەی کە بە عیسای مەسیح گەیشت قەرەبوو دەکەمەوە."

ـ ٤ ـ

سانت پۆلس هەروا لەسەر رێگەکەی خۆی دەڕۆیشت. وەکو شۆڕشوانێکی پڕجۆش دەکەوتە بەر راوەدوونان و ئەشکەنجە. چەشنی یاخی و ئاژاوەگێڕێك بەردبارانیان دەکرد بەتۆمەتی سیخوڕی دەکەوتە زیندان. بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، لێوانلێوی شادی بوو و دڵی بەوەوە خۆش دەکرد کە نوێنەری مەسیحە لەسەر رووی زەوی. زۆربەی جاران کە نەیدەتوانی بەخۆی بچێتە



لای مەسیحییەکان نامەی پڕ لە خۆشەویستی و بارگاوی بە باوەڕ و خەمڕەوێنی و ئومێدی بۆیان دەنووسی، هەندێکجار ئەوانی بەهۆی کێشمانەکێشیانەوە سەرزەنشت دەکرد بەڵام هەمموو جارێ نامەکانی خۆی بەو وشانە کۆتایی پێدەهێنا کە لە رەنجانیان کەم بکاتەوە و ئارامی بە گیانیان ببەخشێت. نامەکانی سانت پۆلس، کە هۆنراوەی دلگیر و دلۆڤانی بزوێن بوون، بریتیبوون لە روون کردنەوەی بنەماکانی فەلسەفەی پەرتووکی چەرخی نوێ.

فەلسەفەی سانت پۆلس تێکەڵەیەکی بیروڕاکانی یۆنانی و بیرۆکەکانی عیبری بوو کە لەسەر بناغەی باوك و کوڕی(گیانیپاك) دامەزرابوو و یەکێتی بەدەست هێنابوو و بەشێوەیەکی سادە دەتوانرێ بەم شێوەی خوارەوە دەربڕێن:

١ـ باوکایەتیخوایی و برایەتی مرۆڤی.

٢ـ گواستنەوەی هێزی ئەڤین و خۆشەویستی.

٣ـ نەمریی گیان.

### ١ـ باوکایەتی خوایی و برایەتی مرۆڤی

عیبریەکان هەردەم خۆیان بە کوڕانیخوا دادەنا بەڵام سانت پۆلس ئەم خێزانەی فراوان کرد و هەموو تاکەکانی مرۆڤی لەو خێزانە خواوەندییەدا بەشدارکرد.

سانت پۆلس یەکێك لە پێشرەوانی مێژووە کە بیرۆکەی نێونەتەوەیی هەبووە و لە "نامەیەك بۆ رۆمییەکان"دا نوسیویەتی: "ئایا ئەو تەنیا خوای یەهودییەکانە و پەروەردگاری مەسیحییەکان نییە؟ هەمموومان یەهوودی و عیسایی، رەش و سپی، ئاغا و کۆیلە میراتی پەستی خواوەندین. کەواتە لێنەگەڕێن کەسێك خۆی بە باڵاتر لەوی دیکە بناسێت چونکە هەموومان ئەندامانی یەك لەشین و وەکو چاو و گوێ و دەست و پێ ئافرێنراوین تا لە ئەرکە گشتییەکانی ژیان، هەریەکەمان ئەرکێکی تایبەتی لە ئەستۆیدا بێت. ئێمە پێویستمان بە هەموو ئەو ئەندامانە و هەموو ئەم کردەوانە هەیە تا تەندروستی بوونی لەشی مرۆڤ دابین بکەین." یۆنانییەکان ئەم بڕوایە بە "هاوئاهەنگی" و یەهودییەکان بە "هاوڕێیەتی" دەردەبڕن و پۆلس بە "برایەتی مرۆڤانە" ناوی دەبات. "لەگەڵ یەکتر میهرەبان و دلۆڤان بن وەکو دوو برا لە یەك خێزاندا"و ناوبرایاندا"خۆشبەخت ئەوکەسەیە کە دەستی بدەری هەبێت نەك وەرگر." ئەوەی کە بە تواناترە





دەبێت خۆی لەگەڵ بێتواناییەکانی ئەوانیتردا بگونجێنێت کەواتە باشتر وایە لەئازاردانی ئەوانیتردا هێواش بین و لە لەبیرکردنیخراپەیاندا پەلە بکەین. چونکە تەنیا و تەنیا لەم ڕێگەیەوە دەتوانین "بە شوێن ئەو کاروبارانەوە بین کە بە ئاشتی و پاکی کۆتاییان پێدێت.)

## ٢ ـ گواستنەوەی هێزی ئەڤین وخۆشەویستی

هەویرترشی ئەو نانەی، کەسانت پۆلس بە خەڵك پێشنیاردەکرد، ئەڤین و خۆشەویستی بوو. لێرەشدا ئەو، بیروڕاکانی یۆنانی و عیبری لەگەڵ فەلسەفە تایبەتییەکەی خۆیدا ئاوێتەدەکات. "نەوای ئەڤین"ەکەی (بەشی سێزدەهەمی یەکەمین نامە بۆ کۆرینتیان "Corinthians" لە ڕیزی بەرزترین ئەدەبیاتیجیهاندایە "هەرکاتێ بەزمانی مرۆڤەکان یان فریشتەکان قسەبکەم و قسەکانم خالی بن لە ئەڤین، لە شێوەی کەسێکدا دەبم کە سەرنج لێدەدات و دەهۆڵ دەکوتێت. هەرکاتێك تایبەتمەندییەکانی گەشبینیو پێشبینیم پێبەخشرابێت ودەرکم بە هەموو هێما و نهێنییەکان کردبێت و زانستی سەرەتایی و کۆتاییم بەدەست هێنابێت و هەرکاتێ بروا و بیروباوەڕم هێندە قایم بێت کە بتوانم چیا لەشوێنی هەڵکەنم، لەبەرئەوەی عیشقم نییە هیچم نییە. ئەگەر هەموو ئەوەی کە هەیتم بە بێنەوایان ببەخشم و خۆم بەدەستەوە بدەم تا لە ئاگردا بستوتێت و لە ئەڤین بێبەش بم هیچ سودێکم پێنابەخشێت." وشەی ئەڤین لەم بەشەدا زۆربەی جار بە خێرخوازی و بیرکردنەوەی چاك ڕاڤەدەکرێت بەڵام وشە بەرامبەرە یۆنانییەکەی واتای فراوانتری هەیە. واتاکەی تەنیا بەخشندەیی نییە بەڵکو لێبوردەییشە. هەموو واتاگەلی دلێری، تێگەیشتن، دلۆڤانی، خاکێنی (بێفیزی)و میهرەبانی لەم وشەیدا کۆبوونەتەوە. خۆ لەبیرکردنێکی پەتی و فیداکارییەکی بێگەرد لەڕێگەی خزمەتکردنی گەڵدا. لە بەردەوامی بابەتەکانی ئەم بەشەد دیارە سانت پۆلس مانایەکی ئێجگار فراوانی بۆ ئەم ووشەیە هەبوو: "ڕەنجی ئەڤین بەردەوام و دڵگیرە. ئەڤین لە خۆهەڵکێشان و ئێرەیی و قسەی پوچ و بێکەڵك بەدوورە. عیشق خۆی پشتگوێ ناخات بەم خۆپەرستییەش نییە. عیشق زوو ناوڕووژێنرێت و خراپ بیرناکاتەوە ئەڤین هەموو شتێك قبوولدەکات، بڕوای بە هەموو شتێك هەیە، ئومێدی بە هەموو شتێك هەیە، بەرگی هەموو شتێك دەگرێت..."





ئەم دەربڕینانە بۆ کەرتە گرنگەکەی ئەم بەشە ڕێنماییدەکات کە گەوهەر و کاکلە (مەغزا)ی فەلسەفەی ئەم یاوەرەییە. دەبێت بکەوینە بەختی ئومێد و بڕوا و خۆشەویستی و لەو سێیانەش ئەڤین لە هەمووان بەرزترە.

## ٣ ـ نەمریی گیان

پۆلس دەڵێت" ئەڤین میراتی گشت گیانە نەمرەکانە. لەم بارەشدا پۆلس فەلسەفەی خۆی لەسەر بنەمای بیرۆڕاکانی سوکرات و ڕێنماییە عیبرییەکان بەند دەکات.

بە بڕوای ئەو، هەریەکە لە ئێمە نەتەنیا لەڕووی جەستەییەوە، بەڵکو لەڕووی گیانیشەوە، ئەندامی لەشی مرۆڤێکین.

لەڕوانگەی پۆلسەوە بێبڕوایی بە نەمریی گیان دەکرێ بە ڕوانگەی کرمێك بۆ دونیا، بچووێنرێت. کرم کە لەژێر خاکدا ڕادەکشێت،دەبێت کە دەنکە(ناوکیمیوە) بەناو تاریکیدا ڕەگ دادەکوتێت و دەگاتە ئەو ئەنجامەی کە ئەمە کۆتایی ژیانی دەنکەکەیە و لە ژیانە نوێکەی بە یەکجاری بێئاگایە و نازانێت کە دەنکەیە و لە ژیانە نوێکەی بەیەکجاری بێئاگایەو نازانێت کە دەنکەکە سەری لەخاك دەرهێناوە و لق و خونچە و گوڵ دەدات و ئەم جەستە مردووەو بێگیان و لە ژێر خاکدا خەوتوو،گیان دەگرێت و زیندوو دەبێتەوە.

پۆلس لە وەڵامی ئەو کەسانەدا کەدەپرسن" مردووەکان چۆن هەڵدەستنەوە و بە چ لەشێك دەردەکەونەوە، دەڵێت:"ئەی ساویلکە، دەنکە تا نەچێتە ناو خاکەوە گەشە ناکات و گیان ناگرێت. هەستانەوەش بەو شێوەیەیە. مردووەکان کاتێك پوکانەوە بە ناو خۆڵدا دەچەقن وبەتەڕوتازەیی سەر لە خۆڵ دەردێنن. بە سوکی و پەستی چوونەتە ناو خاکەوە و بە شکۆ و گەورەییەوە سەر بەرز دەکەنەوە. لەو بارەدا بێتوانا بوون و کاتێك هەڵدەستنەوە، بەهێزن. بە لەشێکی خۆڵی ڕۆیشتونە و بە جەستەیەکی ڕۆحی دەردەکەونەوە. لەشی یەکم لە خۆڵ بوو و خاکی بوو و هی دووەم بەهەشتی و گەردوونی. کاتێك خۆمان لەگەڵ قالبیخاکی بگونجێنین، شێوە بەهەشتییەکەش وەردەگرین. وەرە با هێما یەکت بۆ بڵێمەوە... ئێمە بەخەوێکی هەتاهەتاییدا ڕۆناچین. بەڵکو تووشی شێوەگۆڕکێ دەبین... چونکە ئەم گەندەڵییە دەبێت ببێتەچاکە و ئەم فەنایەش دەبێت بۆ مانەوە بگۆڕێت..."

کەواتە لە بارەی دوایین رۆژی ژیان هیچ ترسێك مەخەرە دڵەوە. رۆژی مەرگ رۆژی لەدایك بوونە بۆ ژیانێکی نەمر.

ئەم گەشتەی کۆتایی دەرباز بوون لە گوزەرگایەکی تاریك و نووتەکە بەرەو دونیایەکی رووناك. بەگوێرەی ئەم وەسفە، ژیانی هەتاهەتایی، سەرکەوتوو ودڵنیاییبەخشە. ژیان میراتێکی خۆشەویستە کە لە خواوەندەوە گەیشتۆتە بەندەکانی."ئەی مەرگ وەرەوە. ئەی گۆڕ لە باوەشم بگرە." ئەم بیرورِایانە بۆ پۆلس ئەندێشەی پەتی نەبوون. بەڵکو یەقینی تەواوی دەروونی بوون کە بۆتەی دەردەو ئەشکەنجەکانداو لە گەشتی فیکرەجۆراوجۆرەکاندا لێنرابوون (بابوون).

"تا منداڵ بووم وەکو منداڵ قسەم دەکرد، وەکو ئەو تێدەگەیشتم و بیرم دەکردەوە و هەر کە گەشەم کرد و بوومە پیاو، کارەکانی منداڵیم خستە لایەکەوە." پۆلس باش دەزانێت چ دەڵێت "ئێستا لەم دونیایەدا لە تۆیی شیشەیەکی قۆپاوەوە سەیردەکەین. بەڵام دواتر، لە جیهانی دوارِۆژدا، هەموو شتێك لەرِووبەرِوودا دەبینین." "ئیستا بەشێك دەزانم بەڵام لەو دونیایەدا لە هەموو شتێك ئاگادار دەبمەوە."

## - ٥ -

ئێستاکە با ببینین ئەنجام و بەرهەمی ئەم هەموو زانیارییە چییە. بەڵێنی ژیانێکی نەمر کە تیایدا ئەڤینێکی یەکرِەنگ لە نێوان تاکەکاندا دەسەڵاتدارە و خواوەند خۆشەویستییەکی باوکانەی بۆ هەمووان هەیە. بە پشت بەستن بە ئەڤین و ئومێدێکی ئەوهایە کە پۆلس لەگەڵ ئەو هەموو دژواری و زەحمەتییە لە باوەرِکردن بەدەرانە هەڵکردووەو ئەو فەرمانەی کە پیدرابوو گەیاندووتە کۆتایی(بەجێهێناوە).

کاتێك لە ئۆرشەلیم توش بوو و درایە دەست دەسەڵاتدارە رۆمییەکەی شار، داوایکرد کە وەکو یەکێك لە هاونیشتمانیانی رۆم رەوانەی بەردەرگای ئیمپراتۆر بکرێت. ئەم داواکارییە وەکو ئەوە وابوو کە کەسێك بیەوێت لە (ئاوە)وە بیخاتە ناو ئاگر. لەو کاتەدا نیرۆن (Neron) ئیمپراتۆری رۆم بوو کە سەردەمی لاوێتیخۆی بە سەر دەبردو کەم تا زۆرلەژێر کاریگەری دایەنیخۆی سێنێکان (Senecan)ی فەیلەسووفدا بوو. ئەم گیانەوەرە درِندەیە هێشتا دەمامکی لە سەر دەم و چاوی لا نەبردبوو و خۆی بە پشتگیریکەری هونەر و قوتابی فەلسەفە





و ئایین دادەنا. لەو رووەوە مۆڵەتی بە پۆلس دا کە چەند ساڵێك لەژێر چاودێریدا بێت و لە پەرەستگای رۆمدا دەست بە فێرکاری و پرِوپاگەندەبکات. چەند ساڵێك پێنەچوو کە گیانی گلاوی نیرۆن دەرچوو و دەمامك. لە سەر دەم و چاوی لاچوو کە خراپکارێکی(لەچارەسەر نەهاتوو)ە. فرمانیدا دایکی بخنکێنن، ژنەکەی بە لێدان کوشت. سێنێکای دایەنی خۆی ناچارکرد کە دەمارەکانی خوێنیخۆی بکاتەوە و لەئاکامدا تاوانێکی شوومی لەمێژوودا ئەنجامدا. بەو گریمانەوە کە شاعیرێکی خاوەن ئیلهامە، شاری رۆمای ئاگر تێبەردا تا بۆ هونینەوەی داستانێکی "گەورەتر لە داستانی هۆمیرۆسی لە ئاگر گرتنی شاری ترۆیدا" بنەمایەك دابین بکات.

نیرۆن لەوە دەگەرِا کە گوناهی ئاگر تێبەردانی رۆم بخاتە ئەستۆی بێگوناهێك. بۆیە چووە لای مەسیحییەکان و باجی ئەم تاوانەی بە سەر ئەواند اسەپاند.

بۆ ئەشکەنجە و ئازاردانی مەسیحییەکان پشووی گشتی راگەیاندو گرووپێکیانی لە مەیدانی شاردا خستە بەردەمی شێران. لەکاتێکد کە هاواری"بژیسزار)ی تەماشاکەران بەرز دەبووە ئاسمان، قوربانییەکان سروودی "خواوەند شڤانیمنە، پێویستیم بە کەس نابێت" یان دەچرِی.

کۆمەڵێکیتریان لەخاچدا و وەکو مەشخەڵ ئاگری تێبەردان و بۆ شوکرانەی هەنگاونانە سەرکەوتووەکانی لە شەقامەکانی شاری رۆمدا خستە گەرِان و بە نیگایەکی مۆرِەوە لێیان روانیو هاواریکرد: "مەنزوومەیەکی ئاگرین، نوێگەریەکی هونەرمەندانە کە دونیا هەرگیز هاو وێنەی نەبینیوە!"

سانت پۆلس بینەری شیتایەتییە روو لە زیادبوونەکەی نیرۆن بوو دەزانی کە رۆژی تەمەنی ئەویش رووی لە کۆتاییە بەڵام ترسی نەبوو و دەیگوت خۆشحاڵم کە:"بەچاکی جەنگام و خولی خزمەتم گەیاندە کۆتایی و بروای خۆم پاراست."

نیرۆن بەشێوەیەکی ئاوارتە(ئیستسنایی) پۆلسی، وەکو یەکێك لە هاونیشتمانیانی رۆم، خستە ژێرچاکەی تایبەتی خۆی و فەرمانیدا کە نە فرِێی بدەنە بەر شێران و نە لە خاچی بدەن. بەڵکو وتی لە سەریدەن و بەدەم هاوارەوە "کۆتایی مەسیحییایەتی"ی راگەیاند. بیئاگا لەوەی کە کۆتایی ژیانی سانت پۆلس سەرەتای کلێسای مەسیحییەتە.

# ئۆرلیۆس و ئێپیکتێتوس

## دوو دەرکەوتەی دلێریی فەلسەفەی ستۆینیزم

### ئۆرلیۆس (١٢١ــ ١٨٠ز)

### ئێپیکتێتۆس (لە دەوروبەری٦٠ ــ ١٢٠ز)

(مارکۆس ئۆرلیۆس)ی ئیمپراتۆر و ئێپیکتێتوسی نۆکەر، دوو نموونەی بەرجەستەی فەلسەفەی (ستۆیکی*)نە، فەلسەفەیەك کەبەدلێرییەوە چارەنووس قبوولدەکات. ئەم دووانە کە لە دوو جەمسەری دژبەیەکی چارەنووسی مرۆڤی کەوتنەرێ، لە خالێکدا بە یەکتر گەیشتن. مرۆڤ هەم دەکرێ دیلی شادییەکانی خۆی بێت و هەمیش دەتوانێت بەقەید و بەند و زنجیرەوە شادوسەرمەست بێت.

ئیمپراتۆر لەلوتکەی بەرزی و گەورەییەوە سەیری خوارەوەی کرد و لە دلی شادی و دلخۆشیدا، رەنج و خەمێکی شاراوەی بینی و خولامەکە لەنشێوی سووکی و پەستییەوە سەری هەلبری و بینی کە تەنانەت دەتوانرێ لە دلی رەنج و خەمیشدا سۆراخی وخۆشحالی بکات. بەلام هەردووکیان لەسەر ئەوە کۆك بوون کە"مرۆڤی ژیر لەم وەرچەرخانەدا، لەم شکۆ و پەستی و

* زینون (نزیکەی ٣٠٠ سال پ.ز) بە دامەزرێنەری ئەم فەلسەفەیە دادەنرێت، ناوی ستۆیك لەوشەی (ستۆیا) ی یۆنانییەوە هاتووە کە مانای (بەردەم پایە) دەبەخشێت، لەراستیدا زینون لەبەردەمی پایەیەکی شاری ئەسینادا شاگردەکانیکۆدەکردەوە(فەرهەنگیسۆفیا، نوسخەیکوردی، لا١١٥، وەرگێرانی بەهرۆز حەسەن)



شادی و رەنجە هەنگاوی ژوورتری ناوە و ئاسوودەیی گیانی خۆی لە کونجە خەلوەتەکەی ژیانە تایبەتییەکەی خۆیدا دەبینێتەوە.

لەگەل هەمووو ئەمانەشدا، ئەمە ئیمپراتۆر بوو کە بە توندی پێویستی بە ئارامی و دلئاسوودەیی قوتابخانەی ستۆیسیزم هەبوو خەلك فێری رێگەی کوشتار و خوێنرێژی بکات بەلام ئێپیکتیۆس دەیتوانی فێریان بکات کە چۆن بژین. ئەم دووانە کە لە ناودارانی قوتابخانەی ستویسیزمن یەکێکیان ئاغای خەلك بوو بەلام ناشاد و ئەویتر ئاغای خودی خۆی بوو بەلام شادومان و رازی بوو.

ـ ٢ ـ

مارکۆس ئۆرلیۆس ئەرکێکی لەئەستۆدا بوو کە بە هیچ شێوەیەك لەگەل مەعنەویاتیدا گونجاو نەبوو. شازادەیەك کە رقی لە شەر و کێشمانەکێش (سواژ)بوو، بۆ فەرمانڕەوایی نەتەوەیەکی شەرخواز هەلبژێردرابوو. مارکۆس لەسەردەمی مندالییەوە مەیلێکی پڕاوپڕی بۆ فەلسەفە هەبوو ودەیەویست ببێت بە فەیلەسووف.

شێوەی ژیانی سوکرات سینکیەکان، ئەو فەیلەسووفە بێباکانەی کە راستی و دروستیان بەسەر کۆکردنەوەی مال و ساماندا، پەژراندووە، لەگیانیدا ئاگرێکی هەلکرد. جلی شڕی لەبەردەکرد و لەسەر تەختێکی زبر دەنوست. لە هەژدە سالیدا بە ناچاری دەستی لەفەلسەفە شوشتەوە تا بۆ جێگریی ئانتۆنیوس (Antonius)ی مامی، کە ئیمپراتۆری رۆم بوو، پەروەردە بکرێت. کاتێك ئانتۆنیوس لەسالی١٦١ی زایینیدا مالئاوایی لەدونیاکرد، ئۆرلیۆس بەپێچەوانەی حەزی لەدلی خۆی بووە وارسی سامانی نەخوازراو (داوانەکراو) و شەر و کوشتارێکی بەناحەق. لەو رۆژە بەدواوە، زینی ئەسپ، بوو بە تەختەکەی و دەوارێکیش لە مەیدانی جەنگدا بوو بە کۆشکەکەی. لێرەدا، لەژێر رووناکی کزی چرای رۆنی، ئۆرلیۆس پەرتووکی "بیرکردنەوەکان"ی خۆی لەبارەی ژیان نووسی. سێبەرە بێ رووناکی و لەرزییەوەکانی حیکمەت و زانست لەژێر فشاری ئەو پیلانانەی کە بۆ کوشتارەکانی رۆژی دواتر دایدەنا، لەناو دەچوون.





ئۆرلیۆس بەرهەمی ئەزموونی تاڵی ژیانی خۆی بەم شێوەیە وەسفدەکات: "ژیان کێشمانەکێش و ململانێیەکی بەردەوامە. گەشتێکە بۆ سەرزەمینێکی سەرسوڕهێنەر..." ئەو لە کارەکەی خۆی بێزاربوو، لەو رووەوە کە ناچاربوو ببێتە میراتگری پاشایەتی بەتوندی ناراحەت و دەردەداربوو. ئەو بەرامبەر بە بڕوای خۆی وەکو فەیلەسووفێك، لێهاتوویی خۆی چەشنی ئیمپراتۆرێك و دلڕەقی و بێبەزەییەکەی خۆی لە وێنەی سەربازێکدا بوو بە خۆ بەدەستەوە دەرێکی پەتی و لەهەمان کاتدا ببوو بە خۆ بە دەستەوە دەرێکی پەتی و لە هەمان کاتدا خولقێکی سادە و میهرەبانی هەبوو. ئەو تەنیا لە تۆیی لاپەڕەکانی پەرتووکەکەیەوە دەیتوانی بەچاوی دڵ ببینێت و هەر لەوێدا بوو کە لەناو ئەو *گلادیاتور و تاوانبار و دزانەی کە سوپاکەی ئەویان پێکدەهێنا، ئاسوودەیی خۆی بەدەستدەهێنا. ئەو کەشتیوانێکی ئاشتیخواز بوو کە لە دەریای زریاناویدا بۆ پێشەوە دیئاژووت.

گرووپێك رۆمی پلەپەرست بەوگریمانەی کە ئەو دڵی شەڕی نییە، لابردنی ئەویان بەئاسان وەرگرت و بە رێبەرایەتی یەکێك لەسەرداران بەناوی ئاڤیدیۆس کاسیسوس (Avidins cassius) دەستیان بە یاخیبوون کرد. بە گاڵتەوە دەگوترا: "ئاڤێدیۆس ئارەزووی ئەوەی هەیە کە لە بڕی ئۆرلیۆس لەسەر تەخت دابنیشێت." و هەندێك کەس لەژێرلێوەوە بۆیان زیاددەکرد: "... و لە بڕی ئەو لە قەرەوێلەیدا بخەوێت." ئەم بەند و باوە ناشیرینانە کە گوزارشتیان لە تەختێکی لەرزۆك و ناقایم و ژنێکی بێئەمەك دەکرد، لە ئاکامدا گەیشتە گوێی ئیمپراتور و هەمووان چاوەڕێ بوون تا ببینن کە کاردانەوەی ستۆیکێك لە بەامبەر ئەم قەیرانە چ دەبێت. بەتایبەت کاتێك کە گەلە کۆمەگێڕەکان لە هەموو شوێنێك بلاۆیان کردبێتەوە کە ئیمپراتۆر مردووە و گرووپێك لە سوپاییەکان ئامادەبن کە ئاڤیدیۆس لەبڕی ئەو لەسەر تەخت دابنێن.

مارکۆس ئۆرلیۆس بەسەر پێشهاتەکەدا دەسەلاٚتدار بوو. ستۆیکەکان فێریان کردبوو“"خۆت بەدەست چارەنووسی خۆتەوە بدە، ژیانی تایبەتی خۆت درێژە پێبدە و لەگەڵ سروشت و دڵ و دەروونی خۆت راستگۆ بە." زۆرچاکە. سەرمەشق یان نموونەی ژیانی ئەو ئەوەبوو کە هەردەم

* Gladiateur وشەیەکی فرەنسییە لە رۆمای کۆندا بەو کەسانە دەوترا کە لە سێرك یان مەیدانی گشتیدا لەگەڵ گیانەوەری دڕندەدا شەڕیان دەکرد (وەرگێڕ)



(شا)یانە رەفتاربکات. کردەوەیەکی هاوڕێ لەگەڵ پێشبینی و گەردەنیش و بەدوور لە رق و خراپەکاری. کەوابوو سەربازانی بانگلکرد تا لێی کۆببنەوە و ئەوها بۆیان دوا:

"سەربازانی من! بیستوومە کە باشترین هاوڕێیانیمن بۆ لەسەرکار لابردنی من گەلەکۆمەیان ئەنجامداوە و من ناچارم بە شەڕکردن لە دژی ئەوان هەڵسم. تەنیا ترسم لە شتێك هەیە و دەترسم ئاڤێدیۆس لەساتێکدا کاسیۆس لە شەرمەزاریاندا خۆی بکوژێت یان کەسێك لە هێرشێکدا لەڕووی بێ ئۆقرەوییەوە بیکوژێت. لە بارێکی ئەوهادا گەورەترین خەلاٚت کە ئەگەری هەیە ببێتە نسیبی فاتحێك، لە کیسم دەچێت. واتا بەختی ئەوەم نابێت تا لەو پیاوە ببورم کە خراپەی دەرحەق کردووم ولەگەڵ ئەوکەسەی، کە هاوڕێیەتی خۆی لەگەڵ من بڕیوە، هەروا بە هاوڕێ بمێنمەوە." ئۆرلیۆس گیرۆدەی هەمان ئەو شتە بوو کە لێی دەترسا و خەلاٚتەکەی لەدەستدا. یەکێك لە هەوادارە توندوتیژ و بێئۆقرەکانی، ئاڤیدیۆسی رکابەری لە پەل و پۆ خست. سەربازەکەیان دەیانەویست گەلەکۆمەگێرەکانی تریش لەناو بەرن بەلاٚم ئۆرلیۆس پیلانەکانی تێکدا و گوتی: "لێگەڕێن با هەڵهاتووەکان بگەڕێنەوە ماڵ و تالاٚنکراوەکان ماڵ و سامانی خۆیان پەیدا بکەنەوە. هیوادارم بتوانم ئەو قوربانییە کلۆلاٚنە لەمەرگ رزگار بکەم کە هەنوکە لە سزای خۆیان ئازار دەچێژن."

پاشان شەخسی خۆی لەگەڵ ژنەکەی بۆ ناوچەی یاخییەکان بەڕێکەوت تا ئاوێك بەئاگری فیتنە و ئاژاوەدا بکات. لە ماوەی ئەم گەشتەدابوو کە بەهۆی مەرگی ژنەکەیەوە تۆشی دەرد و رەنجێکی قووڵ بوو.

سەرەڕای ئەو بەندوباوانەی کە لەبارەی بێنمەکیی ژنەکەیەوە بلاٚوکردبوونەوە و ئەونیشانە و ئاماژەی لەسەر راستییەکەیان هەبوو، لە تەواوی ژیانی ژن و مێردایەتیدا، عیشقێکی یەکرەنگ و فیداکارانەی بۆ فۆستینا (Faustina)ی ژنی هەبوو و ئەو فیداکارییە دوایمەرگی ژنەکەیشی هەروا بەردەوام بوو. پەیکەرێکی زێڕینی هاوشێوەی بۆ دروستکرد و لەهەموو گەشتەکاندا پێی بوو. بە یادی ئەوەوە خانوویەکی بۆ بێنەوایان دروستکرد و هەموو رۆژێك لە بەرامبەر پەیکەرەکەی دەکەوتە نزا و رازونیاز.

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، هەوڵی دەدا بەسەر خەم و رەنجی خۆیدا زاڵ بێت تا لەگەڵ فەلسەفەی ستۆیسیزمدا راستگۆ و بەئەمەك بێت؛ "لێگەڕێن با بە یەکسانی لە بەرامبەر شادی و خەمدا





بمینێن ولە زەنازەنا و هەراوهۆریای خراپکاران و بۆختان و زەمی گەو جان دڵپیسی هەڵنەگرین و نەکەوینە هەیەجانەوە." لەبارەی فۆستینای ژنیەوە دەیگوت: "چەندە باش بووکە ئەو لەخەونە تەم و مژاویەکەی ژیان چاوی هەڵێنا." بەم جۆرە دیسانیش گەڕایەوە مەیدانەکانی شەڕ و بیانییە بێگوناهەکانی لەبەرخاتری دەسەڵاتەکەی کوشت و هەوڵیدا تەعبیرێك بۆ "خەونە تەم و مژاوی" یەکەی خۆی بدۆزێتەوە. لەم مۆتەکە سەرسوڕهێنەرەدا، فەیلەسووفێك کە گەیشتۆتە پلەیپاشایەتی، وەکو مرۆڤێك کە لە ناکاو لە خەوڕا پەڕیوە و زەینی بەوەهم و خەیالآتی بێبنەما بارگاوی بووە، لەبارەی حیکمەت و زانستەوە دەدوێت و لەهەمانکاتدا دەست لەکاری گەوجانە دەدات دەڵێت:"هەمووومان لە رەنج و خەمدا برای یەکترین. من ناتوانم لەگەڵ کەسێك دەمارگرژبم یان خۆم لێیان بە جیا بزانم.چونکە ئێمە بەشێوەیەکی سروشتی وەکو دەست و پێ و پێڵۆی چاو و ڕیزەکانی ددان، بۆ یارمەتیدانی یەکتر ئافرێنراوین."

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، خۆی لە هاوڕێیەتی براکانی کە بە مەسیحی ناسرا بوون لادەدا. وایدەزانی کە ئەوان بڕوایان بە جۆرە "پاشایەتییەکی سەیری ئاسمانی" هەیە کە لەگەڵ دەسەڵاتداریێتی ڕۆمەکان لەسەر زەویدا لەدوژمنایەتییەکی ترسناکدایە. ئەو لە بلاوبوونەوە پێشکەوتنی بیروڕا نوێکەدا، دوژمنایەتی و کێشمانەکێشی ئایدیالیزمی مەسیحایەتی لەگەڵ ئیمپریالیزمی ڕۆمی پێشبنی دەکرد و لەدەروونی خۆیشیدا کێشمانەکێشێکی هاوشێوەی دەبینی.

تەقوا و دورەپەرێزییەکەی هی مەسیحییەکان بوو و پەرەستییەکەیشی هی رومییەکان بوو. سەرەنجام هەستی پلەپەرستییەکەی بەسەریدا زاڵ بوو و فرمانیدا کە پێشەوایانی مەسیحی لە خاچ بدرێن.

ئەمە تاریکترین خالە لاوازە ئەخلاقییەکەی و گەورەترین تراژیدیای ژیانی بوو. کەوتنە ناو قەڵەمڕەوی دەسەڵاتداریێتی ئاسمانی بۆ ئیمپراتۆریش بەقەد خاوەن توانا و ئەوانەی سامان پاشەکەوت دەکەن، زەحمەت و دژواربوو.

**ـ ٣ ـ**

بەڵام ئەم کارە بۆ خولامێك گەلێك ئاسان بوو، بۆیە ئێپیکتێتۆس لە ئۆرلیۆس خۆشبەختتر بوو چونکە بەئاسانی دەیتوانی گیانێکی ئازاد و ئاسودە و بێقەید لە جەستەیەکدا، کە لە بەندی





خولامیدا بوو، پەروەردە بکا و دەیگوت:"من هیچم نییە تا لەدەستبدەم جگە لە ژیانم." و هێژایی و نرخێکی کەمتری بۆ ژیانی دادەنا وەك ئەو دڵبەندی و تاسەیەی کە ئۆرلیۆس بۆ تانج و تەخت هەبوو. لەبارەی بەسەرهاتی ئێپیکتێتوس شتێکی زۆر نازانین بەلام لەوەی کە لە بەر دەستاندایە بە ئاشکرایی دیارە کە ئێپیکتێتوس کەسێك بوو کە موڵکی خۆی بوو. لەگەڵ ئەوەشدا کە خولام بوو و قاچێکیشی شەل بوو، یەکێك لە خۆشحالترین خەڵکانی ڕۆژگاری خۆی بوو. چونکە لە لەشە نەخۆشەکەیدا گیانێکی تەندروستی هەبوو. باش تێگەیشتبوو کە گوێی بۆ ڕێنماییەکانی ئەقلی هەڵخات و پشت لە و یستەکانی دڵی بکات؛ "هەرکاتێك نەتوانی هەنگاونانەکانی خۆت بگەیێنیە ئاستی

پلەپەرستی، ئەوا ئەمە لەگەڵ ئەوە بگونجێنە".

ئێپیکتێتوس رەوشە سووك و پەستەکەی خۆی لە ژیاندا بەبێ بایەخی و بە زەردەخەنەوە پەسندکرد و وەکو ئەکتەرێکی شانۆ هەم باش فێر ببوو کە چۆن خۆی لەگەڵ دەردوڕەنجدا بگونجێنێت و هەمیش وەکو تەماشاکەرێکی سەرخۆش، دەیزانی چۆن بە رەنج و دژوارییەکانی خۆی پێبکەنێت.

گەورە (ئاغا) کەی ئەو، ستەمکارێکی تازە بە دەسەڵات گەیشت بوو کە چێژی لە ئەشکەنجەی ژێردەستان وەردەگرت.

رۆژێکیان ئێپیکتێتوسی ئازار (ئەشکەنجە) دەدا و ئەو (ئێپیکتیتۆس) بە گەردەنیشەوە گوتی: "وا باشترە واز بێنی مەگەرنە قاچم دەشکێنی" و کاتێك قاچی شکا فەیلەسووفەکە بە هەمان گەردەنیش و پشودرێژیەکەی پێشوودرێژەی پێدا: "نەمگوت قاچم دەشکێنی؟!"

بۆ هەرکوێیەك بڕۆیشتایە بەدبەختیشی لەگەڵ بوو. دوای ئەوەی کە گەورەکەی جیهانی جێهێشت، ئازادییەکەی خۆی بەدەستهێنا و لە رۆما دانیشت و کەوتە وتنەوەی وانەکانی فەلسەفە. دۆمیسیەن (Domitian)ی ئیمپراتۆری رۆم، ئەوی لەگەڵ چەند فەیلەسووفێکی تر لە شار کردە دەرەوە. لەو کاتەدا ستەمکاری و حیکمەت نەیاندەتوانی لە یەك شوێندابژین.

ئێپیکتێتوس لە یۆنان قوتابخانەیەکی کردەوە و ناو بانگێکی دەرکرد بەلام هەروا بە هەژاری مایەوە. ئەو بە هەمان بێ بایەخی و بێ پیتەیی ستۆیکەکان سەیری ناوبانگ و هەژاریی دەکرد.

رۆژێکیان چراکەیان لێ دزی، بەڵام ئەو نیازی تەمێکردنی دزی نەبوو و وتی: "دز بەهایەکی گرانی بە چراکە داوە چونکە چەند (شاهی) یەکەم، کە نرخەکەیەتی، لەدەست داوە بەڵام ئەو گیانی خۆی لەبەرامبەریدا گلاوکردووە". لەڕوانگەی(ئێپیکتێتۆس)ەوە ئازادیی گیان لەدونیادال هەموو شتێك بەنرختر بوو؛ "ئێوە دەتوانن لەشم بە زنجیر ببەستنەوە... بە برسیەتی بمهێڵنەوە، تەنانەت دەتوانن لە ناوم بەرن بەڵام ناتوانن ئازارم پێگەێنن (ئازار بە (من) بگەێنن). ئەم "من"ە بەشە نەمرەکەی بوونی منە."

بەم جۆرە ئێپیکتێتۆس بە لەشێکی ڕەنج چەشتووەوە، خەمڕەوێنی و ئاسوودەیی خۆی لە ئازادیی گیاندا بینی و بۆ ئەوەی هەردەم ئازادیی ڕۆح بە پارێزراوی بهێڵێتەوە، هەرگیز خۆی نەدا بەر ژنهێنان بەڵام بەتەنیاییش نەدەژیا بەڵکو ئەو مناڵەی بە زڕمناڵی پەسندکرد کە خزمەکانی بەهۆی دەستکورتی و نەدارییەوە لە باری مەرگدا بەجێیان هێشتبوو و پەرستیار (مامان)ێکی هێنا ماڵەوە تا چاودێری مناڵەکە بکات.

ئێپیکتێتۆس چەشنی فەیلەسووفە ستویکەکان بە سادەیی ژیانی گوزەراند و لەگەڵ ئەوەشدا کە هەرگیز قسەیەکی لە عیسای مەسیحەوە نەبیستبوو، هاوبەش پەیداکەرێك بوو کە لە سەر شێوەی مەسیحییەکان ژیا.

"حەقیقەت وەکو رووناکی خۆر لە دەمیلە (یان کلاوڕۆژنە)ی جۆراوجۆرەوە رووناکی بڵاو دەکاتەوە یان بە واتایەکیتر لە کات و شوێنە جۆراوجۆرەکانەوە و بە روونکردنەوەی جۆراوجۆرەوە پێمان دەگات. بەڵام حەقیقەت و واتاکەی لە هەموو بارێکدا یەك شتن هەروەك باوکایەتی خواوەند و برایەتی تاکەکانی ئادەمیزاد و دەستووری کاری "*ببەخشەو ببورە" هەموویان تەعبیری جۆراوجۆری یەك حەقیقەتن."بێ قسوری کردن ببەخشە و لەو کەسانە ببوورە کەناتوانن پاداشتی چاکەی تۆبدەنەوە."

لەسەر و هەموو ئەمانەشەوە و بەپێچەوانەوەی ئۆرلیۆسەوە، ئەو پیاوێکی ئاشتیخواز بوو و ئاشکرای دەکرد:"ژیان لەڕاستیدا شەڕ و جەنگە بەڵام جەنگ لەگەڵ دوژمنایەتیدا نەك لەگەڵ دوژمن" ئێپیکتێتۆس دەیوت: "دوژمنەکانی خۆتان بەهۆی بە دۆستکردنیانەوە لەناوبەرن." و

* مەبەست بەخشینی ماڵ و گیانی لێبوردەییە



ئەم ڕایە لە تویێی چیرۆکێکی دڵگیردا بەم شێوەیە دەردەبڕێت: "لێکورگوس (Lycurgus)ی یاسادانەری سپارد لەکاتی هێورکردنەوەی ئاژاوەیەکدا کەوتە بەر هێرش و چاوێکی کوێربوو. هێرشبەریان دەستگیرکرد و بەویان سپارد تا سزای بدات بەڵام لیۆرگوس لەگوناهەکەی بۆری و کردی بە قوتابی خۆی، چەند مانگێك دواتر لەگەڵی چوو بۆ تیاتر و (Tueartre) و لەبەرامبەر چاوە پڕ لە سەرسامییەکانی خەڵکدا وتی: "من دەرحەق بەم کوڕە بەگوێرەی داد و لۆژیك هەندێ سزام بە ڕەوا بینی. ئەوم لە وێنەی تاوانبارێکدا وەرگرت و ئێستاکە وەکو تاکێکی بەڕێز و هێژا بە ئێوە دەسپێرم."

ئەم چیرۆکە کە پێناسەری ئاکاری لێکورگوسە لەگەڵ میزاجی (ئێپیکتێتۆس)یش دا بە تەواوەتی دەگونجێت. ئەو لە بەرامبەر ئەو ڕەفتارە ناشیرین و ناپەسەندانەی، کە لە تاوانبادانەوە دەبینی، چاکەی دەنواند و ئەوانی بۆ خەڵکێکی بەڕێز وەرەچەرخاند.

- ٤ -

بەم شێوەیە دەبینین کە ئۆرلیۆس و ئێپیکتێتۆس لە دوو ڕێی جیاوازەوە چوونە ناو قوتابخانەی ستۆیسیزم و ڕوانگەی جیایان هەبوو. فەلسەفەی ئیمپراتۆر نێگەتیڤ بوو و دەیگوت لەبابەت ئەو شتەوە کە بە دەستت نەکەوتووە خەمگین مەبە، بەڵام فەلسەفەی خولامەکە ئەرێنی بوو و دەیگوت بەوەی کە هەتە شادوومان بە.

ئۆرلیۆس هەوڵیدەدا چاو لە ئاست گلاویەکانی جیهاندا بنوقێنێت و نەیانبینێت؛ "کاتێك خیار تاڵ بێت، فڕێیبدە. ئەگەر درك لەسەر ڕێت ڕوواوە، خۆت لێ لابدە. بەس ئەوەندە. ئیتر مەپرسە کە لەبنەڕەتدا بۆچی ئەم جۆرە شتانە ئافرێنراون." بەڵام ئێپیکتێتۆس هەموو گلاوی و دژوارییەکانی ژیانی وەکو بەشی پێویستی ژینی قبووڵکرد؛ "لە بەرامبەر تاڵیدایە کە شیرینی هێندە شیرینە. بەهۆی دەرچوون لە تاریکیەوەیە کە هەڵهاتنی خۆر ئەوها شادیبەخش و خەونئامێزە."

جیاوازی بیردۆزە فەلسەفییەکانی ئۆرلیۆس و ئێپیکتێتۆس لە سەرتاپای ڕەفتاریاندا دیارە. ئۆرلیۆس پێکی شکۆ و گەورەیی بە تەواوەتی هەڵدەدات و ئێمە لەدەردەکەی دووردەخاتەوە "کامیلۆس(Camillus)، سپیپۆ(Scipio)، سزار(Caesar)، ئۆگوستوس (Augustus)،





هادریان(Hadrian)، ئانتونیوس(Antonius") ئەم ئیمپراتۆرانە هەموویان لە یاد کراون. هەمووشتێك بە هەڵەداوان ڕووی لەکۆتاییە و وەکو ئەفسانە دێرینەکان ساتێك دێنەسەر زمانی ئەم و ئەو وپاشان لە ناو یاد چوونەوەدا لە یادەکاندا دەسڕێنەوە." بەلاّم ئێپپیکتێتوس کە بە رادەی کافی ڕەنجو دژوارییی چەشتووە بە ئومێدی هاتنی ڕۆژگارێکی باشتر توانا و هێزیکی دەروونیمان پێ دەبەخشێت؛ "قایل بە. ئەوەی خوا بۆی کردووی بە چارەنووس لەوە بەرزترە کە تۆ هەڵی دەبژێری. ئارام و دڵنیابە کە سبەی، وەکو ئەمڕۆ، خواوەند ئەوەت پێ دەبەخشێت کە بۆ گیانت شایستەترە." کەواتە فەلسەفەی ستۆیکی دوو مەبەستی هەیە. لە لایەکەوە لە خۆپەستی و بەفیزی دەوڵەمەندان کەم دەکاتەوە و لە لایەکی ترەوە بێفیزی و خاکێتی دەستکورتەکان بەهێز دەکات. ئەم فەلسەفەیە توانای ئەوەمان پێدەبەخشێ کە لە راست و ڕێکی تەبیعەت و چاکەکاریی ژیاندا ڕاددەی ناوەند بەدەستبێنین. لەم بابەتەدا هەردوو فەیلەسووفەکە هاوڕێنە. دەوڵەمەندی و هەژاری، ئاغایی و کۆیلایەتی، شادی و ڕەنج، بە موراد گەیشتن و نامورادی هەموویان مەسەلەی بێ متمانەن گرنگ ئەوەیە کە هەموو خەڵك لە کۆتاییدا یەکسانن. تیرەی ستۆیسیزم دەبێت بەیەکەمین پارتیی دیموکراتێك لە مێژوودا دابنرێت.

ئۆرلیۆس و ئێپپیکتێتوس دەیانگوت؛ هەموومان دیلی چارەنووسی خۆمانین. تاکەکانی مرۆڤ لە بارودۆخی جیاوازدا هاتوونەتە دونیاوە بەلاّم سەرئەنجام هەموویان چارەنووسێکی وەك یەکیان دەبێت. مەرگ زیاتر لە دەوڵەمەند دەستێنێت تا هەژار بەلاّم بەهەرحاڵ ئاکامەکە یەك شتە. ئەوەی بەجێ دەمێنێت گیانێکی نەمرە. کەواتە وەرن با سەری خۆبەدەستەوەدان بۆ چارەنووسی خۆماندا بنوێنین چونکە دەزانین کە ئەمە ڕێگایەکی قایلکەرە. ئۆرلیۆس دەڵێت: "بۆهەر کوێیەك کەدەتەوێت فڕێم بدە. من خوای خۆم لە زەمیرە ساف و ڕووناکەکەی خۆمدا هەیە." ئێپپیکتێتوس لە رەوشێکی هاوشێوەدا دیاریدەکات: "من دڵم بەوە خۆشە کە خواوەند گیانی منی بە خۆم بەخشیوە و هێندە بایەخی پێداوم کە گوێڕایەڵی هێزی خوایەتی خۆم بم..."

کەوابوو تۆ لە (خود)ی خۆتدا، نزیکترین هاوڕێی خۆتت هەیە و ئەگەر ئاگادار نەبی ترسناکترین دوژمنی خۆتت هەیە. بەداخەوە زۆربەمان گیانێکی بچووکمان لە لەشێکی گەورەدا هەیە و بەو هۆیەوە ئەو فشارەی کە دەکەوێتە سەرمان ئێجگار قورسە. وەرن با





زەرفییەتی* خۆمان بپێوین و بەگوێرەی ئەو بژین. وەرن با لە کردەوە و هەیەجان و فیکرەکانی خۆماندا لەبار و سازگاربین. پلەپەرستییەکی زۆر، وەکو مەیخواردنەوەیەکی لەڕادەبەدەر، ترسناکە پێکی یەکەم چێژ دەبەخشێت، پێکی دووهەم سەرخۆشی دروستدەکات، پێکی سێیەم کارەکە دەگەیێنێتە تەعدا و بێ ڕێزی.

لە هەرشتێك کە هەیەجان و وروژانی لێدەکەوێتەوە جا چ دەروونی بێت یان جەستەیی، خۆت دوور خەرەوە چونکە دەبێتە هۆی تاریکبینی و ستەمکاری. تەواو کۆنترۆڵت لەسەر نەفسی خۆت هەبێت. ئەوەی بە تۆ دەگات لە چاکە و خراپە، بە گیانێکی ئارام قبووڵبکە. دڵنیابە کە خوا لە تۆ زاناترە بۆیە بەگوێرەی ڕەزامەندی ئەو ژیان بەسەر ببە. بە واتایەکیتر هاوڕێیەتی ڕەوتی سروشت بکە کاتێك بەرەو کۆتاییەکی واجبکراوت دەبات. ئەو بەدبەختییە رۆتین و ئەو دژوارییانەی کە رووت تێدەکەن ڕەنگە ئەو بەربەستانە بن، کە بۆ تاقیکردنەوەی گیانت، لەسەر ڕێگای تۆیان داناوە. پشت بە حوکمدان و خۆشەویستی و چاکەی خوا ببەستە. ئەوەی دێتە پێش تەواوە. تەنانەت مەرگیش پیرۆزە گەر لەدایکبوون پیرۆز بێت. هەریەکە لەو پێشهاتانە داوەتێکە بۆ گەیشتن بە سەری ماڵێکیتر و چوونە ناو قۆناخێکی سەرووتر کە خوا پێشتر بۆی بەوپەڕی راستی و وردبینییەوە هەڵبژێردراوە.

ئەرکی تۆ لە هەر قۆناخێکی ژیاندا لە ئەرکی ئەکتەری تیاتر و دەکات. فێری قسەکانی خۆت ببە و یەکەمجار لەگەڵ کردەوەکانی خۆت و پاشان لەگەڵ قسە و کردارەکانی ئەکتەرانیتر بگونجێنە (هاوئاهەنگ بکە). لە خولق و میزاجی خۆت وردببەوە و بیپشکنە و داواکراوەکانی بەجێ بگەیێنە."خواوەند دوو گوێی پێداوین لەگەڵ زمانێك واتا دوو قسە ببیستە و قسەیەك زیاتر مەڵێ." دوو گوێ بۆ بیستن، زمانێك بۆ دوان و دوو دەست بۆ ئەنجامدانی چاکە و چاکەکاری. بە روویەکی کراوەوە گوێ بۆ قسەکانی براکەت رادێرە و لە خەم و رەنجەکانیدا هاوبەش و خەمخۆری بە، بەلاّم گلیەیی و سکالاّ لە خەم و رەنجەکانی خۆت مەکە. لە ناو خەڵکدا و لە کۆمەڵگای گەورەی مرۆڤیدا وەکو ئەندامێکی دلێر و ئومێدەوار و هاوکار بژی.

* فراوانی لەخۆگرتن (Capacity) و. کوردی

بیردۆزە رامیارییەکانی فەیلەسوفە ستۆیکەکان، وەکو بیروڕا ئاکاریەکانیان، هەموویان گشتی و جیهانی بوون. ئیمپراتۆر گوتوویەتی: "لەو رووەوە کە مارکۆس ئۆرلیۆسم، شاری من رۆمە، و لەبەر ئەوەش کە مرۆڤم ولاتم هەموو دونیایە." و ئێپیکتێتیۆس رایەکی هاوشێوەی دەربڕیوە، لەوێدا کە دەڵێت "لە ژیاندا لە ژێر فەرمانی ئەقلدا بەو لە بڕی ئەوەی کە تەنیا ئەندامێکی خێزان و شار و ولاتی خۆت بی، هەولدە ببی بە هاوولاتی هەموو تاکەکانی مرۆڤ."

تەنیا لە و ڕێگەیەوە، واتا بە گۆڕینەوەی شەهوەت بە دلۆڤانی و نەفرەت بەخۆشەویستی، دەتوانی ژیانێکی هاوئاهەنگ و گونجاو لەگەڵ ڕەزامەندی خواوەندت هەبێت.

هەریەکە لە ئۆرلیۆس و ئێپیکتێتوس پێداگریان لەسەر هاوکاری و هەرەوەزی خەڵکان دەکردەوە لەڕێگەی ئامانێکی هاوبەشدا. بەکورتیدەبێت کە ئەم هەردوو فەیلەسووفە ستۆیکە قسە و دەربڕینی هاوشێوەیان هەیە. هەردووکیان پێکهاتە (ستراکتۆر)ی جیهانی بە لەشی مرۆڤی بەراورد دەکەن"بەشێوەیەکی جیایانە و تاکانە سەیری هیچ بابەتێك مەکە و وا دامەنێ کە مەسەلەیەك تەنیا پەیوەندی بە تۆوە هەیە. کاری تۆ دەبێت بەگوێرەی کاری دەست و پێی تۆ بەمەرجێك کە ئەوان ئاگاداری پەیوەندی خۆیان بن لەگەڵ دڵ و دەرووندا."

شتێکی سەرنجڕاکێشە کاتێك ئێمە هاوشێوەی ئەم بیروڕایانەی فەلسەفەی ستۆیسیزم لە بنەماکانی مەسیحییەتیشدا دەبینرێن، لەوێدا کە سانت پۆلس دەڵێت:"هەرچەندە ئێمە جیاجیاینە بەلام لە ڕاستیدا هەموومان ئەندامانی بەدەنێکی جیهانینە... هەموومان ئەندامانی یەکترین." ئەو شاعیرە رۆژهەلاتییە سەرنجی ئەو خاڵەی داوە کە گوتوویەتی "ڕووناکی حەقیقەت لە زەینی خەڵکاندا ڕووناکیدانەوەی جیاوازی پەیداکردووە. نەوەکان (ڕووناکیدانەوەکان) جیاوازن بەلام حەقیقەت یەك شتە."

## - ٥ -

ئەم کورتەیە، کۆمەڵەیەکە لە فەلسەفەی ستۆیسیزم کە لە رووی بنەما ئاکارییەکانەوە هێندە لە مەسیحیەتەوە دوور نییە و وەکو مەسیحییەت فەلسەفەیەکە کە دەکرێ لەگەڵ هەرکەسێك بگونجێت. شتێکی تەواو لۆژیکییە کە دوو مامۆستای خاوەن ڕێزی ئەم قوتابخانە فەلسەفییە، لەبەرزترین و نزمترین چینی کۆمەڵگا هەڵسابن. ئەمە یەکێك لەوانە دیارەکانی مێژووە کە



مامۆستا رەشبینەکەی ئەم قوتابخانەیە، منالێکی خۆشبەخت بێت لەکاتێکدا کە مامۆستا گەشبینەکەی زڕمناڵی پێداویستی و ئاتاجی بێت. ئۆرلیۆس گوتوویەتی: "دونیا سەرتاپا خەم و دەردە گەرچی پاشاش بی." و ئێپیکتێتوس ئاشکرای کردووە: "دونیا لێوانلێوی شادی و خۆشییە هەرچەندە خولامیش بی" و کێ نالێت کە هەردووکیان ڕاستیان کردبێت.





# کۆچی سانت ئاگوستین (٣٥٤ ـ ٤٣٠ ز)

## له گلاۆییه‌وه بۆ پاکژی

ئاکاری سانت ئاگوستین کەم تا زۆر لە ئاکاری *تۆلستۆی دەکرد. هەردووکیان سەردەمی منالّیان بەوپەڕی خۆشگوزەرانییەوە بەسەر برد. هەردووکیان خۆیان دایە دەست تکا دەروونییەکانی خۆیان، گوناهیان کرد و رەنجیان چەشت تا سەرئەنجام ڕێگەیان بەرەو رووناکی کردەوە و کاتێك لە ڕۆژگاری پیریدا بۆ ڕێگەی راست ڕێنمایی کران کەوتنە ئامۆژگاری کردنی لاوان تا وەك خۆیان لە ئارامی و پاکیدا ژیان بەسەر بەرن و داوێنی خۆیان بەگوناه پیس نەکەن. ئەم دووانە لەخالّێکی دەروونناسی بێ ئاگابوون لەوەی کە هەبوونی بیرێکی رووناك و ژیانێکی ئارام هێندە ئاسان نییە کاتێك کە هەستەکان لە جۆش و خرۆشدا بن. تەنیا لەو کاتەدا کە ئاگرە دەروونیەکان کوژا نەتەوە و بڵێسەکان دەنیشتنەوە دەتوانرێ بە گەردەنیشی و ئارامیی فەلسەفییانە بە سەریاندا زالّ بن و جڵەو بکرێن. ئامۆژگاریکردنی لاوان لەلایەن پیرەکانەوە بۆ زاهیدی و لە خواترسی (تەقوا)، بەتایبەت کاتێك کە خۆیان لە سەردەمی لاوێتیدا لە زاهیدی بە دوور بوونە، هێندە کاریگەری نابێت. لەو رووەوە ئامۆژگارییەکانی سانت ئاگوستین وەکو ئەوانەی تۆلستۆی خالّی بوو لەبروا و کاریگەری. بەلاّم چیرۆکی گوناهەکانی و روو تێکردنی ئەو لە پاکی و پیرۆزی یەکێکە لە بەسەرهاتە دلّبزوێنەکانی جیهانی فیکر.

* Tolistoy (١٨٢٨ ـ ١٩١٠) گەورە ڕۆماننوسی روسیایی





دەکرێ ڕوون کردنەوەی ژیانە سەرەتاییەکەی سانت ئاگۆستین بەکورتی لەراز و نیازەکەیەوە دەرك پێبکرێت کە دەیگوت "ئەی پەروەردگار داوێن پاکی و تەقوام پێ ببەخشە، بەلاّم نەك ئێستا." ئەو تامی گوناهی چەشت بوو و رقی لەو مێوە یاساغکراوە بوو کەچێژەی دەبەخشی یان بەواتایەکیتر چێژی لەو میوەیە وەردەگرت کە رقی لێبوو. سانت ئاگوستین کە لە سالّی ٣٥٤ی زایینیدا لە باوکێکی خوانەناس و دایکێکی‌مەسیحی، لەدایکبوو هەر لە تاقی ساوایەتییەوە کەوتە ژێر کاریگەری بیروڕای ناودژ(دژیەك). باوکی دەیویست ببێت بە مامۆستا و دایکی خوازیار بوو ببێت بە قەشە سەرەتا باوکی بوو بە ڕێنماییکەری و ئاگۆستین کەوتە خوێندنی فەلسەفە و واتاکانی دەربڕین و هونەری و وتاردان کە دەتوانێت هەلّە(خەتا) بە هۆی پەیڤە جوانەکان و گوتە رازاوەکان ڕاست بەدیاردەخات. ڕۆژگاری منالّییەکەی بەشێوەیەکی ئاسایی بە کار و یاری و وەرزشەوە بەسەرچوو. جارێکیان بە هاوڕێیەتی هاوکایەکانی بۆ دزینی هەرمێ بە درەختی مالّی هاوسێکەیاندا هەلّگەڕا بەلاّم تالّی و شوورەییەکەی شەرمەزاریی ئەم کردەوە منالاّنەیە هێندە کاری کردە سەر گیانی (دەروونی) کە ئاگستین دواتر چەند بەشی پەرتووکەکەی خۆی بەڕوونکردنەوەی ئەم "گوناهە تۆخ". ڕەش کرد"ئەنگیزەی ئەو لە دزینی ئەو میوەیەدا، برسێتییەکەی نەبوو و دایك و باوکی هەرمێی چاکتریان لە مالّەوە هەبوو. ئەو گوناهێکی فیتنەکارانە بوو و منیش، ئەی خوای گەورە، ئەوم خۆشدەویست. دلّبەندیی من بۆ هەرمێکە لەبەر ئەوە نەبوو کە برسی بووم بەلّکو خۆشەویستی خۆم بۆ گوناهەکەم دەردەبڕی."

ژیانی منالّی و لاوێتی ئەو بەم بێسەروبەری و تالّییەوە بەسەرچوو. وەکو فاوست گوتە بەردەوام گوناهی کرد و تۆبەی کردودیسان دەستی بە گوناه کردەوە و "بە لەپە کوتێ" بەرەو ڕووناکی ڕێگەی خۆی کردەوە. بەگوێرەی دانپێدانی خۆی لە تەمەنی پێگەیشتن (بالّغی)دا پیاوێکی "درۆزن و ملەستور و فێلّباز" بووە و هەمیشە بۆ گەمە و شۆخی ئامادەبووە" "هەردەم لەناو ئاگری ئەڤین وشەهوەتدا دەکولاّم و لە ئەنجامدانی گوناه و تاواندا پێم ئەردی نەدەگرت."

دەبێت لە قبوولّکردنی ئەم داخوایانیانەدا کەمێك دوودلّ بین. سانت ئاگوستین هێندە لە فشاری بێ سنوری خراپەکاری و گوناهداری ڕەنجی نەدەچێشت بەلاّم ئاگایی و هۆشیاریی ویژدانەکەی بە دژواری ئەشکەنجەی دەدا. لە سەرتاپای دانپیانانەکانیدا رووبەڕووی لاوێکی رووناك و هەستیار





و ئارام دەبینەوە کە گیرۆدەی رەنج و ئەشکەنجەیە کە بۆچی باشترلەوە نەژیایە کەسروشت و میزاجی داوای دەکرد ئەو شەوق و زەوق و ورژووانی سەردەمی لاوێتی بە رووچوون بەناو چڵکاوێکدا گوزارشت دەکات و دەڵێت" ئەو عیشقە توندوتۆڵەی کە بەرامبەر بە تیاترو هەبوو"وەکو زیادکردنی ئێزنگ بۆ سەر ئاگرێکی درەوشاوە" بووەتە هۆی ئەوەی کە ئاگری شەهوەتی زیاتر بڵێسە بسێنێت. دیارە کە سانت ئاگوستین تەقوا و داوێنپاکیی خۆی بە کەم زانیوە و لەبارەی گوناهەکانی ڕیگای زیادەڕۆویی (یان بێ هۆدەیژی) دەگرێتە بەر. کامەرانی خۆی لە مامۆستایەتی و فێرکاریی زانستی واتاکانی بەیانکردن بە هیچ دەزانی و بەهۆی نوستن لەگەڵ ژنێك کە لێی مارە نەکرابوو، خۆی بێ بەزەییانە سەرکۆنە دەکات: "من و ئەوژنە چەندین ساڵ بە نغرۆیی لەناو گوناهدا پێکەوە ژیاین."و بەرهەمی ئەم پەیوەندییە منالێکی ناشەرعی بوو بەناوی ئادیۆداتوس (Adeodatus).

ئاگۆستین خۆشەویستی بەرامبەر بە منالەکەی دەردەبڕی و لە ئەڤینەکەی خۆی سەرشۆڕ و شەرمەزار بوو چونکە ئەوی بە زادەی گوناە دەزانی. ئاگوستین چەند پەرتوکێکی لەبارەی "داد و راستی" لە ژیانی مرۆڤیدا، نووسی بەلاّم پاشان نکۆڵی لەوەکرد کە هی ئەو بن. ئەو خۆی بە "گیانێکی نغرۆ بوو لە دەریای گومڕاییدا" ناو دەبرد. کاشکی هەڤدە سالاّن بوو باوکی مالّئاوا دایکی کە ئایینداریێکی ڕاستین بوو بۆ کوڕەکەی نزای خێری دەکرد بەلاّم ئاگوستین دەڵێت: "نزای خێر و نەزەر و ئاتاجیی دایکم نەیتوانی بچێتە دڵمەوە." ئاگوستین ئامۆژگارییەکەی دایکی کە دەیگوت: "خۆت بەزینا پیس مەکە و هەرگیز بەچاوی خراپ چاو لە ژنێکیتر مەبڕە" بە چەست و سووك زانی و هەروا درێژەی بە ڕێگاکەی دا و یەکبینە لە رووناکی و رۆشنایی هەڵدەهات"... بە شوێن بزربووێکەوە بووم کە لە حەقیقەتەکەی بێئاگابووم"

لەو سەردەمەی سەرگەردانیدا کە بە شوێن گیانی خۆیدا بۆ هەر لایەك بەرێدەکەوت، لە بەفریقای زێدی خۆیەوە، هاتە شاری ڕۆما و لەوێوە بەرەو میلان کەوتەڕێ. لەم شارەدا دەستیکرد بە وانەووتنەوەی واتاکانی دەربڕین بەلاّم ئەم مامۆستایە هێشتا خۆی لە قۆناخی قوتابییەتیدا بوو. هێشتا تینووی گەشەسەندن و قازانجخوازی و پیاهەڵگوتن و ستایشی ئەم و ئەو بوو. بەلاّم تا کەی؟





یەکەمین وانەی کە لە بارەی بێ فیزی و خاکێتی فێربوو بەم جۆرە بوو. لەستایشی ئیمپراتۆری رۆمدا وتارێکی بەیانکرد و ئەو قسانەی کە؛ "بە درۆ و دەلّەسە (قسەی بێ کەڵك و تڕوهات) بارگاوی بوون، لەلایەن ئەو کەسانەوە، کە دەیانزانی درۆ دەکەم، بە چەپڵە لێدان و ئافەرین گوتن پێشوازی لێکرا." ئاگوستین کە لەو سەرکەوتنە شاگەشکە ببوو، بە گەرووییێکی هەڵپفاوەوە لەگەڵ گرووپێك لە هاوڕێکانیدا چوو بۆ پیاسەکردن لە ناو شەقامەکانی شاری میلان. لە رێدا رووبەڕووی سواڵکەرێك بوونەوە کە "لەو ساتەدا سکی تێر و شاد و کەیفخۆش بوو".

ئەم رووبەڕووبوونەوەیە کاریگەری و شوێنەوارێکی قووڵی لەسەر ئاگوستین بەجێ هێشت و لای خۆی بیری کردەوە: "ئەوەی کە هەژارێك دەتوانێت بە دەستی بەتاڵ بکرێت، من لەوە دەگەڕێم کە بە ئافەرینبێژی و ڕێزلێنانی بێ بەرهەم دابینبکەم کە خەڵك بەرامبەرم ئەنجامدەدەن. سواڵکەرەکە لە مەستی و بێ خەمی و منیش لەو شانازی و سەربلّندییەی کە بەرم کەوتووە، لەشادی و شاگەشکەییدا نغرۆ بووینە، چ جیاوازییەك لەنێوان من و ئەودا هەیە؟"

لەوساتەوە ئاگوستین بڕیاریدا کە ئیتر دەست لە دەرۆزەکردنی شانازی و شکۆ وگەورەیی بشواتەوە. ئیتر کەوتە ڕێگەیەکەوە کە بتوانێت گیانە ون بووەکەی خۆی بدۆزێتەوە. بەڕای ئەو شادیی هەرکەسێك بە میزاج و نیهادی خودی ئەو کەسە پەیوەستە و لەو میانەدا ئەوەی کە بە راستی بەنرخە" "ئەو شادیەیە کە لە ئومێدێکی بارگاوی بە باوەڕ" هەڵدەقولێت ـ بڕوا بە چاکەی خوا و ئومێدەواربوون بە رزگاری گیان.

## ـ ٣ ـ

هێشتا ئاگوستین نەگەیشتبووە کۆتایی کۆچەکەی."من بە سەر لە خۆبایێتی و شانازیدا سەرکەوتم بەلاّم هێشتا دۆڕاوی شەهوەتی خۆم بووم." لەوڕووەو بەیارمەتی ئەو چەند هاوڕێیەی کۆمەڵگایەکی هاوبەشیی دامەزراند کە وەك خۆی پشتیان لە"هەراو هۆریای ژیان" و لە "بازرگانان و جم و جووەکانیان" کردبوو. ئەوان لە خانوویەکی شڕدا کۆ ببونەوە و ماڵ و موڵکی خۆیان یەك خست بەلاّم کۆمەڵی ژنان هەموو پیلانەکانیانی کردە نەخشی سەر بەفر و ئیرەیی ژنانە ئەم کۆمەڵەی پەرێشان کرد. لە قۆناخەی ژیاندا، هەمیشە بوونی ژنێك رێگەی لە ئاگوستین دەگرت بۆ رزگارکردنی گیانی: "لە رۆیشتن بەرەو لای حەق خۆم دوا دەخست چونکە

"دەمبینی کە مرۆڤێکی کلۆڵ و بێچارەمە تەنیا لەو کاتە نەبێت کە لە باوەشی ژنێکدام."
دایکی هەوڵیدا ژنێك بۆبخوازێت تا هەوەسبازییەکەی کەم بێتەوە. ئاگوستین وازی لە دڵدارەکەی خۆی هێنا کە بەتوندی دڵی پێوە بەندبوو و بووە دەزگیرانی کچێك بەلاّم ناچار بوو دوو ساڵ بۆ زەماوەند چاوەڕێ بکات چونکە کچەکە دوو ساڵ لە تەمەنی یاسایی بچووکتر بوو. ئەم ماوەیەی دوورەپەرێزی بۆ "برسییەکی بێ ئۆقرە"ی وەکو ئەو ئێجگار درێژخایەن بوو. پەنای بۆ باوەشی دڵدارێکیتر برد و دەستیکرد بە رابواردن و خۆشگوزەرانی و لەو رووەوە کە هەروابە "خولامێکی ناکەس لە ناو دەستی شەهوەتدا" مابۆوە، چەندەها جار خۆی سەرزەنشت کردبوو. سەرەنجام گرێبەستی ژن و مێردایەتی (مارەیی) لەگەڵ کەسدا گرێ نەدا و بە و گۆڕانەی کە لە رەوشیدا روویدابوو، لە ژیانیدا بە زگوردی مایەوە.

گۆڕانی ڕەوشی، تارادەیەك پەیوەست بوو بە پاڕانەوەکانی دایکییەوە. هەروا کە تەمەنی بەرەو زیادبوون دەرۆیشت زیاتر "تۆشبوون بە گوناه" دڵی دەرەنجاند. شەوق و زەوق لەرێگەی چێژە جەستییەکاندا جێی خۆی بە خزمەت و بەندایەتیدا لە بەر دەرگای گیاندا و ئاگوستین چاوپۆشی لە خۆشگوزەرانی و رابواردن کرد لەپێناو ئاییندا. روون کردنەوەی ئەم لە خۆبردوویی و فیداکارییە یەکێك لە بەشە ئێجگار کاریگەر و پڕهەیەجانەکانی "دانپیانانەکان"ی ئەوە.

ئاگوستین لەگەڵ یەکێك لە هاوڕێ گیانی بە گیانییەکانی خۆی لە باخەکەیدا دانیشتبوو. گیانی کە "لە ئاستۆنی وەرگرتنی بڕیارێکی ژەهراوی" دابوو بە ئاشکرایی کەوتە هەیەجان“ "دوو هێزی دژیەك لەگەڵ یەکتر لە شەڕ و ململانێدا بوون تا گیانی من داگیربکەن." هاوار و هەراوهۆریا لەلایەن جەستەوە و ئارامی و نەرمی نواندن لەلایەن خواوە، ئەوی بە خۆوە سەرقاڵ کردبوو. هاوڕێکەی هەیەجان و ورووژانی ئەو لە بێدەنگی و کش و ماتیدا سەیردەکات.

ئاگوستین کاتێك لەکۆتاییدا بەسەر هەیەجانی خۆی زاڵدەبێت، "قوڵپی گریانی ناو گەرووی دەتەقێتەوە و دەکەوێتە گریان و لەو رووەوە کە وەکو ژنان فرمێسکی هەڵڕژاون" بەشەرمەزاری هاوڕێکەی بەجێ دەهێڵێت و ماوەیەکی کورت دەچێتە گۆشەیەکی تاریکی باخەکە. لەوێدا، لەژێر درەختی هەنجیردا خۆی فڕێدەداتە سەر زەوی و هەستەکانی خۆی بەرڵلا و ئازاد دەکات. لەکاتی شێوەن و ناڵە و هاواربردندا ئاوازێك دەبیستێت، ئاوازێکی منالانە کە بانگ دەکات: "هەیلگرە و بخوێنەرەوە، هەڵیگرە و بخوێنەرەوە" و ئەو ئەم بانگەی وەکو "فەرمانێك لە لایەن





خواوەندەوە" وەردەگرێت و بێ مەبەست بەرگێکی پەرتووکی سانت پۆلس دەکاتەوە و تیایدا ئەوها دەخوێنێتەوە: "پشت بە سەرپێچیکاری و لاساری و مەستی مەبەستە و هەروەها بە وێڵگەڕی و بێشەرمی و شەڕخوازی و ئیرەییش. بەڵکو تەنیا دەبێت روو لە خوا بکەی و پشت بەو ببەستی."

ئیتر زیاتر ناتوانێت بخوێنێتەوە. پێویستیش نییە. خۆی دەڵێت:"لەو ساتەدا، لە کۆتایی ئەم ڕستەیەدا، ڕووناکییەك کەوتە دڵم و پەردەی تاریکی گومان و دوودڵی دا دراند." داواکاری ئەو لە خوا تا ئەوکاتە ئەمە بوو: "داوێن پاکی و تەقوام پێ ببەخشە بەلاّم نەك ئێستا." لەوە بەدواوە دەیگوت:"سبەی چەند درەنگە. خوایە بۆچی هەر ئێستا تاریکییەکانی ژیانی من ناسڕییەوە!"

بەم جۆرە گیانی ئاگوستین "پشتی لە شەیتان کرد و رووی لە خواکرد."

- ٤ -

ئەو فەلسەفەیەی کە بەهۆی لێگەڕانی گیانی ئەو هاتە کایەوە بە قسەی *لێرتراند روسێل لە ناو فیکرە گەورەکانی جیهاندا پلەیەکی بەرزی هەیە. هەرچەندە سانت ئاگوستین لە "ساڵە رەشەکان"دا دەستی بە نووسین کرد بەلاّم توانی زەینی زۆر لە بیریارانی نوێ ڕووناك بکاتەوە. *دیکارت بنەمای بەڵگە هێنانەوەی خۆی لەبابەت سەلماندنی بوونی خوای لەویوە بەدەست هێنا.

سپینوزا لە نەخشەی جیهان لە سەر باگرەوندی هەتاهەتاییدا، ئیلهامی وەرگرت. ئەو یەکەم کەس بوو کە ئاماژەی بە بیردۆزی ڕێژەیی بوونی زەمان کرد ـ ئەو بیردۆزەی کە ئەمڕۆ لە فەلسەفە و زانستدا بووەتە مایەی پەسەندی گشتی. سانت ئاگوستین لە دەریای نهێنییەکانی جیهاندا رۆ چوو کاتێك سەری هەڵبڕی وەلاّمی سێ پرس لە گەورەترین نهێنیەکانی جیهانی لەچنگدا بوو. ئێستا ئەو مرواریانەی فیکر لە بەر تیشکی ئەو رووناکییەی کە ئەمڕۆ جیهانی زانستی رووناك کردووتەوە دەخەینە بەرخوێندنەوە.

---

* Bertiand Russel فەیلەسوف و بیرکاریزانی هاوچەرخی ئینگلیز
* Descartes (١٥٩٦ ـ ١٦٥٠) فەیلەسووفی فرەنسایی

### ١ ـ نهێنی خوا:

سانت ئاگوستین دەڵێت گەرچی زانیارییەکانمان سنووردار و کەم و کورتن، بەڵام دوو شت بۆ ئێمە مسۆگەرن(یەقینن). یەکەم ئەوەی کە ئێمە هەین و دووەمیش ئەوەی کە بیردەکەینەوە و ئەم دوو حەقیقەتە پەسەندکراوە، فیکری ئێمە بەرەو حەقیقەتێکیتر ڕێنمایی دەکات کە ئەویش بوونی خوایە کە گەوهەری هەرخاوەن گیانێکە و لەش و گیانێکی بیرکەرەوەی پێ بەخشیوە. بەڵام خوا خۆی بێجەستەیە. ئەو گیانێکە کە بەکات و شوێنەوە بەند نییە. ئەو ئافرێنەری کات و شوێن، خۆر و ئەستێرەکان و هەموو ئەو شت و بوونەوەرانەیە کە لەسەرپانتایی زەوی بلاّوبوونەتەوە ـ ئەوزەوییەی کە کاملبوونی گیانی (یان دەروونی) ئێمە لەو ژیانەدا دابین دەکات کە ئێمە لەسەری بەسەر دەبەین.

لەبەرئەوە گیانی مرۆڤ"بوونێکی مەلەکوتییە کە گەشتێکی کورتی لە بەردەم دایە لەسەر رووی زەوی." گیانی ئێمە چەند کاتێك قوتابی قوتابخانەی هەتاهەتاییە و پەرتوکی جیهان بە کراوەیی لە بەردەمیدایە و هەموو ئافرێنراوی ئەم گۆیە خۆلییە ئامرازی کارەکەینە. کاتێك خول یان ماوەی ئەم خوێندنە کۆتایی پێهات، گیانمان ئەم پەرتووکە دادەخات و ئامێر و ئامرازی ئێستاکەیی دەخاتە لایەك چونکە ئیتر پێویستیی پێیان نییە و خۆی بۆ خولی دواتر ئامادە دەکات. ئێمە لەو بار و شێوەیە بێ ئاگاین کە لەچاخی دواتر دەبیێت بەڵام دڵنیاین کە رەوشێکی باشتر لەهی ئەم چاخەی دەبێت. لە نەخشەی شایستەی خاوەندیدا هەر شتێك لە باشترین شێوەی خویدایە. مەبەستی کۆتایی ئەم نەخشەیە، کامل بوونی زانیارییەکان و بالاّڕوویی گیانی مرۆڤە بۆ دەربازبوون لەم شارە خۆڵییە بۆ "شاری خوا"

### ٢ ـ مەتەڵی ئەبەدیەت:

ئەم شارە خۆڵییە لەکاتی حازردایە و "شاری خوا" لە ئەبەدیەتدایە. ئەبەدیەت چییە؟ ئاگوستین دەڵێت:"ئەبەدیەت زیادبوون و درێژبوونەوەی کات نییە و لەڕاستیدا هیچ جۆرە پەیوەندییەکی بەکاتەوە نییە، کات درێژبوونەوەیەکی ماددییە لە رابردووە بۆ داهاتوو. سەرەتا و ئەنجامێکی هەیە. ئەبەدیەت بابەتێکی مەعنەوی و کۆتا. هەمیشە لەکاتی ئێستاییی(حارز) دایە." زۆربەی جار پرسیار دەکرێت:"خاوەند بەرلە ئافراندن چی دەکرد؟ ئاگوستین وەڵامی دەداتەوە لە ئەبەدیەتدا قسەکردن لەسەر پێش و پاش نابەجێیە. بە واتایەکیتر تا بوونەوەرێك نەبێت کات





بوونی نییە تا ببێتە بابەتی هەڵسەنگاندن. کەواتە قسەکردن لەسەر کاتی بەر لە پەیدابوونی ئافرێنراوان بە تەواوەتی بێ واتایە. خوا کاتی دوای خەڵقکردنی جیهان ئافراند. لەگەڵ هەمەوو ئەمانەشدا، ئاگوستین خۆی دان بەوە دادەنێت کە روون کردنەوەی ئەم راستییە بە هۆی کورتی هێنانی زمانی مرۆڤییەوە، ئەستەمە. هەرکاتێك بەدوای ئەوە بگەڕێین کە بیرۆڕایەکی نادیاریکراو (یان بێ سنوور) لە ناو وشە دیاریکراوەکاندا جێ بکەینەوە، ئەوا بەدوای کارێکی بێکەڵك و بێفایدە کەوتووین. نابێت لە بیربکەین کە دونیا هەستپێکراوەکەی ئێمە، دونیایەکی دیاریکراوە، دونیایەکە کە بە هەمەوو ئافرێنراوەکانییەوە رۆڵی پەرتووکی وانە و کەلوپەل و پێداویستییەکانی دەبێت. بەڵام دونیای گیانی(یان دەروونی) ئێمە، دونیایەکی کۆتایی و نادیاریکراوە، جیهانێکە ئێجگار بەرزتر لە قوتابخانەی هەنووکەیی بوونمان.

لەو کاتەدا کە بیر لە حەقیقەتەکانی وەکو بڕوا و فیداکاری و ئەڤین دەکەینەوە، دەتوانین لەو دەلاقانەوە سەیرێکی دونیای بێکۆتایی بکەین. بەو جیهانەی ئەبەدیەتی ڕوحی خۆمان کە پەیوەندی بە ڕۆحی خواوە کردووە. ئێمە ناتوانین پەی بە قولاّیی بڕوا ببەین یان بەرزایی فیداکاری و لەخۆبردوویی بپێوین یانیش رادە و سنووری ئەڤین دیاریبکەین. ئەم حەقیقەتانە"ئاماژە هاتووە خوارەوەکانی خوایی" نە لەبارەی نادیاریکراو(یان ناسنوردارو) بوونی ڕوحمان و ئەبەدیەتی ژیانمان. ئاگوستین دونیای هەستپێکراو بە ئیسفەنجێکی دیاریکراو دادەنێت و جیهانی گیانیش، واتە وێنای خودی ئافرێنەر، وەکو ئۆقیانوسێکی ئابلووقەدراو بە ناسنووورداری و بێکۆتایی دێنێتەپێش چاوی خۆی. بەڵام هەرچەندە ئەمە وەسفێکی دڵگیرە دەبێت لە قبووڵکردنیدا تەگبیر وەربگرین چونکە هەم ئیسفەنج و هەمیش ئۆقیانوس بە سنووی ماددی ئابلوقەدراون بەڵام ئەبەدیەتی گیانی خوا و ناکۆتایی، لە بەندی کات و شوێن ئازادن (بە دەرن). لەو ڕووەوە دەبێت ڕوح بە گیانی لەش و ئەبەدیەت بە گیانی کات ناو ببەین. لەش یان جەستە لەدایکدەبێت، ماوەیەکی کورت ژیان بەسەر دەبات و دەمرێت بەڵام گیان هەمیشە زیندوو و نەمرە.

### ٣ ـ واتای کات:

دونیای ماددی ئێمە، دونیای میکانیکی کات و شوێنە. ئەم دونیا ماددییە کۆتایی ڕاستینی ژیان نییە- ئەو بیردۆزەی کە لە زانستی نوێدا هەندێ بەڵگەی بۆ پشتگیری کردنیخۆی بە دەستهێنا.

سێرجێمز * جینز نووسیویەتی: "جیهان پەیتاپەیتا شێوەی بیرۆکەیەکی گەورە بەخۆوە دەگرێت تاشێوەی مەکینەیەکی گەورە." بەم شێوەیە، کات یەکەی پێوانی دونیای میکانیکییەکەمانە کە ئەویش ڕێژەییە نەك ڕەها.

بۆنموونە کاژێری جۆراوجۆر لەجیهاندا هەن کە کاتی جیاواز پیشاندەدەن.

باری زەوی بەگوێرەی خۆر دەبێتە هۆی پەیدا بوونی ڕۆژ و ساڵەکانمان و باری هەسارەکانیتر بەگوێرەی خۆرەکانیان ڕۆژ و ساڵی لێك جیاواز دێنێتە کایەوە کە حسێبی تەواو جیاوازیان هەیە. بەم جۆرە کات هۆیان ئامرازێکی دەستکردە بۆ پێوانی درێژبوونەوەیە لە نێوان ئەوەی کە بەسەرچووە و بە ئێستا ناوی دەبەین و لە نێوان ئێستا و ئایندەدا. هەرچەند کە تەنیا یەك جۆر کات بوونی هەیە کە ئەویش کاتی ئێستایە.

ئەوەی بە ڕابردوو ناوی دەبەین یادەوەری هەنووکەیی ئێمەیە لە ڕابردوو و ئەوەی بە داهاتوو ناوی دەبەین چاوەڕوانی ئێستایی ئێمەیە لە سبەینێ و بەتەنیا "ئێستایەکی هەتاهەتایی" یەکە لەواقیعدا بوونی هەیە. بیری ئێمە کە سەر بە جیهانی گیانییە دەتوانێت هەموو ئەم درێژبوونەوەیە بەیەکجاری لەخۆی بگرێت، بەڵام زەینی ئێمە کە سەر بە جیهانی ماددییە و لەخۆیدا گرفتار و دیاریکراوە، تەنیا لە یەك درێژیدا، تەنیا لە یەك هێلی ڕاستدا دەتوانێت بەرجەستەی بکات.

بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم مەسەلەیە وا دادەنێین ئەو فیکرەی کە لە مێشکدا زیندانییە چەشنی ئەو گەشتیارەیە کە لەفڕۆکەدایە. وا دادەنێین کە ئەم فڕۆکەیە لە واشنگتونەوە بەرەو بوستون لە فڕین دایە و ئێستا گەیشتوتە ژوور نیۆرۆك. واشنگتۆن دواوەیەتی، لەڕابردوو دایە و بۆستون لە پێشەوەیەتی، لە ئایندەدایە. ئەمە ڕاست نییە کە بڵێین واشنگتون "هەبوو" نیۆیۆرك "هەیە" و بوستون "دەبێت". هەرسێکیان لەساتێکی دیاریکراودا "هەنە" و تەنیا ڕوانینی سنووورداری ئێمەیە کە بەر بەوە دەگرێت کە هەرسێکیان لە یەك "سات" دا ببینین. ئەمەیە ڕای ئاگوستین لە بارەی کات. ئەمە ڕاست نییە بڵێین دوێنێ "هەبوو" ئەمڕۆ "هەیە" و سبەی "دەبێت". ئەمە هەرسێکیان بەشەکانی کاتن. هەموویان لەیەك "ئان وسات" دا هەن.

* Sir james feans (١٨٧٧ ـ ١٩٤٦) فیزیازان وبیرکاریزانی ئینگلیزی





بۆیە، کاتی ماددی وێنایەکی دیاریکراوە لە ئەبەدیەتی نادیاریکراوی ڕۆحی. ئەم شارە مرۆڤییە، نموونەیەکی کەموکورتی شاری خوایە. کەواتە واباشترە هیچ کاممان لە کاولبوونی ئەم خانووە کاتییە خەمگین نەبین چونکە خانووی هەتاهەتایی ئامادە و لە چاوەڕێی ئێمەدایە. ژیانی چاکان لە بەهەشتدا بێکۆتاییە. ئەگەر دڵدار و تەمەن و ماڵ و سامانت لەدەست چوو خەم مەخەرە دڵتەوە چونکە ڕۆحی خۆتت پێیە. گیانی تۆ قابیلی پووکانەوە نییە. لە هەموو کات و هەموو بارێکدا پشت بە ڕێنمایی خوا ببەستە. خەبات بۆ ئەوە بکە کە بەشە ماددیەکی بوونی خۆت بەهیچ وەربگری، بۆ ئەوەی کە بەشە گیانییەکە(یان دەروونییەکە) بواری خۆ دەرخستنی هەبێت. چاودێری لەشی خۆت بکە بۆ ڕزگاربوونی گیان. گیانی تۆ یەکبینە بەدوای ئەوە دەگەڕێت تا بۆ جیهانی مەلەکووت، بۆ نیشتمانە بنەڕەتییەکەی خۆی، بگەڕێتەوە.

- ٥ -

لەوکاتەدا کە ئاگوستین بیروڕا بیردۆزەکانی خۆی پێشکەش بەخەڵکی جیهان دەکرد، شاری ڕۆما لەلایەن گۆت (Goth)ە کانەوە کەوتبووە بەر تالاَنکردن.

ڕۆژگارێك بوو کە ژیان بێنرخ و نائومێدی بەسەر ئومێددا زاڵببوو. جگە لەو بێسەروبەری و ئاژاوەیەی کە جیهانی داگرتبوو و ئاگوستینی ئەشکەنجە دەدا، مەرگی منالەکەشی گورزێکی تری وەشاندە پەیکەری. بەڵام بەو هەموو دەرد و ڕەنجەشەوە کە ئابلووقەی دابوون، توانی هاودەردانی خۆی بۆ بەرزاییەك هەڵبکشێنێت کە توانیان لەو بڵندایییەوە ئەبەدیەت لە ناو ئاوێنەی کاتدا ببینن.

"هەرچەندە شارەکەت ڕووی لە وێرانییە و جیهان لەبەردەم هەڕشەی لەناوچووندایە، درێژە بە ڕێگەکەی خۆت بدە و هەروا خۆڕاگر و ئومێدەوار بە تا ببی بە خۆشەویستی بەندەکان و پەسەند کراوی ئافرێنەر."

# ئیبن مەیمون (١١٣٥ ـ ١٢٠٤)

## ئەو کەسەی کە حیکمەتی لە کوێرەوەریدا بینییەوە

سەدەی ئیبن مەیمون (Maimonides) یەکێکە لە چاخە ئێجگار پەشۆکاوەکانی مێژوو و سێ دانە لە گەورەترین شەڕوانەکان لەداوێنی ئەم سەدەیەدا پەروەردەبوون. دوو لەوانە، سەلاحەدینی ئەیوبی و ڕیچاردی شێردڵ بوون کە سەربازانی شەڕ بوون و هی سێیەم، ئیبن مەیمونی سەربازی ئاشتی بوو.

چیرۆکی ژیانی ئیبن مەیمون لەناو قیڕین و شکۆی شەڕە خاچییەکاندا، لەسەر زمانان نەما و لە بڕی ئەمە چەندەها ئەفسانە لەبارەی جوامێری دوو ڕکابەرە گەورەکە، سەلاحەدین و ڕێچارد، بازاڕێکی گەرمی پەیدا کرد. دەڵێن کاتێك ڕێچارد نەخۆش کەوت بڕێك قۆخی بۆی نارد کەلە بەفردا پارێزرابوون و ڕێچاردیش بۆ ئەوەی دوانەکەوتبێت، پێشنیاریکرد کە (جۆن)ی خوشکی شۆبە "ئەلعەدیل"ی برای سەلاحەدین بکات. بەڵاّم ئەم کارە جوامێرانانە کە بەرامبەربە یەکتریان دەکرد زەمینەیەکی ئێجگار خەمبزوێنی بۆ سەربازەکان دابیندەکرد. جارێکیان کە بەدحاڵی بوونێکی بێ بایەخ رووی دابوو، سەلاحەدین دوو هەزار و پێنجسەد دیلی کریستیانی بەکۆمەڵ کوشت و ڕێچاردیش بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی فەرمانی کوشتنی دووهەزار و پێنجسەد دیلی موسڵمانی دەکرد. ئەم بەدحاڵی بوونە هەر زوو لاچوو و ئەو دوو سەرکردەیە بە جوامێرییەوە داوای لێبوردنیان لە یەکتر کرد. بەڵاّم بەداخەوە ئەو دیلانەی کە لە ناو خاکدا ڕاکێشا بوون بواری ئەویان نەبوو کە بۆ جوامێریی فەرماندەکانی خۆیان ڕێز و ئافەرینبێژی بەجێ بێنن. لەم هەنگامەی جوامێری و بەربەرێتیدا بوو کاتێك ئیبن مەیمون هەنگاوی نایە



ڕێگای ژیانە مەعنەوییەکەی خۆی. بەرهەمی بەسەرهاتی ئارامی ئیبن مەیمون لەدونیادا ئەسەری لە شەڕە پڕ دەنگە دەنگەکانی خاچپەرستی زیاتربوو.

ئیبن مەیمون توخم (یان ڕەگەز)ی تێگەیشتووی سەدەی دوازدەهەم بوو. هەروەك دەبێت سانت* فرانیس بە گیانی سەدەی سێزدەهەم بزانرێت.

کاتێك دوو فەیلەسوف لەگەڵ یەکتردا لەبارەی مێژووی ئادەمیزاد قسەیاندەکرد، یەکەمیان، کە فەیلەسووفێکی ڕەشبین بوو، گوتی تەواوی مێژووی ئادەمیزاد دەکرێ لەم چەند وشەیەدا کورتبکرێتەوە: "ڕەوتاری نامرۆڤانەی مرۆڤ لەگەڵ مرۆڤ" و هی دووەمیان، کە فەیلەسووفێکی گەشبین بوو، بێ دواکەوتن وەلامی داوە: (نەخێر هاوڕێکەم، ئەو چەند وشەیەی کە مێژووی جیهان کورت دەکاتەوە بریتییە لە بەرگەگرتنی ڕەنج و کوێرەوەری بۆ چوونە ناو حیکمەت و زانست."

بەسەرهاتی ئیبن مەیمون پێشاندەدات کە هەردوو فەیلەسووفەکە ڕاستیان دەکرد، کاتێك منداڵ بوو بڕوای بەو حەقیقەتە تاڵە بوو کە مرۆڤ لە ئەشکەنجە و ئازاری جۆر یان ڕەگەزەکەی خۆی چێژ وەردەگرێت و لەم حەقیقەتە تاڵە سیستمێکی فیکری ژیرانە و ئارام هاتە ئاراوە (دروست بوو).

تەمەنی ئیبن مەیمون سێزدەساڵ زیاتر نەبوو(١١٤٨) کاتێك خێزانەکەی لەشارەکەی خۆی (لەئیسپانیا) دەرکرا. دەڵێت:"ئەوەی سواری ئەسپە لە بنپێ کردنی پیادە چێژ وەردەگرێت. پاشاکانی بەنی ئیسرائیل لە فەلەستیندا پێغەمبەرانی خۆیانیان کوشت. قەشە کریستانیەکان لە ئەورووپا جوولەکەکانیان دایە بەر ڕاوەدوونان و دادگایی کردن و ئێستاکەش فەرمانڕەوا موسڵمانەکانی ئیسپانیا کریستیانی و جوولەکە لە کرتوبە (قرطبە) دووردەخەنەوە.

ئەم دەرکردنە بۆ ئیبن مەیمون دەستپێکی بەسەرهاتێکی زریاناوی بوو چونکە ناچاری کرد کە لەسەرتاپای تەمەنیدا بەدوای پەناگەیەك بۆ جەستەکەی و دالدەگەیەکی ئەمن بۆ گیانی بگەڕێت و هەڵبەتە ئەوشتەی بۆ هەموو خەڵکی جیهان داوا دەکرد.

* St.Francis ـ (١١٨١ ـ ١٢٢٦)





ـ ٢ ـ

ژیانی ئیبن مەیمون خەباتێك بوو لە دژی بێبەریکردن، نەخۆشی، رق و کینە بەرامبەر بە مرۆڤ، دژواری سروشت و رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ مەترسییەکان. خێزانەکەی بۆ ماوەی نۆساڵ دوای دەرچوون لە کرتوبە، لە شارێکەوە بۆ شارێکیتر دەربەدەر بوون و دەتوانرێ بگوترێ، هیچ شوێنێك ئەو خێزانەی نەگرتەخۆ (دالّدەی نەدا). مەیمونی باوکی کە جوولەکەیەکی (ئەستێرەناس و بیرکاریزان) بوو، تاکە مامۆستای ئەو و تەنیا پەرتووکخانەیەکیش کە لە بەردەستی دابوو زەینە تیژ و وەرگرەکەی بوو چونکە لە بووخچەی پەنابەراندا جێیەکی زۆر بۆ پەرتووکەکان نەدەبووەوە.

ئیبن مەیمون بەدرێژایی ئەو ساڵانەی کە بە کەشتی یان بە وشتر یان بە پێی پیادە، سەرگەردان و گەشتیار بوو گەشتێکی دژوار لە بیابانەکاندا کە هیچ نیشانەیەك لە "شاری بەڵێن پێدراو" دیار نەبوو ـ بەخوێندەوەی پەرتووکی تەورات، کۆمەڵەی یاساکان و رێنماییەکان (دەستورات)ی جوولەکە و ڕایەکانی فەیلەسووفانی یۆنان و هەروا بە بیرکاری و پزیشکییەوە خەریك بوو. چۆن لە ناو هەنگامەی ئەم هەموو پەرێشانی و دەربەدەری و مەترسیانە، ئەو توانی ببێتە یەکێك لە گەورەترین بیرمەندانی مێژوو، ئەمە خۆی یەکێك لە هێما سەرسوڕهێنەرەکانی مێشکی مرۆڤە. ئەم پەنابەرە ڕووناکبیرە لە تەمەنی بیستوسێ ساڵیدا توانی دوو پەرتووك لەبارەی ئەستێرەناسی و لۆژیك دابنێت. لە شەوانی تەنیاییدا کاتێك بەسەر دەریادا گەشتی دەکرد خۆشەویستی ئەستێرەکان چووە دڵیەوە حەزی بۆلای خوێندنەوە و لێکۆڵینەوە لەبارەیانەوە چوو و لە هەڵسان و دانیشتنی لەگەڵ خەڵکی جۆراوجۆری نەتەوە جیاوازەکان شێوەی کاری مێشکی مرۆڤی بەباشی تێگەیشت.

ـ ٣ ـ

ئیبن مەیمون لەساڵی ١١٦٥ لەشاری(فاس)ی پایتەختی مەغریب (مەراکیش) بار و ئەسپاپی مانەوەی دانا، بەڵام ئەم ڕاوەستانە ئێجگار کورتخایەن بوو. مامووری لێکۆلینەوەی موسڵمانان مەبەستیان بوو ئەو بە هۆی جوولەکە بوونی دەستگیربکەن و دادگایی بکەن کاتێك یەکێك لە هاوڕێ موسڵمانەکانی بەهانایەوە هات و ئاگاداری کردەوە، ئەو توانی لە تاریکایی شەودا بەپێی پەتی هەڵبێت.



لەم گەشتەیدا توشی تێکشکانی کەشتی هات و دوای مانگێك دژواری و کوێرەوەری هەڵهاتن لە زریان و مەترسییەکان جارێکیتر گەڕایەوە فەڵەستین. بەڵام سەرزەمینە پیرۆزەکەی باوباپیرانی بە هۆی شەڕی خاچی (یان خاچپەرستییەکانەوە) بە تەواوەتی کاول ببوو جگە لە هەندێ لادێی پەرتەوازە و خراپ نەبێت شتێك بەجێ نەمابوو و ئەو شتەی، کە بتوانێت گیانە نائارامەکەی قایلبکات، بوونی نەبوو. بەمەش کەوتە ئەوەی کە بۆ گیانە چالاکەکەی خۆی بە دوای سەرزەمینێکی باشتردا بگەڕێت. بەو نیازە سواری کەشتی بوو و ڕێگەی میسری گرتەبەر.

ئیبن مەیەون دواجار لە شاری قاهیرە کۆتایی بە گەڕوو سەرگەردانی خۆی هێنا بەڵام هێشتا بەلا و موسیبەتەکانی تەواو نەببوون.

داوودی برای بە نیازی پشتگیری لێکردنی لە کاری خوێندندا، بە بارگانیی گەوهەرەکانەوە خۆی خەریککرد. بەڵام لە ماوەی یەکێك لە سەفەرەکانیدا توشی تێکشکانی کەشتی هات و گیانی سپارد. چەندەها ساڵ پێچوون تا ئیبن مەیمون توانی لە ژێر باری ئەم خەمەدا خۆی ڕاست بکاتەوە. خۆی دەنووسێت: "ئەمە گەورەترین زەڕبە بوو کە بەرم کەوت. کچە بچکووکەکەی داود و بێوەژنەکەی بۆ من بەجێمان... یەك ساڵی تەواو لە بارەی تاو ونائومێدیدا کەوتمە ناوجێگا... داود لەسەر بازووەکانی من گەورە ببوو. ئەو برای من بوو، قوتابی من بوو... هەمیشە لە سەفەردا بوو تا قازانجێك پێی بگات و من بتوانم لە ماڵەوە بمێنمەوە و درێژە بە خوێندنەوە و خوێندن بدەم. تەنها شادیی من بینینی ئەو بوو بەڵام ئەو ماڵئاوایی لێکردم و منی لە وڵاتێکی نامۆدا، بەپەرێشانی بەرەڵا کرد. دەبوا من لەو لایەدا بمردبوومایە. بەڵام تەورات خەمی رەواندمەوە و فەلسەفە بە هانامەوە هات و تەپ و تۆزی دەرد و رەنجی لە فیکرو یادمدا سڕیەوە."

ئیبن مەیمون دوای مردنی برای، دەستی بە پیشەی پزیشکی کرد تا مووچەی ڕۆژانەی خۆی دابین بکات(مسۆگەر بکات). ئەم هەوڵ و تەقەلایە بەهۆی پێویستییەوە بوو و ئەو لە کاری پزیشکیدا تەڕەدەستییەکی وای پیشاندا کە ناوبانگی گەیشتە گوێی(ئەلفازڵ)ی سەرۆك وەزیری سەلاحەدین و داوای لە فەیلەسووفەکە کرد کە ببێتە پزیشکی دەربار.

تەنانەت لەو چاخەشدا ئیبن مەیمون لە ئاشتی و ئاسوودەیی بێبەش بوو. لە یەکێك لە کێشمانەکێشە لاوکییەکانی شەڕە خاچپەرستییەکاندا شاری فێستات کە ئەو خانووی لەوێ





دروستکردبوو، بوو بە خۆراکی ئاگر. ئەم ئاگرکەوتنەوەیە نزیکەی دوو مانگی پێچوو و هەرکە بڵێسەکانی ئاگر نیشتنەوە تاعوون رووی تێکرد.

ئیبن مەیمون لەم چاخە خەمبزوێنەدا کاتی خۆی لەگەڵ نەخۆشەکاندا دەبردە سەر و بەنامەی خەمرەوێن دڵی یەهوودە دەربەدەرەکانی دەدایەوە؛ کاتی بەچاکسازی و پێداچوونەوەی دوایین لاپەڕەکانی پەرتووکی "رووناکی" دەگوزەراند کە یەکێك لە دوایین دانراوە فەلسەفیەکانی بوو.

- ٤ -

فەلسەفەی ئیبن مەیمون چرایەك بوو کە رێبوارانی دۆڵی تاریکایی نەزانیی بەرەو پەناگەی ئاشتی و ئارامی ڕێنمایی دەکرد و لەڕاستیدا ڕێنماییکەری دەربەدەران بوو. ئەو بەخۆی دوایین و گەورەترین دانراوی بە "رابەری ون بووەکان" ناوناوە. ئامانجی لەو رێبەرییە لەدونیای ماددی و مەعنەویدا پێکەوە ڕێکخستن(یان پێکەوەنان)ی بنەما ئاکارییەکانی پێغەمبەرانی بەنی ئیسرائیل و بیرۆکەکانی فەیلەسووفانی یۆنان بوو. رای پێخەمبەرانی بەنی ئیسرائیلی کە عەدالەتیان لە هەموو شتێك بالاتر دادەنا، پەسەندکرد و چەشنی فەیلەسووفەکانی یۆنان بایەخی هاوئاهەنگی و هاوسەنگیی قبووڵکرد و رایگەیاند کە عەدالەت لەڕاستیدا هەمان هاوئاهەنگی و هاوسەنگییە. دادپەروەر ئەو کەسەیە کە ژیانی هاوئاهەنگ بێت واتا مافەکانی ئەو بە ئاراستەی مافەکانی ئەوانیتر بڕوات. ژیان وەکو سەمفۆنیاییێکە و هەرکەسێك دەبێت ئاوازی خۆی بەوردی و لێهاتوویی (نەئارام و نەبەرز) بژەنێت. ئەوەی ئاوازی خۆی بەباشی دەژەنێت هەم دادپەروەرە و هەمیش مامناوەندە(یان میانەڕەوە) و ئێمە خاوەنی ئەو هێزەیە کە فەیلەسووفانی یۆنانی بە خۆگری و کۆنترۆلکردنی خود تەعبیری دەکەن. بەم جۆرە دەبینین ئایدیال یان لوتکەی ئارمانجی ئیبن مەیمونیش وەکو فەیلەسووفانی یۆنان، دروستکردنی ژیانێکی بارگاوییە بەداد و هاوئاهەنگی و کۆنترۆڵکردنی خود (نەفس). بەواتایەکی تر ئەمە ئامانجە لوتکەییەی پێخەمبەرانی بەنیئیسرائیلە لە داد و دروستکاری.

لە فەلسەفەی ئیبن مەیموندا حیکمەتی یۆنانی کۆن بە شێوەی دەربڕینی عیبری دەبینین. فەلسەفەی ئەو لە ئەرستۆوە ئێجگار نزیك بوو و لەلایەکیترەوە نزیکایەتی لەگەڵ حیکمەتی(ئەشعیا)ی پێغەمبەری بەنیئیسرائیل و سانتپۆلس هەیە. لەڕاستیدا ئەم جوولەکە کورتوبیە و جولەکەی تەرسوسی(سانت پۆلس) بڕوایان بەو بنەما ئاکارییانە هەیە کە لە ئایینی





کریستیانیدا بە بڕوا و ئومێد و دلۆڤانی ناو دەبرێن. ئیبن مەیمون دەڵێت:"بەر لە هەرشتێك دەبێت بڕواداربین و ئافرێنەر بناسین. بەلاّم نە ئەو ئافرێنەرەی کە بوونێکی جەستەیی هەیە و وەکو *ژویتەر بە بوونێکی سەروو مرۆڤی وەسفکراوە، بەڵکو خوایەك کەهێزیکی رەهایە، گەوهەری دادە و دروستکەری هاوئاهەنگییە. ئەقلی خواوەندی بووە هۆی ئەفراندنی ئێمە و چاکەی ئەو ئێمە لە پەنای خۆیدا دەپارێزێت. خوا کۆتایی ژیان و یاسای ئەزەلی و هەتاهەتایی (بوون)ە. ئەو هەمان ئەو مۆسیقایەیە کە سەمفونیاکان لێوە لەدایکبوونە، حەقیقەتێکە کە خەونەکان لێیەوە بەرگی کرداریی لە بەردەکەن و سەرەتایەکە کە جیهان لێیەوە پەیدابووە. هەر ئەو گیانەیە کە پاکی و پیرۆزیی بە پێخەمبەران بەخشیوە و ئیرادەی ئەوە کە توانای فاش کردنی حەقیقەتەکانی پێیان بەخشیوە. گەوهەری ئەو حەقیقەتەی کە پێخەمبەران مامووری ڕەونەق پێ بەخشین و برەوپێدانینە، ئەوەیە کە هەموو شتێك گیانی هەیە و ژیان نەمرە و هیچ شتێك نامرێت."

ئەم داخویانییە بەرەو بنەمایەکی تری فەلسەفەی ئیبن مەیمون ڕێنماییمان دەکات، واتا جگە لە بڕوا دەبێت ئومێدیشمان هەبێت و چاوی ئومێدەواری* بدرووینە ئایندە و ژیانی دوای مەرگ.

ئیبن مەیمون تێگەیشتنی ئێمە لە نەمری و بیروڕای ئێمە لەبارەی خوا پاکژ و دڵگیر دەکات: دەڵێت:"مەبەست لە نەمری ئەوە نییە کە ئارەزوو و پاڕانەوە جەستەییەکانی خۆمان بەدەست بێنین. بەڵکو مەبەست ئەوەیە کە بوونی خۆمان لە ناو ویژدان و هەستی جیهانی و بوونی ڕەهای خوادا بتوێنینەوە. هەر خاوەن گیانێك، بیرۆکەیەکی قابیلی بینینی خوایە لەناو ڕێکخراو(یان کۆمەڵە)ی ئافراندندا کە نەخش و شوێنەواری لەسەر لاپەڕەی زەمان دەرچووە. کاتێك لاپەڕەیەکی ئەم پەرتووکە کە ژیانی تاکێك پێشاندەدات، تێکبچێت ئەو بیرۆکە بینینبارەی خوا کە لە بوونی ئەو تاکەدا بەدەرکەوتووە لە چاو ون دەبێت بەلاّم حەقیقەتەکەی لەناو ناچێت و هەروا دەمێنێتەوە. بۆ ڕوونکردنەوەی بابەتەکە نموونەیەك دێنینەوە: کاتێك بەشێك لە پەرتووکی پیرۆز کە ئاهەنگێکی مەلەکوتیی تێدایە ون دەبێت، لەڕاستیدا ئاوازەکە لەناو نەچووە بەڵکو ئەسەرێکی بینینبار، کە شکلی لەسەر کاغەزەکە بووە، بزر بووە. ئەم

* Tupiter: خوای خۆیان، سەرۆکی خوایان لای یۆنانیان و رومیانی کۆن. و. کوردی

* ئەو شتەی کە قابیلی بینینە(دەکرێ ببینرێ) و. کوردی

ئاوازانە لەسەرتاپای ئەم پەرتووکە بلاّوبوونەتەوە. ڕەنگە ئەم لاپەڕانە هەموویان بزر بن و لەناو بچن بەلاّم کەس ناتوانێت بیرۆکە شاراوەکانی ناو قالّبی وشەکان لە ناو ببات. "لەش دەمرێت و گیان هەروا بە زیندوویی دەمێنێتەوە." بە چوواندنێکیتر بابەتەکە ڕوونتر دەبێتەوە. هەریەکەمان پارچەیەکی ڕەنگینە کە لە پەردەیەکی پڕ نەخش و نیگاری ژیاندا بەکار هاتووە. کاتێك پەردەکە لە ناو بچێت ڕەنگەکە بە یەکجاری لەناونەچووە بەلّکو بە سپیاتی درەوشاوە و نەمر پەیوەستە. هەروەها دەتوانرێ لەشی مرۆڤی بە حەوزێکی شێلو(قوڕاوی) بچووێنین کە گیان وەکو تیشکی خۆر ڕووناکی پێدەبەخشێت. کاتێك ئەم حەوزە ئاوە وشك بوو واتا لەش مرد، لێکەوتنی ڕووناکییەکە ون دەبێت بەلاّم خۆر بەهەمان درەوشاوەیی و بریقەی پێشوو بەتینە.

بەگوێرەی ئەم وەسفە ژیان دوای مەرگ جۆرە. بارێکە کە تیایدا تاکایەتی لەناو دەچێت و تاکەکان لە بوونێکی جیهانی و ڕەهادا لەناو چوونە.

ئەم مستیکە هەندێجار بەڕێکەوت لە ژیانی ڕۆژانە (لەو ساتانەدا کە قالّبە تەسك و دیاریکراوەکەی هەستە رووکەشەکان بەجێ دەهێلّین) روودەدات. خوێندنەوەی هۆنراوەیەکی دلّبزوێن، بیستنی نەوایەکی ئیلهامبەخش، هەلّهاتنی شکوداری هەتاو، راز ونیازێکی بێ خۆپەرستی، بەشداریکردن لە شادیی هاوکوفان و ڕێزگرتن و بەخشندەیی بەرامبەریان، رەوشێکی وەکو ئەو مستیکە لە مرۆڤدا دروستدەکات.

ئەم دەربڕینانە بنەمای سێیەمی فەلسەفەی ئیبن مەیمون دێننە گۆڕێ. واتا بڕوا و ئومێد بەرەو دلۆڤانی و ڕێزلێنان دەبات یان بە واتایەکی تر دلۆڤانی و ڕێزلێنان، بڕوا و ئومێدی ئێمە بەهێزدەکات.

لەوکاتەدا کە بەڕاستی بەرامبەر بە هاوسێکانمان هەست بە هاودەردی و دلّسۆزی دەکەین و بەدوای پڕکردنەوەی پێداویستییەکانیانەوەین، لەگەلّ گیانی جیهانی هاوئاهەنگی و پەیوەستییەکی تەواومان هەیە.

ئیبن مەیمون فەیلەسووفێکی دوورەپەرێز نییە. بەلّکو پیاوی کارە و لەو بڕوایەدایە هەرکاتێك بەرامبەر بە جۆری خۆمان هەست بە هاودەردی نەکەین بڕوا بە خوا و ئومێد بە دوارۆژ هیچ



نرخێکی بۆمان نییە. ژیانی باش چالاکە و تێکۆشانێکە بۆ گەیشتن بە گەورەیی و ڕەسەنایەتی. ئەم جۆرە ژیانە لە هەبوونی شەوق و زەوق و ئارەزوویەکی نێگەتیڤ و ناچالاك پلەیەکی بەرزتری هەیە."پیاوی چاك یەکبینە بەرەو بەهەشت هەلّدەکشێت و لەم ڕێگەیەدا بە(هەشت پلەی زێڕین)ی قالّدرمەی دلۆڤانیدا هەلّدەگەڕێت. ئەو بەخشندەیی داناوە، هێشتایش دوای هەشت سەد سالّ لەسەر ئیعتباری یەکەمی خۆی ماوە.

بەڕای ئەو"یەکەمین و نزمترین پلەی بەخشندەیی هاوڕێیە لەگەلّ نابەدلّی. خەلاّتێکە کە دەست دەیدات و دلّ هیچ بەش و پارێکی تێدا نییە."

پلەی دووەمی بەخشندەیی بە ڕوویەکی کراوەوەیە بەلاّم "لەگەلّ پێویستی و چارەڕەشی پرسیارکەر (یان سوالّکەر)دا ناگونجێت" پلەی سێیەمی بەخشندەیی بە ڕوویەکی خۆش و بەگوێرەی پێویستی بێنەواکەیە بەلاّم دوای پرسیار (یان سوالّ) ئەنجامدەدرێت.

لە پلەی چوارەمدا، ئەم سێ مەرجە هەنە بەلاّم بەخشەر و وەرگر ڕووبەڕووی یەکتر دەبنەوە و لەئەنجامدا ئارەقەی شەرم دەنیشێتە سەر تەوێلّی وەرگرەکە.

لە قۆناخی پێنجەمدا، سوالّکەر خاوەنی خێرە کە دەناسێت بەلاّم بەخشندە ئەو ناناسێت. ئەوە ئەو شێوازە بوو کە پیاوچاکانی ئێمە ئەنجامیاندەدا، بەو جۆرەی کە بڕە پارەیەکیان بە گۆشەیەکی بالاّپۆشیانەوە دەبەست. بۆئەوەی کە بێچارەیەك نەناسانە هەلّگرێتەوە.

لە پلەی شەشەمدا کە پلەیەکی بالاّتری هەیە، بەخشندەییەکە کە سوالّکەر ئاشکرایە بەلاّم بەخشندە بە نەناسراوی دەمێنێتەوە. هەمان ئەو ڕێگەیەی کەپێشینان هەلّیانبژارد و عادەتەن خەلاّتەکانیان بەشێوەیەکی نەناسانە بۆ مالّی بێنەوایان دەبرد.

لەوە بەرزتر قۆناخی حەوتەمە کە باوباپیرانی ئێمە لە پەرستگاکاندا ئەنجامیان دەدا. لەو بینا پیرۆزەدا شوینێك هەبوو کە بە "ژووری بێ دەنگی" ناوزەد کردبوو و لەوێ، لە خۆ شاردنەویەکی تەواودا، ئەوەی کە دلّە بەخشندەکەیان داوا دەکرد، بە بێنەوایانیان دەبەخشی.

هەشتەمین و دوایین پلە کە لە هەموو پلەکان شایستەترە، ئەو جۆرە بەخشندەییە کە بۆ ڕێگەگرتن لە پەیدابوونی هەژاری و خزانی ئەنجامدەدرێت. ئەمە بەرزترین پلە و دوایین پلەی"قالّدرمەی زێڕینی بەخشندەیی"ە.





ئیبن مەیمون یەکێکە لە دامەزرێنەرانی ئەو زانستە کە ئەمڕۆکە بە زانستی کۆمەڵناسی ناو دەبرێت.

- ٥ -

ئیبن مەیمون بیست ساڵی کۆتایی تەمەنی بۆ پڕکردنەوەی پێداویستییە گیانی و جەستەییەکانی نەخۆشەکان و بێنەوایان تەرخان کرد و ئەم سەردەمە ڕەنگە پڕکارترین سەردەمی ژیانی ئەوبێت.

ئەو پزیشك و فەیلەسوف و زانای خواناس بوو و بۆ کەسانێکی زۆر لە سەرتاپای جیهان نامەی ئاسوودەیی هێنەری دەنووسی و زۆربەی جار کاری یەك حەفتەی لەیەك ڕۆژدا ئەنجام دەدا. وێنەیەکی زیندووی چالاکیەکانی ڕۆژانەی لەگەڵ ئەوەشدا کە پیاوێکی تەندروستیش نەبوو ـ لەو نامەیەوە لە زەینماندا درووستدەبێت کە بۆیەکێ لە وەرگێڕەکانی دانراوەکانی(یان بەرهەمەکانی) خۆی نووسیوە:"لەبارەی ئەو ئارەزوومەندییەی کە بۆ دیداری منت هەیە، بە تاسەخوازییەکی فراوانەوە پێشوازی لێدەکەم و لەهەمان کاتدا دەمەوێت ئامۆژگاریت بکەم کە ڕەنجی سەفەر بێسود بەسەرخۆتدا مەسەپێنە. چونکە ئەنجامێکی ئێجگار کەم لە دیدارەوە دەست دەکەوێت" و یەکسەر هۆیەکانی ئەم داخویانییە ڕووندەکاتەوە و دەڵێت: کاتەکەی بۆ پەزێرایی ئیجگار بەرتەنگە؛ ـ من لە فیستات دەژیم و سوڵتانیش لە قاهیرە. ئەم دوو شارە نزیکەی سێ کیلۆمەتر لە یەکترەوە دوورن. ئەرکەکانی من بەرامبەر بە سوڵتان بەتەواوەتی دیارن. ناچارم هەموو بەربەیانێك بچمە سەردانی. ئەگەر ئەو لەگەڵ مناڵەکانی یان لەگەڵ یەکێ لەئەندامانی حەرامسەراکەی نەخۆش بن ناچارم زۆربەی کاتم لە دەرباردا بەسەربەرم. چونکە ڕەنگە وارێیکەوێت کە یەکێك لە دەرباریەکان نەخۆش بکەوێت و من بەناچاری دەبێت دەرمانی بکەم. سەرەڕای ئەمە، عادەتەن پێویستە تا نیوەڕۆ لە قاهیرە بمێنمەوە. کاتێك دەگەڕێمەوە فێستات لە تاو برسێتییەوە دەگەمە سەرلێواری مەرگ (چونکە هەروەك دەزانن من خواردنی سوڵتان سەرف ناکەم) لەکاتی گەڕانەوە بۆماڵ ژووری چاوەڕوانی پڕە لە یەهوودی و کریستیانی، دەوڵەمەند و هەژار، دادوەر و ئەفسەر، دۆست و دوژمن کە چاوەڕێی من دەکەن تا لەبارەی نەخۆشەکانیان ڕاوێژ بکەن. لە ئەسپ دادەبەزم. دەستەکانی خۆم دەشۆم و دەچمەلای نەخۆشەکان و داوایان لێدەکەم تا مۆڵەتم بدەن پشوێك بدەم. پاشان بە پشکنینی نەخۆشەکانەوە



خەریك دەبم و نوسخەکانیان بۆ دەنووسم. نەخۆشەکان تا خۆرئاوابوون دێن و دەڕۆن و تەنانەت هەندێ جار تا بەشێکیش لەشەو دەڕوات لە هاتوچۆ دان. لەکاتێکدا کەلە تاو ماندوویەتییەوە ڕاکشاوم لەگەڵیان دەدوێم و کاتێك کە دوایین نەخۆش کلینیك بەجێ دەهێڵێت "هێندە ماندوو و هیلاکم کە توانای قسەکردنم نابێت."

هەندێك کەس بلیمەتیان ئەوها پێناسە کردووە:"فراوانی لەخۆگرتن و توانایەکی نادیاریکراوە بۆ بەرگەگرتنی دەرد و ڕەنج." ئەم وەسفە بە گۆڕینێکی بچووك، لەبارەی ئیبن مەیمونەوە ڕاستە و ئەو سەرەڕای ئەو دەرد و ڕەنجەی کە خۆی هەبوو"توانایێکی نادیاریکراوی بۆ کارکردن هەبوو." لەو نامەیەدا، کە بۆ وەرگێڕ نوسیویەتی لەبارەی لێکۆڵینەوە پزیشکی و فەلسەفییەکان، لەو پەرتووکە بێشومارانەی کە نوسیویەتی و لەو نامەگۆڕینەوانەی لەبارەی فەلسەفە و ئایین و پزیشکی و ئامۆژگارییە زانستییەکاندا ئەنجامداوە، ناوێکی نەبردووە کە ئەمە خۆی شایانی سەرنجە.

لەگەڵ هەموو ئەم کارە و کوێرەوەریانە، ئەو نامەکەی خۆی بەوە بیرهێنانەوەی دوو خاڵی بەرجەستە کۆتایی پێدێنێت کە ناسێنەری خاکێتی ئەوە:"هەرکاتێك هێشتا هەر لەسەربینینی من سووربی هەر لەگەڵ تەواوکردنی وەرگێڕانەکەت وەرەلام. بەڵێندەدەم کە بە بینینی تۆ ئێجگار خۆشبەخت دەبم بەلاَم دەبێت بڵێم کە هیچم لێوە فێرنابێ."

- ٦ -

ئیبن مەیمون ژیانی خۆی بەو شێوەیەی کە دەستپێ کردبوو، بێدەنگە و دەنگ و بە دوور لە درۆ و دەڵەسە کۆتایی پێهێنا. بەرهەمی ژیانی لەم دێرەدا کورت دەبێتەوە کە هی یەکێك لە شاعێرانی سەدەکانی ناوەڕاستە: ئەو هەموو تەمەنی بۆ کاری ئاشتیخوازانە تەرخان کرد و بەرامبەر بە هاوسێکەی خۆشەویستی نواند و خەریکی پەرستنی خوابوو.

خۆشەویستییەکەی نەك تەنیا هەر وەبەر جوولەکان دەکەوت، بەڵکو کریستیانی و موسوڵمانیش لێی بەهرەمەند بوون. کریستیانی و جوولەکەکانی هاوچەرخی بە "پزیشك و مامۆستای مرۆڤایەتی" ناویان دەبرد. ئەو زانستی پزیشکی لەگەڵ ڕێنمایییە ئاکارییەکان یەکخست و دەیوت: "بۆ تەندروستی نەفس سێ هۆکاری کاریگەرن: شێوازی مامناوەندی،





وەرزشی کافی و ڕەوتارێکی بەرگەگرانە بەرامبەر بە کاروباری دونیایی. فەلسەفەکەیشی وەکو پزیشکایەتییەکەی لەسەر بنەمای کەمکردنەوەی کێشمانەکێش و ڕەنجە مرۆڤییەکان، بناغەی داڕیژرابوو.

لە سێ سەردارەکەی سەردەمی شەڕەکانی خاچپەرستی، ڕێچارد و سەلاحەدین چاویان بڕیبووە ڕابردوو و ئاگری شەڕ و دوژمنایەتیان هەڵگیرساند و ئیبن مەیمون دەیڕوانییە دوارۆژ و بە بیری چاك و خێرخوازی هیممەتیان کرد بۆ لە سەرکار لابردنی بیرکردنەوەی خراپ و خراپەخوازی.

ئەفسانەیەکی دراماتێك توندوتۆڵی خێرخوازییەکەی بەرامبەر بە مرۆڤ بەباشی ئاشکرادەکات. کاتێك لە تەمەنی هەفتاساڵیدا گیانی سپارد تەرمەکەیان لەمیسرەوە بۆ فەلەستین گواستەوە چونکە خۆی داواکردبوو کە لەسەرزەمینی پیرۆز بنێژرێت. کاتێك لاشەکەیان لە بیابان دەرباز دەکرد، ڕێگرانی بیابانگەڕ هێرشیان کردە سەر بەلاّم هەر کە زانیان بەرامبەر بە لاشەی ئیبن مەیمون بێڕێزی کراوە، هەموویان لە شەرما سەریان دانەواند ئەلقەیەکی پاراستنیان بە دەوری لاشەکە پێکهێنا و تا گۆڕستان بەڕێیانکرد چونکە پیاوێك بوو کە هەموان بە گەورەیان دادەنا. سالاّنێکی زۆر نەخۆشەکانیانی بێ کرێ و مووچە چارەسەر کردبوو و دەیگوت:"پیشەی پزیشکایەتیم بەو بۆنەوە هەڵبژارد تا نەخۆشەکان شەفا بدەم، نەك ئەوەی ماڵ و سامان پاشەکەوت بکەم."







# ماكیاڤێلْ (١٤٦٩ ـ ١٥٢٧)

## موریدی شەیتان

لەساڵی ١٤٩٨ ساڤۆنارۆلا (Savonarola)یان بە تاوانی ئەو بیروڕا قایمەی كە هەیبوو خستە ناو ئاگر و ماكیاڤێلْ (Machiavelli) یەكێك لە تەماشاكەرانی ئەو سەحنەیە بوو. لەو رووەوە گەیشتە ئەو ئەنجامەی كە راستی و دروستی خراپترین سیاسەتە. ئەم بیرۆڕایە ڕەگی لەزەینیدا داكوتا و دواتر لە مێژووی فیكری ئادەمیزاددا بەشێوەی یەكێك لە خراپكارترین بنەماكان، وەدەركەوت. ماكیاڤێلْ ڕایگەیاند كە ساختەكاری و كاری چەوتانە كورتترین رێگان بۆ گەیشتن بە سەركەوتن.

ڕێنماییەكانی ئەو دەستووری كاری ستەمكارانە و فریودەرانەن. ماكیاڤێلْ تابە ئەمرۆ دەگات ئیلهامبەخشی رووداوخوازەكانی سیاسی و هەموو ئەو كەسانە بووە كە لەو بڕوایەدان كە مەبەستەكان دەتوانن هۆیەكان، هەرچەندە زەلیل و گلاۆلیش بن، بیانكاتە شتی پەسەند كراو.

ماكیاڤێلْ نموونەیەكی دیار و كەسێكی بەرجەستەی ئەو سەردەمەبوو ـ سەردەمی سێزار بۆرژیا (Caesar Borgia)ی خوای ڕیاكاری و مامۆستای هونەری مرۆڤكوژی ـ بۆرژیا بە كوشتنی برا و زاوا و خزم و دۆستەكانی تری كە بەربەستی سەر ڕێگای بوون، بوو بە دوك(میر)ی ئیتالیای ناوەندی و چووە ڕیزی پێشەوا دەست رویشتووەكانی ئەوروپا. ئەو لەو بوارەدا توانایەكی هێندە قووڵ و شەیتانی هەبوو كە دەیتوانی هاوڕێكانی خۆی لەهەمان باردا كە لە باوەشی گرتبوو، بداتە بەر خەنجەر و میوانەكان لەكاتێكدا كە لەسەر خوانەكەی دانیشتوون ژەهرخوارد یان بكات.



سێزار بۆرۆژیا كەسێكی ئاوارتە نەبوو، بەڵكو نوێنەری پێشەوایانی سەردەمێك بوو كە هەوڵیان دەدا سەرنجی خەڵكی ئاسایی بۆكاروباری بەهەشتی و ئاسمانی ڕابكێشن و شتە باشەخاكییەكان لە دەستیان بڕفێنێت. بچووكترین دڵبەندی و ئارەزومەندییان بەرامبەر بە دادپەروەری و لێبوردەیی پیشان نەدەدا و تەنیا چاویان بڕیبووە سامان و هێز. وایان دەنواند كە بڕوایان بە خوا هەیە بەڵاَم لەڕاستیدا گوێیان بۆ بانگی چاوبرسێتی و چاوچنۆكی هەڵدەخست.

پەرتووكی پیرۆز لەڕوانگەی ئەوانەوە كۆمەڵە بنەما و ڕێسایەك بوون كە بۆ كۆیلەكان دەبوون. هەرگیز نەهی و فرمانیان بەسەر ئەو كەسانە دانەدەدا كە ئەگەری ئەوەیان هەبوو ببنە خاوەنی پلە و پایە. سەرۆكایەتی و سەروەری بە تاكە ئامانجێكی مرۆڤی ناسرابوو و بڕوایان بە دەوڵەتێك بوو كە دڵی نەبێت.

ئەمە بوو كورتەی ئومێد و ئارەزووەكانی پلەپەرستان لەسەردەمی ماكیاڤێلدا و هەڵبەتە هەندێ شتی ئاوارتەشی هەبوو. تەنیا ئەو كەسانە ڕێزیان هەبوو كە ڕێگەی گەشەكردنیان بەبێ بەزەیی و خوێنڕێژی بڕیوە ـ كەسانێكی بەدكار و دێوسیفەت، وەكو خەڵكانێكی دانیشتووی دەریای ناوەڕاست كە نیچە دواتر ئەوانی بە "ئاژەڵی قژزەرد"ی باكووری ناو برد و ڕێزێكی تایبەتی بۆیان دانا.

ئەم گرووپە هۆڤ و درندە سیفەتە وایان دەزانی ـ گەرچی ڕیاكارتربوون لەوەی كە خۆیان بدەنە بەر پەسەندكردنی ـ كە فەلسەفەی ئەفلاتوون و دەستووورە ئاكارییەكانی پەرتووكی پیرۆز، بەشی مەبەستە پلەپەرستییەكانی ئەوان ناكات و بۆ ئەم دونیایە نابن. ئەوان پێویستیان بە (دەستووری كار) ێكی ئاكاری و واقیعی بوو، ئەو دەستووری كارەی كە فێریان بكات كە چۆن دەتوانن باشتر فریوكاری بكەن، تالاَن بكەن و خوێنی خەڵك بڕێژن تا سەرەوەری دەستبخەن. ئەوان [*] كۆمەڵەیەكی نوێیان دەویست. بەدوای كۆمەڵەیەكی ڕێنماییدا دەگەڕان كە بە كەڵكی دز و ناكەسان بێت.

ماكیاڤێلْ پێویستیەكەیانی هێنایەدی (دابین كرد.). ئەویش بەتوندی ئارەزوومەندی بوو كە لە لوتكەدا بێت و سەروەری بكات و بۆئەوەی دڵی فەرمانڕەوایانی سەردەمی خۆی دەستبخات

[*] مەبەست كۆمەڵەی یاساو دەستوراتە. و. كوردی





دەستوورێکی لە کارە چەوتەکان ئامادەکرد و خستیە بەردەمیانەوە تا بەو هۆیەوە پێ بخەنە سەر جەستەی خەڵك و خۆیان بگەیێننە پلە و پایەی بەرز.

شێوازی زانستی ئاکاری ماکیاڤێلی بنەمای نوێی ستەمکاری لەخۆگرتبوو و بەسەرهاتێکی پڕ ڕووداو و بارگاوی بەکینە خوازی و فریوکاری بوو. لەبری "بنەما زێڕینەکان"

هەندێ ڕێسای "مسین"ی ڕێکخستن:"بەرلەوەی ئەوانیتر دژ بە تۆ بەکارێك هەڵسن، خۆت لەدژیان هەنگاو بنێ" ماکیاڤێلی ئامۆژگاری و وتارە بەناوبانگەکەی مەسیحی لەسەر بەرزایی شاخ، ڕەفزکردەوە چونکە ئەو خەونانەی بە ناکردە دەزانی و لەجیاتی ئەو کەوتە فێرکردنی فێڵ و تەڵەکەبازی و بۆ برەو پێدانیان تێکۆشیا؛ "خۆشبەختەکان، ناکەس وخوێڕییەکانن. ئەمانەن کە جیهانیان بە میرات بۆ دەمێنێتەوە."و بۆ ئەوەی خۆشیی بێنسیب نەبووبێتن و بەشە بچوکەکەی خۆی وەرگرتبێت خیانەتی لەو فیکرانە دەکرد کە خۆی برەوی پێدەدان چونکە لە یەکێك لە پەرتووکەکانیدا بەناوی "وتارەکان" پیشتگیری لەو پەندە لاتینییە کۆنە کرد کە دەڵێت: "دەنگی خەڵك دەنگی خوایە." بەلاّم دواتر لە پەرتووکە بەناوبانگەکەیدا بەناوی "گەورەی شار" پروپاگەندەی بۆ بنەمایەکی تەواو جیاواز لەو کرد و وتی: دەنگی خەڵك نەفرەتاوی و بەدوومە، لێ نەگەڕێن جگە لە زرنگەی دەنگی ئۆتۆکرات و ستەمکار هیچ دەنگێکیتر فەزا لەخۆ بپێچێتەوە.

بەلاّم چارەنووس لەگەڵ ماکیاڤێلی هاوکار نەبوو مەبەستەکەی پراکتیزە نەبوو چونکە ئەو پەرتووکەکەی بۆیە نووسی تا لەلای پاشا نزیکایەتی و پلە و پایەیەك بەدەستبێنێت، بەلاّم پاشا وانەی خۆی لە هەمان ئەو پەرتووکەوە بەباشی فێرببوو و دەزانی کە ماکیاڤێلیش لە پاشماوە زەمینییەکانە. ڕووپامایی و مەڕاییی قبوولدەکرد بەلاّم ڕووپاما و مەراییکەرانی دەردەکرد. لەو ڕووەوە ماکیاڤێلی بە دەستکورتی و بێناوی مایەوە. بەلاّم بەدبەختی یەخەی خەڵکی گرت و فەلسەفەی ماکیاڤێلی بەباشی پەسەندکرا و ئەو موریدەی شەیتان تا بە ئەمڕۆ دەگات لە نێو کۆمەڵێکی زۆردا، بە پێشەوای سەرکەوتووی ژیانی کرداری ناسراوە.

با ئیستاکە خوێندنەوەیەکی وردتر لەبارەی ڕەوش و بیروڕاکانی ئەنجامبدەین.



## - ٢ -

ماکیاڤێل کە لەساڵی ١٤٦٩ لە فلورەنسا هاتە دونیاوە، لە بارە جۆرا و جۆرەکانی ئەورووپادا وەکو دیپلۆماتێك پەروەردە بوو. دە ساڵی تەواو، لەساڵی ١٥٠٢ تا ١٥١٢، دەستی ڕاستی سۆدێرینی(Soderini) بوو کە بە درێژایی ژیانی فەرمانڕەوای فلورەنسا بوو.

بەم شێوەیە ماکیاڤێل بواری ئەوەی هەبوو تا ئەوەی لە پشت پەردەی درامای ئەورووپاوە بوو، لە نزیکەوە ببینێت. هەر ئەویش بوو کە ڕێکخستنێکی نوێی بە سوپای فلورەنسا بەخشی، گوتارەکانی (سۆدێرینی)ی دەنووسی و ئەگەرێکی زۆریش هەیە کە بەرپرسی بەشێك لە کارەکانی بووبێت. کاتێك سودێرینی لەبەرامبەر رکابەرانی خۆی نشوستی هێنا و لە فەرمانڕەوایی کەوت، ماکیاڤێلیان ئەشکەنجەدا و بۆ خاڵێکیان گواستەوە کە نزیکەی دوانزە میل لە فلورەنساوە دوور بوو. لەم شوێنەدا، ماکیاڤێلی، لە لایەکەوە هێندە لە شارەوە نزیك بوو، کە دەیتوانی ئەو ڕووداوانە بخاتە ژێرچاودێرییەوە کە لەوێدا ڕوویان دەدا و هەمیش هێندە کەوتبووە پەراوێزەوە کە نەیدەتوانی خۆی لە سیاسەتی فەرمانڕەواییاندا هەڵقورتێنێت. لەبەرئەوەی بۆی مەحاڵ بوو ببێتە توخمێکی چالاك لەسیاسەتدا، بۆیە کاتی خۆی بۆ فێرکردنی ئەوانیتر سەرف کرد تابتوانن ببن بە سیاسەتمەداری بەئامانج گەیشتوو.

ماکیاڤێلی چەندین پەرتووکی لەبارەی سیاسەت (کە مەبەست لێیان فێڵ و تەڵەکەبازییە نەك شێوازی بەڕێوە بردنی مەملەکەت)و هەفت بەرگی پەرتووکی لە بارەی هونەری شەڕ و تەنزێك لە بارەی زەواج و یەك دوو شانونامەی خراپ فێربوون و چەند چیرۆکی ریالیستی کە چەشنی شەهوەتپەرستیان هەبوو، نووسی. بنەماکانی (ئاکار)ی لەژیانی تایبەتی و گشتیدا بە یەکجاری وەرچەرخاند. جوامێریی لە سیاسەتدا بە ژەهرێکی کوشندە ناو دەبرد و شەڕوجەنگێك کە ڕاستگۆیی تێدابێت بە گێلانە دەیزانی و ڕایگەیاند لە رامیاریی شەڕدا، ڕاستی و ڕێکی بێ واتان و هەموو کارێك ڕەوایە. ئەگەر پێویست بێت خەنجەر لە دوژمن بدرێت ئەوا دەبێت ئاگاداربین و لەو پشتەوە لێیبدرێت. بیروڕاکانی ماکیاڤێلی لە پەرتووکی "گەورەی شار"دا بە ڕوون و ئاشکرایی ڕوون کراونەتەوە. ئەم پەرتووکە کۆمەڵێك یاسا و بنەمای چاوبرسێتی و چاوچنۆکییە. ماکیاڤێل ستایشکەرێکی گەرم و گوڕی سێزار بورژیایە و لەپەرتووکی "گەورەی شار"دا ستەمکارییەکەی وەکو نموونەیەکی تەواو ناو بردووە. ماکیاڤێل شازادە نوێکەی





فلورەنسا (لورێنز و دومێدیسی Lorenzode medici) و هەموو شازادەکان ئامۆژگاری دەکرد کە ئەگەر دەیانەوێت دەوڵەتەکەی خۆیان سەروبەر بخەن و دەسەڵاتی خۆیان بپارێزن ئەوا دەبێت شێوازەکانی بورژیا بەکار بێنن.

ماکیاڤێل لە هیچ ڕوویێکەوە بایەخ بە خۆشبوونی ژیانی خەڵك نادات و تەنیا ئارەزوومەندییەکەی گەشەسەندن و پێشکەوتنی شازادەیە. پەرتوکی"گەورەی شار" بێئەوەی دانەرەکەی مەبەستی بێت، ڕوو کردنەوەیەکی چاك و وەسفکەری بارودۆخی ئەورووپایە لەماوەی سەدەکانی پانزدە و شانزدە. لێرەدا بنەماکانی بیروڕای ماکیاڤێل (یان حوکمە دەبیە دڕندانەکانی) بەشێوەی بیروڕانامەی ماکیاڤێل کورت دەکەینەوە تاوێنەیەکی ڕووناکی (ڕوونی) پەرتوکی "گەورەی شار"ان لە زەیندا دروستبێت:

١ ـ تەنیا بەشوێن بەرژەوەندی و ئارەزوومەندییەکانی خۆتەوەبە.

٢ ـ هیچ کەسێك جگە لەخۆت بە ڕێزدار (هێژا) دامەنێ.

٣ ـ کاری خراپە بکە بەڵام وا بنوێنە کە نیازی چاکەت هەیە.

٤ ـ چاوچنۆك بەو بۆکۆکردنەوەی ماڵ و سامان تێ بکۆشە.

٥ ـ ڕەزیل بە.

٦ ـ توندوتیژ و بێ بەزەیی بە.

٧ ـ دوژمنەکانت لەناوببە و لەباری پێویستدا ڕەحم بە هاوڕێکانیشت مەکە.

٨ ـ تا بوارت بۆ دەرەخسێ بە شوێن فێڵ و تەلەکەبازیەوە بە.

٩ ـ لە مامەڵە کردن لەگەڵ خەڵکدا تەعەداکاری لە نەرمی نواندن باڵاتر دابنێ.

١٠ ـ جگە لە شەڕ لەبابەت هیچ شتێکی ترەوە بیر مەکەرەوە.

**ئێستا چاو بە هەریەکە لەو دەستورانەدا دەخشێنین:**

١ـ تەنیا بەشوێن بەرژەوەندی و دڵبەندییەکانی خۆتەوە بە. ماکیاڤێل لەڕووی ئاکارییەوە کوێر بوو و نەیدەتوانی دونیا وەکو یەکەیەك ببینێت. مرۆڤەکان لەڕوانگەی ئەوەوە خێزانێکی لێك



نزیك و پێکەوە بەستراو و هاوبەشی دەردوخەمی یەکتر نەبوون، بەڵکو ئەوانی بە گرووپێکی پەرتەوازەی خەڵکانی ساویلکە و ستەمکار دەبینی. ئەو لەو بڕوایەدابوو کە دەبێت ستەمکار ساویلکەکان لە ڕێگەی مەبەستەکانی خۆیدا بەکاربێنێت و وایدادەنا کە باشترین ڕێگەی بەکارهێنانیان بریتییە لە فشار خستنە سەریان. چونکە بەگوێرەی یاساکانی جەنگەڵ، هەرکاتێك تۆ نەیانخەیتە تەنگانەوە ئەوان نەنگت پێەڵدەچنن، هێز لە سەر حەقە، بۆیە بەهێز دەبێت هەمیشە توانای خۆی بەکار بەرێت و هەندێك یاسا بۆ پشتگیری کردنی خۆی و دژی بێتواناکان دابنێت. ئەرکی لاواز و بێتواناکان ئەوەیە کە لە خزمەت بەهێزەکاندا بن و باڵایی یان جیاکەرەوەی کەسی بەهێز لەوەدایە کە بکەوێتە خزمەتکردنی خۆی.

٢ ـ جگە لە خۆت کەس بە ڕێزدار (هێژا) لەقەڵەم مەدە. ماکیاڤێل دەڵێت: "ئەوەی دەبێتە هۆی ئەوەی کە ئەوانیتر گەورە بن و ڕێزیان دەستبکەوێت، ستەم لە خۆی دەکات." تا ئەو کاتە ڕێز لە بەرژەوەندیەکانی ئەوانیتر بگرە کە بتوانی باش سودیان لێوەربگری. بەڵام کاتێك (لەو ساتەدا) کە ترسی ئەوە دێتە ئاراوە کە ببنە خۆشەویستی خەڵك، ئەوا بۆ لەناوبردنیان خەبات بکە چونکە پیاوێکی پلەپەرەست نابێت تەحەملی بینینی (ڕکابەر)ی هەبێت.

ماکایڤێل لەو بڕوایەدایە کە نەتەوەی خۆشبەخت ئەو نەتەوەیەیە کە تەنیا یەك خاوەن زەوی و زاری هەبێت و هەمووخەڵك ئەلقەی کۆیلایەتیی یەك کەسیان لە ملدا بێت. شازادە دەبێت دەستی وەرگری هەبێت و لە چاکە و بەخشندەیی خۆی دووربخاتەوە.

٣ ـ خراپە بکە بەڵام وابنوێنە کە گوایە نیازی چاکەت هەیە. ماکیاڤێل بە دڵ و گیان ڕێز و نرخ بۆ نەبوونی یەکڕەنگی دادەنێت و بەڕاستگۆییەوە ئامۆژگاری سیاسەتوانان دەکات کە نەکەن ڕاستگۆ و یەکڕوو بن.

بەڕاستی چاك بوون، زەحمەتی دروستدەکات، بەڵام خۆ بە چاك پیشاندان قازانجی بێشوماری هەیە. ئەوەی بە خۆی دەڵێت:"دەبێت لەگەڵ ئەو خەڵکەی کە هەموویان وەکو خودی ئەون، بە یەکڕەنگی و چاکەکارییەکی تەواوەوە مامەڵە بکات، بەناچاری لە ناو کۆمەڵێکی زۆردا کە چاك نینە لەناو دەچێت" بۆ ئەوەی هێز(دەسەڵات) بپارێزرێت و تاڵانکاری بەردەوام بێت، لەسەر شازادە پێویست دەکات کە بەپێچەوانەی داد و عەدل و مرۆڤایەتی و بڕوا و جوامێری هەڵسوکەوت بکات. گرنگ ئەوەیە کە نابێت خەڵك لەم کارانە ئاگادار ببنەوە، بەڵکو دەبێت

گێڵ بكرێن و ئەم بیرۆكەیە لە زەینیاندا جێگیر بكرێت كە ئەو پیاوێكی خانەدان و دلۆڤان و خواترس و دادپەروەرە. بەواتایەكیتر فەرمانڕەوای بە ئامانج گەیشتوو ئەوەیە كە لە هەمان ساتدا كە خەڵك دەخاتە بەر پێلاقە، قایلیان دەكات كە ئەو پارێزەر و پاڵپشتیكەری ئەوانە. ئەو وا شازادە فێردەكات كە لێگەڕێ بەزەیی و نەرمی نواندن لەسەر زارت بێت و ناپاكی(گلاوی) و شەیتانكاری لە دڵتدا بێت.

٤ ـ چاوچنۆك بە و بۆ كۆكردنەوەی ماڵ و سامان تێبكۆشە. شازادەیەك بە گوێرەی دەستوورە توندوتیژەكانی ماكیاڤیڵ نابێت جگەلە بەرژەوندییەكانی خۆی چاو لە هیچ شتێكیتر بكات. نابێت لە بنەڕەتدا بایەخ بە مافی ئەوانیتر بدات. بە راشكاوی دەڵێت هەرچەندێك دەتوانی تالاْن بكە و دەمی ئەوكەسە ببەستە كە بە سكالاْ و گلەیی هەڵدەستێت. بەڵام لەهەموو بارێكدا هەوڵبدە خۆت بە ئازادیخواز بنوێنی. لە چاو برسێتی و چاوچنۆكیدا رادەی پێویست بپارێزە، نە لەبەرئەوەی كە كارێكی تەواو نییە، بەڵكو بەوهۆیەوە كە لەڕادەی خۆی زیاتر ترسناكە. واباشترە لەو بێگانانەی كە بێ توانان و توانای رووبەڕووبوونەوەیان نییە لەگەڵ تۆ بستێنی و خۆت لە وەرگرتنی باج لە خەڵكی وڵاتەكەت لادەی تا لێت توڕە نەبن و لە تەخت نەتخەنە خوارەوە. بەواتایەكیتر بێهێزەكان تالاْنبكە و خۆت لە بەهێزەكان بپاریزە تا بەو هۆیەوە ببی بە پیاوێكی گەورە.

**٥ ـ رەزیل بە:**

ماكیاڤێل دەستووراتی سەرەتایی خۆی بەم چەشنە درێژە پێدەدات و ئامۆژگاری شازادە دەكات كە ماڵ و سامانی خۆی پاشەكەوت بكات و لە هی خەڵك خەرجبكات. بۆ شازادە شتێكی ماقووڵ نییە كە لە هەڵسوكەوتیدا لەگەڵ رەعیەتی خۆی دەستبڵاو بێت. ئاشكرایە كە لە قۆناخی یەكەمدا ناوبانگی بە بەخشندەیی دەچێت بەڵام هەر زوو خەرجییەكەی زیاد دەبێت و ناچار دەبێت باج زیادبكات تا بتوانێت دەرەقەتی ئەو خەرجانە بێت. بەو هۆیەوە ئەو شازادەیەی كە بەخشندە بێت و دەست بۆ ئەو ماڵ وسامانە درێژبكات، لە كۆتاییدا لەناو دەچێت: "ئەوەی زیانت پێدەگەینێت بەخشینە لە ماڵ و سامانی خۆت." بەڵام شایستەی شازادەیە كە لەو تاڵووەی كە لە تالاْنكردنی بێگانەكانەوە دەستكەوتووە، تا ئەو ڕاددەیەی كە شیاوبێت بەخشندە



و دەستبڵاو بێت چونكە بەم شێوەیە نەك تەنیا رەعیەتەكەی بەهۆی ئەم بەخشندەییەوە ستایشی دەكەن بەڵكو هەردەم ئامادە دەبن بچن بۆ مەیدانی شەڕ و لەپێناویدا بمرن.

**٦ ـ توندوتیژ و بێ بەزەیی بە:**

شازادەیەك كە ئەركەكەی ئەوەیە هەموو خەڵك بكاتە نۆكەری خۆی، نابێت هەرگیز نەرمی و دلۆڤانی بنوێنێت. ماكیاڤێل ئەوە بیردەخاتەوە كە سێزار بۆرژیا تەنیا بەو هۆیەوە لە شكۆ و گەورییدا پێش شازادەكانی تری هاوچەرخی خۆی كەوت چونكە لە هەموویان توندوتیژتر و بێبەزەییتر بوو(ماكیاڤێل وەیاد هێنانەوەی ئەو خاڵە لەبیردەكات كە شكۆ و گەورەیی بۆرژیا سەرەنجام بەهۆی بێبەزەییەكەیەوە لە ناوچوو).

پیاوێكیتر كە"بێ بەزەییە دوورە پەرێزەكەی" مایەی ستایشی بێسنووری ماكیاڤێلە فێردیناند( Ferd inand)ی پاشای ئیسپانیایە. ماكیاڤێل دەڵێت: تەنیا كەسێكی بێبەزەیی و چارەڕەش دەتوانێت ببێت بە سولتانێكی سەركەوتوو. سولتانە مرۆڤدوست و خۆشتەبیعەتەكان كە لایەنگری عەدل وداد و دوژمنی چارەڕەشی و ستەمكارینە، ئاكامێكی دژوار و ناخۆشیان هەیە. چاكە هەرگیز بەرامبەری نییە. شازادەیەك، كە لەبن فەرمانی رەعیەتەكەی بێت و رێز لە سەربازانی خۆی بگرێت، خەڵكێكی لە ناخی خۆیدا خنكاندووە و لە جیاتی ئەو دێوێكی پەروەردە كردووە.

٧ـ تا بوارت بۆ برەخسێ بە شوێن فێڵ و تەڵەكە بازییەوەبە. ماكیاڤێڵ چەندین جار پێداگری دەكات لەسەر ئەوەی كە مرۆڤ دەبێت بۆسەركوتكردنی ركابەرەكان بە ئانقەست توندوتیژی بنوێنێت. ئامۆژگاری شازادە دەكات كە توڕەیی شێر و فێڵبازی رێوی لە خۆیدا پەروەردە بكات.

"ئەوەی كە شێوازی رێویی باشتر فێربووە و چاكتر بەكاردەبات، سەركەوتوترە." بە بڕوای ئەو هێزوتوانا لە عەدالەت و داد گرنگترە و فێڵ و تەلەكەبازی لە حەقیقەت بەهێزترە. ئامۆژگاری ئەو بۆ شازادە ئەوەیە كە هیچ كاتێك خۆی تووشی زەحمەتی نەكات لەپێناو ئەوەی كە بەرامبەر بە بەڵێنەكەی وەفادار بمێنێت، چونكە هیچ كەسێك واناكات:"ئەگەر هەموو خەڵك باش بوونایە ئامۆژگارییەكی وا راست نەبوو بەڵام كە هەموو خەڵك خراپكار و بەدخۆن و لەگەڵت ئەمەكدار





نامێننەوە، واباشترە تۆش لەگەڵیان بەئەمەك نەبی." ئەوەش بۆ قسەکەی زیاددەکات کە: دەبێت بۆ فەرمانڕەواییك بەڵێن شکێنی کارێکی بێئەندازە ئاسان بێت:"هیچ پێویستی پێناکات کە شازادە پەیمان شکێنییەکەی بەو بەڵگانە پەردەپۆش بکات کە ماقووڵ دیارن." چونکە خەڵك زۆربەیان ساویلکە و گەوجن. دونیا هەمیشە ئامادەی فریو خواردنە.

٨ـ دوژمنەکانت لە ناو ببەو ئەگەر پێویستیش کرد رەحم بە دوستەکانیشت مەکە. ئەو سەردەمەی کە ماکیاڤێل ژیانی تێدا بەسەر دەبرد چەندەها فرسەخ لە مرۆڤایەتی و گەلووستی دووربوو. لەو وەرزشانەی کە لە سەدەی شانزدەهەمدا رەونەقێکی شایانیان هەبوو راوی گیانەوەران و سووتاندنی ئەو کەسانە بوو کە بەپێچەوانەی بیروڕای باو رای خۆیان دیاریدەکرد. یەکێك لە ئیمپراتۆرەکانی ئەو سەردەمە کە دەیویست لە کۆئەندامی هەرسیٚ ناو لەشی مرۆڤ بکولێتەوە، فەرمانیدا سکی دوو پیاو بەزیندوویی لە بەردەمیدا هەڵدڕێنن. رێك وەکو ئەوەی بۆ قوتابیانی پزیشکی توێکاری لە سەرچەند بۆقێك ئەنجامبدات.

سەدە درێژخایەنەکانی کوشتار و خوێنرێژی دڵڕەقی و بیٚ نرخبوونی ژیانی مرۆڤەکانی لێکەوتبوو. لەو رۆژگارەدا، لە قوماری ژیاندا، تاوان رووداوێکی ناچیز و ناپاکیش رێسایەکی پەسەندکراوی هەموان بوو. قوتابی و خوێنەرانی بەرهەمەکانی ماکیاڤێل بەتەواوەتی ئامادەی جێبەجیٚ کردنی دەستوورات (رێنماییەکان)ی بوون و هەر ئانوساتێك چاوەڕێیان دەکرد بەشێکیتر لە لۆژیکە شەیتانییەکەی ئەو فێر بن و بەکار بهێنن.

٩ـ لە مامەڵە کردن لەگەڵ خەڵکدا تەعەداکاری لە نەرمی نواندن بالاٌتر دابنێن. ماکیاڤێل ئەم رێسایە وەکو بنەمایەکی پەسەندکراو دەردەبڕێت کە واباشترە خەڵك ترسیان لە تۆ هەبێت نەك خۆشیان بوێت. هەرکە سەرکەوتی، و چان بە شازادە ڕکابەرەکەی خۆت مەدە و لەناوی بەرە و بۆ تەواوکردنی کارەکەی خۆت بنەماڵەکەی هەمووی لە رەگوریشە دەربێنە گەرنە یەکێك لەوان خۆی راست دەکاتەوە. (سەر هەڵدەداتەوە)و تۆڵە دەستێنێت. پیاوێکی پلەپەرست نابێت ستەمکارێکی ناتەواو بێت. دەبێت یان ستەمکارێکی نیهادپیس و پڕ بەپێستی خۆی بێت یان دەست لە پایە پەرستی بشوات و لابچێت. بەلاٌم هەرچەندە ستەمکارییەکەت سنووری نییە دەبێت رێکوپێکی و تەنسیق لە کارەکەت دابێت. کاتێك ولاٌتێکت بەدەستخست یان کەسێکت تالاٌنکرد، بێدواکەوتن و بە هەموو هێزێکەوە گورزەکانی خۆت بوەشێنە تا هەرچی زووە لە



یادەکاندا بسڕێتەوە. بەپێچەوانەوە ئەگەر پێویستی کرد لێیان ببوری، کرداری لێبوردنەکە بەرەبەرە و هێدیهێدی جێبەجیٚ بکە تا لە یادەکاندا درێژە بخایەنێت و چەندە باشترە کە لە بنەڕەتدا خۆت لە لێبوردن لابدەی؛ چونکە کەسێکی ستەمکار دەبێت پشت بە خۆ ببەستێت و لەو رێگەیەوە خۆی لەسەر کار بهێڵێتەوە نەك بە هۆی لێبوردن و چاکەخوازی. ئەم دەستوورەی کارە بۆ دوایین(لە روانگەی بەربەریەتەوە، گرنگترین) دەستووری ماکیاڤێل رێنمایی دەکات.
١٠ ـ جگە لەشەڕ، لە بابەت هیچ شتێکیتر بیرمەکەرەوە. شەڕ گرنگترین سەرقاڵیی "دڕندەی هەڵبژێردراو"ی ماکیاڤێلە.

شازادەیەك دەبێت زۆربەی کاتەکانی خۆی سەرفی فێربوونی هونەری خوێنرێژی و کوشتار بکات:"چونکە شەڕ تەنیا هونەرێکە کە بە کەڵکی فەرمانڕەوا دێت."

شازادە نابێت هەرگیز فیکری خۆی لە بەدواداچوونی کاروباری عەسکەریی لابدات. خوێندنەوە و لێکۆڵینەوە و بیرکردنەوە

ئێجگار جدییەکانی. گشتیان دەبێت بە دەوری ئەو تەوەرەدا بسورێنەوە کە چۆن دەتوانێت بە سەر رکابەرانی خویدا سەرکەوێت.

ـ ٣ ـ

لە فەلسەفەی ماکیاڤێلدا هەموو رێگاکان بە شەڕ کۆتایی دێن و ڕەنگە یەکێك لەو هۆیانەی کە شەڕ تا ئەمڕۆ لە جیهاندا ماوە، ئەوە بێت کە زۆرترینی مەملەکەتەکان لەلایەن موریدانی ماکیاڤێلەوە بەڕێوە دەبرێن یان رێکتروایە بڵێین بەرەو لاڕیٚ دەیبەن. زانستی ئەخلاقی ئەو هەمان ئەو زانستەیە کە لە عەسکەریدا بەکاردێت و سیاسەتمەدارە خۆپەرستەکان لەسەرتاپای جیهاندا کەڵکی لێوەردەگرن. ژیان لەڕوانگەی ئەوانەوە هێشتاش هەمان شەڕ وکێشمانە کێشی ناو جەنگەڵە و تەنیا هێزوتوانا بە راست (حەق) دەناسن. هیچ لەو دلۆڤانی و نەرم و نیانییەی کە خەڵکی ڕەسەن و خانەدانی راستین لە خەڵکانی بە روالەت ئارام و بەڕەوشت جیا دەکاتەوە، نازانن.





ماکیاڤێل فەیلەسووفی ئایدیالی حکوومەتی پایە بەرزییە. کە دەکرێ بە حکوومەتی "گورگە میهرەبانەکان" ناو ببرێت. موریدانی ماکیاڤێل تەنیا لە ناو عەسکەرییەکاندا نینە، بەڵکو لەناو سیاسەتمەدار و نووسەرانیشدا هەواداری هەیە.

لۆرد بیکەن (Bacon) کە حیکمەت و خراپەکاری (فیتنەکاری) بە شێوەیەکی سەیر پێکەوە لە بوونیدا هەبوون فەرمانی بە هەموو فەرمانڕەوایانی داوە و گوتوویەتی: زۆرترین ڕادەی ڕیاکاری و کەمترین رادەی راستی و ڕێکی لە کارەکاندا بۆ خۆیان بکەنە رێوشوێن.

تۆماس کرۆموێل (Thomas Cromuell)ی سەرۆك وەزیرانی هێنریی هەشتەم (HenryVill) ی پاشای ئینگلتەرا پەرتووکی "گەورەی شار"ی بە پوختەی حیکمەتی سیاسی ناو بردووە. ماکۆلێی(Macaulay) کە یەکێکە لە ناسراوترین مێژوونووسانی سەدەی بیستەم، لە بەرهەمەکانی ماکیاڤێلدا پەی بە "لوتکەی بەرزایی هەستەکان" بردووە. و نیچەش زیاترین ئیلهاماتی ژەهراوی خۆی لە سەرچاوەی بیروڕا ئەهریمەنییەکانی ماکیاڤێل* وەرگرتووە.

لە زەمینەی سیاسیدا دەتوانرێ لە گەورەترین موریدانی ماکیاڤێل ئەم کەسایەتیانە ناوببەین: ناپلیۆن، قەیسەر ویلهێلیم، هێتلەر، مۆسۆلیونی ـ ئەو دەست درێژیکەرانەی کە تێنوێتیی توندیان بۆ دەستخستنی هێز(دەسەلآت) تەقریبەن شارستانیەتی وێرانکرد. ئەمڕۆکەش بنەما و دەستووراتە ئەهریمەنییەکانی ماکیاڤێل رێنماییکەری پیرۆزی ئەو جەنگاوەر و دیکتاتۆر و داگیرکەر و ستەمکارە خراپکارانەیە کە تەنگیان بە نەژادی مرۆڤ هەڵچنیوە و گەرووی دەگوشن(دەستیان خستوتە بینافاقای).

---

* حوکمەکانی ئەم نووسەرە لەبارەی نیچەوە لە مروەتەوە دوورن، ڕەنگە ئەمە ڕوانگەی نووسەرانی ئەو سەردەمە بەرامبەر بە نیچە دەربخات، چونکە کورتکردنەوەی فەلسەفەی نیچە کە دیارە چەندین خوێندنەوە هەڵدەگرێت بۆ فیکرەیەکی فاشیانە کە نازیەتی لێکەوتووەتەوە ئەوپەڕی بێویژدانییە بەرامبەر بەم فەیلەسووفە کە ئیستاش کاریگەری لەسەر فەیلەسووفانی سەدەی بیست، بەتاییەت چۆست مودێرنەکانەوە ماوە.





# تۆماس مۆر ( ١٤٧٨ ـ ١٥٣٥ )

## ئەو فەیلەسوفەی کە لە ڕێگەی بیروباوەڕدا لە گیانی خۆی خۆشبوو

لە ساڵی ١٤٩٩ دانیشتنێکی میوانداریتی بۆ نانی نیوەڕۆ لەلایەن سەرۆك شارەوانیی لەندەنەوە ڕێکخرا. لە ناو میوانەکاندا دوو لاو ئامادە بوون کە یەکتریان نەدەناسی. کاتێك لە پاڵ مێزەکە دانیشتن، بەزمانی لاتین کە زمانی زانست و ئەدەبی ئەو ڕۆژگارە بوو کەوتنە ئاخاوتن و دوای کورتە گفتگۆیێك یەکێك لەو ڕۆحە ئاشنایانە بە تاسەبارییەوە ئاشکرای کرد:"تۆ لە (مۆر) بەولاوە کەسێکی ترنیت." و ئەویتریان بێ دواکەوتن وتی: "تۆش یان ئێراسم (Erasmus)* ی یانیش شەیتان."

ئەمە یەکەمین دیداری دوو لە دیارترین پیاوانی ئەوسەردەمە "شەیتانی هۆڵەندی و پیری ئینگلیزی" لەگەڵ یەکتر بوو کە هاوڕێیەتیان لە تەواوی ماوەی ژیانیاندا بەردەوام بوو.

ـ ٢ ـ

چەند ساڵێك دواتر لەو نامانەدا کە ئێراسم بۆ یەکێك لە هاوڕێکانی نووسی بەم چەشنە وەسفی مۆری کرد"... پیاوێکی بەژن مامناوەندییە. سورێتییەکی نیوە توخ لە ژێر سپیاتی پێستیدا بەرچاو دەکەوێت. قژێکی ڕەش و تۆخی هەیە. ڕوخساری زیاتر شادی و کراوەیی پێوە دیارە تا نێوچاو گرژی و ڕووگرژی و هەردەم دەم بەپێکەنینە. هیچ شتێك نییە کە بۆی نەبێتە مایەی شادی. چاوەکانی بەزەوق و خەندەران و گوتوبێژیی ـ بەتایبەت لەگەڵ ئافرەتان ـ بە گەپ و

* نووسەر و فەیلەسووفی هۆڵەندی (١٤٦٧ ـ ١٥٣٦)



نوکتەبێژی و شوخێتی بارگاوی بوون." بوونی ئەم هەموو سیفەتانە لای ئەو شتێکی سەیرنییە چونکە باوکی لە لەندەن پارێزەرێکی کامەران و دوستی گیانیبەگیانی پاشا بوو و ئەو بەخۆی لە بەختەوەریدا گەورە بووە."بۆ هەرکوێیەك بچووبایە خەرمانێکی ڕووناکیی شکۆ و گەورەیی ئابلۆوقەی دەدا." لەهەمان کاتدا هیچ کەسێك، جگە لە کچەکەی، نەیدەزانی کە مۆر، لەژێر جلە پۆشتەوپەرداخەکانی کراسێکی کوڵکنی لە بەر کردووە.

ئەم فەیلەسووفە بە گیانێکی ئازاد و هەڵسوکەوتێکی بە ڕەوشت، خاوەنی کەسایەتییەکی قووڵ بوو و لەساڵی ١٤٧٨، لە خێزانێکی"بەڕێز و ڕەسەن" چاوی بە دونیا هەڵێنا، باوکی دادوەر بوو و ئەوها پەروەردەی کرد کە کاتێك گەورە بوو پیشەکەی ئەو هەڵبژێرێت.

دەڵێن کاتێك منالێکی شیرەخۆر بوو دایەنەکەی لە ڕووبارێك دەیپەڕاندەوە و تەوژمی ئاوەکە هێندە توند بوو کە هەردووکیان ـ دایەن و منالەکە ـ لە مەترسی نقوم بووندا بوون. دایەنەکە بۆ ڕزگاکردنی منالەکە بەرەو کەناری پەرژین فڕێیدا و کاتێك خۆیشی هاتە بەستێنەکە بەسەرسامییەوە بینی کە هیچ زیانێك بە منالەکە نەگەیشتووە. لەو ڕووەوە بەپێکەنینەوە وتی:"خواوەند دەبێت بۆکارێکی ترسناك پاراستبێتی."

مۆر لەقوتابخانەدا لە خوێندکارانیتر جیابوو. لەو سەردەمەدا وانەی لاتینییان "بە زەربی دار و فەلاقە لە مێشکی منداڵانیان دەئاخنی" بەڵام مۆر خولیای بوو و پێویستی بەو ئامرازانە نەکرد. ڕەفتارە سەرنجڕاکێش و فیکرە دەروشاوەکەی مۆر بوو بە مایەی سەرنجی مۆرتۆن (Morton) کە ئەسقەفی گەورە و وەزیری خەزینەی ئینگلتەرا بوو و لەکۆشکەکەیدا کارێکی پێ سپارد کە دووساڵ بەردەوام بوو. لەوێ، لەکاتێکدا کە لە پشت کورسییەکەی مۆرتۆن ڕاوەستابوو، هەموو ئازای لەشی ببوون بە گوێ تا شتی شایانی دیتن و بیستن ببینێت وببیستێت. جیهان لەبەرچاوی، دیمەنێکی ئێجگار دڵگیر و جوان و شادیبەخش و فرە ڕووداوی ڕاخستبوو کە هەندێك جاریش ناشرین و خیانەتئامێز و پڕ لە دژیەکی دەبوو.

مۆر لە تەمەنی چواردە ساڵیدا وازی لە خزمەتکردنی ئەسقەفی گەورە هێنا تا بچێتە ئۆکسفۆرد، ئەمەش لەساڵی ١٤٩٢ دا ڕوویدا ـ ئەو ساڵەی کە کریستوفەر کۆلۆمبس جیهانی نوێی دۆزییەوە. واتا سەردەمی بوونەوەی ئاسۆتازەکان، دۆزینەوە یەك لەدوای یەکەکان و دەرکەوتنی مێشکە فێرخوازی لێگەڕەکان. سەردەمی ڕێنیسانس کە کاتی ئاوڕدانەوە و





بەئاگاهاتنەوەی سەرلەنوێی گیانی مرۆڤییە لە جوانییەکانی رابردوو و ئومێدەکانی ئاییندە: گیانی ڕێنیسانس، مۆری خستە ناو خۆوە و ئەوی، بە پێچەوانەی ڕەزامەندی باوکی، بۆ دەست خستنی زانستە نوێکان و خوێندنەوەی فەلسەفەی یۆنان و تواناداودەرییەکانی رۆما، هاندا. باوکی دەیویست مۆر لە کاری دادوەریدا ببێتە زانا، نەك ئەوەی بە"خوێندنەوەی رۆتینیانە و ناتەواوی فیکرە کوفراوییەکان" کاتەکانی خۆی بەفیڕو بدات. بەلاّم مۆر بە بڕیارێکی بێدەنگ و بە گەردەنوش کە پێناسەری مەعنەویات و رێوشوێنی بوو لە ململانێیدا لەگەلّ دوو پاشادا کە دواتر ڕوویدا، پێداگری لەسەر هەلّبژاردنی توانای دەروونی خۆی کرد.

ئەم هێزە دەروونییە لە ڕاستیدا تاکە خواردنێك بوو کە بۆ قوتابیانی ئۆکسفۆرد بەرەوا بینرابوو.

ژیانی زانکۆیی بەقەد ژیانی زیندانییێك سادە و توندوتیژ بوو. چوار قوتابی پێکەوە لە حوجرەیەکدا دەژیان و بڕە پارەیەك بەرامبەر بە بیست رّیالی ئەمڕۆ بۆ خەرجی پێویست دەدرا بە هەریەکەیان. قوتابیان کاتژمێر پێنجی بەیانی لەخەو هەلّدەستان و تاکاتژمێر دە وانەیان دەخوێند. دوای خواردنی نانی نیوەڕۆ کە یەکەمین ژەمی ڕۆژانە بوو و بریتی بوو لە پارچە گۆشتێکی گوێرەکەی پڕلە ئێسك و کووپێك گۆشتاو، تا کاتژمێر دەی شەو هەروا سەرقالّی خوێندن دەبوون، "لەبەرئەوەی ئاگر لە ژوورەکانیاندا نەبوو" ناچار بوون نیو سەعاتێك هەلّپەڕن تا قاچیان گەرم ببێتەوە و بچنە ناو جێگا.

ئەم شێوازەی ژیان بۆ کەسێك کە ژیانی فەیلەسووفێتی هەلّبژاردبوو و لەڕێگەی بیروباوەڕیدا شەهید بوو، مەشقێکی ئێجگار باش بوو. هەرچۆنێك بێت، مۆر خوێندنەکەی تەواو کرد و بۆ رووبەڕووبوونەوە لەگەلّ پێشهاتەکانی ژیان ئامادە بوو. هەرچەندە لەکاتی کاردا ڕێگاکەی ساف و هەموار بوو، ئەو خۆی بۆ ڕووبە ڕووبوونەوە لەگەلّ هەرجۆرە بەربەستێك کە دەکرا بکەوێتە سەر ڕێگای، ئامادە کردبوو.

مۆر، ماوەیەك دوودلّ  بوو لەوەی کە پیشە و ژیانێکی چالاك هەلّبژێرێت یانیش لە گۆشەیەکدا بە ئاسودەیی ژیان بەسەر بەرێت. بەرلەوەی ببێتە دادوەر بیری لەوە کردەوە کە بچێتە ڕێزی راهیبەکانەوە. چوار سالّی لە دێریکدا* بەسەر برد و بە وردبینییەکی تەواوەوە سەیری ئەو

* وشەی دێر لێرەدا لەبڕی وشەی صومعەم بەکاربردووە کە مانای دێرێك دەگەیێنێت لە سەر شاخێك.



ڕێوڕەسمەی کرد کە لە "بێدەنگییەکی بەردەوام"دا بەڕێوە دەچوو بەلاّم سەرەنجام ئەڤینەکەی بەسەر چالاکییە کۆمەلاّتییەکەیدا زالّبوو و بەرەو ژیانی دونیایی پەلّکێشی کرد.

بەلاّم لە ژیانی ناو دێرە چیاییەکەدا، کێشمانەکێشی نێوان گیان و جەستەی بە دیاری هێنا و هەڕ لەو کاتانەدا بوو کە لەژێر روخسارە رزاوەکەیدا کراسی کولّکنی ئاسوودەیی و دەروێشی لەبەر دەکرد. لەو بەروارە بەدواوە، ژیانی مۆر، بەلایەنی کەمەوە لەڕوانگەی خەلّکی جیهانەوە، شکۆدار و سەرکەوتوانە بوو بەلاّم خودی مۆر، بەباشی ئاگای لە پووچی و ناراستی ئەو بابەتانە بوو.

## - ٣ -

مۆر لە تەمەنی بیستوحەوت سالّیدا ژنی هێنا. پێنج سالّ دوای ئەمە ژنەکەی مرد و چوار منالّی ساوای بۆ بەجێ هێشت. مانگێك دوای ئەوە، مۆر هاوسەرێکی تری هەلّبژارد تا دایەنێکی بۆ منالاّن و هاودەمێکی بۆ خۆی هەبێت.

کارە دادوەرییەکانی هێندە سەرکەو تنیان بەدواوە بوو کە لە وێناکردنی خۆی بەدەربوو. هەموو کەسێك ستایشی دەکرد جگە لە خۆی، بڕوای وابوو: "کاتێك مرۆڤ گەیشتە لوتکەی سەرکەوتن (بالاّڕوویی) ئەوا لەسەر لێواری کەوتنەخوارەوەدایە." (کاتێك فوارە بەرزببێتەوە، سەرەوژێر دەبێتەوە) و لەم دیاریکردنەدا، ژیانی خۆی لەبەر چاوگرتبوو. مۆر نرخی ڕاستەقینەی ناوبانگی خۆی دەزانی، نە بەو هۆیەوە هەستی بە لەخۆبایی بوون دەکرد و نەش رقی لێ دەبووەوە. دەیگوت: گەورەترین تراژیدیای ژیان لەوەدایە کە مرۆڤ ئارەزووی ئەوە بێت کە بێچێتە ریزی پیرەکانەوە بەلاّم لە کۆتاییدا تەنیا ببێتە پیاوێکی سەرکەوتوو و خاوەن پلە.

بەو هۆیەوە، مۆر سەرکەوتنی راستەقینەی لە بێفیزی و خاکی بوونی مەعنەویدا بینییەوە و لەهەلّگەڕان بۆ بەرزترین خالّی قالّدرمەی بالاّڕوویی و گەشەپێداندا خۆی لە پێخستنە سەر پەنجەکانی ئەو کەسانە پاراست کە بەنائومێدیەوە لە پلەکانی خوارەوە تەقەلاّ دەکەن.

مۆر، بەرگریی بەهێزەکانی بەرامبەر بە لاوازەکان قبوولّ نەدەکرد و خۆی لە وەرگرتنی دەستحەقی پارێزەری لە هەژاران بەرامبەر بەدەولّەمەندان لادەدا.





کارە بەرز و بەشکۆیەکەی لە هەڵسوکەوتیدا لەگەڵ دەربارییشدا بەتەواوەتی دیاربوو. لەوکاتەدا هێنریی حەوتەم داوای کرد پارەیەك بەبڕی نەوەت هەزار لیرەی ئینگلیزی بۆ خەرجی زەماوەندی پرەنسیس مارگرێت لەگەڵ پاشای ئسکوتلەندا دابینبکرێت، مۆر ئەندامی ئەنجومەن بوو و تەنیا ئەو بوو کە وێرای دژایەتی خۆی بەرامبەر بە سەپاندنی ئەم برە پارە زەبەندە بەسەر میللەتدا پیشانبدات و بتوانێ برەکەی بۆ چل هەزار لیرە کەم بکاتەوە. پاشا لەم بڕلە سووکایەتییەی مۆر هێندە توڕە بوو کە فەرمانیدا باوکی لە ناو بورجی لەندەن زیندانی بکەن" چونکە بە هۆی ئەو خۆشەویستییەی کە مۆر لە ناو خەڵکدا هەبوو، (هێنری)ی حەوتەم نەوێرا بە تەمێکردنی ئەو سووچیارە هەڵسێت. دوای مەرگی(هێنری)ی حەوتەم، (هێنری)ی هەشتەم جێی گرتەوە و دانیشتنی ئەو لەسەر تەختی دەسەلاّت مژدەهێنەری رۆژگاری نوێ بوو بۆ ئینگلتەرا.

نووسەرێکی ئارەزوومەند لەهەمان کاتدا نووسی: "ئاسمان پێدەکەنێت و زەوی سەمادەکات و تۆ بەدەست دەپرژێنێت. شادی و خۆشحاڵی ولاّتی لەخۆ پێچاوە تەوە. پاشاکەمان بە شەق لە زێڕ و بەردە بە نرخەکان و کانزا گرانبەهاکانی هەڵداوە و تاسەخوازی پاکژی و شکۆ و نەمرییە"

ئەمە بوو ئەو ئومێدانەی کە لەبارەی پاشاوە لە دڵدادەیان پەروەراند ـ ئەو پاشایەی کە بڕیاری وابوو خراپترین جۆری حکوومەتی ستەم و ئۆتۆکراسیەت لە مێژووی ئینگلتەرادا دامەزرێنێت- (هێنری)ی هەشتەم لە سەرەتای کارەکەیدا جێگەی پەسەندی بوو و رەفتارێکی دۆستانەی هەبوو.

ئەم پیاوە قژ زەرد و بالاّبەرز و باریکەلەیە، دوای چەند ساڵێك بۆ سەر شێوەی دێوە پیاوێکی بە ریش و هەڵپەنمان گۆڕا کە زاناکانی لەخۆ کۆ دەکردەوە و دەیگوت:"ژیان بێ بوونی خاوەن فەزلەکان ئێجگار دژوار و ناخۆش دەبێت."

لە سەرەتادا ئەمە بوو بیروڕاکەی، بەلام دواتر ئەو تێنوێتییەی کە بۆ ستەم و زۆرداری بەسەر بوونیدا زاڵبوو زیاتر بوو لەو خولیایەی کە سەرەتا بۆ دەستخستنی زانست پیشاندەدا.

یەکێك لەو زانایانەی کە (هێنری)ی هەشتەم دڵبەندی و رێزێکی تایبەتی بەرامبەر هەبوو تۆماس مۆر بوو فەرمانیدا کە مووچەیەکی سالاّنە بۆی دیاریبکرێت تا "تا لە ئەرکەکانی



رۆژانەی خۆی کاتێکی بەتاڵی زیاتری دەستبکەوێت و بتوانێت زیاتر خزمەتی پاشا بکات" بەلاّم مۆر ئەم پێشنیارەی پەسەند نەکرد و داوای کرد کە ئەم مووچەیە بۆ ئێراسم دیاربکرێت. لەوکاتەدا ئێراسم لە ماڵی مۆر ژیانی بەسەر دەبرد و لە خوانی بەخشندەییەکەی بەهرەمەند بوو. لێرەدا بوو کاتێك ئیراسم پەرتووکە ناودارەکەی بە ناوی "پیاهەڵگوتنی شێتایەتی" نووسی. بەلاّم لە هەمان کاتدا ئامۆژگاری مۆری دەکرد کە واز لە شێتایەتی بێنێت و فەرمانی پاشا بۆ خزمەتکردنی ئەو(واتە پاشا) پەسەند بکات. سەرەنجام مۆر، لە پێناوی ولاّتەکەیدا، ملی بۆ ئەو داواکارییە دانەواند. ئینگلتەرا پێویستی بە پیاوێك بوو کە بتوانێت دوو لایەتی کێشەیەك بەبێ ئالیگری کردن لە لایەنێك، بەباشی ببینێت.

ئەم هەنگاوەی مۆر کاریگەرییەکی ئاشکرای لەسەر شۆڕشی مانگی گوڵان هەبوو. لەو رۆژەدا کرێکاران کۆ بوونەوە و لە دژی ئەو بێگانانەی کە لە لەندەن دەژیان، دەستیان بە خۆ پێشاندان کرد.

مۆر، بە لە مەترسی خستنی ژیانی خۆی، هەوڵیدا شۆڕشگێڕەکان ئارام بکاتەوە. سەرەتا شۆڕشگێڕەکان بەرد و کەرپووچیان تێگرت و ئاوی گەرمیان بەرەولای پرژاند. بەلاّم مۆر سەرەنجام توانی بلاّوەیان پێبکات و بۆ ماڵیان بگەرێنێتەوە.

چەند رۆژێك دواتر، نزیکەی چل کەس لە شۆڕشگێڕەکان بە فەرمانی (هێنری)ی هەشتەم لە سێدارەدران و ژمارەیەکی زۆریان کەوتنەبەر راوەدوونان و دادگاییکردن. مۆر بۆ تکاکردنی لێبوردنیان چووە لای پاشا و وتی:"لێت دەپاڕێمەوە کە چاکە و میهرەبانیان بەرامبەر بنوێنی و لەو کەسانە ببووری کە بەرامبەر بە کردەوەکەیان سەرشۆڕ و پەشیمانن." پاشا شەفاعەتی مۆری پەسەندکرد و بەهۆی ئەم کردەیەوە توانی کۆمەڵێك لە خزمەتکارانی ئاشتی بخاتە خزمەتی خۆیەوە. ئێراسم لەو بارەیەوە بۆ یەکێك لە هاورێکانی خۆی نووسی:"دواجار پاشا توانی مۆر بۆ دەربارەکەی خۆی رابکێشێت."





تۆماس مۆر وەکو شیڤالیە* ی پاشا و بە بەگومانی و بڕواپێ نەکراوییەکی توندەوە هاتە ناو دەربار. ئەو بەڵێنی بە پاشادا:"بەرزترین ڕادەی ئەمەکداری و ئەرکناسی، دوای خواوەند، بەرامبەر بە ئەو (واتا پاشا) ڕەچاو دەکات" و (هێنری)ی هەشتەم لە بەرامبەر ئەم بەڵێنە، لەرووی ئەدەب و میهرەبانییەوە وەڵامی داوە کە ئەو ئەرکەی کە بەرامبەر بەخوا لە ئەستۆیدایە هەرگیز مۆڵەتی ئەوەی پێنادات کە بێبایەخ بێت بەرامبەر بە بیرکردنەوە چاکەکانی هاوڕێ بە ئەمەکەکانی. بەڵام مۆر دەیزانی کە ئەم قسانە لە حەقیقەت بێبەرینە ."هەرکاتێك هێنری بتوانێت بە بەدەستەوەدانی سەری من کۆشکێك لە فەرەنسا بکرێت، لەم کارەدا دوودڵ نابێت." مۆر لە هەمان کاتدا گیانێکی شەیتانیی لە پشت نیقابی (شا)یی‌دا بەهۆی چاوی دڵەوە دەبینی. ئەو باش لە ڕێوڕەسم و دابونەریتە ئاساییەکان و فێڵەکانی پاشا ئاگادار بوو. مۆر چەندها ساڵ بیری لەو دونیایە کردبووە کە تیایدا مرۆڤە ژیرەکان و خەڵکی ئازاد و ڕەسەن فەرمانڕەوا بن و بەرهەمی بیرکردنەوە و خەونە زێڕینەکانی خۆی لە چیرۆکێکی فەلسەفیدا بەناوی یۆتۆپیا (١٥١٨) نووسیبوو.

- ٤ -

یۆتۆپیا دورگەیەکی خەیاڵییە کە تیایدا هەرکارێك بۆ بەرژەوەندی گشتی ئەنجامدەدرێت. ئەم چیرۆکە، بەو شێوە بەرکەماڵە ئایدیالییە نەك تەنیا بۆ ئینگلتەرای ئەو ڕۆژگارە، بەڵکو تەنانەت بۆ دونیای هەنووکەیش، لەئەفسانەیەك بترازێ هیچیتر نییە. مۆر بەکێشانی نەخشەی چیرۆکەکە لە سەر شێوەی گوتوبێژ لەگەڵ کەشتیوانێك بەناوی ڕافاییل هیتلۆدی ( Raphae v lHythlodaye) ڕەنگی حەقیقەتی لێدەدات وخوێنەرەکانی ئاگادار دەکاتەوە کە ئەم کەشتیوانە بەرێکەوت دەگاتە دورگەیەك، پێنج ساڵ تیایدا دەژیت دوایی دەگەڕێتەوە ئینگلتەرا تا هەواڵی خۆشی بوونی وڵاتێکی تەواو بگەیەنێتە گوێی هاوڵاتیانی.

بۆ ئەوەی چیرۆکەکە بە تەواوەتی ڕاستەقینە بنوێنێت، مۆر هەندێك لە ڕێوڕەسمە باوەکانی ئەم شارە خەیاڵییە ڕەفز دەکاتەوە و پشتگیریش لە هەندێکیان دەکات. بۆ نموونە یەکێك لەو

* Chevalier وشەیەکی فەرەنسییە، لە سەدەکانی ناوەڕاستدا بەو کەسە خانەدانەیان دەگوت کە پلەی شانازی لەلایەن شاوە دەستکەوتووە. و. کوردی



ڕیوڕەسمانەی کە لە ڕوانگەی ئەوەوە "بێ کەڵك و گەوجانە"یە، ئەو دابەیەکە بووك و زاوا یەکتر بە رووتی وەکو ڕۆژی لەدایکبوون ببینن تا دواتر هیچ هۆیەك بۆ سکالاٌ کردن لە کەم و کورتییە جەستەییەکانی یەکتر نەهێتە ئاراوە. سەرتاپای ئەم چیرۆکە هێندە بە بیروبڕوا و یەکڕەنگی نووسراوە کە کۆمەڵێك لە خوێنەران بە ڕاستەقینە دایدەنێن. ڕەنگەش زیاتر بە هۆی ئەوەوە بێت کە ئارەزوومەند بوونی وڵاتێکی وا، راستبێت. چونکە یۆتۆپیا، لە زۆر ڕووبەوە، گوزارشتێکی خەونەکانیان بوو. لەو شارە خەیاڵییەدا، بەگوێرەی داخۆیانییەکانی مۆر، خاوەن تواناکان هەژاران فریونادەن، نەفرەت و بێزاری بوونی نییە. ستەم و زۆرداری بەرچاو ناکەوێت. هیچ ئەسەرێك لە شانازیکردن و لووتبەرزیی بێسنوور کە بە "دایکی گەندەڵی" ناوی بردووە، نییە چونکە خاوەندارێتیی تایبەتی دژایەتی لەگەڵ بەرژەوەندی گشتیدا هەیە و ئارەزوومەندییە گشتییەکان پەیدا نابن، یەکسانی و دادپەروەری بۆ هەمووان بەدەستنایێت. ئەوەی مۆر لەمێشکی خۆیدا گەڵاڵە دەکات، لەڕاستیدا هەمان ڕێبازی هاوبەشێتی (ئیشیتراکی) سەردەمی مەسیحیەتە. واتا هەبوونی مەعنەویات و بیروباوەڕێکی ئایینی لە بەهرەمەندبوون بە شێوەیەکی یەکسان لە نیعمەتە خواییەکان. مۆر، کاتولیکێکی دەمارگیر بوو و هەروەك کە دەبینین کە هەر ئەو دەمارگیرییە دەبێتە هۆی شەهیدبوونی. یۆتۆپیاکەی وەکو چاڵاکیەکەی لەسەرتاپای ژیانیدا، بۆ ئەو بابەتە تایبەتمەند کرابوو (تەرخان کرابوو) تا بەهەشت بخاتە بەردەستی خاکییەکان.

لەم وێنە بەهەشتییەدا، کە لەسەر زەوی دەرچووە، بەپێی ئەوەی کە لە یۆتۆپیادا هاتووە، چل و چوار شار هەنە کە هەموویان بەنەخشەی هاوشێوە، بە مەبەستی دابینکردنی ئاسایشی پێویست بۆ خەڵکی گشتی، بیناکراون. فراوانی شەقامەکان یەکسانە و بینای خانووەکان وەکویەکن. لە هەموو خانووەکاندا دەرگایەك بەرەو شەقام و دەرگای تریش بەرەو باخ دەکرێتەوە. هەرکەس بەڕادەی پێویست توانای هەیە بۆ پڕکردنەوەی پێداویستییەکانی، لەو ڕووەوە، گومانی دزیکردن بۆ کەمترین ڕادە کەم بووەتەوە.

خانووەکان بۆکەس ناگەڕێنەوە. بەڵکو لەلایەن دەوڵەتەوە بەکرێ دراون. کرێچیەکان هەر دەساڵ جارێك ماڵەکانی خۆیان دەگۆڕن تا ڕێگە لە دەرکەوتنی هەستی خاوەندارێتی تایبەتی(شەخسی) بگرێت. لە یۆتۆپیادا لە ڕەنجخۆری و ستەم و زۆرداری، ڕاو، قومار و فێڵ و





تەلەکەبازی هیچ شوێنەوار(ئەسەر)ێك نییە و پێویستیش بە پارێزەری دۆز و زیندان و گرتن نییە. مۆر لە بارەی ئایینی باو لە یۆتۆپیادا بەزمانێکی ناڕوون دەدوێت. وا چاوەڕێ دەکرێت کە قەشەکان "ئێجگار پاکژ و پیرۆز بن لەو ڕووەوە ژمارەیان بە پەنجەی دەست دەژمێردرێن" مۆر لە هەموو تەمەنی خۆیدا سوور بوو لەسەر ئەوەی کە دەبێت ژمارەی قەشەکان لە ئینگلتەرا ئەوەندەی بکرێ"کەمتر ببێتەوە و لە باشترین کەسەکان" بن.

ئەو وێنەیەی کە مۆر لە یۆتۆپیادا لەبارەی بەرزترین ڕادەی زاهدی و دوورەپەرێزی (تەقوا) پیشان دەدات، هیچ نییە جگە لە دەرخستنی ئارەزووی ناخی بۆ پالاوتنی پەرستگاکانی ولاتەکەی. مۆر بە دڵ وگیان ستایشی ڕوحانییە ڕاستەقینەکانی دەکرد کە بریتی بوون لەو شوانانەی کە خۆیان لە قەڵەوکردن بە هۆی قوتدانی مەڕەکانەوە دەپاراست و لە لایەکیترەوە لەگەڵ هەندێك لە ڕێبەرانی ئایینی، وەکو کاردینال ولزی (Wolsey) کە پلەیەکەی بەرزی لە کلیسادا بەدەست هێنابوو، لەشەڕ و سواژدابوو و ئیمانی لەوان دەچوور" بڕوای وابوو کە ئەم گروپە ئەرکە دینیەکانیان تێکەڵ بە پلەپەرستیە مرۆڤیەکان کردووە. مۆر نەیدەتوانی هیچ جۆرە پەیوەندی و خزمایەتیەك لە نیوان خوا و زێردا ببینێت. "لێگەڕێن پیاوە ئایینییەکانمان گیرفانی سووکتر و دڵی سافتریان هەبێت."

ئیتر خەڵك لە یۆتۆپیادا، لەبەرامبەر کەمترین بڕی کارکردن کە بۆ پڕکردنەوەی پێداویستیە زەرورییەکانی ژیان ئەنجامیدەدەن، زۆرترین مووچە وەردەگرن. هەموو خەڵك، ژن بێت یان پیاو، بە شێوەیەکی یەکسان ڕۆژانە شەش سەعات کار دەکەن و کاتە بۆشەکانیان بە خوێندنەوە و وەرزش پڕدەکەنەوە. شەش سەعات کاری ڕۆژانە بەسە تەنیا بەو مەرجەی کە هەموو کاربکەن و کەس بێکار نەبێت و کاتی خەڵك بۆ دابینکردنی پێداویستەکانی جوانکاری و هونەرکاریی دەوڵەمەندان بەفیڕۆ نەچێت. ئەگەر پێداویستییەکانی خەڵك زیاتر لە ڕادەی پێویست دابین ببێت کەس پیشەی خۆی لەدەست نادات، بەڵکو لەجیاتی ئەمە ماوەی کارکردنیان کەم دەبێتەوە، تا ئەوکاتەی کە پێشکەشکردن و داواکاری هاوسەنگ دەبن. ئەو دەستەیەی کە جلەوی کاروباری ولاتی بەدەستەوەیە هەڵبژێدراوی خەڵکن تەنیا لەبەر ئەوە هاتوونەتە سەرکار چونکە کەسانێکی ژیرمەند و لە سیاسەت و ئابوریدا بەهۆش و فیداکار و ئاشتیخواز بوونە. خەڵکی یۆتۆپیا لەو ڕووەوە کەبۆ کۆکردنەوەی ماڵ و سامان، چاو برسێتیان



لانییە بۆیە حەزێکی ئەوها بۆ شەڕوجەنگ نیشانادەن. زێڕ لە ڕوانگەی ئەوانەوە هێندە سووك و بێنرخە کە زبڵدانیان لێ دروست دەکرێت. پارەکەیان ئاسنە نەك زێڕ و زیو و ئەو کانزا قورس و کەم نرخەیان بۆیە هەڵبژاردووە تا کەس حەزی بۆ پاشەکەوت کردنی نەچێت. مرواری و ئەڵماس لە لیستۆکی منالانن نەك هۆیەکانی خۆڕازاندنەوەی گەورەکان. بەکورتییەکەی ئامانجی ژیانی خەڵکی یۆتۆپیا ئەوەیە کە هاوڕێیانە و بە ڕەچاوکردنی یەکسانی و هاوکارییەکی تەواو و بێبەش لە هەرجۆرە کینە و ئیرەیی و چاوبرسێتییەك، ژیان بەسەربەرن. ئەم ڕەفتارە هاوڕێیانەیە تەنها لە پەیوەندییەکانی نێوان خۆیاندا باو نییە بەڵکو لە پەیوەندییەکانی خۆیاندا لەگەڵ ولاتە بێگانەکانیشدا هەمان شێواز بەکار دێنن. خەڵکی یۆتۆپیا هەرگیز بە شەڕکردن لەگەڵ نەتەوەکانیتر هەڵناستن. بەلاّم هەرکاتێك نەتەوەیەکیتر جەنگی لە دژیان هەڵگیرساند ئەوا لەبری ڕەوانەکردنی لاوان (کە دڵیان بە توندی بە ژیانەوە بەندە) بۆ گۆڕەپانی شەڕ داوخواز (خۆخواز)ە کرێخوازەکان بەکرێ دەگیرێن و شەرەکەشیان دژی خەڵکی نەتەوە دەستدرێژکەرەکە نییە، بەڵکو بۆ دژایەتیکردنی فەرمانڕەواکانیانە. بۆ کوشتنی پاشای شەڕکەر، پاداشتێکی زۆر و زەبەند دەدەن بەلاّم ئەگەر پاشا بە زیندوویی دەستگیر بکەن پاداشتیان زیاترە. بۆ چاکسازی و ڕێکخستنی ولاتی دوژمن، خەڵکی یۆتۆپیا، بەزەیی و دلۆڤانی دەگرنەبەر و"دەزانن کە خەڵك بەپێچەوانەی ویستی خۆیان و بە ورووژاندن و پاڵپێوەنان لەلایەن شا و فەرمانڕەوا شێتەکانیان بۆ جەنگ ڕاکێشروان."

لە یۆتۆپیادا، لێك تێگەیشتنێکی تەواو بالاّ دەستە و ئازادیی فیکرە سیاسییەکان و خواپەرستییە ئایینیەکان بۆ هەمووان بوونی هەیە. هەر کەسێك سەربەستە لەوەی هەرکەسێك کە دەیەوێت و بەهەر شێوەیەك کە پێی خۆشە بپەرستێت. تەنانەت بتپەرستانیش مۆڵەتی ئەوەیان هەیە کە بە دوور لە ڕەنج و ترس لە نێویاندا بژین: "لێگەڕێن با لەو دونیایەدا بەرگەیان بگرین و سزادانیان بۆ حوکمدان یان دادوەریی خاوەند لە دونیاکەی تر بەجێ بهێڵین." لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، ژمارەیەکی زۆری خەڵکی یۆتۆپیا کریستیانینە، لەوکاتەوە کە زانیان عیسای مەسیحیش دژایەتی خاوەندارێتیی تایبەتیی ماڵ و سامانی کردووە ڕوویان لەو ئایینە کردووە.





یۆتۆپیای تۆماس مۆر، نموونەیەکە لەوەی کە ئەمڕۆ بە سوسیالیزمی مەسیحی ناو دەبرێت. واتا دیموکراسیەتێکی کۆمەڵایەتی کە لەسەر ژیانی مەسیح بنیاتنراوە. هەروەك کە (بەرنارد شۆ)ش وەبیرخستۆتەوە ئەم جۆرە حکوومەتە تاکو ئێستا نەهاتۆتە سەرکار: "ئێمە سوسیالیزمی بێ مەسیحیەت و مەسیحیەتی بێ سوسیالیزممان هەیە. بەڵام لە هیچ شوێنێك، ئەم دووە پێکەوە کۆنەبوونەتەوە." کاتێك کە مۆر وێنەی وڵاتە ئایدیالەکەی خۆی دەکێشێت، لە راستیدا تەمسیلەکانی پەرتووکی پیرۆز بەزمانی سەردەمی خۆی دەردەبڕێت. ئەو بەتەمایە ئەو بنچینە کۆمەڵایەتییە هەڵبوەشێنێتەوە کە تیایدا "گوندییێکی گێلٚ (کەم فام)ی بێ سەر و مێشك تەنیا لەو رووەوە کە بڕێکی بەرچاو زێڕ و زیوی پاشەکەوت کردووە، خۆی بەسەر کەسانی ژێردا هەڵدەکێشێت".

مۆر، لەوێدا کە لەبارەی کۆکردنەوەی ماڵ و سامان دەدوێت ئاماژە بە ئایدیالیزمی سەرەتای مەسیحایەتی دەکات و بەم چەشنە رەخنەی لێدەگرێت: "سامان، ئەو هۆکارەی کە هەرجۆرە ڕەسەنایەتی و خانەدانی و شکۆ و گەورەیی و ڕاستی و ڕێز، لەناو کۆمەڵگایەکی ئیشتراکیدا لەناو بردووە."

بەکورتی، هەوڵی مۆر لە دانانی نەخشەی یۆتۆپیادا، لەڕاستیدا بەو مەبەستە بوو تا مەسیحیەت لە دەستوورات (ڕینماییەکان)ی مەسیح نزیکبخاتەوە.

ـ ٥ ـ

ماوەیەکی کورت بەرلە بلاوبوونەوەی پەرتووکی یۆتۆپیا، ماکیاڤێل پەرتووکی "گەورەی شار"ی بلاو کردبووەوە. خەڵك دەستخۆشی و ئافەرینیان لە مۆر کرد بەڵام پاشا،ماکیاڤێلی بەدڵ بوو و "گەورەی شار"ی پێ باشتر بوو لە"یۆتۆپیا". چونکە بۆ حکومەتە ستەمکارەکەی ئەو ئەوکتێبە بەکەڵکتر بوو و هێندەی پێنەچوو کە ئینگلتەرا کەوتە بەر لافاوی کوشتن و تاوان و ستمەکاری و چاو برسێتی.

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، خۆشبەختیی مۆر ماوەیەکی زۆر بەردەوام بوو.(هێنری)ی هەشتەم پلەی سەرۆك وەزیرانی پێبەخشی کە بەرزترین پلەی دادوەریی ئینگلتەراش بوو، شەرەفی ئامادە بوونی لە میوانداریە پاشاییەکاندا هەبوو و بە هەڵسوکەوتێکی دۆستانە و بە ویقار،



لەکاتێکدا کە بریقەی تەنز لەچاوانیدا دەدرەوشایەوە، خواردنە بەچێژەکانی دەخوارد و لە پێکە زێڕینەکاندا قومێك مەی دەخواردەوە. مۆر هەموو ئەو شانازییانەی بەبێ یاخییەوە قبوولدەکرد و دەیزانی زوو بێت یان درەنگ ئەو پلە و شانازیانە لێیوەردەگیرێتەوە. بەمە بەگەدەنیش و ئاسوودەییەوە چاوەڕێی ئەو ڕۆژە مایەوە.

بۆ مشووری ئەوە بخۆین کە تەمەن چ کاتێك و چۆن کۆتایی پێدێت؟ "هەموومان بە مەرگ مەحکووم کراوین چ ئەمڕۆکە بێت چ سبەی، چ بیست ساڵیتر. ئەم لێدانە بێگومان بەر سەری هەمووومان دەکەوێت. کەواتە تا هەناسەمان لەبەردایە دەبێت سەرهەڵبڕین و جیهان بە ملێکی قیتەوە ببینین." سەرەرای ئەمە، مۆر لەسەر بەڵێنەکەی خۆی بوو و بڕیاری وابوو کە هەروا بە ڕێزوهێژاییەوە لەگەڵ شا مامەڵە بکات. هیچ بایەخێکی بە بەخێرهاتنەکانی پاشا نەدەدا و چەوتییەکانی پاشای بە ئاشکرایی وەبیر دەخستەوە و(شا)ش بە زەردەخەنەیەکی ڕیاکارانەوە قسەکانی مۆری بەڕاست دادەنا، بەڵام بەرەبەرە ئەم زەردەخنەیە لەسەر ڕوومەتی پاشا ون بوو. ڕاوێژکاری تایبەتی پاشا پێی لەسنووری خۆی زیاتر هەڵێنابوو و دەنگی بەرزتربووە ـ هەمان ئەو دەنگەی کە لە ویژدانی (هێنری)ش بەرزدەبۆوە ـ بەتایبەت کاتێك کە ئامۆژگاری دەکرد تا خۆی لە تەلاقدانی کاسێرینی ئاراگۆن(Katherine oF Aragon) لابدات. پاشا بەتوندی خوازیاری ئەوە بوو کە خۆی لە بەندی هاوسەرێتی لەگەڵ کاسێرین ئاسوودە بکات تا بتوانێت لەگەڵ ئان بۆلین (Ann Boleyn) بزەوجێت. بەڵام پاپا دژایەتی تەلاقدانی کاسێرینی دەکرد و (مۆر)یش پشتگیریی لە ڕایەکەی دەکرد.

ئەم نارەزایی دەربڕینەی دادوەری گشتی، بوو بەمایەی تورەیی ئان بۆلێن و (هێنری)ی فریودا تا زەمینەی لەسەرکار لابردنی مۆر ـ ئەو پیاوەی کە کەوتبووە سەر ڕێگای ئەڤینەکەی ـ دابین بکات. بەم شێوەیە حوکمی پاشا دەرچوو و پلەی دادوەری گشتی لێ سەندرایەوە.

بەڵام هێشتا گورزی کۆتایی نەوەشێنرابوو. هێنری، کاسێرینی تەلاقدا و لەگەڵ ئان بۆلێن زەماوەندی کرد و داوای لە مۆر کرد تا بەشداری لە ڕێوڕەسمی تاج لەسەرکردنی شاژنی نوێدابکات بەڵام مۆر ئەم داوایەی پەسندنەکرد. ئەو ئاگای لە سەرەنجامی ئەم خۆلادانە بوو و لەگەڵ گاڵتە(شۆخی)یەکی سەرنجڕاکێش بەراوردی کرد. دەیگوت: یەکێك لە ئیمپراتۆرانی ڕۆما





سزای هەندێك لە تاوانەكانی بە مەرگ ڕاگەیاند و تەنیا گوناهكارێك كە *كچ بێت لەو سزادانە عەفوكرد. سەیرەكە ئەوەبوو كە یەكەمین سوچدار كچ بوو و ئیمپراتۆر لە جێبەجێ كردنی حوكمەكەدا كەوتە سەر دووڕیانێك. یەكێك لە ڕاوێژكارانی كە پیاوێكی سادە بوو پێشنیارێكی گاڵتەجارانەی كرد و گوتی:"یەكەمجار فەرمان بدە دەستدرێژی بكەنە سەری و پاشان پارچە پارچەی كە"و ئەوها ئەنجامی لێوەرگرت: "بەڵام لەبارەی من، ڕەنگە پارچە پارچەم بكەن، خوا چاودێری من دەكات، بەڵام هەرگیز ڕێگە نادەم دەستدرێژیم بكرێتە سەر."

مۆر تەخمینی دەكرد كە هێنری تا تۆڵەی خۆی نەستێنێت، ئاسوودە نابێت. بۆیە خێزانەكەی خۆی لە شوێنێك كۆكردەوە و ئەوانی بۆ قبوولكردنی ئەو ئاكامە مسۆگەرە ئامادە كرد:"هەركاتێك ژن و منداڵەكانم ئەو بوێریەم پێ ببەخشن كە بە(هۆ)ی ماقووڵ و بەجێ بەرەو مەرگ برۆم، ورەم بەرز دەبێتەوە و ئەمە دەبێتە هۆی ئەوەی كە بە هەڵەداوان ڕوو لەمەرگ بكەم."

یەكێك لەهاوڕێ نزیكەكانی بەناوی دوكی نۆرفۆرلك(Duke oF Norfolk) ئامۆژگاریی كرد كە:"سەر دابنوێنێت و واز لە كەللەڕەقی بێنێت" چونكە تێكەوتن لەگەڵ پاشا ترسناكە:"هیوام وایە بەگوێرەی خواست و حەزی پاشا ڕەفتار بكەی" مۆر وەڵامی داوە:

"فەرمایشیی دیكەت نەبوو؟ دیارە ژیانی من و تۆ هێندە لێك دوور نییە. من ئەمڕۆ دەمرم و نۆرەی تۆ سبەی دەگاتێ."

لەو نیوانەدا، تورەیی ئان بۆلێن ئەو ئاگرەی خۆشتر دەكرد كە (فەیلەسووفەكەی خستبووە ناو خۆی تا ئەو ڕادەی كە سەرپێچیكردنی مۆر لە بەجێهێنانی "سوێندی بالأیی" بووە هۆی ئەوەی كە بێ دواكەوتن بیخەنە زیندانەوە.

لەساڵی ١٥٣٤ پاشا ئەنجومەنی ناچاركرد كە ڕابگەیێنێت كە وا سەرۆكی كلیسای ئینگلتەرا پاشایە نەك پاپا. خەڵكی ئینگلتەرا هەمووی ناچار بوو سوێندێك بخۆن كە بریتی بوو لە دان نان بە بالأییە مەعنەوییەكەی(هێنری)ی هەشتەم و سەرۆكایەتییە ڕۆحانییەكەی و لەبەرئەوەی مۆر بەوكارە هەڵنەستا، لە بورجی لەندەنیان كرد و بەمەرگ مەحكوومیان كرد.

* مەبەست ئەوەیە كە كچێتییەكەی نەدوڕاندبێت. و. كوردی



كاتێك مۆریان بەرەو بورجی لەندەن دەبرد، لەڕێگادا بە زاواكەی كە لەناو ڕووباری تایمزدا سەوڵی لێدەدا گوتی:"سوپاس بۆ خوا كە لە خەباتدا سەری خستم." لەڕاستیدا مۆر بەسەر دڕدۆنگیی خۆیدا سەركەوتبوو و ژیانی چەند ڕۆژەی بەقوربانی پاراستنی كەسایەتی و پایەداری (جێگری) بیروڕاكەی كردبوو.

## - ٦ -

لەهەمان ئەوكاتەدا كە مۆر لەچاوەڕوانی هاتنی ڕۆژی وادە پێدراودا ڕۆژ ژمێری دەكرد، یەكێك لە دڵبزوێنترین پەرتووكەكانی خۆی بەناوی "دیالۆگی ئاسودەیی و ڕەنج"ی نووسی. بابەتی ئەم پەرتوەكە وێنەیەكی زیندووی مۆراڵی شەهیدێكە. هەموومان لەم جیهانەدا شەهیدین ـ ئەو بیردۆزەی كە مۆر چەندین جار لە فەلسەفەكەی خۆیدا دەری دەبڕی ـ ئەو ئەوە قبووڵدەكات كە خۆدانە بەرمەرگ بە ئازارە و یەكبینە ترسی لە دەرد و ڕەنج هەبووە بەڵام ڕەنگە مەرگی سروشتی لە شەهیدبوون پڕئازارتر و ئێشبزوێنتر بێت."چونكە ئێش و ئازاریی دژواری شەهیدبوون، زوو لە ناو دەچێت) لەكاتێكدا كە ئازاری نەخۆشی لەوانەیە بە هەفتە و مانگان درێژە بخایەنێت.

سەرەڕای ئەمە گەیشتن بە پلەی شەهیدایەتی لوتكەی ئیمانە و هۆیەكی شەرەفدارانە بۆ مردن لەگەڵ خۆی دێنێت، لەكاتێكدا مەرگی ئاسایی تراژیدیایەكی ناماقووڵ و نالەبارە. ئایا دەبێت هەروا كە كۆمەڵێك لە هاوڕێكانی پێشنیاردەكەن، خۆی بداتە دەست ڕای پاشا و ژیانی خۆی ڕزگابكات! بەڵام ئەگەر وابكات نزمترین بەشی بوونی خۆی زیندوو هێشتوتەوە و بەرزترین بەشی كوشتووە. بەم شێوەیە ئەویش وەكو گەلێك لە خەڵكیتر بە جەستەیەكی زیندوو و گیانێكی مردوو، چەند ڕۆژێك دەخاتە سەر تەمەنی خۆی.

ئەو لەوە ژیرتر بوو كە خۆی بداتە بەر "ژیانی گێلانەی پیاوێكی بەساڵاچوو و كەنفت"و "لەكونجێكدا دابنیشێت گۆشت و شۆربا بخوات و زۆربلێنی بكات و لیل بەدەمیدا بێتە خوار. ئێستا كە پەنجاوحەوت ساڵ لە تەمەنی بەسەر چووە واباشترە تۆماری تەمەنی بپێچێتەوە و دەرك بە بەخشندەییی"مەرگی شكۆدار و شەهیدبوون لەڕێگەی ئیمان و بیروبڕوا بەمەسیح" بكات.





مۆر لەکاتی بیستنی فەرمانی مەحکوومێتی خۆی، وەکو عیسای مەسیح بە ویقارێکی تەواوەوە لەگەڵ دادوەرەکاندا دوا:"سانت پۆلس شایەتی بەردباران کردنی سانت ستیفێن بوو و ئێستا هەردوو پیاوچاکەکە لە بە هشتدان... دڵنیام و لە ناخی دڵەوە نزادەکەم لە بەهەشتدا هەموومان بە شادییەوە رووبەڕووی یەکتر ببینەوە و بگەین بە رزگاریەکی نەمر (هەتاهەتایی) هەرچەندە کە ئێوە لەم دونیایەدا خاوەن رابوونە و دەنگتان بۆ مەحکوومێتی من دا."

دادوەرەکان رایەکی ترسناکیان دژ بە مۆر دەرکرد، بەو جۆرەی کە فەرمانیان دا لەدار بیدەن و بەزیندوویی بیکەن بە چوارپارچەی یەکسان. بەلاّم پاشا ئەم حوکمەی گۆڕی و فەرمانیدا لەسەری بدەن و لەبەرامبەر ئەو بەزەیی و سۆزەی کەپێی رەوابینی فەرمانیدا"دەربڕینی هەرجۆرە بابەتێك لەکاتی مەرگدا لە مۆر قەدەغەبکرێت." چونکە پاشا تا دواسات لە دەربڕینە راشکاوەکانی دەترسا. هەروا کە مۆر لەشوێنی کوشتن نزیك بووەوە ئاوڕی داوەو زەردەخەنەیەکی بۆ پاسەوانەکەی کرد و گوتی:"جەنابی سەرقۆڵە، داواکارم بەسەلامەتی تائەو سەرانەمبەی، بۆ هاتنە خوارەوە لێم گەڕێ خۆم دێمە خوارێ!" و چەندساتێك دواتر هەوڵیدا کە سەرکردەی مامورەکان کە تۆڕە(دەماگرژ) دیار بوو هێوربکاتەوە و گوتی: ورەی خۆت بپارێزە کاکە، من ترسم نییە و تۆش ترس مەخەرە دڵتەوە."

کاتێك کە تەور بەرملی کەوت، فەیلەسوف ماڵئاوایی لە دونیا کرد و بە ئاوازێکی تەنزئامێزەوە وتی:"لێتان دەپاڕێمەوە کە مۆڵەتم بدەن ردێنم لەسەر تەختە هەڵگرم چونکە بە دڵنیاییەوە ردێنم تووشی هیچ ناپاکیەك بەرامبەر بە پاشا نەبووە.







# فرانسیس بیکۆن (١٥٦١ – ١٦٢٦)

## ئەو فەیلەسووفەی کە چەشنی بێ عەقڵێك ژیا

لەساڵی ١٩٢١ لە لەندەن ناپاکێك فاش بوو (ئاشکرابوو) و هەراوهۆریایەکی گەورەی نایەوە. لێکۆڵینەوەکان گەیشتنە ئەو ئەنجامەی کە کۆمەڵە مامورێکی پلەبەرز دەستیان داوەتە بەرتیلخۆری و لە سەرووشیانەوە (فرانسیس بێکۆن)ی سەرۆك وەزیرانی ئینگلتەراو فەیلەسووفی ناوداری ئەو سەردەمە هەبوو.

واباشە بزانین ئەم دکتۆر جێکیل و بەرێز *هایدەی سەدەی حەڤدەهەم کێیە؟

ـ ٢ ـ

فرانسیس بێکۆن یەکێکە لە رووداوخواز (سەرچڵ)ە سەیر و سەمەرەکانی مێژوو. گیانی رووناکی لە درەوشانەوەی ئەستێرەکان وەردەگرت بەڵام جەستەی بەتوندی بەکەلاکی دونیاییەوە بەسترابووەوە.

هەروەك کە شەکسپیر گوتەنی کارکردن بەحەق، تارادەیەك لەزانینی دژوارترە و بەسەرهاتی فرانسیس بێکۆن بەڵگەیەکی ئاشکرای ئەو ڕاستییەیە. بۆ فەیلەسووفێکی سیاسەتمەدار زۆر ئەستەمە بتوانێت هاوسەنگی خۆی بپارێزێت و لەژیاندا لەگەڵ خۆی هەڵبکات بەڵام نشوستی هێنا. ئەو ئەوهێزەیەی حیکمەت کە لە ڕێنماییەکان (دەستوورات)یدا حەشاردرابوو لەڕێگەی

* Dr. jekyll and Mr. Hyde کەسێك کە خاوەنی دووکەسایەتی دژیەك بێت. ناوی پەرتووکێکی (روبێرت لویس ستیونس)ی ڕۆمان نووسی ئینگلیزی (١٨٥٠ ـ ١٨٩٤)





کردەوەی خراپەوە پێشکەش بە خەڵکی جیهان کرد نەك بە کردەوەی چاك. هەم بەهۆی ئەو کارە چەوتانەی کە ئەنجامیدا و هەمیش بە هۆی قسە بەحیکمەتەکانی خۆی بە حەقیقەتەکان ئاشنای کردین. بێکۆن یەکبینە لەگەڵ خۆیدا لەشەڕ و سواژدا بوو و لەسەرتاپای تەمەنیدا دووهێزی قووڵبەسەریدا زاڵ ببوون: عیشقی دەست خستنی زانست و چاوبرسێتیی کۆکردنەوەی سامان.

ئەم لاوە کە زووتر لەکاتی ئاسایی گەیشتبووە تەمەنی پێگەیشتن و لە دوانزە ساڵیدا چووبووە ئامادەیی، دیاریدەکات:"بۆ هیچ کارێك جگە لە دۆزینەوەی حەقیقەت و دەست خستنی زانست شایستە نییە" بەڵام لەلایەکیترەوە لەبەرئەوەی باوکی پیشەی سیاسەتی هەبوو و لەکاری خۆیدا سەرکەوتبوو بۆیە بێکۆن بە تاسەیەکی زۆرەوە دەیەویست شوێن پێی باوکی هەڵبگرێت؛ "لەدایکبوون و پەروەردە و زانیارییەکانم... هەمموو شتێك بەرەو سیاسەت پاڵم پێوە دەنێت." لەو رووەوە بڕیاریدا ڕێبواری هەردوو ڕێگابێت" هەم ببێتە فەیلەسوفێکی ناودار و هەمیش یەکێك لە دەست ڕۆیشتووترین دەرباریەکانی سەردەمی خۆی.

هەوڵی دەدا لەهەمانکاتدا کە سەرقاڵی پەرستنی پەروەردگارە لەبەردەم خواوەندی ماڵ و سامان و پلەوپایە سوجدە بەرێت.

بێکۆن زۆر درەنگ تێگەیشت کە کۆکردنەوەی ئەم دووانە وەکو ئاو و ئاگر، مەحاڵە بەڵام ئیتر ڕێگەی ڕزگار بوون لەسەری داخرابوو و گیانی لەناو گەردەلوولی چاوبرسێتیدا نغرۆ ببوو.

ـ ٣ ـ

بێکۆن تەمەنێکی ئەوەندە زۆری نەبوو کاتێك گیرۆدەی کارە چەوتەکان بوو. تەمەنی سیوپەك ساڵ بوو کاتێك ڕایگەیاند:"من هەمموو زانستێکم دەست خستووە" و لەهەوڵی ئەوە دابوو کە دەست بەسەر سەرتاپای ئینگلتەرادا بگرێت. لە هەمان کاتدا کە هۆنراوەی دڵگیر و بابەتی تازەی لە بابەت باڵایی گیان و ئازادی دەنووسی، یاداشتی سووکایەتی ئامێزی بۆ کەسانی دەسترۆیشتوو دەنارد تالەلای پرەنسیس ئەلیزابێتی یەکەم گەورەی بکەن و پێشی بخەن. لە یەکێك لەو نامانەدا کە بۆ ئێرلی* ئێسێکس (Earl oF Essek) کە مایەی داڵبەندی و خۆشەویستی شاژن بوو، نارد و دیاریکرد:"بێ قەید و شەرت و لە هەربارێکدا خزمەتکاری

* Eari پلەیەکی ئەرستوکراتییە. و. کوردی

شاژن دەبێت" خۆشەویستییەکی لە رادەبەدەری بۆ کۆکردنەوەی ماڵ و سامان و پاشەکەوتکردنی هەبوو بەهەر رێگەیەك و بەهەر هۆیەك بێت و دەیگوت: "من پشت بە بیروڕای تالۆس دەبەستم کە دەڵێت فەیلەسووفیش ئەگەر بیەوێت دەتوانیت دەوڵەمەند بێت."

هێندە زەوقی لە کۆکردنەوەی ماڵ و ساماندا هەبوو کە بەتەواوەتی لە قاڵبی فەیلەسووفێك دەچووە دەرەوە. خەرجەکەی هەمیشە زیادەی داهاتەکەی بوو. چەند جارێك بەهۆی نەدانەوەی قەرزەکەی خۆیەوە کەوتە زیندان. بە تێپەڕبوونی رۆژگاری، ئەو نامانەی کە بۆ هاوکاری دارایی و دەستخستنی پلە و پایەی سیاسی دەنووسی، کاریگەریان نەما. لەگەڵ هەموو ئەمانەدا و سەرەرای چەوتییەکانی، هێندە پەیوەندی و نزیکایەتی بە خەڵکەوە هەبوو کە خۆشیان دەویست. ئیسێکس چەندین جار بۆ پێشخستنی لە دەربارەدا هەوڵیدا. لە شوێنێکدا نوسیویەتی:"من گشت هێز و توانا و دەست رۆیشتن و دۆستایەتی خۆم بەکار دەهێنم و بە هەموو هێزێکەوە دەست بۆ هەر فێڵ تەدبیرێك دەبەم تا هاوڕێیەتی شاژن بۆ فرانسیس بێکۆن، لە بەرامبەر هەرکەسێکیتر بورووژێنم." بەڵام بە هەموو ئەو هەوڵ و تەقەلا فراوانەی کە ئەو پێی هەڵسا، شاژن وردە وردە فەیلەسووفەکەی ناسی. ئێسێکس بۆئەوەی نائومێدی و نارەحەتیی "ئازیزترین هاوڕێی خۆی" کەم بکاتەوە قیتعەی پاشایی بە دیاری پێی بەخشی. فرانسیس لە سوپاسنامەیەکدا کە بۆ ئێسێکس نووسی ئەوەی بیرخستەوە کە "زیاتر لە هەموو کەسێك قەرزداری ئەوە." پاشان بڕیاریدا، بە شێوازی تایبەتی خۆی، قەرزەکەی خۆی بداتەوە و ئەمەکداری خۆی بەرامبەر بە خاوەنی بەخشندەیی بسەلمێنێت. رەفتاری بیکۆن لەگەڵ ئێسێکس، نموونەیەکی گوزارشتکەرە لە رەفتاری نامرۆڤانەی کەسێك لەگەڵ کەسێکی تر. ئێسێکس دوژمنایەتی شاژنی لە دژی خۆی وروژاند و شاژن فەرمانیدا کە بە تاوانی خیانەت بیخەنە زیندانەوە و جیگەی پێکەنینە کە شاژن بێکۆنی بۆ دادوەری هەڵبژراد تا لە دژی باشترین هاوڕێی خۆی، دۆزنامەیەك رێکبخات. ئەم کارە ئەرکێکی قورس بوو و پێویستی بە تەدبیر وەرگرتنێکی زۆر هەبوو. بێکۆن خۆشەویستییەکی راستەقینەی بۆ ئێسێکس هەبوو و بەلایەنی کەمەوە بە شێوەیەکی تیۆری، بڕوای بە پیرۆز بوونی هاوڕێیەتی هەبوو. لە دەربڕینەکانی ئەوە کە خزمەتی هاوڕێیانە، پیاوێکی خانەدان و بەخشندە دێنێتە کایەوە و پیاوەتییەکی هاوڕێیانە کەسانی خزمەتکار و ئەمەکدار و لە خۆبردوو دێنێتە ئاراوە. بەڵام دەبینی کە هاوڕێیەتی ئێسێکس بووەتە بەربەستێك لە بەردەم پێشکەوتن و بەرەوپێشچوونی.





بێکۆن دەیگوت: پلەپەرستی ئەو وەکو رووناکی خۆر"بەناو پیسەکاندا تێپەڕ دەبێت بەڵام لە کۆتاییدا وەکو یەکەمجار، پاکژ و خاوێن دەمێنێتەوە".

بەم شێوەیە، بێکۆن هاوڕێیەتی خۆی لەگەڵ ئێسێکس کردە قوربانی پلەپەرستیەکەی خۆی و پاداشتی بەخشندەییەکەی بە دۆزنامەیەکی توند دایەوە و ئەو کەسەی کە ئەوهەموو چاکە گەورانەی دەرحەق کردبوو، رەوانەی کونجی زیندان کرد.

فرانسیس بێکۆن بە قسەی ئەلێکساندر پۆپ* "ژیرترین و ناکەسترین جۆری مرۆڤ" یەکەمین هەنگاوی پێشکەوتن و بالاڕوویی لەسەر پشتی ئێسێکس هەڵێنا و هەروەك کە دەبینین تا بەرزترین رادەی ناسوپاسی چووە پێشەوە.

ـ ٤ ـ

بێکۆن لە بەرامبەر بە دەستەوەدانی هاوڕ گیانی بەگیانییەکەی بە دوژمن، بڕێك زیاتر لە سی سکەی زیو ـ نزیکەی هەزار دۆلار ـ حەقدەستی وەرگرت.

بێکۆن دوای ئەو ڕووداوەی کە بۆ ئێسێکس هاتە پێشەوە، لەرێگەی گەشەسەندندا چووە پێشەوە بەڵام شایستەی فەیلەسووفێك نەبوو کە هێندە لە کامەرانی خۆی لە خۆ بایی بێت.

ئەو بەهۆی هەستێکی غەریزییەوە بۆی دەرکەوتبوو کە ئەم هەورازە نشێوێکی بە دواوەیە. ئەو رِفتارەی کە بەرامبەر بە ئێسێکس ئەنجامی دابوو، هەندێ دوژمنی بۆی پەیدا کردبوو کە چاوەڕێی هەلیکیان دەکرد تا لە پلە و پایەکەی بیخەنە خوارەوە.

بەڵام بێکۆن وایدەزانی کە ئەو دۆستە خاوە نتوانایانەی کە کۆی کردوونەتەوە، دەکەونە ئاوێزی دوژمنەکانی. بێ ئاگا لەوەی کە ئەوان هەموویان لە فیکری کارەکەی خۆیاندا بوون. هەروەك خودی بێکۆن گوتوویەتی: "مرۆڤ بۆ پاراستنی خۆی هەستێکی بەهێزی هەیە هەروەك کە مشك، بەرلەوەی بنمێچی خانوو بڕوخێت، بەهۆی توانای هۆشییەوە پەی پێدەبات و خانوو بەجێ دەهێڵێت" بە پێی ئەم وەسفە بێکۆنیش لە خانووێکدا بوو کە بناغەکەی سست و ناقایم بوو.

* Alexander pope (١٦٨٨ ـ ١٧٤٤) شاعیری ئینگلیزی

ژنی هێنا بەڵام نە لەرووی عیشقەوە بەڵکو لە پێناوی پارە و سامان، لەڕاستیدا هەستێکی قووڵی عیشق وخۆشەویستیی نەبوو و بە دەربڕینێکی لە حەق تالێر نووسی:"ڕۆحە گەورەکان لەم ئاشووب و هەڵچونە لاوازانە بێبەرینە" بێکۆن لەناو ماڵ وسامان و خۆشی و سەفادا نغرۆ ببوو بەڵام لە ئاسودەیی خەیاڵ کە لە هەمووان گرنگتربوو، بێبەش بوو. ئەو بۆ گەشە سەندنی خۆی یەکێك لە دەستوورەکانی ماکیاڤێلی لەبەر کردبوو:"هاوڕێی گوێڕایەل لە خۆت کۆ بکەرەوە، سەری ڕێز بۆ زۆرداریەکان دابنوێنە و هەمووان فریو بدە. وەکو هەنگ بە، کە هەنگوین دەدات و پێوە دەدات." بێکۆن بە بەکارهێنانی ئەو دەستوورە قۆناغەکانی گەشەسەندن (پێشکەوتن)ی پلە بە پلە بڕی و بەپێی تەعبیری خۆی:"بەیارمەتی ڕەفتار و کرداری نابەجێ بە هەموو پلە و پایەکان گەیشت".

ئەو هەم لە سەردەمی پرەنسیس ئەلیزابێت و هەمیش لە سەردەمی جێمز، بە دەرۆزەکاری و ڕووپامایی، گەیشتە پلە و پایەی بەرز و بۆ پۆستی ڕاوێژکاری بەرزی حقوقیی دادوەری گشتی و ئەندامی ئەنجوومەنی نهێنی و مۆرداری فەرمانڕەوایی هەڵبژێردرا و سەرەنجام پلەی سەرۆك وەزیران کە بەرزترین پلەی دوای پلەی پاشا بوو، بەدەست هینا. ئیتر لەم پلەیەدا هەستی پلە پەرستییەکەی ئارام بۆوە. ئەو نە تەنها بەرزترین پلەکانی دەستخست، بەڵکو دەتوانرێ بگوترێ کە بوو بە یەکێك لە دەوڵەمەندترین پیاوانی وڵاتی خۆی.

بێکۆن لەو کاتەدا خاوەنی چەندین شار و گوند بوو. لە زەویەکانی دەوروبەری یەکێك لە کۆشکە کوێستانییەکانی، دەریاچەیەکی دروستکرد کە دوورگەی گەوهەرداری هەبوو. لە دورگەی ناوەندی (مەرکەزی)دا خانوویەکی هاوینەی ئێجگار شکۆداری دامەزراند کە کۆڵەکەی مەرمەڕین و هۆڵێکی بۆ مۆسیقاژەنەکان هەبوو. کاتێك جەژن و شادی و ساز و ئاواز تەواو دەبوون بە دەیان خزمەتکار لەو خانووە هاوینەیەدا بە باشترین خواردن و خواردنەوە پەزیرایییان لە میوانەکان دەکرد. پیاوێکی بەژن کورت، نغرۆ لەناو ئەو هەموو کەل و پەل و پێداویستیی جوانکاری، بە گەروویەکی هەڵپڵغاوەوە و بە دڵنیاییەوە پیاسەی دەکرد و خەوی خۆشی دەبینی. چەند سەد خزمەتکارێك شانیان دابووە بەر خزمەتکردنی و هەزاران سکرتێر لە بەردەستیدا بوون تا لەچەوتی و سەهوەکانی ئاگاداری بکەنەوە.





ڤایکانت سانت ئەلبانز(viscount st. Allbans) ئەمە ناونیشان یان نازناوی فەرمیی بێکۆن بوو لەوکاتەدا» چاك ئاگای لەو مەترسییانە بوو کە کەوتبوونە سەر ئەو ڕێگایەی کەوا وەکو هەڵبژێردراو و کەسێکی نزیکی پاشا گرتبووە بەر لەو بارەوە نووسیبووی:"پێم لەسەر جێگایەکی لەرزۆك و ناقایم داناوە و گەڕانەوە لێی یان کەوتنەخوارەوەیە یان بەلایەنی کەمەوە لەدەستدانی تەواوی پلە و ئیمتیازاتەکانە." هەرچەندە هەردەم بەخت یاوەری بووە خۆی دان بەوەدا دەنێت کە لە "خەمۆکی و نابەدڵی" ئازاری چەشتووە. ئەم هەستەی بەر لە ڕوودان، کە بێکۆنی هێندە توشی خەمۆکی کردبوو، هۆی خۆی هەبوو و زەربەی تەواو ئەوکاتە بەر سەری کەوت کە لە لوتکەی ناو بانگ و باڵاڕووییدا بوو.

- ٥ -

### بەخت بەم چەشنە ڕووی لێوەرگێڕا.

بێکۆن بەبۆنەی شەستەمین ساڵڕۆژی لە دایکبوونی میوانداریيەکی گەورەی ڕێکخستبوو و کۆشکەکەی لە لەندەن پڕی میوان بوو. بێن* جۆنسۆن ئەو چامەیەی، کە بەو بۆنەیەوە دارشتبوو، خوێندەوە. گرووویێك لە ئەکتەرەکان شانۆیەکی شیاوی ستایشیان هێنایە سەر سەکۆ کە لە بەرهەمە دیارەکانی سانت ئەلبانزەوە وەرگیرابوو. هەر پیرۆزباییی بوو کە لە هەر لایەکەوە لەو وەزیرە بەژن کورت و خۆپەرستە دەباری کە ردێنێکی شێوەبەرو و چاوانی زیندوو و مێشنی ڕەنگی هەبوو. ئەو چاوانەی کە دوژمنەکانی دەیانگوت:"نیگایەکی توند و سەرنجراکێشی هەبوو وەك هی کۆرەمار." یەکێك لە میوانەکان پێکێکی بۆ سەلامەتی ئەم پیاوە "ئێجگار بەڕێز و بەختیارترین شوێنکەوتووی پاشا" بەرزکردەوە.

لەوکاتەدا یەکێك لە سکرتێرەکان بابەتێکی بەگوێی بێکوندا چرپاند. ڕەنگی لە ڕوو نەما. پەیامێکی شووم لە پەرلەمانەوە پێگەیشتبوو. ئەندامانی پەرلەمان بڕیاریان دابوو کە لە کردەوەکانی بکۆڵنەوە کە خاوەنی بەرزترین پلەی دادوەری بوو. لێکۆڵینەوەکان بەخێرایی کۆتاییان پێهات و حەقیقەتی سەرسوڕهێنەر لە بن پەردە وەدەرکەوتن. فرانسیس بێکۆن دەستی لە "ناپاکییەکی گەورە"دا هەبوو و دوژمنەکانی بە پێشکەشکردنی بەڵگە گەلێکی زۆر،

* Ben Jonson (١٥٧٢ ـ ١٦٣٧) دامانووسی ئینگلیزی.

ڕێگەی بێسنوریان تەی کرد و مەسەلەکەیان لەوەی کە هەبوو گەورەتر پیشاندا. کورتەی چیرۆکەکە باس لەوە دەکات کە بێکۆن بە بەڵێن و پەیمانی خراپ و ترساندن و هەڕەشەکردن باجی لە بازرگانان وەرگرتووە و لە حوکمداراوانی تاوانکاری بەرتیلی وەرگرتووە و بەقازانجیان دەنگی داوە.

سەرەتا بێکۆن هەوڵیدا نکۆڵی لە تێکڕای تۆمەتەکان بکات و بۆ یەکێك لە هاوڕێیانی دەست ڕۆیشتووی خۆی بەناوی بۆکینگهام (Buckingham) ئەوها نووسی:"سەروەرم، من دەزانم کە دەستپاك و دڵسافم.... بەڵام قبووڵکردنی پلەیەکی ئەوها لەم ماوەیەدا ڕەنگە کارێکی ڕاست نەبووبێت. بەتایبەتی کاتێك کە مرۆڤ لە بارێکی ئەوهادا دەبێتە خاوەن پلە و دەکەوێتە بەر بۆختان و تۆمەت"، بەڵام دواتر کە بەڵگەکان لەدژی هاتنە ئاراوە، سەروسەکوتی گوڕی و لە بڕی دوورخستنەوەی تۆمەتەکان، گشتیانی خستە ئەستۆی خۆی و داوای لێبوردنی لە پاشاکرد:"من بە باڵەکانی کۆترێك بەرەو لای ئەو پاشا خاوەن شکۆیە دەفڕیم کە وام دادەنا بۆ لوتکەی گەورەیی بەرزم دەکاتەوە."

پاشان دان بە"لاوازیی ئەخلاقی" خۆی دادەنێت و هیوا دەخوازێت: "دڵی پاشا کە دەریایەکی چاکە و خێرخوازییە، دەرحەق بە من کە لە گەرداوی بەدبەختیدا ماوم، خۆی حوکمدەدات. من وەکو مۆمێك لەناو دەستە بەخشندەکانی پاشادامە و چاوی هیوام بڕیوەتە سۆزی پاشایانە." پاشان بە ڕاستگۆیی و بێباکییەکی تایبەت بە ماکیاڤێلی پێشنیاری قەرەبوو کردنەوەی لێبوردەیی پاشا دەکات: "چونکە ئەوەی کە بەرتیلی وەرگرتووە جێی خۆیەتی بەرتیلیش بدات، لەو ڕووەوە منیش بەرتیلێك پێشکەش بە پاشا دەکەم. هەرکاتێك پاشا ئاشتی و ئارامیم پێرەوا ببینێت و خوا تەمەنم بداتێ، مێژوویەکی شایستە لەبارەی ئینگلتەرا دەنووسم و پێشکەشی بە پاشای دەکەم یاساکانی ئەو پاشایە بە باشترین شێوەشی دەکەمەوە." بەڵام سەرەڕای ئەو هەموو پاڕانەوە و تکاکارییە، پاشا خۆی لە هەڵقورتاندن لە ڕای پەرلەمان لادا. بێکۆن لە بورجی لەندەندا زیندانی کراو سزایەکی چل هەزار لیرەیی دا. هەندێك لە ئەندامان داوای دەرکردنیانی لە خاکی ئینگلتەرا کرد؛ بەڵام بوکینگهام دژایەتی ئەم هەنگاوەی کرد و گوتی: "دادوەری گشتی هێندە نەخۆشە کە زۆر زیندوو نامێنێت." چەند ڕۆژێك دواتر بێکۆن لە زیندان ئازاد بوو و لە لەندەن دوورخرایەوە و لە هەبوونی پیشەی



دەوڵەتی و گشتی بێبەش کرا. ئەو پەنای بردە بەر کونجی گوندێك و دوای ئەو شوورەیی و ریسواییەی کە هێنابوویە ئاراوە، ئیتر کاتی تەواوی هەبوو کە بە دوای فەلسەفەکەی خۆی بکەوێت و ئەوەی بە هزریدا دەرباز دەبوو کە: "ئارەزووی بەدەست خستنی هێز بەڕادەیەکی تەواو، فریشتەکانیش بەردەداتەوە."

- ٦ -

ئارەزووی بەدەست خستنی هێز بەڕادەیەکی کامل، پەیوەستە بە نەبوونی زانیاری تەواو. ئەم حەقیقەتە بەشێوەیەکی زۆر کورت و تێکچڕژاو لە بناغەی فەلسەفەی بێکۆندا هەیە.

گەرچی بێکۆن لە پیاوە هەرە ژیرەکان بوو، لەڕاستیدا دەستکەوتی سەردەمی خۆی بوو. فیکرەو بیرو ڕاکانی ماکیاڤێل لە سەردەمی ئەلیزابێتدا ئێجگار بە کاریگەربوون. بەرتیل خۆری لەناو مامورە پلەبەرزەکاندا ڕێسایەکی باو و ئاسایی بوو نەك مەسەلەیەکی ئاوارتە.

دژواری کارەکەی بێکۆن لەوەدا بوو کە لە گەیشتن بە پلە و پایە و کۆکردنەوەی ماڵ و ساماندا زیادەڕۆیی و پێداگری دەکرد. ئەو لە خەملاندنی ئەو مەترسیەی کە بەهۆی کۆکردنەوەی ماڵ بەو چاوبرسێتی و چڵێسییەوە، لە بەرامبەر لەدەستدانی هاوڕێکانی ڕووی تێکردبوو، سەهوی کردبوو. گومان لەوەدا نییە کە ئەو بە سەختی خۆ پەرست بوو بەڵام ئایا هەموومان وانینە؟ بەدبەختانە، خۆپەسندییە لەڕادەبەدەرەکەی کەبە ناڕوونی وتارێکی مابوو، لە کۆتاییدا لە خۆهەڵهاتن و ڕق لەخۆبوونەوە، گۆڕا. بێکۆن ئەو حەقیقەتانەی لە کردەوەکانی خۆیدا پشت گوێ خست بەڵام لە فەلسەفەکەی خۆیدا پەیدای کردنەوە.

ئەو هەوڵیدەدا هەرجۆرە شکۆ و گەورەییەك بەدەستبخات و لەهەمان کاتدا دەینووسی: "داوێن پاکی و باڵایی وەکو بەردێکی گرانبەهای ساف و ڕووناك وایە." دوای ئەوەی کە پێکی ژیانی ڕازاوە تا دوای دڵۆپ خواردەوە و دەردە تاڵەکەی چەشت، وەبیری هاتەوە کە ئەوەی کە پێویستیمان پێیەتی ڕووناکییەکی زیاترە نەك ژیانێکی ڕازاوە و شکۆدار.

ڕووناکییەکی زیاتر! ئەمە دوا ئامانجی لێکۆڵینەوە فەلسەفییەکەی بێکۆن بوو. لە دەست خستنی زانستدا، مەوداگرییەکەی هەرچەندێك فراوانتر بێت تۆش جیددیتر بە لەهەربابەتێکدا تا پێت دەکرێت لێکۆڵینەوە ئەنجامبدە و بەگوێرەی ئەوەی کە فێربووی بژی.





بێکۆن لە سەردەمێکدا دەژیا کە هێشتا زانست بۆ لق و بەشە پسپۆڕییەکان دابەش نەببوو. هەرچەندە مەوداگریی خولیا و دڵبەندییەکان فراوانتر بێت ڕەونەقی ژیان زیاتر دەبێت، "تەنیا زانستە کە ڕووناکی بە زەینی ئەو کەسانە دەبەخشێت کە لە پەشۆکاوی و نائارامیدانە." شادیی ڕاستەقینە و دڵخۆشی لەوەدایە کە فیکر و خەیاڵ بخەینە سەروو کاروباری پەشۆکاو و تێکەڵ و پێکەڵ.

بەڵام چۆن و بەچ شێوەیەك دەتوانرێ بیروخەیاڵ هێندە بەرز بکرێتەوە کە بتوانێت دەرك بە بەرزترین ڕادەی چاکە بکات؟ لەڕێگەی فێربوونی "هەڵسەنگاندنی کاروبارەکان بە گوێرەی نرخە واقیعیەکەیان" گۆڕەپانی زەین لە نرخە ساختە و ناتەواوەکان پاکبکەرەوە. ئەو وێنایانە یان بێکۆن گوتەنی ئەو بتە هەڵانەی کە لەبارەی کاروباری جیهان لە بتخانەی هزرتدا هەنە تێك بشکێنە. بێکۆن ئەو وێنا یان بتە ناڕاستانە بۆ چوار گروپ دابەش دەکات:

### ١ ـ بتەکانی تیرە

ئەو بتانە بریتین لە "بەوەهم بووەکان، خەونەکان و فاڵ گرتنەوەکان و شتگەلێکی لەو بابەتە." واتە ئەو بیرو باوەڕە وەهمانەی کە لەناو هەموو خێزانەکانی جۆری مرۆڤدا برەوی هەیە. ئەو بیروڕا و وەهمانە بەرەو لاڕێ ڕامان دەکێشن چونکە ئێمە ئارەزوومەندین بەر لەوەی چاك لە حەقیقەتەکانمان کۆڵیبێتەوە، بەرەو ئەنجامەکان بازبدەین یان ڕوونتر بڵێین، بەرەو لایان بفڕین "تێگەیشتنی مەسەلەکان نابێت بە بازدان و فڕین ئەنجام بدرێت، بەڵکو تێگەیشتنی تەواو ئەو کاتە مەیسەر دەبێت کە خۆمان بپارێزین (کۆنترۆڵ بکەین) و لە بازدان و فڕین خۆمان دوور خەینەوە." بەواتایەکی تر، دەبێت یەکەم جار ببینین و بپیێوین پاشان باز بدەین تا ئەگەری کەوتنە ناو چاڵ لە ئارادا نەبێت.

### ٢ ـ بتەکانی ئەشکەوت

ئەم بتانە زیاتر پەیوەندیان بە کەم و کورتییەکانی تاکە کەسیەوە هەیە. تا کەم و کورتییەکانی گشتی.

"هەریەکەمان لە دەروونی خۆیدا ئەشکەوت یان ساردخانەیەکی هەیە کە ڕووناکی سروشت دەشکێنێتەوە و بێڕەنگی دەکات." لە ساردخانەی بوونە زەلیلەکەت دەرکەوە و بۆ ناو ڕووناکی






دەروەشانی خۆر هەنگاو بنێ، چاوئەندازەکانی دەورووبەری خۆت تاقی بکەرەوە. سەرنجی ئەو دیمەنانە مەدە کە لە دواتەوەن. واتە خۆت لە پشت بەستنێکی زۆر بە رابردوو بپارێزە و تەواوی هۆش و بیری خۆت لەسەر چاوئەندازەکانی بەرامبەرت چڕ مەکەرەوە، واتا چاوەڕوانییەکی لە ڕادەبەدەرت لە داهاتوو نەبێت. "هەوڵ بدە ڕادەی ناوەندی بپارێزی و هەلس و کەوت و کرداری خۆت لەگەڵ باشترین شتێك کە لە دوێنێوە فێربووی و زۆرترینی ئەو شتەی کە دەتوانی سبەینێ چاوەڕێ بکەی، بگونجێنە "ڕێکی بخە." بەم چەشنە نە پشت "لەوەی کە پێشینەکان بە تەواوەتی وەریان گرتووە و چەسپاندوویانە (مکۆمیان کردووە") دەکەی نە بە چاوێکی سووکەوە سەیری "تێگەیشتنی نوێی نوێخوازان" دەکەی.

### ٣ ـ بتە بازارییەکان

"ئەم چەوتی و خەتایانە لە تێکەڵاویەتی و ئالوێری خەڵك لەگەڵ یەکتر سەر هەڵدەدات." هەوڵ بدە وشەکان بە گوێرەی مەبەست بەکار ببەی و مەرامەکەت لە وشەی ڕاست و بەجێدا بگونجێنی. ئێمە وشە ناڕاست یان ناتەواوەکان بەهۆی نەزانینەوە یان لەپای نەزانینی چەمکە تەواوەکە یان و یانیش بە ئەنقەست بۆ فریودانی ئەوانی تر، بەکار دەهێنین. خۆت لە وشە ناڕاستەکان (چەوتەکان) بپارێزە هەروەك کە سکە ساختەکان دەخەیتە لایەکەوە. ئەم سکانە لە کۆتاییدا جگە لە چەرمەسەری و سزا هیچ دەستکەوتێکی تریان بە دواوەنییە.

### ٤ ـ بتە شانۆییەکان

ئەم سەهوانە لە گوزارشت و ڕاڤەی چەوتی درامای ژیانەوە پەیدا دەبن. ئەقڵ و هۆشی خۆت بە هۆی ئەو شانۆیانەوە لە دەست مەدە کە لە سەر سەکۆ دەبینی. ئەوان "دونیا ئافرێنراوەکەی خۆیان بە شێوەی سەحنەی شانۆیی و ناڕاستەقینە) پیشانت دەدەن. ئەوەت لە یاد بێت "کە ئەو چیرۆکانەی کە بۆ نواندن داهێنان دەکرێن زیاتر بە شێوەیەکن کە ئارەزوومەندین وابێت نە بەو چەشنەی کە بەڕاستی هەنە."

بۆیە، دەبێت سوود لە ئەزمونە کەسیەکان و ئەزمونی خەڵکان وەربگری و مۆمێك دابگیرسێنی تا ڕێگاکەت ڕووناك بکاتەوە. چونکە تەنیا بەدەست خستنی زانستە کە دەتوانێ توانات پێ

ببەخشێت تواناییێك کە بەو هۆیەوە دەسەڵاتت بە سەر خۆتدا دەشکێ، نەك چەوساندنەوەی سوودخۆرانەی دونیا.

ـ ٧ ـ

بێکۆن لە پەرتووکی "ئەتلانتیسی نوێ"دا کە دوو ساڵ بەر لە مەرگی بلاّوکردەوە باس لە دورگەیەکی ئەفسانەیی دەکات کە دانیشتوانی توانای ئەوەیان بە دەستهێناوە کە زاڵبن بە سەر خۆیاندا. خەڵکی ئەم دورگەیە بەهۆی هۆش و تێگەیشتنێکی سەروو ئاساییەوە شادیی گەورەی بەدەستهێناوە و بەختیار بوونە. لەوێ ئەو کەسانە لە شوێنی سیاسەتمەداران دانیشتوون کە شارەزای هونەری بەڕێوەبردنی وڵاتن. رووپامایی و بەرتیلخۆری لە رەگ و ریشەوە دەرهێنراون و کەسانێکی بەڕێز و هەڵبژێردراو، بە پێی لێهاتوویی و لێوەشانەوە پلە و پایەکانی وڵاتی داگیرکردوون. دەستی بازرگان و خاوەن بانکەکان بە چەوساندنەوەی خەڵك ڕاناگات و فەیلەسووف و زاناکان جڵەوی کاروباریان بە دەستەوە گرتووە و شانیان داوەتە بەر خزمەتکردنی خەڵك. خەڵك لەگەڵ یەکتردا لە ململانێ و کێشمەکێشدا نین و هەموویان بە یەك دڵ و یەك ئاراستە هێزی خۆیان بۆ دەستە مۆکردنی هێزەکانی سروشت خستوتە گەڕ.

لە یۆتۆپیای فرانسیس بێکۆندا، تەنیا لەبەرئەوەی کە چاوبرسێتی و چلێسی لە رەگ و ریشە دەرهێنراون، شەڕ و جەنگ بوونی نییە. هیچ کەسێك دەستدرێژی ناکاتە سەر مافی هاوسێکەی و دەست لە ماڵ و سامانی ئەوانیتر نادات. بەم شێوەیە سامان بە چەشنێکی ئێجگار شایستە لە نێوان خەڵکدا دابەشبووە و خەڵك هەمووی، ئەم بنەما ئابووریەی پەسەند کردووە و بەکار بردووە کە: "سامان وەکو پەین وایە و تا باش بلاّو نەبێتەوە، سوودی نابێت" بازرگانیی دانیشتوانی ئەم شارە بالاّیە زۆر سەیرە.

"بازرگانییەکەمان بازرگانیی وێر و زیو و گەوهەر و ئاوریشم و دەرمان و کەولوپەلەکانیتر و ماددە خۆراکیەکان نییە، بەڵکو کەلوپەلی بازرگانیمان یەکەم ئافرێنراوی خوا واتا ڕووناکییە: ئێمە بلاّو کردنەوەی رووناکی لە سەرتاپای جیهاندا گرتۆتە ئەستۆی خۆمان." بەم شێوەیە تێبینی دەکەین کە لە یۆتۆپیادا جۆرێکی تایبەتی هاتوتە کایەوە کە بە"بازرگانانی رووناکی" ناو دەبێرێن و بریتین لە فەیلەسووف و زاناکان کە لە سەرتاپای جیهاندا کەوتوونەتە گەڕان و سەرقاڵی ئاڵوگۆڕکردنی بیرۆکە نوێکان و بلاّو کردنەوەی داد و دڵۆڤانین.



بەم شێوەیە بە رێبەرایەتی فەیلەسووفەکانی یۆتۆپیا و هەوڵەکانیان، تەواوی خەڵکی جیهان روو لە دەستووری هاوکاری و چاکە خوازی دەکەن.

ئەمە بوو ئەو دوایین خەونەی کە بێکۆن، دوای ئەو مۆتەکەیەی شکۆ و گەورەیی و خەم و رەنج، دەبینی. لەو کاتەدا بوو کە بیری کردەوە: "مرۆڤ گیانەوەرێك نییە کە بە دوو پێ رێ دەکات، بەڵکو خودایەکی نەمرە." بێکۆن بە هۆی ئەو ئەزمونانەی کە پاشەکەوتی کردبوون رەوشی خۆی گۆڕی و لە وەزیرێکی بەفیز و لووتبەرزەوە گۆڕا بۆ بازرگانێکی بی فیزی ڕووناکی و بەو پیشەیەوە خەریك بوو کاتێك تەمەنی کۆتایی پێهات.

بێکۆن بە هۆی ئەزمونێکی زانستیەوە ماڵئاوایی لە ژیان کرد. لە گەشتێکدا کە لە وەرزی زستاندا لە دێیەك ئەنجامیدەدا ئەوە خۆی بە مێشکی داکرد کە رەنگە بکرێ گۆشت، بەو چەشنەی کە لەناو خۆیدا دەیپارێزن، لە ناو بەفریشدا بپارێزرێت. مریشکێکی کڕی و خستییە ناو بەفرەوە. یەکسەر دوای ئەم تاقیکردنەوەیە سەرمایەکی دژوار لێیدا کە بووە هۆی هەوکردنی سییەکانی و چەند رۆژێك دوای ئەمە کۆچی دوایی کرد. بێکۆن بەر لەوەی چاو لێك بنێت نووسی: "تاقیکردنەوەکەم ئەنجامێکی ئەرێنی دا."

*   *   *

رێورەسمی ناشتنی تەرمەکەی بە پێچەوانەی سەردەمی ژیانی، سادە و بێ دروشاوە بوو. ئەو باش فێری وانەکەی خۆی ببوو لە وەسیەتنامەکەیدا نووسی: "من جەستەم وەکو میرات بەجێ دەهێڵم کە بە نەناسراوی بەخاك بسپێردرێت... ناوم بە سەدەکانی داهاتوو و نەتەوەکانی جیهان دەسپێرم و گیانیشم بە خوا دەسپێرم."





## شۆڕشه سپییه‌كه‌ی جۆن لۆك

**(١٦٣٢ـ ١٧٠٤)**

سیاسه‌تمه‌داران دوو گرووپن. گرووپێكیان خاوه‌ن را یان خاوه‌ن روانگه‌نه‌ و گرووپه‌كه‌ی تریان مامه‌ڵه‌كار. لۆك(John Locke) سه‌ر به‌ گرووپی یه‌كه‌م بوو و وه‌كو هه‌رجارێ، حكوومه‌تی سه‌رده‌مه‌كه‌ پاداشتی بیروڕاكانی به‌ دوورخستنه‌وه‌ و بێزاركردن و رق و نه‌فره‌ت دایه‌وه‌. له‌گه‌ڵ هه‌موو ئه‌مانه‌شدا، لۆك تا دوا هه‌نگاو له‌ سه‌ر بیروڕاكانی مكوڕ بوو و توانی "فه‌رمانڕه‌وایه‌تیه‌ خواوه‌ندییه‌كه‌ی حه‌ق" كه‌ له‌ ئاره‌زووی ناخه‌وه‌ نزیكتره‌، بخاته‌ شوێنی "حه‌قه‌ خواوه‌ ندییه‌كه‌ی فه‌رمانڕه‌وایه‌تی".

لۆك یه‌كێك له‌ ئه‌كته‌ره‌ پێشه‌نگه‌كانی درامای مێژووه‌ كه‌ حكوومه‌تی له‌ نیزامی پاشایه‌تییه‌وه‌ بۆ دیموكراسیه‌ت گۆڕی. ئه‌و پێغه‌مبه‌ری شۆڕشی ساڵی(١٦٨٨)ه‌ كه‌ بێرتراند روسل (Bertrand Russel) "له‌ ته‌واوی شۆڕشه‌كان مامناوه‌ندتر و سه‌ركه‌وتوانه‌تر" وه‌سفی كردووه‌.

واباشه‌ ژیانی ئه‌م پیاوه‌ جه‌سته‌ بچووك و به‌ گه‌رده‌نیشه‌ له‌ نزیكه‌وه‌ بخوێنینه‌وه‌ كه‌ فه‌لسه‌فه‌كه‌ی بناغه‌ی داب و نه‌ریته‌ باوه‌كانی، كه‌ هه‌زاران ساڵ جیهانی به‌ره‌و لاڕێ برد، تێك و پێكدا.

ـ ٢ ـ

جۆن لۆك، له‌ ساڵی ١٦٣٢، له‌ ناو تۆفانێكی سامناكدا كه‌ ئاسمانی سیاسه‌تی ته‌نی بووه‌، چاوی به‌ دونیا هه‌ڵێنا و له‌ رۆژگارێكدا كه‌ بای توندی سته‌مكاری و دیكتاتۆری و شه‌ڕه‌كانی ناوه‌خۆ به‌دژواری هه‌ڵیده‌كرد.





ته‌مه‌نی له‌ ده‌ساڵ زیاتر نه‌بوو كاتێك خه‌ڵكی ئینگلته‌را دژی (چارلزی یه‌كه‌م)ی ناپه‌سه‌ند راپه‌ڕین. باوكی جۆن لۆك كه‌ سه‌رقاڵی پیشه‌ی دادوه‌ری بوو، په‌یوه‌ندی به‌ هێزی گه‌له‌وه‌ كرد كه‌ رێبه‌رایه‌تییه‌كه‌ی له‌ ئه‌ستۆی ئۆلیڤه‌ر كرۆموێلدا[*] بوو. لۆك ته‌مه‌نی هه‌ڤده‌ ساڵ بوو كاتێك پاشا نشوستی هێنا و به‌ تاوانی ناپاكی كردن له‌گه‌ڵ خه‌ڵك درایه‌ دادگا و به‌ مردن مه‌حكووم كرا و سه‌ریان له‌ جه‌سته‌ جیاكرده‌وه‌.

به‌م شێوه‌یه‌ ئینگلته‌را به‌ رێبه‌راتی چارلزی دووه‌م كه‌ پیاوێكی بێكه‌ڵك و خۆشگوزه‌ران بوو له‌ رابواردن و چێژ په‌رستیدا نقوم بوو. پاشا مافی به‌ڕیوه‌بردنی سیاسه‌تی ده‌ره‌وه‌ی ئه‌وروپای به‌رامبه‌ر به‌ سه‌د هه‌زار لیره‌ به‌ لویس چوارده‌هه‌م (پاشای فه‌ره‌نسا) فرۆشت و خۆی بۆ ئه‌سپ و سه‌گ و ژنه‌كانی خۆی ته‌رخان كرد. كاتێك هۆڵه‌ندییه‌كان له‌ساڵی ١٦٦٧ له‌ رووباری تایمز ده‌رباز بوون و ئاگریان له‌ كه‌شتیگه‌لی ئینگلته‌را به‌ردا كه‌ له‌ ژێر دیواره‌كانی كۆشكدا بوو، هه‌روه‌ك له‌ یادداشته‌كانی رۆژانه‌ی (پیپی)[*]دا هاتووه‌: "پاشا به‌ هاوڕێیه‌تی خاتوو كاسلمین شیوی خواردبوو و هه‌موویان شێتانه‌ و به‌ سه‌رخۆشی خه‌ریكی راوكردنی په‌پوله‌یه‌كی چاره‌ڕه‌ش بوون."

ره‌عیه‌تی پاشاش حه‌زیان له‌ قومار و فریوكاری بوو و كه‌وتبوونه‌ ئاوێزی كوێكه‌ره‌كان[**] كه‌ تاوانیان ئه‌وه‌ بوو كه‌ خۆشه‌ویستێكی زوریان بۆ ئاشتی و ته‌بایی پیشان ده‌دا. ئه‌مه‌ بوو ئه‌و سه‌حنانه‌ی كه‌ هزری جۆن لۆكی به‌ خۆوه‌ خه‌ریككرد بوو.

ـ ٣ ـ

لۆك كه‌م تا زۆر له‌ ده‌رس خوێندنه‌كه‌ی خۆی ناڕازی بوو. مامۆستاكان به‌ شێوه‌یه‌كی گشتی له‌ بێ ته‌كوزی و بێ سه‌روبه‌ریی سه‌رده‌مه‌كه‌ی خۆیان بێ ئاگان و مشووری لێ ناخۆن. ته‌نیا خه‌میان ئه‌وه‌یه‌ كه‌ ئه‌ده‌بیاتی یۆنانی كۆن له‌به‌ر بكه‌ن و بایه‌خ به‌ سیاسه‌تی ئینگلته‌را نه‌ده‌ن "مامۆستاكانم كاریگه‌رییه‌كی ناچیزیان له‌ سه‌ر رووناك كردنه‌وه‌ی هزری منیان هه‌بوو." ئه‌وان لۆكیان بۆ خزمه‌تێكی هاوشێوه‌ی ئه‌وه‌ی كه‌ خۆیان گرتبوویانه‌ به‌ر، ئاماده‌ ده‌كرد و گوتنه‌وه‌ی

---

[*] Olver crcmwen ژه‌نراڵ و سیاسه‌ تمه‌داری ئینگلیزی كه‌ له‌(١٦٥٣ تا ١٦٥٨) دیكتاتۆری ئه‌و وڵاته‌ بوو

[*] Pepy (١٦٣٣ـ ١٧٠٣) مێژوو نوسی ئینگلیزی

[**] Quakers ئه‌ندامانی ئه‌و ئه‌نجومه‌نه‌ی كه‌ له‌ سه‌ده‌ی نۆزده‌هه‌مدا په‌یدا بوو و لایه‌نگری ساده‌یی زمان و خواردن و جل و به‌رگ و لابردنی نازناوه‌كان و دژبه‌ری سه‌رسه‌ختی شه‌ڕ بوون.

وانەکانی زمانی یۆنانیان لە کڵێسای مەسیحیدا پێ راسپارد. بەڵام لۆك لە مامۆستاکانی خۆی ژیرتر بوو و کاتە بۆشەکانی خۆی بۆ خوێندنی پزیشکی و هونەری بەڕێوەبردنی وڵات تەرخان کرد و زەوقێکی زۆری بەرامبەر بە فەلسەفە پیشاندا بەڵام فەلسەیەك کە بەکەڵکی ژیانی پراکتیکی بێت نەك ئەوەی کە بیردۆز و بیروڕای ناکرداریی پەتی بن. لۆك بۆی دەرکەوت کە ژیان لە ڕاستیدا کردارێکی گونجان و هاوهەنگییە بە واتای ئەوەی کە دەبێت بە هەر شێوەیەك بێت ئازار و رەنج لە بیر بکرێن و خۆ لە خەم و دەرد لابدرێت.

لۆك هەموو ئەندامانی خێزانەکەی (باوك و دایك و تاکە براکەی) لەدەست دا و خۆیشی تووشی نەخۆشییە خێزانیەکەی خۆیان (سیلی سنگ) بوو. بەڵام هێندە گوێی بە نەخۆشیەکەی نەدەدا و هەردەم بە شوێن ئەوەوە بوو تا دەست بە چارەسەری ئەو نەخۆشییە بکات کە وڵاتەکەی تەنی بووە. لەم ڕێگەیەدا یەکێك لە هاوڕێکانی سەردەمی خوێندنی بەناوی لۆرد ئەشلی (Lord Ashley) کە بە ئیرلی شۆفتس بێری (Earl of shoftestury) نازناوی دەرکرد، بە هانایەوە هات. ئەشلیش وەکو لۆك لە سڕی و بێ هۆشی و بەڕەڵایی خەڵك و پووچکاری و هەوەسکاریی شا نارازی بوو. بۆیە هەردووکیان نیازیان ئەوەیان لا پەیدا بوو کە تەندروستی بۆ بوونی نەخۆشی ئەو سەردەمە بگەڕێننەوە.

لۆك لەوە بەدوا بە راوێژکاری ئەشلی و دایەنی منداڵەکانی و پزیشکی خێزانەکەی. هەرچەندە بڕوانامەی پزیشکیی نەبوو و لە نەشتەرگەریدا کاری نەکردبوو، کەچی بە سەرکەوتوویی کرداری نەشتەرگەریی لە سەر سنگی ئەشیلی ئەنجامدا و ڕژێنێکی لێدەرهێنا. لۆك لەو کەسە دەگمەنانە بوو کە زانیاریی گشتی فراوانیان هەیە. ئەو لە زانستە کرداری و تیورییەکاندا شارەزایی هەبوو. بەرە بەرە ئەو سەردەمە داهات کە لۆك تەڕدەستی خۆی لە بەشێکی تردا پیشانبدات و هونەری خۆی لە بەسەربردنی شادومانانەی ژیاندا بخاتەڕوو هەرچەندە چارەنووسێکی ناخۆشیشی هەیە. هەرچەندە لۆرد ئەشلی بیرێکی ئازادیخوازانەی هەبوو، کە چی چەندین ساڵ لە چاکەکانی شا بەهرەمەند بوو. بەڵام چارلز لەوە سەرقاڵتر بوو کە گوێ بۆ قسەکانی رادێرێت و خۆی تووشی زەحمەتی بکات. لەهەمان کاتدا هەرچەندە بایەخی بە ئامۆژگارییەکانی ئەشلی نەدەدا بەڵام بۆ پلەی دادوەریی گشتی بەرزیکردەوە. ئەستێرەی بەختی لۆکیش وەکو هی گەورەکەی درەوشانەوەیەکی هەبوو بەڵام کتوپڕ بارودووخەکە هەڵاو گێڕ بوو. پاشا لە دەستوویشتوویی ئەشلی و بیروڕا و کردەوە ئازادیخوازەکانی ترسا و لە سەرکار لای برد و لە بورجی لەندەندا زیندانی کرد.



لۆك بۆ ئەوەی تووشی چارەنووسێکی ئەوها نەبێت بۆ فەرەنسا هەڵهات. بەڵام زۆری پێ نەچوو کە پاشا دڵی نەرم بووە و مۆڵەتی گەڕانەوەی پێدا. لۆك لە زانکۆی ئۆکسفۆردا بە وانە گوتنەوەوە خەریك بوو بەڵام هەر زوو ڕووبەڕووی دژواری بووە. پاشا جارێکیتر بڕوای خۆی بەرامبەر ئەو لەدەستدا و سیخوڕێکی بۆی دانا تا غەفلەت بە فەیلەسووفەکە بێنن و لە گوتوبێژەکاندا قسەی وا پێبکەن کە گوزارشت لە بێ وەفاییەکەی بکەن بەرامبەر بە پاشا. بەڵام لۆك لەوان زیرەکتر بوو. سیخوڕەکان رایان گەیاند: "تەنانەت یەك وشەشیان لێ نەبیستووە کە پیلانە ناوەکییەکانی ئەو ئاشکرا بکات."

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، پاشا لە ئۆکسفۆرد دەری کرد و هەڕشەی ئەوەی لێکرد کە لە بورجی لەندەندا زیندانی دەکات. ئەم جارەشیان فەیلەسووف توانی لە کاتی خۆیدا هەڵبێت و بچێتە هۆڵەندا و سەرەڕای ویستی پاشا، ئەم (پەنابەرە ئازادیخوازە) توانی خۆی بگەیێنێتە "هەوای نەرم و ناسك".

لۆك لە ماڵی یەکێك لە هاوڕێکانی کە پزیشك بوو خۆی شاردەوە و بە خەیاڵێکی ئاسوودەوە کەوتە ڕێکوپێککردن و ڕێکخستنی بیرۆکە فەلسەفییەکانی خۆی ـ فەلسەفەیەك کە بنچینەی جیهانێکی ئازاد بناغەڕێژ دەکات.

ـ ٤ ـ

کلیلی تێگەیشتنی فەلسەفەی لۆك لە دوو وشەی "ڕێکەوتنی پەیماننامەیی"دایە. دەبێت بە شێوەی ئالۆیر (مامەڵە) سەیری دەوڵەت و هەموو خزمایەتی و پەیوەندییەکانی تاکەکانی ئادەمیزاد و ژیان بکرێت و بە جۆرە بازرگانییێك دابنرێت. فەرمانڕەوا لە بری ئەوەی ئیرادەی خۆی بە سەر خەڵکدا بسەپێنێت. دەبێت خزمەتی خۆی پێیان بفرۆشێت و دەبێت ئەم کارە بەگوێرەی ڕێکەوتننامەیەك ئەنجامبدات کە مایەی رەزامەندیی ئەو و خەڵك بێت. ئەو بازرگانییە ئازادەی کە لە ناو چینی ناوەندا باو بوو و لەگەڵ هەموو ئەو زیرەکی و هۆشیارییەی کە بازرگانەکان لە کاری خۆیاندا هەبوو، زۆربەی جار شەریفانە و بەدەستپاکی و لەسەر بنچینەی خێرخوازی بەڕێوە دەچوو، زەمینەیەکی تەواو تازەیان لە بەردەم دیدی لۆکدا کردەوە تا ئەقڵ لەو بوارەدا تاو بدات. بە پێی لۆك ئەو فەلسەفەیەی کە لە بازرگانیدا پیادە دەکرێت دەبێت لە کاری دەوڵەت و لە بنەماکانی هەلسوکەوت و کردارمان لە ژیانی رۆژانەدا بەکار بهێنرێت. واتا بەڵێنی شەرەفدارانە، رەچاوکردنی مروەت و مامەڵەی ئەو کەلوپەلانەی کە بە سوودن.





لۆك دەڵێت بۆ مسوگەرکردنی ژیانێکی ماقووڵانە سەرەتا پێویست دەکات کە ئەقڵ تاقی بکەینەوە و بزانین چییەتی (ماهیەت)ەکەی چییە و چۆن بەدەستدێت.

بە بڕوای ئەو عەقڵ لە مرۆڤدا بۆماوەیی (ویراسی) نییە و بە پێچەوانەی  ڕای هەمووان لەکاتی لەدایکبووندا زانیاریی زگماکیانەی پەیوەندیدار بە باش و خراپ و ڕاست و چەوت و بەهەشت و دوزەخمان پێ نییە. بەڵکو تەواوی ئەو زانیارییانە دواتر، لە ئەنجامی ئەو ئەزموونانەی کە هزر لە ڕێگەی ئاگاییەوە پێیان دەگات، بەدەستدێنین "لە هزردا جگە لەوەی کە سەرەتا هەستی پێکراوە، شتێکی تر بوونی نییە."

لەکاتی لەدایکبووندا هزر وەکو لەوحێکی سادەی بێ نەخشە و ئەزموونی هەستیی دەستکەوتوو لە بینین، بیستن، چێشتن، بۆنکردن و بەرکەوتن دەقی پەرتووکێکە کە بەناوی زانینەوە لە لەدایك بوونەوە تا مردن لە سەر لەوحی هزر جێ دەگرێت.

ئەم زانیارییانە لە شێوەی یادەوەری لە یاددا کۆ دەبنەوە وپاشان بۆ فیکر (بیرۆکە) دەگۆڕێن و دوایی ناوی ئاوەز (ئەقڵ)ی پێدەبرێت.

بەپێی ئەم وەسفە، ئاوەزی مرۆڤ هیچ نییە جگە لە ڕەنگدانەوەی دونیای مەتریاڵی کە لە دەلاقەکانی ئاگاییەوە ڕووناکی دەخەنە سەر لاپەڕەی زەین.

زەینی ئێمە لە مادە بترازێ توانای دەرککردنی شتی تری نییە، چونکە تەنیا مادە دەتوانێت کار بکاتە سەر هەست.

سەرەڕای ئەمە خەڵك، جیهان بە شێوەی جۆراوجۆر دەبینن. چونکە هەرچەندە ئاگاییەکانمان ڕووکار یان ڕوخساری هاوشێوەیان هەیە بەلاَم بە شێوەی جۆرلەجۆر خۆیان لەگەڵ جیهان گەونجاندووە. هەرئەوندەی کە واتای زۆر لە وشەکان نارِوونە خۆی بەڵگەیەکی دیاری ئەو ڕاستییەیە و یەك وشە دەکرێ بۆ کەسانێکی جیاواز مانای جوراوجۆری هەبێت*. لەو ڕووەوە، زمانی ئێمە بۆ دەربڕینی فیکرەکانمان کەم وکورتە و ئەمە خۆی گوزارشت لەو حەقیقەتە دەکات کە هەستەکانمان دەتوانن تەنیا، بە شێوەیەکی ناچونیەك، لە دونیا بگەن.

چ ئەنجامێك لەو بیردۆزانەوە دەستماندەکەوێت؟ پێویستی نەرمی نواندن و هەڵکردن لەگەڵ یەکتر. لەو ڕووەوە کە ئێمە بە لایەنی زۆرەوە دەتوانین پەی بە گومانەکان بەرین نەك

* خۆم لە وەرگێڕانی نموونەکان (شایەتەکان) لاداوە. و. فارسی



یەقینەکان، هەر ئەو گومانانەش لای کەسانی جیاواز لێك جیاوازن، بۆیە نابێت بیروڕا و بڕواکانی خۆمان بەسەر ئەوانیتردا بسەپێنین.

هەڵس و کەوتێکی لۆژێکی کە دەبێت دەسەلاَتی بە سەر پەیوەندییەکانی تاکەکانی مرۆڤدا هەبێت "نەرمی نواندن و بەرگەگرتنی کەسی بەرامبەر"ە.

ماقوڵ نییە کە خەڵك نەتوانن "بە بوونی جیاوازی بیروڕا لە ئاشتی و تەباییدا ژیان بە سەر بەرن و لەگەڵ یەکتردا بەشداری لە هەوڵەکاندا بکەن." دەبێت هەوڵەکانت بۆ ئەوە بێت کە بەڵگەکانی خۆت بۆ کەسانی دەوروبەرت باس بکەی و پاشان وازیان لێ بێنی تا لەلای خۆیان بابەتەکە بە عەقڵ هەڵبسەنگێنن. "ئەوە شتێکی ڕاست نییە کە لەگەڵ خەڵکدا کەللەڕەق و لاساربین کە بۆچی واز لە بیروڕاکانی خۆیان ناهێنن و بیروڕاکانی ئێمە پەسەند ناکەن لە کاتێکدا کە بە ئەرکێکی زۆرەوە ئێمەش لە قبووڵنەکردنی بیروڕاکانی ئەوندا بە هەمان ڕادە دژایەتی و کەللەڕەقی پیشاندەدەین." هیچیکام لە ئێمە، کە کەسانێکی شیاوی سەهو کردنین، مافی ئەوەی نییە کە خۆی بە پێوەری حەقیقەت دابنێت. "لە کوێیە ئەو کەسەی کە بۆ ڕاست بوونی بیروڕاکانی خۆی و ناحەق بوونی بیروڕایانەی کە نەفییان دەکات بەڵگەی قایم و گومان هەڵنەگر دێنێتەوە؟ یان دەتوانێت بانگەشەی ئەوە بکات کە تەواوی بیروڕاکانی خۆی و بیردوزەکانی ئەوانیتری، بە وردی خستۆتە بەر لیکۆڵینەوە؟"

کەللەڕەقی زادەی زانیارییە کەم و کورتییەکانی ئیمەیە و ئەوگیانەی هەڵکردن و نەرمی نواندنە دەبێت بۆ سەرکوتکردنی دوژمنایەتی و کەللەڕەقی خۆمان بەکار بەرین نەك بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی لاساری (خۆدسەری)ی ئەوانیتر. هەرچەندێك زیاتر بزانین کەمتر توشی دەمەقالە و کێشمەکێش دەبین. "تەواو لە جێی خۆیدایە کە بێنینە بەرچاومان کە ئەگەر خەڵك باشتر فێر ببوونایە و پەروەردە بکرابانایە، کەمتر خۆیان بەسەر ئەوانیتردا دەسەپاند."

بژی و لێگەڕێ با خەڵکیش بژین. لە بیروڕا و فیکرەکانی خۆتدا ئازاد بە و لە بەندکردنی بیروڕاکانی ئەوانیتر خۆت بپارێزە."

کەواتە لۆك پێشنیار دەکات کە بۆ تەواوبوونی هێزی بەکاربردنی عەقڵ (عەقلاندن)، هەموو مرۆڤێك خولێکی پراکتیکی ببرێت تا نەرمی نواندن و هەڵکردن بۆیان شێوەی نەریتێك بە خووە بگرێت. تەنیا لە سایەی تێگەیشتنی ڕای یەکتر ڕێزگرتن لە بیروڕای ئەوانیترە کە دەتوانین ئومێدەوار بین بە حەقیقەت نزیك ببینەوە. لۆك دەڵێت لە بری ئەوەی لە دژی یەکتر بەڵگە و دەلیل بهێنینەوە واباشترە عەقلاندنی هاوبەش تاقیبکەینەوە.





* * *

به واتایەکیتر، باشتر وایە لە دۆخی هەنووکەییەوە بۆ بارە سروشتییەکەی مرۆڤ بگەڕێنەوە. واتا بۆ ڕەوشتێك کە تیایدا ئازادی تاکە کەسی پاراستنێکی بەرامبەرانەی گشتی بوونی هەیە.

عەقڵ کە ئامرازی تێگەیشتنی ئێمەیە لە یاساکانی سروشت "فەرمان بە هەموو ئەو ئادەمیزادانە دەکات کە ڕاوێژی پێدەکەن کە هەموو ئازاد و یەکسانن و هیچ کەسێ بۆی نییە دەستدرێژی بکاتە سەر ژیان، تەندروستی، ئازادی یان ماڵ و سامانی ئەوانیتر." لێرەدا بۆ یەکەمین جار ڕووبەڕووی بابەتێك دەبینەوە کە ڕەگی داکوتا و بەری گرت و لە ئاکامدا بە شێوەی "جاڕنامەی ئازادی" کەوتە ڕوو، ئەوەش بە مافی سروشتی هەرکەسێك بینرا کە ئازاد بێت و سوود لە چێژەکانی ژیان وەربگرێت.

لۆك لە دەربڕینی بیروڕاکانی خۆیدا ئەوها دێتە دوان؛ بۆ دەستخستنی ئەو مافە، خەڵك دەبێت دەستی یەکبوون بۆ یەکتر درێژ بکەن و شان بدەنە بەر حکومەتێك تا لەو ڕێیەوە ئەگەری پێکداکەوتنی بەرژەوەندییەکانی تاك لەگەڵ خێر و ئاسایشی گشتی، لە ئارادا نەمێنێت.

بەگوێرەی ئەم وەسفە، مانای حکوومەتێکی شایستە(چاك) ئەوە نییە کە هەردەم ململانێ و کێشمەکێش لە نێوان پاشا و ڕەعیەتدا هەبێت، بەڵکو لە ڕاستیدا سەقامگیر بوونی ئەو حکوومەتە لەسەر بنەمای ئەو ئاشتبوونەوەیەیە کە لە نێوان تاکێك و تاکێکیتر بە ئەنجامگەیشتووە. توانای سەروو نابێت پشت بە داروودەستەکەی پاشا ببەستێت بەڵکو دەبێت لە دەستی خەڵکدا بمێنێتەوە. کۆمەڵ بە شێوەیەکی گشتی مافی ئەوەی هەیە ڕێکەوتننامەکە هەڵبوەشێنێتەوە ئەگەر هاتو حکوومەت لە مەرجەکانی ئاشتبوونەوە لابدات. بە واتایەکیتر حکوومەت دەبێت پارێزڤانی مافەکانی خەڵك بێت نەك ئەوەی سنووربەندیان بکات و قەید و بەندیان بۆ دابنێت. پاشایەتی ڕاسپاردەیەکی خودایی نییە و پاشا، لە ڕووی مافی تاکە کەسیەوە، بۆی نییە خۆی بە باڵاتر لە برایانی هاوجۆری خۆی دانێت. خەڵك هەمووی لە ڕوانگەی خواوە یەکسانن. حکوومەتیش دەبێت لە ڕووی یاسا سیاسییەکانەوە، بەیەك چاو سەیری هەموویان بکات. "بە بڕوای من دەسەڵات یان توانای سیاسی مافێکە کە بە مەرجەعێك دەردرێت تا هەندێك یاسا لە بەرژەوەندی گشتیدا دابنێت و جێبەجێیان بکات." لە کاتێکدا کە دەسەڵاتداران عادەتەن یاساکان بۆ بەرژەوەندی خویان دادەنێن و دەخەنە قۆناخی جێبەجێ کردنەوە. بۆیە، ئەوپەڕی گەمژایەتی لەوەدایە کە خەڵك بۆ ئەوەی خۆیان لە خراپە و ئازاری یەکتر بپارێزن، پشت بە پاشا ببەستن. ئەمە ڕێك وەکو ئەوە وایە کە داوا لە شێر بکرێت



چاودێری بەرخ بکات، دڵنیاترین کار ئەوەیە کە خەڵك لە ژێر سایەی حکوومەتێکدا کۆ ببنەوە کە لە سەر بناغەی "ریکەوتنی زۆرینە" بەند بێت.

حکوومەتێکی ئەوها لە ڕێگەی بەرژەوەندی گشتیدا هەنگاو دەنێت، بێگومان خەرجی بەڕیوەبردنی دەکەوێتە ئەستۆی خەڵك بەڵام پێویستە باجەکان بە ڕێکەوتن لەگەڵ خەڵك زیاد بکرێت. بە واتایەکیتر هیچ جۆرە باجێك بەبێ دەنگی ئەرێی خەڵك دانەنرێت.

ئەمەیە رای نەخشەدانەری دیموکراسیەتی ئەمریکا، سەدساڵ بەرلەوەی ئەو دەوڵەتە بنەماکانی سەربەخۆیی بناغە ڕێژبکات. لۆك دیاریدەکات: هەموو حکوومەتەکان دەبێت لە سەر بنەمای ڕەزامەندی و ڕێکەوتنی زۆرینەی خەڵك بەند بن و ئازادیی دەربڕن و ئازادیی بیر و هەڵبژاردنەکان و ئازادیی ئایین دابین بکەن. بۆ ئەوەی چارەنووسی حکوومەتی دیموکراسی بەرەو خۆپەرستی نەڕوات پێویستە هەندێك شێوازی کار بە مەبەستی پشکنین و پاراستنی هاوسەنگی بێنە ئاراوە و بە واتایەکیتر بنەمای جیاکردنەوەی دەسەلاتە سیانییەکان (یاسادانان، جێبەجێ کردن و دادوەری) تیایدا ڕەچاو بکرێن.

ئێستا با بزانین ئەگەر دژایەتییەك لە نیوان ئەم سێ دەسەڵاتە بێتە کایەوە چارە چ دەبێت. بۆ نموونە هەرکاتێك دەسەڵاتی جێبەجێ کردن خۆی لە جێبەجێ کردنی یاساکان لادا،ـ هەروەك لە بابەت چارلزی یەکەم لە ئینگلتەرا هاتە ئاراوە کە دەیویست لاسارانە و بەبێ ئەنجومەن فەرمانڕەوایی بکات- دەبێت چ بکرێت. لۆك دەڵێت: لە بارێکی ئەوهادا خەڵك نەك تەنیا بۆیان هەیە، بەڵکو ئەرکی سەرشانیانە بۆ بەرگرتن لە دەستدرێژییەکی ئەوها هەنگاو باوێژن و ئەگەر پێویست کرا پەنا بۆ زەبر بەرن. هەڵبەتە دەبێت بەوپەڕی وردبینی و تەدبیر وەرگرتنەوە سوود لەو مافە یاساییە وەربگیرێت. "زەبر دەبێت تەنیا لە دژی زەبر و تەعەدا بە کار ببرێت نەك بۆ ڕووبەرووبوونەوەی ڕەوشتێك جگە لەو"، حکوومەتێکی دیموکراسی نابێت هەرگیز پەنا بۆ دەستدرێژی بەرێت، بەڵکو پێویستە هەردەم بۆ بەرگری لە خۆ کردن ئامادە بێت. ئەمەیە کورتەی فەلسەفەی جۆن لۆك لەبارەی حکوومەتەکان. دەبێت لە یادمان بێت ئەم فەلسەفەیە کە ئەمڕۆکەش هێز و ئیعتیباری خۆی هەیە، نزیکەی سێ سەد ساڵێك لەمەو بەر پێشکەش بە خەڵکی جیهان کراوە، لە سەردەمێکدا کە دیموکراسی خەون و خەیاڵێك زیاتر نەبوو. جۆن لۆك ڕوانگەیەکی فراوانی هەیە و تەنیا بە ئازادیی حکوومەت بە شێوەیەکی جودایانە ڕانەوەستاوە، بەڵکو بنەماکانی حکوومەتی نێونەتەوەیی دیاریدەکات کە بەرکەماڵییە واقیعیەکەی، ئەو کاتە دێتەدی کە وڵاتانیش وەکو تاکەکەسەکان پەیمانی کۆمەڵایەتی ببەستن و لەڕووی سیاسییەوە





پشت بەیەکتر ببەستن. ڕەوتگەی ئازادی لە دیموکراسیەتی نەتەوەییەوە بەرەو دیموکراسیەتی نێونەتەوەیی دەبێتەوە و وازهێنان لە پێکدادانەکانی نێوان ولاّتان لە ئاکامدا بە هەولّوەشانەوەی شەڕە نێونەتەوەییەکان کۆتایی دێت.

*   *   *

مەبەست لە حکوومەت، چ نەتەوەیی بێت یان نێونەتەوەیی، پارێزگاریکردنی ژیان و ئازادی و بەختەوەرییەکانی خەڵکی جیهانە. بەگوێرەی ئەم وەسفە تێبینی دەکەین کە لە فەلسەفەی جۆن لۆکدا سیاسەت دەچێتە ناو زانستی ئاکارەوە. بنەماکانی دادوەری پابەندی شێوەی داوەرێتیی پاشایانە نییە، بەڵکو پەیوەندی بە پێداویستییەکانی خەڵکەوە هەیە. ئەقلی ئێمە کە بەرهەمی ئەزموونەکانمانە لە سەر بنچینەی ڕوانینە هەستەوەرییەکانمان، پیشاندەدات کە: "چاکە و خراپە لە چێژ و ڕەنج بەولاوە هیچیتر نییە." بەلاّم هۆکارێکی دیاریکەر و دەست نیشانکەر کە دەبێت بلێت چ شتێك بۆ تاك یان کۆمەڵ چێژ بەخش یان ڕەنجهێنەرە، دەنگی خەڵکە نەك ڕای پاشاو دەنگی خەڵك ئیرادەی خواییە. بنەما ئاکارییەکان بابەتی واین کە لە دەرەوەڕا سەپێنرا بن بەڵکو ڕۆشن بوونەوەیەکی هونەرییە. لە هوندری ئێمەدا دەزگایەکی دادوەری هەیە. بەواتایەکیتر جیا لە فەرمانی سوڵتان یان حوکمی حاکم، لە مرۆڤدا جۆرێك لە سۆزی ڕەگەز خوازی و ڕەچاوکردنی مافی ئەوانیتر هەیە. ئەم دەزگایە کە لۆك سوورە لەسەر ئەوەی کە بەرهەمی ئەزموونە هەستییەکانی ئێمەیە و کارەکەی ڕەچاوکردنی ماف و مروەت و دادە، هۆییێکە کە خوا لە ڕێگەیەوە ئیرادە و خواستی خۆی بۆ نەوەکانی مرۆڤ دەخاتە ڕوو و فێرکاری و پەروەردەی پەروەردگاریانەی ئێمە لەو ڕێگەیەوە بەرهەم دێت.

ئەو بنەمایانەی کە لەم فێرکاری و پەروەردە کردنە یان بەواتایەکی تر لەو پابەندییە پەروەردگاریانەدا جێبەجێ دەکرێن وەکو بنەما بیرکارییەکان جێگیر و قایمن و دەتوانرێ بە پشت ڕاستییەوە بخرێنە قۆناخی پراکتیزە کردن. "وێنا کردنی ئەو بوونە بالاّیەی کە توانایەکی بێ سنوور و چاکە و زانستێکی پەتییە، بوونێك کە ئێمە ئافرێنراوای ئەوین و پشتی پێدەبەستین، و وێنای مرۆڤ لەبارەی خۆی کە بوونەوەرێکی ژیرە... بەرای من هەر کاتێك باش بکەوێتە ژێر وردبینییەوە، زانیارییەکی وا لەبارەی ئەرکەکانمان دێنێتە ئاراوە کە ئەگەری ئەوە هەیە ئاکار بخاتە ناو گرووپی یەکێك لە زانستەکان ـ زانستێك کە بتوانرێ بە باشی پیشانبدرێت ـ من دڵنیام کە لەم بارەدا لەو بنەما گومانهەڵنەگر و ئەنجامە پێویست و بێ ئەم



لاو ئەولایانەی کە دەستدەکەون و بە هۆی مکوم بوونی بنەماکانی بیرکارییە کە دەتوانین پێوانەیەکی ڕاستمان بۆ چاکە و خراپە هەبێت."

لۆك بەم چەشنە بنەما ئەخلاقییەکان وەکو کاروباری سیاسی لە سەر بناغەی زانستی جێگیر دەکات کە دووربینی و ڕێ و شوێن وەرگرتن (تەدبیر) واتا ئەو ئەقلەی کە زادەی ئەزموونەکانمانە، ڕێبەرایەتیان دەکات و گلاّوی و دزێوی بە مەودای کاری ئەم ڕێبەرایەتییە نەکەوتوون. شیکردنەوەیەکی و وردی سەهوەکانی ڕابردوو، باشترین ڕێگەی دابینکردنی سەرکەوتنەکانی ئاییندەیە.

بە پێی ئەم وەسفە، بیروڕاکانی ئێمە لەبارەی سەرکەوتن و نشوستی، چاکە و خراپە، ڕاست و چەوت هەموویان سەرچاوەیەکی ئەزموونییان هەیە. واتا ئەو زانیاریانەن کە لە ڕێگەی ئەزموونەوە دابینکروان و ئەم زانیارییە ئەزموونیانە زنجیرەیەك "مەسەلە کە خۆی لە خۆیدا گومانهەڵنەگرن" دەخەنە بەردەستمان. لەوانەش ئەوەی کە هەموو تاکەکانی مرۆڤ بە ئازادی و یەکسانی لەدایك بوونە و بەو هۆیەوە کەس بۆی نییە بە چاوی سووکایەتییەوە سەیری ئەویتر بکات.

ئەرکی ئێمە ئەوەیە کە ئالیکار و هاوکاری یەکتر بین نەك ئازاردەری یەکتر، پەیمانە زارەکی و نوسراوەکان مایەی ڕێزلێنانن و نابێت بشکێنرێن مەگەر بە ڕەزامەندی هەردوو لا یان لە ڕەوشێکدا کە یەکێك لە دوو لایەنەکە خۆی لە جێبەجێ کردنی ئەو مەرجانە لابدات کە لە ڕێکەوتننامەکەدا هاتوون.

دایك و باوك، حەقیانە چاودێری منالّەکانیان بکەن و ئەرکیانە شان بدەنەبەر فێرکاری و پەروەردە کردنیان و ئەو چاودێرییەی دایك و باوك، کاتێك کە منالاّن دەگەنە تەمەنی ژیری، لادەچێت. سامانی سەر زەوی گشتی و هی هەمووانە. هەندێك لەم سامانە ڕەنگە بکەوێتە بەر دەستی کەسێکی تایبەتی بە مەرجێك لەدابینکردنیدا خزمە تێکی ئەنجامدابێت و "کاری خۆی کردبێتە پاشکۆی"، ئەویش "ئەو کاتەی کە هەر لەوەش بۆ خەڵکی گشتی بەشی کافی بەجێ مابێت." بەواتایەکی تر نابێت کەس، بەر لەوەی ئەوانیتر لە برسێتی ڕزگاریانبێت، لە ڕادە بەدەر تێربێت.

ئەم ڕایەی لۆك لەو سەردەمەی کە ئەو تیایدا دەژیا، ڕایەکی تازە بوو لە زانستی ئاکاردا و تەنانەت تا ئێستاش خەڵکانێك کە گیانی دەستدرێژکاریان هەیە پێشوازیان لەو بیرۆکەیە نەکردووە. چونکە ئەم ڕایە کە لە سەر "یاسای ڕووناك کردنەوەی عەدالەتی خوایی" بەندە، دوو





ئەرك بۆ تاكەكەس لەناو كۆمەڵگادا دیاریدەكات: یەكەم ئەوەیە كە دەست بە سەر هیچ شتێكدا نەگرێت تا كاری بۆ نەكردبێت و زەحمەتی بۆ نەكێشابێت. دووەمیشیان ئەوەیە كە تەنیا بەشە یاساییەكەی خۆی هەڵگرێت و لێبگەرێت تا ئەوانیتریش بگەنە بەشەكەی خۆیان.

بۆیە هەڵسوكەوت و كردەوەی چاك ئەوەیە كە مرۆڤ بگەیێنێتە شادی و بەختیاری و رەنج و ئازاری لاببات. بەڵام یاسای ئاكار رێگە بە هەڵسوكەوت و كردارێك دەدات كە بەو هۆیەوە بەختیاری و شادمانی زیاتر بۆ زۆربەی خەڵك دابینبكرێت و رەنج ئازاری زۆربەیان كەم ببێتەوە.

ـ ٥ ـ

رەنج و ئازارەكانی لۆك تاڕادەیەكی زۆر كەم ببوونەوە. چارلزی دووەم كە ناو بە ناو ئاگری ستەم و زۆردارییەكەی بڵێسەی دەسەند، ئازاری بە گیانی لۆك نەگەیاند تەنیا لەو رووەوە كە فێری وانەیەكی گرنگ ببوو و دەیزانی كە خەڵك دەبێت لەرێگەی پەرلەمانێك راو خۆ هەڵقورتاندنیان لە دەوڵەتدا هەبێت تا پاشا بتوانێت سەری خۆی لە سەر جەستە بهێڵێتەوە. چالزی دووەم لەم وانەیەدا قەرزاری لۆك بووـ هەمان ئەو پیاوەی كە ناچار بە دوور خستنەوەی كردبوو.

ئێستا چالزی دووەم كۆچی دوایی كردووە و بەڕێوەبردنی ئێنگلتەرا لە ئەستۆی پاشایەكدایە كە پشت بە بیروڕای دێرین و كۆن دەبەستێت. جێمزی دووەم بڕیاریادا كە بەگژ ئیرادەی خەڵكدا بچێتەوە و خەڵكیش بڕیاریادا لە تەختی دەسەڵات بیخەنە خوارەوە بەڵام نەك بە توڕەیی و زەبر. شۆڕش خەڵكی فێركردبوو كە شورش كردن بەبێخوێنرێژیش ئیمكانی هەیە. پاشا سەرەتا لە بەرامبەر ئیرادەی خەڵك كە داوای دەست لە كاركێشانەوەی ئەویان دەكرد بەرخودانی كرد بەڵام لە ئاكامدا توندوتیژی خۆی بەدەست ئەقلەوەدا و تەنانەت بێ ئەوەی گوللەیەك بتەقێنرێت، جێمزی دووەم دەستی لە كار كێشاوە. (١٦٨٨)

پاشای نوێ كە نازناوی ویلیامی ئورانژ (William of Orange) بوو لە وڵاتی هۆڵەنداوە هێنرا بۆ ئینگلتەراـ هەمان ئەو وڵاتەی كە پەناگەی جۆن لۆك بوو لە سەردەمی دوور خراوەییدا فەیلەسووف ئیتر بە ئاسودەیی هەناسەی هەڵدەكێشاو چەند ساڵی كۆتایی تەمەنی دەبێت بە ساڵە پڕ لە بەرهەمەكانی سەردەمی ژیانی بژمێردرێن. خۆی دەنووسێت:

"ژیانی من لەڕاستیدا لە شەست ساڵیدا دەستیپێكرد." جۆن لۆك لەوە بەدوا ماوەیەك لە وەزارەتی بازرگانیدا دەستی دایە كار و لە دامەزراندنی بانكی لەندەندا هاوڕێیەتی كرد. فێركاری و پەروەردە كردنی خەڵكی عەوامی رێكخست و میتۆدی تازەی بۆ دانا و ژمارەیەك



پەرتووك و بڵاوكراوەی دانا كە هەڵگری پێناسە و روونكردنەوەی مافی كرێكار و ئازادی چاپەمەنی و رێورەسمی ژیانی نەتەوەیی (یان گەلەری" و مافە كۆمەڵایەتییەكان لەبارەی شێوازی دەسەڵاتتخوازی بوون.

جۆن لۆك تا دواسات هەروا بە مامۆستایەتی مایەوە. ئەو ئەڤینێكی پڕاوپڕی بۆ بەسەر بردنی ژیان لە ناو لاوان و گیانە بەزەوقەكاندا هەبوو و ئومێدی لاوێتی بە سەر نائومێدیی پیرێتیدا دەپەژراند. "دوو پیرەمێرد كە شین و شەپۆڕیانە ئاوازێكی خەمهێنەر دەچڕن." ئەم مەعنەویاتە كە هەمیشە رووی لە هەڵهاتنی خۆری سبیەینێ بوو و ئاوڕی لە تاریكایی هەوای دوێنێ نەدەداوە، لەسەر رەوشی جەستەیی و گیانییەكەی كاریگەر بوو و تا هەفتاودوو ساڵی كە ماڵئاوایی لە دونیاكرد هێز و توانای پاراست.

چەند ساتێك بەر لە مەرگ كاتێك یەكێك لە هاوڕێكانی لێی پرسی هەست بە چی دەكات، وەڵامی دایەوە: "جۆن لۆك بە تەواوەتی حاڵی باشە. ئەو كوختەیەی كە لۆك تیایدا دەژیت لەرزۆكە و با لە درزەكانیەوە دەستی بە هەڵكردن كردووە، بەڵام بەڕێز جۆن لۆك حاڵی زۆر باشە، سوپاست دەكەم، و ئێستا لە ئاستانەی گواستنەوەدایە بۆ ماڵێكی باشتر كە دروستكراوی دەستی ئادەمیزاد نییە."





# وەدەرنانی سپینۆزا لەکۆمەڵگای مرۆڤی

## (١٦٣٢ ـ ١٦٧٧)

سپینۆزا (Benedict Spinosa) تەمەنی هەشت ساڵ بوو کە بوو بە شایەتی سەحنەیەکی جەرگبڕ و تا کۆتایی تەمەنی لە بیری نەکرد. ئەو رووداوە لە کەنیسەی جولەکەکان لە ئەمستردام روویدا. پیاوێك بە ناوی ئۆریل ئاکۆستا (Vril Acosta) لە دەمی دەرگادا لە سەر زەوی راکشا بوو و گەورەکانی کەنیسە لەکاتی دەربازبوون بۆ سەر شەقام پێیان لێدەنا.

سپینۆزا لە باوکی پرسی: "چ گوناهێکی کردووە کە شایانی سزایەکی ئەوها بێت؟" باوکی وەلامی دایەوە: "بارۆخ ئەم چیرۆکە دووردرێژە بەلاّم من لە چەند وشەیەکدا بۆت کورتی دەکەمەوە:

ئۆریل ئاکوستا لەگەڵ دەستوورەکانی ئێمەدا نییە و کەنیسە ئەوی بە هۆی بیرە ئازادەکانیەوە لە کۆمەڵی خۆی دەرکردووە. بەلاّم ئاکۆستا هەست بە تەنیایی دەکات و داواکارییەکەی ئەوەیە کە دووبارە لەلایەن کۆمەڵگای جوولەکەوە وەربگیرێتەوە و ئەو بەر لەوەی بتوانێت بێتە ناو کەنیسەوە دەبێت مل بداتە بەر قبوولکردنی ئەو سزایانە.

"باوکە گیان پێم بڵێ بابزانم ئایا بە بن پێخستن دەتوانرێ جوولەکەی بڕوادار پەروەردە بکرێت."

سپینۆزای بچووك بە پەسێوی و بە دەم بیرکردنەوەوە گەڕایەوە ماڵ. هەرێمی جوولەکەنشینی شار لە پای بیستنی هەواڵی سزادانی ئاکۆستا نارەحەت و لە تاوتێدابوون.





زۆربەی خەڵك پشتگیری ئەو هەنگاوەی گەورەکانی کەنیسەیان دەکرد و ئەو ژمارە کەمەی کە ئەم کارە جیێ رەزامەند یان نەبوو لە ترسا بێدەنگ بوون و لە بنا گوێی یەکتردا دەدوان. باروخ بە بونەیەکەوە قسەیەکی خۆشەویستی ئامێزی لەبارەی ئەو بەخت رەشە هێنایە سەر زمان بەلاّم یەکێك لە هاوکایەکانی حەقدەستەکەی دایەوە و شەپازللەیەکی قایمی سرەواندە بناگوێی.

رۆژی دواتر تراژیدیای ئاکۆستا گەیشتە ئەوپەڕی و ئەو پیاوە بەخت هەڵگەڕاوە کە ئیتر لە ژێر باری سوکایەتی و زەلیلی لە پەلوپۆ کەوتبوو، بە گوللەیەك مێشکی خۆی پژاند و خۆی ئاسوودەکرد.

سپینۆزای بچکۆڵە لای خۆی گوتی: دونیایێکی سەیرە! ئەو حیکمەتی جوولەکایەتی لەو ئازار و رەنجەی کە بەرگەیان دەگرت، بۆ دەرکەوت.

جوولەکەکان نەك هەر حەزیان لە خوێندنەوەی مێژوو بوو، بەڵکو خۆیان شایەتی زیندووی بوون. پشکنینی بیروڕاکان، زیندان و ئەشکەنجە و لەئاگردا سووتان، ئەم کارە نامرۆڤانانە تەقریبەن گشتیان چارەنووسی ئاسایی هەر بنەماڵەیەکی جولەکە بوون لە سەدەکانی ناوەڕاستدا. ئەم نەتەوەیە وەکو پارچەکانی کەشتییێکی تێکشکاو، لە لایەکەوە بۆ لایەکیتر توڕ هەڵدەدران. هەندێکیان لە رێگەی ئیسپانیا و پورتوگالەوە گەیشتنە کیشوەری ئەفریقا و لەوێ لەپای ئەوەی کە دەیانگوت گەوهەرەکانی خۆیان شاردووتەوە یان قوتداوە، تووشی کوشتنی بەکۆمەڵ هاتن. کۆمەڵێکیتر رێگەی ئیتالیا و ئینگلتەرایان گرتە بەر بەلاّم لەوێش پێشوازی یان پەزێرایی لەو مێوانە داوەت نەکراوەنە نەکرا. گرووپێکیش چووە هۆڵەندا ـ ولاّتێك کە ئەگەرچی بەوویەکی کراوەوە پێشوازیی لێنەکردن، بەلاّم بەلایەنی کەم پێکەوە گونجان و نەرمییێکی زیاتریان پیشاندا. سپینۆزاش سەر بەو خێزانە بووکە لە پورتوگالەوە بۆ هۆڵەنەدا کوچیکرد. باروخ لە منالّییەوە لەگەڵ چیرۆکە حەماسییەکەی نەتەوەی جوولەکە ئاشنابوو کە بە ئازار و رەنج و کوێرەوەری و ئازایی و بڕوا بارگاوی بوو. ئەو چەندەها چیرۆکی لەبابەت دلڕەقی و ستەمکاری کریستانەکانەوە بیستبوو بەلاّم لێرە، لە تراژیدیای ئاکوستادا، فێری وانەیەکی نوێ بوو کە پەیوەست بوو بە دلڕەقی و بێبەزەییی هاوئایینانی خۆی. جوولەکەکان کە خۆیان ئەشکەنجە و ئازاری فراوانیان بینیبوو ئێستا خۆیان ببوون بە هۆکاری و لە قوتابخانەی

رك لە دڵی و نەفرەت (قین) و لە ژێر قامچی بەرێوەبەرانی قوتابخانەی مەسیحیەت، قوتابیی لێوەشاوەیان لێ‌کەوتبووە.

دونیا پێویستی بە مامۆستایەکی نوێی هەبوو. ئەم بیرە بە شێوەیەکی نارِوون خۆی بە زەینە بێگەردەکەی منداڵەکەداکرد. کاتێك گەیشتە تەمەنی پێگەیشتن، یەکێك لەوکارانەی کە دەیەویست شان بداتە بەری هەر ئەو پیشەیە بوو و مەبەستی ئەوە بوو کە خەڵك فێربکات کە تەپوتۆزی کینەخوازی و رق و قین لەسەر ئاوێنەی دڵیان بسرِنەوە.

- ٢ -

سپینۆزا تەنیا بە خوێندنەوەی پەرتووکەکانەوە نەوەستا بەڵکو زیاتر لە هەمووشتێك لە پەرتوکی سروشتەوە فێربوو و لاپەڕەکانی ئەم پەرتووکە بۆی بە ئەزموونی تاڵ و ناخۆش بارگاوی بوو. سپینۆزا هەر لەقۆناخی یەکەمدا بۆی دەرکەوت کە فەلسەفەی جوولەکایەتی و جوانیی ئایینە ناجوولەکەییەکان گەرچی پڕن لە سەرسامی و ئافەرین بەڵام لە ئەڤین و خۆشەویستی بێبەرین.

مامۆستای زمانی لاتینی کە زانایەکی هۆڵەندی بوو بە ناوی ڤان دێن ئێندی ( Van den Ende)، کچێکی جوانی هەبوو. سپینۆزا لە پێشکەش کردنی داواکاریی هاوسەرییەتی بەوکچە پەلەی کرد و کچەکە رێزی بۆ بیر و زەوقە جوولکانەکەی ئەو هەبوو و روخسارە جوولەکەییەکەی بەدڵ نەبوو، وەڵامی نێگەتیڤی داوە و دەستی ئەرێی بۆ خوازگینێکی ناجوولەکە درێژکرد.

سپینۆزا خۆی لەگەڵ ئەو نائومێدی و نشوستییە گونجاند و لە چاوەڕوانیی لێدانەکانی تردا راوەستا.

دوای مردنی باوکی، خوشکەکەی نیازی بوو بیخافلێنێت و لە میراتی باوکانە بێبەریی بکات.

ئەم جارە سپینۆزا مەسەلەکەی بەجیددی وەرگرت و خوشکەکەی راکێشا دادگا و بە سەریدا زاڵ بوو (سەرکەوت)، بەڵام لەهەمان کاتدا گەورەیی نواند و سامانەکەی بۆ خوشکەکەی گێڕاندەوە و رای دادگای دڕاند و گوتی: لێگەڕێ با عەدالەت رۆڵی خۆی بگێڕێت بەڵام خوشەویستی و ئەڤین بە سەریدا سەرکەون.



دژوارترین قۆناخی تاقیکردنەوە ئەو ئەوکاتە بۆی هاتە پێش کە گەورەپیاوانی کەنیسە بڕیاریاندا ئەو بیردۆزە چەوتانەی کە لە بابەت تەورات هەیبوو لە هزری دەربێنن و ئامادە بوون ساڵانە پێنج سەد دۆلار بدەنێ تەنیا بە مەرجێك کە قایل بێت فیکرەکانی خۆی بۆ خۆی بپارێزێت و خۆی لە ئاشکراکردنیان لابدات. ئەو پێشنیارەی رەتکردەوە و بە هۆی ئەمەوە لە رۆژی ٢٧ ی مانگی حەوتی ساڵی ١٦٥٦ بەشێوەیەکی فەرمی لە (نیشتمان و دڵ)ی هاوئایینەکانی خۆی دەرکرا.

سپینۆزا لەو کاتەدا تەمەنی بیستوچوار ساڵ زیاتر نەبوو. تاقیکردنەوەیەکی دژواری تێپەڕاند بوو و تا کۆتایی تەمەنی بە تەنیاییەکی مەحکووم ببوو. ئەو وەکو تارماییەکی زیندوو دەربەدەر و ئاوارە بوو وهیچ جوولەکەیەك بۆی نەبوو خواردن بداتێ و داڵدەی بدات یان تەنانەت بیدوێنێت یان بە دیاریەوە پێبکەنێت. ئەم حوکمە لە نا هاواری ئەو خەڵکەی کە کۆببوونەوە و نەفیری زوڕناییێك کە لە قۆچی بەرخ دروستکرابوو، راگەیێنرا. لەو بارەدا مۆمەکان یەك لە دوای یەك کوژانەوە کە ئەمە خۆی نیشانەی لە ناو چوونی شوێنەوار و بوونی سپینۆزا بوو لە ئەندامێتی ئەو کۆمەڵگایە.

"شەو و رۆژ نەفرەتی لێ بێت، کاتی وریایی و خەو، مافی هاتوچۆو. خواوەند هەرگیز لێی خۆش نەبێت، و لەئاگری توڕەیی خۆیدا بیسوتێنێت. هەموو ئەو نەفرەتانەی کە لە تەوراتدا هاتوون لێبێت. خواوەند ناوی لە ئاسمانەکان بسڕێتەوە."

کاتێك هاواری دوا نەفرەت لێکردن دەوروبەرەکەی لە خۆ پێچاوە، دوایین مۆم کوژاوە و کەنیسە بە ناو تاریکییەکی پەتیدا رۆچوو. بە فەرمانی پیاوە گەورەکانی کەنیسە سپینۆزا لەسەر پانتایی زەویی دەرکرا: "کەس نەیدوێنێت و نامەی بۆ نەنووسێت، کەس خزمەتێکی پێ رەوا نەبینێت و لەگەڵیدا لەژێر بنێکدا نەژیت و لێی نزیك نەکەوێتەوە و گوتە و نووسینەکانی نەبیستێت و نەخوێنێتەوە" سپینۆزا لەناو ئەو تاریکاییەدا راوەستا. فەرمانی مەحکوومیەتی خۆی لە زاری پەروەردەگەراوە بیست. گوێی بە قیژەی شەپیۆڕ و هاواری خەڵکیدا. لەم کەین و بەینەدا یادەوەریی رۆژگاریی منداڵی لە هزریدا زیندوو بۆوە و پێشێلکرانی ئۆریل هاتەوە یادی. دڵی مرۆڤ بە چ شێتایەتی و درِندایەتییێك سیخناخ بووە!





لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، لە ناو ئەو هەموو دەرد و ڕەنجەدا، هیچ جۆرە ڕق وکینەیەکی لە دادوەرەکانی خۆی هەڵنەگرت، "کاری من ئەوە نییە کە خوردەگری و نەفرەت لە کەس بکەم یان کەسێك مەحکوو بکەم بەڵکو ئەرکی من تێگەیشتنە." لەوە بەدوا ئەرکەکەی بەتەنیا هەرئەوە بوو. بە دڵتەنگی و تەنیایی ئەوێی بەجێ هێشت و بڕیاریدا کە خوا بناسێت و سروشتی مرۆڤی بە دەستبێنێت.

- ٣ -

سپینۆزا بە قبووڵ کردنی فەرمانی تەکفیر، بوو بە یەکێك لە منداڵانی چاکی ئایینی جوولەکە- ئایینێك کە شوێنکەوتووانی بە لاساری (خۆسەری) و کەللەڕەقی تایبەتییەوە ڕێگەی خۆیان بەرەو بەهەشت گرتەبەر- نەتەوەی جوولەکە بە هۆی ئەوەی کە خۆیان لە پەسەندکردنی ئایینی مەسیح لادابوو گیرۆدەی ڕەنج و ئازار ببوو و ئێستاکە سپیینۆزا بە هۆی ئەوەی کە ئایینی جوولەکەی قبووڵنەکردووە تووشی ئازار و ئەشکەنجە بووەوە. سپنۆزا بە ئاسانی دەیتوانی ئایینێکی تر هەڵبژێرێت و پەنا بباتە بەر باوەشی هاوئایینە نوێکانی بەلاّم وا بە باشی زانی کە هەروا بە تەنیا بمێنێتەوە و دونیا بە چاکەکانی خۆی ببینێت و بناسێت.

"ئەو کەسانەی کە ئارەزوومەندن... بوونەوەرانی سروشت وەکو فەیلەسووفەکان بناسن و بە بینینیان وەکو گەوجەکان چاویان ئەبلەق نەبێت، لە ڕوانگەی عەوامی خەڵکەوە بەبێدین و بیدعەکار دەناسرێن. ئەو نایەوێت ڕووپامایی و زمانلووسیی عەوام لە بڕی حەقیقەتخوازی بۆ خۆی قبوڵبکات. سپینۆزا بەتەمابوو کە تا کۆتایی ژیانی تەنیا یەك هاودەم بۆ خۆی هەڵبژێرێت کە بریتی بوو لە ئاسوودەیی فیکر، بەلاّم ئەویش زۆری نەخایاند. یەکێك لە ئەندامە دەمارگیرەکانی کەنیسە شەوێك بە خەنجەر هێرشی کردە سەر و سپینۆزا کە ڕووشانێکی بچووك لە سەر ملی دروستببوو، توانی هەڵبێت و لە یەکێك لە ناوچەکانی ئەمستردام پەنا بباتە بەر ژوورێکی بێدەنگی بن بنمچی جەمەڵون و ناوی خۆی بکاتە بێنێدیکت (Benedict) کە هاوتا لاتینییەکەی ناوە ڕەسەنەکەی: باروخ (Baruch) بوو. لەوێ لەڕێگەی خاوێن کردنەوەی عەدەسی (بلور)ەوە کە پێشتر فێری ببوو بژێوی خۆی دابیندەکرد و سەرگەرمییەکەی ئەوە بوو کە سەیری شەڕ و جەنگی جاڵجاڵۆکەکانی دەکرد لە بنمچی کوختە شڕەکەی.



سپینۆزا لایەنی وێکچووی زۆری لە نێوان جاڵجاڵۆکەکان و ئادەمیزادەکاندا بینی. جاڵجاڵۆکەکانیش بە بلیمەتییەکی سەرسوڕهێنەرەوە تۆڕ دەچنن و خانوو دروستدەکەن و پاشان بەو پەڕی گەمژایەتییەوە، بەبێ هۆ و سەبەبێك، کارە خۆکردەکەی خۆیان تێکدەدەن.

سپینۆزا لە کاتە بۆشەکانیدا بنچینەی فەلسەفەکەی بناغەڕێژ دەکرد. ماوەیەك دواتر خاوەنی خانووەکەی ماڵەکەی بۆ لیدن گواستەوە. سپینۆزاش بە دوایاندا کەوتەڕێ. خاوەنی خانووەکەی شوێنکەوتووی ڕێبازە ئاشتیخوازەکەی مێنۆنیت (Mennonite) بوو- تیرەیەکی مەسیحیەت کە خۆیان دەژیان و لێدەگەڕان ئەوانیتریش بژین - ڕۆژێك وا ڕێکەوت کە سپینۆزا لە کاتێکدا کە لە لایان دانیشتبوو و قەلوونی دەکێشا، بە دەربڕینێکی سادە کە لە ناخییەوە هەڵدەقوڵا، بیروڕا و بیردۆزەکانی خۆی بۆیان گێڕاوە. ئەوانیش لەوە بەدوا پڕکردنەوەی پێداویستییە سادەکانی ڕۆژانەی ئەویان گرتە ئەستۆ کە بریتی بوو لە کەرتە نانێك و کەمێك تریێ و شیر و لە کاتی نەخۆشیدا چاودێریان لێکرد.

سپینۆزا تووشی نەخۆشی سیل ببوو و دەیزانی کە هەتاوی تەمەنی ڕووی لە ئاوابوونە. لەو ڕووەوە بە گەرم و گوڕی و بێ ئۆقرەییەوە دەست بە کار ببوو تا بەر لەوەی ماڵئاوایی لە دونیا بکات کۆتایی بە پەرتوکەکانی. لەم ڕێگەیەدا سەرکەوتنێکی تەواوی بە دەست نەهێناو دوایین دانراوی، ڕەنگەش یەکێك لە باشترینیان بێت کە ناوی "نامەیەك لە سیاسەتدا" بوو، بە نیوەچڵی مایەوە. تەنانەت پەرتووکەکانی تریشی وەکو "نامەیەك لەبارەی ئایین و دەوڵەت" و "چاکسازیی توانای پێزانین" و پەرتووکی "ئاکار" بەتەواوەتی کۆتاییان پێنەهات. ئەو بە خۆی دەیگوت کە ئەوان "بەشێکی حەقیقەت" دەگرنە خۆ و دانی بەوەدادەنا کە تەنانەت گەورەترین فەیلەسووفەکانیش وەکو زیندانیێك، دونیا لە درزی دیوارەکانی لەشی خۆی کە زیندانی تەواوی ماوەی تەمەنە، سەیردەکەن.

بەلاّم هەر خودی ئەم تەماشاکردنەش هەرچەندە سنووردار و کەم وکورتە، هەرکاتێك بکەوێتە ناو "چوارچێوەی ئەبەدیەت" دەبێتە دیدێکی ڕاستین و ڕاستەقینە. ئەمە گەوهەر و پوختەی فەلسەفەی سپینۆزایە. شەڕوجەنگی جاڵجاڵۆکەکان، کێشمەکێشی مرۆڤەکان، ئەشکەنجە بڕست بڕەکان، ئەو حوکمە تەکفیریانە کە لەلایەن سەرچاوە ئایینییەکانەوە دەردەکرێن، بەدحاڵی بوونەکان، ئەو ڕق وکینەخوازیانەی کە لە نێوان تاکەکەسەکان و خێزانەکان و نەتەوەکاندا هەیە،





هەموویان دوای رەش و تاریکن کە لە چنینی هەتاهەتایی بووندا جێیان گرتووە و بۆ کامل بوونی "بوون"، ئەم داوە رەش و تاریکانەش وەکو داوە سپی و رووناکەکان، سەربە ماددە یان کەرەستەی بنچینەیین.

ئێستا با بزانین لە بنەڕەتدا (بوون) چ واتایەکی هەیە:

سپینۆزا "بوون" بە یەکێتیی جیهان گوزارشت دەکات لە رەوتی ژیانی نەمردا. لەبەر ئەوەی کە ئێمە لە گرتووخانەی لەشدا زیندانی کراوین، تەنیا دەتوانین نیگایەکی تێپەڕ بخەینە سەر ژیانی هەتاهەتایی و خواوەندی. لەگەڵ ئەمەشدا، لەڕوانگەی سپینۆزاوە، هەر ئەو نیگا رووناککەر و کورتانە بەسن بۆ ئەوەی ئەو حەقیقەتەمان بۆ بخەنە ڕوو کە خوا و مرۆڤ و جیهان یەك شت زیاتر نییە.

ئەم فەلسەفەیە کە بە (یەکێتی بوون*) ناوبانگی دەرکردووە مانای ئەوەیە کە خواوەند لە ئێمەدا هەیە و هەریەکەمان تیشکێکی خودی ئەوین.

ئەو دڵڕەقییەی کە ماموری پشکنینی بیروباوەڕەکان دەخاتەڕوو، ئەو ئازار و رەنجەی کە تۆوشبووانی نەخۆشی سیل تەحەمول دەکەن، ئەو نائومێدی و بێ هیواییەی کە لە ئەڤینێکی ناکامەرانەوە لەدایك دەبێت، هاتنی ساتی مەرگ، گشتیان سێبەری تێپەڕن کە دەکەونە سەر سەروسیمای خواوەند.

گەوهەری بنەڕەتی خوا رووناکییە. رووناکییەکی نەمر و هەتاهەتایی لەشی مرۆڤ بەشێکە لە گەوهەرەکانی خوایی هەروەك کە گیانی مرۆڤیش بەهرە لە گیانی خواوە وەردەگرێت. بەلاّم نابێت تێگەیشتنە لاوازەکەی خۆمان لەگەڵ زانستی بێ کۆتایی خوایی تێکەڵ بکەین و تووشی سەهو ببین. جیهان بەگوێرەی ئارەزووەکانی یەك بە یەکی ئێمە نییە بەڵکو بە پێی خواستی دەرك پێکەری خوایی بەڕێوە دەچێت. بێگومان هەموو ئافرێنراوەکان بەشی خۆیان لە زانستی خوایی هەیە بەلاّم زانست و تێگەیشتن پلەی خۆیان هەیە. بۆ نموونە ئەو هەستانەی کە لە درەختێکدا هەنە تەواو جیاوازە لەوەی کە لە سەگێکدا بوونی هەیە و تێگەیشتنی ئادەمیزادێکی ئاسایی لە تێگەیشتن و فامکردنی نووسەرێکی گەورە چەندین جار کەمتر و

* Pantheism ئاوێتەیەکە لە وشەی یۆنانی Pan بە واتای هەموو شتێك و Theos بە واتای خوا.



زانستی شێکسپیر بۆ نموونە بە بەراورد لەگەڵ زانستی خوایی تەنانەت لە شعروی درەخت بە گوێرەی شێکسپیر چەندە ها پلە کەمترە.

پوختە و گیانی فەلسەفەی سپینۆزا لەوەدایە کە دەڵێت لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا ئەرکی مرۆڤی لەوە گرنگترە کە لە قۆناخی یەکەمدا بەرچاو دەکەوێت. ژیانی ئێمە لەسەر زەوی یەکێکە لەدوا قۆناخەکانی فێرکاری و پەروەردەمان. هەر یەکەمان، لە شا بێت یان سواڵکەر، لە پۆلی ژیانی هەتا هەتاییدا، قوتابیانی هاوئاست و هاوڕێزین و بە گوێرەی ئاشتی ئەو توانایەی کە لە فێربووندا دەخەینە روو، ئەگەری ئەوە هەیە لە هەر ساتێکدا لە پلەی جیاوازدا جێی خۆمان بکەینەوە. بەلاّم بەپێی ئەو نەخشەیەی کە رێکخراوە هەموومان بەرەو پۆل یان کلاسێکی بەرز و نایاب بەرێوەینە کەواتە چەند خۆشترە کە لە قوتابخانەی جیهاندا، هاوپۆلی هاوڕێ و دڵۆڤانی یەکتر بین. پەیرەوی لەو کەسانە بکەین کە لە پێش ئێمەدان دەستی یارمەتی بۆ ئەوانە درێژ بکەین کە دواکەوتوون.

سپینۆزا دەڵێت: لە بوونی هەمووماندا بە شێوەیەکی غەریزی و ئاگایانە جۆرە ئەڤینێکی خوایی هەیە. بە واتایەکی تر بە ئاگاییەوە هەست بە خۆشەویستییەکی برایانە دەکەین بەرامبەر بە جۆرەکەی خۆمان کە لەڕاستیدا بنچینەی فێربوون و پەروەردە بوونی ئێمەیە لە قوتابخانەی هەتاهەتاییدا. لە بوونە باشترەکەی ئێمە، لە بەشە خواوەندییەکەی ئێمە "ئەڤینێکی بێ کۆتایی" حەشاردراوە و ئەو کەسەی کە بە وردی و روونی پەی بە بەشە خواوەندییەکەی بوونی خۆی دەبات خۆی لەو "ئەڤینە بێکۆتاییە"دا بە ئابلووقەدراوی دەبینێت کە لە خودی خواوە سەرچاوە دەگرێت.

ئەم بەشە خوداییەی بوونی ئێمە (هەرکاتێك گوێ بە فەرمانی بدەین) بەرەو ئامانجی ژیان کە بەختیاری و خۆشبەختی مرۆڤانەیە، رێنماییمان دەکات.

"بە ختەوەریی مرۆڤ لەوەدایە کە هێزەکەی، واتا تامەزرۆییەکەی بۆ ژیان، لە زیاد بووندا بێت" و ئەم زیادبوونەی هێز بۆ ژیان، بۆ کار و چالاکییە ئافرێنەرەکان تەنیا لە "ئەڤین بەرامبەر خود" پەیدا دەبێت.





له فه‌لسه‌فه‌ی سپینۆزادا "خۆشه‌ویستی به‌رامبه‌ر خود" به‌ واتای ئه‌و خۆپه‌رستییه‌ سنووردار‌ه‌ی خه‌ڵکی خۆهه‌ڵکێش و پیلانگێڕ و شه‌ڕخواز نییه‌. به‌ڵکو جۆره‌ خۆویستنێکی هۆشیارانه‌ و ئازادی که‌سانی نه‌ژاددۆست و خێرخواز و ئه‌ڤیندارانی مرۆڤایه‌تییه‌. چونکه‌ ئه‌ندامانی ره‌گه‌زی مرۆڤ له‌ڕاستیدا به‌شه‌کانی یه‌ك ژیانن. کاتێك ئازاری که‌سێك ده‌ده‌ی له‌ڕاستیدا ئازاری جه‌سته‌ و گیانی خۆت، ئه‌و "به‌شه‌ خواییه‌"ی بوونی خۆت داوه‌. هه‌ر ده‌ستدرێژییێك، ده‌ستدرێژییه‌کی تری به‌دواوه‌یه‌ کاتێك که‌ مرۆڤ گه‌یشته‌ پله‌ی کاملبوونی ژیری، پشت له‌ رق و کینه‌خوازی ده‌کات و له‌ ڕێگه‌ی لێبورده‌ییه‌وه‌ به‌ پله‌ی ئه‌ڤین ده‌گا.

هه‌ر ئه‌و دلێرییه‌ سپینۆزای هاندا تا سامانی خۆی ببه‌خشێته‌ خوشکه‌که‌ی؛ "ئه‌و که‌سه‌ی که‌ به‌دوای ئه‌وه‌وه‌ بێت که‌ تۆڵه‌ی ئه‌و زیانانه‌ی پێگه‌یێنراون به‌ هه‌مان ڕێگا بسێنێته‌وه‌، یه‌کبینه‌ خه‌مگینه‌." چونکه‌ چوارچێوه‌یه‌کی ئابلوقه‌دراو به‌ دڵپیسی (گومان خراپی) و تۆڵه‌ و شه‌ڕ و جه‌نگ ژیانی ده‌گرێته‌ ناو خۆی. سپینۆزا ته‌نیا یه‌ك جۆره‌ جه‌نگ، هه‌رده‌م و له‌ هه‌موو شوێنێك، به‌ڕاست ده‌زانێت ئه‌ویش ئاماده‌کاریی گشتی بۆ دابینکردنی ئاشتییه‌، "گه‌وره‌ترین سه‌رکه‌وتن به‌ هۆی هێزی زۆردارییه‌وه‌ نایێنه‌ دی، به‌ڵکو به‌هۆی له‌ خۆبردوویی و گه‌وره‌یی و شه‌ریفی یان ره‌سه‌نایه‌تی گیان، به‌ده‌ستدێن،"

کێیه‌ ئه‌و که‌سه‌ی که‌ رای ئه‌م فه‌لسه‌فه‌ به‌ چه‌وت بزانێت؟ به‌تایبه‌تی که‌ پێشنیاری سپینۆزا تا ئێستا نه‌که‌وتوته‌ قۆناخی پراکییزه‌ کردن. ئه‌و به‌کار بردنی شێوازی چه‌وت بۆ نه‌هێشتنی کێشمه‌کێشه‌کان به‌ کارێکی دزێو ده‌زانێت و ده‌ڵێت: کرده‌وه‌ی ته‌عه‌داکارانه‌ ئه‌نجامه‌که‌ی به‌رخۆدانه‌ و به‌رخۆدانیش ته‌عه‌دایه‌کی زۆرتری ده‌وێت. سپینۆزا رق و کینه‌ و دوژمنایه‌تی، ئێره‌ی، سته‌مکاری، شه‌ڕخوازی و خراپه‌خوازی به‌ ئه‌نجامی نیقاشه‌ هه‌نوکه‌ییه‌کان بین، هه‌رکاتێك بتوانین دونیا به‌ چاوی هاوره‌گه‌زه‌کانی خۆمان ببینین، خوێنڕێژی و کوشتار چه‌نده‌ که‌م ده‌بێته‌وه‌. به‌ هۆی بێمه‌راقی ئێمه‌ به‌رامبه‌ر به‌م حه‌قیقه‌ته‌ "چه‌نده‌ زۆرن ئه‌و بیروباوه‌ڕ و رایانه‌ی ئێمه‌ که‌ خه‌وشدار و په‌شۆکاو ده‌بن." ئێمه‌ ده‌بێت چاو ئه‌ندازی جوان دابینبکه‌ین و ده‌بێت بتوانین به‌و چاوه‌ سه‌یری ئه‌وانی‌تر بکه‌ین که‌ خۆمان پێی ده‌بینین. ده‌بێت خۆمان وه‌کو ئه‌و کۆترانه‌ دابنێین که‌ به‌کۆمه‌ڵ به‌ره‌و ئه‌به‌دیه‌ت له‌ شه‌قه‌ی باڵ ده‌ده‌ن. ئه‌م به‌ره‌و ئه‌به‌دیه‌ت فڕینه‌ نه‌ته‌نیا له‌ روانگه‌ی ئه‌وانی تره‌وه‌، به‌ڵکو بۆ خۆشیان شادیهێنه‌ر و خۆشحاڵکه‌ره‌ کاتێك





به‌ لوتکه‌ی چیا گه‌یشتیٚ ده‌ستی هاوکاری بۆ ئه‌وانی‌تر درێژ بکه‌ و ڕێنماییکه‌ریان به‌ تا ئه‌وانیش بتوانن خۆیان بگه‌یێننه‌ ئه‌و شوێنه‌ی که‌ لێیی.

کاتێك به‌ هێز و ده‌سه‌ڵاتی خۆت شادومان به‌، که‌ به‌شێکت لێی به‌ یاسا به‌خشیبێت.

سپینۆزا ئه‌و تاسه‌ و زه‌وقه‌ی به‌شدارکردنی ئه‌وانی‌تری له‌ شادی خۆدا، به‌ "توانای پیاوی ژێر" ناو بردووه‌. به‌ پێچه‌وانه‌وه‌ نه‌زان ته‌نیا به‌ هۆی هێزی شه‌هوه‌ته‌وه‌ بۆ پێشه‌وه‌ پاڵی پێوه‌ ده‌نرێت. به‌ واتایه‌کی تر، مرۆڤی ژیری راسته‌قینه‌ که‌سێکی کۆمه‌ڵایه‌تییه‌ که‌ شانی داوه‌ته‌ به‌ر خزمه‌ت کردنی هاو جۆره‌کانی خۆی و ده‌زانێت که‌ هه‌موو ئاده‌میزاده‌کان منداڵانی قوتابخانه‌ی ئه‌به‌دیه‌تن. ئه‌و سوود له‌و ئازادییه‌ ده‌بینێت که‌ به‌ نرخه‌ـ ئازاد بوون له‌ نه‌فره‌ت ودوژمنایه‌تی.

"هه‌رکاتێك تۆوی نه‌فره‌ت و دوژمنی له‌ روحمدا بچێنی گه‌وره‌ترین دوژمنایه‌تیت ده‌رحه‌ق به‌ من کردووه‌." رزگار بوون له‌ ترس؛ "کاتێك هه‌ردووکمان ئازادین بۆ ده‌بێت یه‌کتر به‌ زه‌لیل دابنێین و سووك له‌ قه‌ڵمبده‌ین؟" رزگار بوون له‌ نه‌زانی، کوێرفامی و ده‌مارگیریی وشك و دوودڵی؛ "حیکمه‌ت پشو درێژی و به‌رگه‌گری له‌گه‌ڵ خۆیدا دێنێت که‌ خۆی هۆکاری زیادبوونی حیکمه‌تن."

به‌ پێیی ئه‌م وه‌سفه‌، ئازادیی ته‌واو (کامل) هاو واتای ئه‌قڵی ته‌واوه‌ و که‌سی ژیر "هیچ شتێك بۆ خۆی ناخوازێت مه‌گه‌ر ئه‌وه‌ی بۆ ته‌واوی ئاده‌میزاده‌کان ئاره‌زوو بکات." ئه‌مه‌یه‌ به‌کورتی ئه‌و نوسخه‌یه‌ی که‌ سپینۆزا بۆ دابینکردنی "ئاسووده‌یی راسته‌قینه‌ی گیان" ده‌منداتیٚ.

ـ ٤ ـ

سپینۆزا خۆی یه‌کێکه‌ له‌و پیاوه‌ که‌مانه‌ی مێژوو، که‌ له‌م ئاسووده‌ییه‌ ده‌روونییه‌ به‌هره‌مه‌ند بوو. له‌شی له‌ تاو کۆخه‌وه‌ به‌ ئێش و ئازار بوو، دولاٚبه‌ بچووکه‌که‌ی له‌ خواردن به‌تاڵ و جله‌کانی شڕبوون، "شتێکی ئاسایی نابێت به‌رگێکی گرانبه‌های هه‌بێت." له‌گه‌ڵ ئه‌مانه‌شدا، به‌ هێز و تواناوه‌ به‌ شوێن مه‌به‌سته‌که‌یدا ده‌ڕۆیشت و کاره‌که‌ی به‌ره‌وپێش ده‌برد.

جارێکیان ته‌قریبه‌ن گه‌یشته‌ سه‌ر لێواری مه‌رگ. به‌سه‌رهاته‌که‌ی هه‌م پێکه‌نیناوی و هه‌میش داخبزوێنه‌. رۆژێکیان سپینۆزا چوو بۆ بنکه‌ی سه‌رکردایه‌تیی پرینس کۆندیٚ (Conde Prince) که‌ له‌و رۆژگاره‌دا هێرشی کردبووه‌ سه‌ر هۆڵه‌ندا و سه‌ردانی ناوبراوی

کرد. کاتێك لە لای گەڕایەوە خەڵك بەردیان تێگرت و بە توڕەییەوە هاواریان کرد: "لە دین هەڵگەڕاو، خوانەناس، خایین" سپینۆزا بە دژوارییەکی زۆرەوە توانی قەناعەت بە خەڵك بێنێت کە ئەو تووشی هیچ گوناهێك نەبووە و تەنیا بە مەبەستی گوت و بێژکردن لە بارەی چەند بابەتێکی فەلسەفی سەردانی (کوندێ)ی کردووە. سپینۆزا هەم دوژمنکارییەکانی خەڵك لە بابەت ئەو پێویستییە دەروونیانەی کە بەیەکتر هەیانە، بە ناچز و بێبایەخ دەبینێ و هەمیش لە بەرامبەر ئازادیی ڕۆحی (دەروونی) هێندە بایەخی بە باشترکردنی باری جەستەیی خۆی نەدەدا. بە لایەنی کەمەوە دوو پێشنیاریی رووپامایی کە دەرگاکانی پێشکەوتن و بەرەو پێش چوونی لە بەردەمدا دەکردەوە، رەتکردنەوە. یەکێك لەو دووانە پێشنیاری (لەیی چواردە هەم) ی پاشای فەرەنسا بوو کە گوتی ئەگەر سپینۆزا پەرتووکەکەی تری بخاتە سەر ناوی ئەو. ئەوا مووچەیەکی گونجاو بۆی دیاریدەکات، بەلاّم سپینۆزا بە ئەدبەوە پێشنیارەکەی رەفز کردەوە.

ئەویتریان داواکاری یەکێك لە فەرمانڕەواکانی ئەڵمانیا بوو کە مامۆستایەتیی فەلسەفەی زانکۆی (هایدلبێرك)ی خستە ئەستۆ، تەنیا بەو مەرجەی کە سپینۆزا خۆی لە رەخنەگرتن لە ئایینی فەرمی وڵاتەکەی بپارێزێت. ئەم جارەشیان سپینۆزا وەلاّمی نێگەتیڤی دا "پیاوی ئازاد، گەورەی خۆیەتی و کویلایەتی کەس ناکات." ئەو بڕیاری وابوو لەگەڵ هەژاری و ئازادی و بیرۆکەکانی خۆیدا هەر بەو شێوەیە بە تەنیا ژیان بەسەر بەرێت.

بەم شێوەیە سپینۆزا لە ژووری بن بنمچی جەمەڵۆن ژیانی بەسەر دەبرد و هاوێنەکانی خاوێن دەکردەوە و بیروخەیاڵی خۆی لە ناو نهێنی و هێماکانی کائیناتدا بە گەشت و سەیرانەوە خەریکدەکرد و لەم بارەدا بوو کە دوانیوەڕۆی رۆژێکی ساماڵ و ئارامی مانگی شوباتی ساڵی ١٦٧٧ ماڵئاوایی لە دونیاکرد. ئەو لەو کاتەدا تەمەنی تەنیا چل و چوار ساڵ بوو.

خاوەنی خانووەکەی لە کلێسا بوو و تاکە کەسێك کە لە ژوور سەرینی ئامادە بوو دکتۆر مایری پزیشك و دۆستی بوو. سپینۆزا لە باوەشی ئەودا گیانی سپارد.

- ٥ -



دونیا لە دوای مەرگی، پەی بە گەورەیی ڕۆحی برد. ئێستا، لە بەرامبەر ئەو خانووەی کە ئەو تێیدا دەژیا، وێنەی فەیلەسووفەکە لە سەر بەرد کێشراوە بەو چاوانەی کە لە ناکوتا مۆر بوونەتەوە و بە دەستێك کە خەریکی نووسینی حەقیقەتێکی ئەزەلییە، چونکە بە پێی قسەی مێژوونووسی فەرەنسایی *رێنان "وێنای ئەو بۆ خوا رەنگە راستەقینە ترین وێنایەك بێت کە لە زەینێکدا جێی خۆی کردۆتەوە"

*Frnest Renan (١٨٢٣ ـ ١٨٩٢) مێژوونووس و نووسەری فەرەنسایی





# رۆسۆ، باوکی شۆڕشی فەرەنسا

**(١٧٢١ ـ ١٧٧٨)**

ژیانێکی نائارام و بارگاوی بە هەژاری، تاوان، نەفرەت، دەرۆزە، سپڵەیی (ناشوکری)، دلۆڤانی، گومان خراپی، گەمژایەتی و بالآیی (فەزڵ) و زانست بەسەرهاتی رۆسۆ * پێکدێنن. فەلسەفەکەی سیستمێکی فیکری نییە بەڵکو داستانێکی هەستەوەریانەیە. دیڤید ** هیومی فەیلەسووفی ئینگلیزی نووسیویەتی: "رۆسۆ لە هەموو ژیانیدا تەنیا هەستیکردووە." کەسانێکی دەگمەن لە مێژوودا تا ئەو رادەیە هەستیاری خۆیان بەرامبەر بە گورزەکانی چارەنووس و بێعەدالەتەکانی جیهان پیشانداوە. هیوم لە درێژەی رادەربڕینەکەیدا بەم شێوەیە دێتە قسە:

"رۆسۆ مرۆڤێکە کە نەك تەنیا لەڕووی روخسارەوە لە بەردەم گوڕانکاریدایە بەڵکو هەندێك جار بە یەکجاری چییەتی (ماهیەت)ی خۆی دەگوڕێت و لەم بارەدە لە بەرامبەر هۆکارە دژوار و پڕ دەنگە دەنگەکان بە شەڕ و جەنگ هەڵدەستێت." ئێستا ئەو داستانە پڕ جۆشەی فەیلەسووفی ئێجگار هەستیار لە نزیکەوە دەخوێنێتەوە کە لەدژی دوژمنایەتیی دەست درێژکارانەی سەردەمی خۆی هۆنیوەتەوە.

---

* Jean Jacques Roausseau

** David Hume (١٧١١ – ١٧٧٦)





رۆسۆ لە ساڵی ١٧١٢ لە خێزانێکی هەژار چاوی بە دونیا هەڵێنا و لە تەمەنی منداڵیدا دایکی لە دەستدا.

باوکی کە وەستای سەعات و مامۆستای سەما بوو بە نانی وشك گەورەی کرد و لە لایەنی ئەخلاقییەوە، کەسێکی بەرەڵلا و کالونیستێکی بە گوڕی لێ دەرخست.

رۆسۆ لە تەمەنی دوانزە ساڵیدا قوتابخانەی بەجێ هێشت. لە شانزە ساڵیدا لە زێدی خۆی (جنێڤ) هەڵهات و بۆ دەستکەوتنی بژێوی لە شارێکەوە بۆ شارێکیتر دەچوو تاکو دواجار لە یەکێك لە دێرەکانی شاری تورین (Turin) وە ژوورکەوت. لێرەدا قەشەیەکی ناسی و داوای لێکرد کە بیخاتە سەر رێبازە ئایینە کەی کاتۆلیك. بە شێوەیەك کە دواتر خۆی دانی بەوداناوە کە زیاتر لەبەرئەوە هاتۆتە سەر کاتولیك تا سکی خۆی تێربکات. نەك ئەوەی گیانی خۆی قایلبکات "ناتوانم ئەوە لە خۆم بشارمەوە کە ئەو کردەوە پیرۆزانەی لە رێوڕەسمی گۆڕینی ریبازی ئایینیدا بەجێم دەهێنا لەڕاستیدا لەڕووی ریاکاری و فریوکاریەوە بوو."

چەند ساڵێك دواتر چووە سەر رێبازی پرۆتستان و پاشان بە یەکجاری خۆی لە کلێسا کێشاوە تا لە خەڵوەتدا "لەگەڵ ویژدان و خوای خۆی"دا تەمەن بەسەر بەرێت.

بەلاَم تا ئەو کاتە تووشی گوناه و خراپەکاری بەرچاو ببوو کە هەستیدەکرد دەبێت بۆ خەڵکی جیهان بیانگێڕێتەوە. پەرتووکی "دانپیانانەکان"ی کە شاکارێکە لە بواری نووسینی بایوگرافیدا، خۆی بەڵگەیەکی زۆر پێوەنان و پووچبێژییە. ئەو دەیویست، گیانی خۆی بەرووتی بێ هیچ ئارایشتێك بخاتە بەر تەماشای خەڵکی جیهان و ئەگەر زیادە بێژی و قسە بێسوودەکانی بخەینە لایەکەوە ئەوا دانپیانانەکانی پیاوێکمان پێ دەناسێنن کە "لە هەرجۆرە داوێنپاکی و بالآییەکی ئاسایی بێبەریبوو بەلاَم بلیمەتییەکی سەرووئاسایی هەبوو."

کاتێك رۆسۆ دێرەکەی لە شاری تۆرین بەجێ هێشت لە خزمەتی خانمێك بە ناوی مادام دو ڤێرسێلی (Madame de Vercellis) خۆی بە خزمەتکردنەوە خەریککرد. ئەم ئافرەتە چەند مانگێك دواتر کۆچی دوایی کرد و رۆسۆ بە تۆمەتی دزینی پارچە گەوهەرێکی دەستگیر کرا. رۆسۆ بە پۆلیسی راگەیاند کە ئەو گەوهەرەی لە کچێك وەرگرتووە کە دڵدارەکەی بووە. کچەکە





بە پشتگیری شایەتییەکەی ئەو مەحکووم بوو و سزا درا و رۆسۆ بە بێ سزادان ئازادبوو. دواتر لە پەرتووکی دانپیانانەکاندا، بەرامبەر ئەو شایەتییە درۆیەی کە داویەتی بەوە پاکانەی خۆی دەکات کە ئەو کیژەی وەکو هۆیەك بۆ هەڵهاتنی خۆی بەکارهێناوە و ئەم کارە بۆیە بە راست و رێ پێدراو زانیوە چونکە کچەکەی بە ئەڤینداری خۆی داناوە. لە بنەما ناڕوونەکانی رۆسۆدا، ئەڤین تەنانەت هەموو تاوانەکان دژ بە دڵداریش بە رەوا دەبینێت.

هێشتا دڵی لە خۆشەویستی ئەو دیلە دانەبڕیبوو کاتێك خۆی گیرۆدەی ئەڤینی خاتوونێکی دەوڵەمەند بوو بەناوی مادام دی وارین (Madam de Warens). نۆ ساڵی تەواو ئەڤینی ئەو خاتوونەی لە دڵدا بوو کە لە بڕی "دایك و دڵدار" بوو و هەرچەندە پیاوێکی تریش لەم ئەڤین و دڵبەندییەدا بەشدار بوو، ئەوبایەخی بەم مەسەلەیە نەدەدا. تاکو رکابەرەکەی مرد و روسو کەیفخۆش بوو کە "جلەکانی رکابەر و نەوازشتەکانی خاتوون" گشتیان بۆ ئەو ماونەتەوە. هەرکە حەسانەوە و کاتێکی بۆشی لە ناو ئەم جۆرە بەسەرهاتانەدا دەستدەکەوت بە تەنیا یان بە هاوڕێیەتی کەسانێکی چارەڕش و دەربەدەری وەك خۆی دەستی بە وێڵگەڕی دەکرد. هەندێك جار دزیی لە هاورێکانی خۆی دەکرد. لە کاتی یەکێك لە وێڵگەڕییە فیتنەئامێزەکانی خۆیدا بەرێکەوت لەگەڵ باڵیۆزی خۆشگوزەرانی فەرەنسا لە وێنیز ئاشنا بوو و باڵیۆزەکە بۆ پۆستی، سکرتێریەتی خۆی هەڵیبژارد.

کارەکەی مایەی رەزامەندی بوو بەڵام لە بڕی مووچە مستێك تەکلیفی وەردەگرت. رۆسۆ لەلای دەوڵەتی فەرەنسا سکالای کرد، هەرچەندە هەموویان ئەویان بە حەق زانی بەڵام کەس هیچی بۆ نەکرد.

ئەم بایەخ نەدانەی خاوەن پلە و پایەکانی فەرەنسایی بوو بە دەستێکی وەرچەرخانێك لە ژیانی رۆسۆدا و لەو بەروارەوە دەربەدەری و سەرگەردانییەکانی کۆتاییان پێ هات، لەوە بەدوا بۆ ژیانی خۆی ئامانج و مەبەستێکی دۆزییەوە و بیانوویەکی بۆ خەباتکردن بەدەستهێنا کە بریتی بوو لە رووخاندنی حکومەتی فەرەنسا و بەڵکو کۆتایی هێنان بە هەموو ئەو حکومەتانەی کە دژ بە رەزامەندیی خەڵك هاتوونەتە سەرکار.

رۆسۆ لە شوێنێك نیشتەجێ بوو و ژیانێکی ئارامی گرتە بەر، بەڵام ژیانەکەی ئابڕودار نەبوو. چونکە بایەخی بە پابەندییە یاساییەکانی ژنهێنان نەدەدا و بەبێ خۆ تێهەڵقورتاندنی قەشە



"خێزان"ێکی پێکهێنا. هاوسەری ژیانی خاتوو تێرێز لی ڤاسۆر (Therese le vasseur) بوو کە لە ماڵەکەی لە پاریس بە خزمەتکارییەوە سەرقاڵ بوو. چەندین ساڵ ژیانی لەگەڵ بردە سەر و سەرەرای ئەوەی کە جار نا جارێ دەربەدەر دەبوو لێی بوو بە خاوەنی پێنج منداڵ. بەڵام هیچ کامەیانی لای خۆی نەهێشتەوە، بەڵکو یەکسەر دوای لەدایکبوون هەموویانی بە دایەنگای منداڵانی سەر رێگا بەجێ هێڵراو سپارد. کەس نازانێت کە رۆسۆ چ شتێکی لە "تێرێز" بینی بوو کە بەم چەشنە بوو بە شەیدایی- تێرێز ژنێکی شلەختە و نەزان و ناشیرین بوو و رۆسۆ بە خورتی توانی فێری ئەوە بکات کە ناوی خۆی بنووسێت. بەڵام هەرگیز نەیتوانی فێری خوێندنەوەی بکات، تێرێز تەنانەت نەیتوانی ناوی مانگەکانیش لە هزری خۆیدا بچەسپێنێت یان حسابی خەرجە سادەکانی رۆژانە لای خۆی بپارێزێت. هەر ئەمەندەش نەبوو. سەرەرای بێهەستی و بێمەراقی دەروونی، تێرێز ئیشتیایەکی ماددی زۆری هەبوو و عیشقێکی لەرادەبەدەری بەرامبەر بە منداڵانی گەورە پیاوان پیشاندەدا و دەیگوت "خۆشیانم دەوێن چونکە لە من دەچن." رەنگە رۆسۆ بەهۆی ئەوەوە دڵی پێوە بەند بووبێت کە بە نموونەی هەمان ئەو "دڕندە سادە"یەی دەبینی کە ئایدیالی فەلسەفەکەی بوو. رۆسۆ سەرەتاییێتیی لە ئاکاری مرۆڤدا دەپەژراند و دەیگوت لە بەر ئەوەی کە دڕندەکان توانای بیرکردنەوەیان نییە بۆیە لە بەدوازیی بێ بەرینە. هۆی دڵبەندی و هەڵکردنی لەگەڵ تێرێز هەرچیەك بێت ئەوەی کە جێگەی بڕوایە ئەوەیە کە ئەو ئاسودەیی رۆسۆی تارادەیەك دابیندەکرد تا بتوانێت بیرۆکە فەلسەفییەکانی خۆی تەواو بکات و رێك و پێکییەکی پێببەخشێت.

- ٣ -

روسو تەمەنی نزیکەی چل ساڵ بوو کاتێك پێی خستە سەر رێگای بەسەرهاتی فەلسەفی خۆی. کۆلیژی دیژۆن (Dijon) پێشنیارێکی خستە روو لە بارەی ئەوەی کە ئایا زانست و هونەر دەبنە هۆی گەندەڵیی کۆمەلایەتی یان چاکسازییەکەی و خەلاتێکی بۆی دانا. رۆسۆ بەشداریی لەو پێشنیارەدا کرد و خەلاتەکەی بردەوە.

رۆسۆ لە نامەکەی خۆیدا لە پاڵ لۆمەکردنێکی زیرەکانەی چینی خوێندنەوار و هەڵاوێردە، رای خۆی وا دیاریکردووە کە شارستانیەت زیاتر هۆکاری هاتنەکایەوەی خراپەیە تا چاکە و گەلێك لە ستەمکارییەکان لەوەوە پەیدا بوونە کە ئێمە رێگەمان داوە هزرمان حوکم لە دڵمان بکات.





هەرچەندنێك زانیاری زیاتر لە بابەت جیهان دەستمان بکەوێت زیاتر بۆ دەست بەسەر داگردتنی تینوو دەبین و بەم چەشنە پلەپەرستیی چینە خوێندەوار و پەروەردە کراوەکان، بە دیلێتی و کۆیلایەتیی عەوامی نەخوێندەوار و نەزان کۆتایی پێدێت. رۆسۆ پێیوابوو کە زانست و تەقوا لەگەڵ یەکتر هەڵناکەن. هەر زانستێك بە هۆی ئامانج و مەبەستێکی زەلیلەوە هاتۆتە کایەوە. زانستی ئەستێرەناسی لە دیارکردنی بەختەوە سەری هەڵداوە کە ئامانجی بەکارهێنانی ئەستێرەکانە لە رێگەی ئامانجە تایبەتی و کەسیەکاندا قسەکردنی رەوان لە سیاسەتەوە پەیدا بووە و ئامانجی سیاسەتوانان ئەوەیە کە ئاغایەتی و فەرمانڕوایەتی ئەو خەڵکانە بکەن کە سیفەتی دەستدرێژکاریان کەمترە. ژمێریاری و ئەندازە زادەی چاوبرسێتی و چلێسی ئێمەیە لە دەست بە سەر داگرتنی ماڵ و ساماندا و هەروەها، تەنانەت هونەری چاپ مەعجونێکی خەوهێنەرە کە خاوەن تواناکان بۆ هێور کردنەوەی هەژاران و ئارام کردنەوەی شۆڕش و جۆشەکەیان، داهێناوە. "لە ناو فەیلەسووفەکاندا پەندێکی باو هەیە کە دەڵێت: خەڵکانی تێگەیشتوو و خوێندەواریی بخەنە هەرشوێنێکەوە، کەسانی دەستپاك و شەریف لەوێ بزردەبن."

بە گوێرەی ئەم وەسفە کەسێکی زانا "گیانەوەرێکی گەندەڵ"ە. کەواتە وەرن بەلایەنی کەمەوە تا ئەو کاتەی کە دڵەکان بە یەکجاری لە بەرامبەر مێشکەکاندا نشوستیان نەهێناوە خۆمان لە زیادەڕەوی کردن لە فێربوون و پەروەردەدا بپارێزین.

رۆسۆ ستایشی "کێویی رەسەن"ی سروشت دەکات. ئەو بوونەوەرەی کە پەروەردە نەکراوە لە پلەپەرستی و گەنەدەڵییەوە دوورە. بوونەوەرێکە کە لە چەواشەکاری و بە هەڵەدابردن بێ بەرییە و بە رێنماییکردنی هەستەکان ژیان بە سەر دەبات و لە بەندی کۆیلایەتی و ئەقڵدا نییە. "کەواتە واباشترە کە ئێمەش خۆمان لە قەید و بەندی ئەقڵ رزگاربکەین و دڵی خۆمان بدەینە دەست فەرمانی هەستەکانمان."

رۆسۆ کە بە توندی کەوتبووە ژێر کاریگەریی سەرکەوتنی گوتارەکەی خۆی لە دژی فێربوون و پەروەردە، دەستی بە ژیانێکی سادە کرد. سەعاتەکەی فرۆشت و رایگەیاند کە ئیتر پێویستیی بە زانینی کات نییە. ژیانی شارستانیی بەجێ هێشت و بۆ سروشت گەڕایەوە. بەلاّم زیاتر لە جیهانی هزردا نەك بە کردەوە. رایگەیاند کە خەڵك هەموویان لە روانگەی خوا و رۆسۆوە یەکسانن.



رۆسۆ بیردوزەکانی خۆی لە گوتارێکی تردا بە ناوی "گوتارێك لەبارەی نەبوونی یەکسانی" زیاتر گەشە پێدا. دەڵێت: "مرۆڤ لە باری سروشتیدا چاکە و تەنیا داب و نەریت و نیزامە کۆمەلاّیەتییەکانن کە خراپی دەکەن." و لەم نیزامە هەرە خراپانەش خاوەندارێتی تایبەتیانەی ماڵ و سامانە.

"یەکەمین کەسێك کە پارچە ئەردێکی خستە ناو حەسارەوە و رایگەیاند ئەمە مەولّکی منە و خەڵکیش بە هۆی ساویلکەییەوە بڕوایان کرد، یەکەمین دامەزرێنەری راستەقینەی حکوومەتیی ستەم و زۆرداریە."

روسو لەو بڕوایەدایە کە تاکە رێگەی رزگار بوون لەم "خراپ"ەیە، "وازهێنان لە شارستانیەت"ە چونکە خەڵك هەموویان لە باری سروشتیدا باشن. مرۆڤی کێوی بۆ بەختیاری جگە لە خۆراك پێویستی بە هیچیتر نییە و هەر کەسێکی تێر بوو و لەگەڵ دونیا و هاورەگەزە کیویەکانی خۆیدا لە ئاشتی و تەباییدا دەژیت.

رۆسۆ دانەیەك لەو گوتارەی بۆ ڤۆلتێر نارد. وەلاّمی ڤۆلتێر دڵی رەنجاند کە نووسی بووی: "لە وەرگرتنی ئەو پەرتووکە نوێیەی کە دژی نەژادی مرۆڤت نووسیوە سوپاست دەکەم. هیچ کاتێك ئەمەندە هۆش و زیرەکیی هزری بۆ بەگێل پیشاندانی ئێمە بەکار نە هاتووە. کاتێك مرۆڤ ئەم پەرتووکە دەخوێنێتەوە حەز دەکات بە چوار دەستوپێ بەرێدا بڕوات. بەلاّم لە بەر ئەوەی کە نزیکەی شەست ساڵێك دەبێت کە وازم لەم خووەم هێناوە، بەداخەوە لە توانامدا نییە دووبارە خوو پێوە بگرم!"

ئەم بابەتە بوو بە پێشەکیی زنجیرە گفت و گۆیەك لە نێوان هەردووکیان کە لە رەخنەگرە ئاوازتوندەکانی ئەو سەردەمە بوون. ڤۆلتێر روسوی بە "شێتێکی چارەڕەش" ناو برد و رۆسۆ ئەوی بە "زوڕنای لەناوبەری و خراپەکاری" ناوزەد کرد و نووسی: "مێشکێکی بیرمەند و گیانێکی گلاّو کە بانگەشەی ئەوە دەکات کە بڕوای بە خوا هەیە بەلاّم تەنیا شوێن کەوتووی شەیتانە."

رۆسۆ جارناجارێ بێدەنگ دەبێت بەلاّم خاڵێکی نوێ کە لە هزری بناغەکێڵی ڤۆلتێرەوە دەدەلاّ دیسان ئاسوودەییەکەی لێتێکدەدا هەتاکو دواجار رۆسۆ دەستی لە بەرەنگار بوونەوە هەڵگرت و بۆی نووسی: "من رقم لە تۆیە هەر وەك تۆش هەمان شتت دەوێت، زیاتر لەو ئەڤینەی کە





بەرامبەر بە نووسینەکانی تۆم هەیە، رقم لە تۆیە. ئەگەر جگە لە توانای هزری، شتێکی ترت پێ نییە کە شایەنی رێز بێت، گوناهی تۆیە نەك من."

ئەم کێشمەکێش و دەمەقاڵە تاڵە، بە هۆی رووداوێکی ناچیزەوە بوو کە لە نێوان دوو کەسدا کە ئەرکێکی ئێجگار گەورەیان هەبوو، هاتبووە ئاراوە. رۆسۆش وەکو ڤۆلتێر تامەزرووی ئەوە بوو کە خراپی و بەدکارییەکان کەوا لە سەردەمی ئەواندا بنکە و بناغەیەکیان دزیبوو، بە یەکجاری لە ناو ببات و دونیایەکی باشتر دروستبکات. کە نەژادێکی بەختیارتر تیایدا بژیت.

رۆسۆ هەندێك سەحنەی لە خەونە دڵگیرەکەی خۆی لە بەرهەمەکانی خۆیدا کە بریتین لە: رۆمان، نامەیەك لە بواری پەروەردە و فێرکاری، گوتارێك لەبارەی ئایین و چەند گوتارێك سەربارەت بە مێژوو، سیاسەت و ئاکار، روون کردووەتەوە.

ئەم. پەرتوکانە، بەتایبەت پەرتووکی (ئیمێڵ) کە دان پیانانەکانی پیاوێکی خاوەن بیرورِا و بڕوادارە و پەرتووکی "گرێبەستی کۆمەڵایەتی" لە هەڵگیرساندنی ئاگری شۆڕشی فەرەنسادا کاریگەرییەکی بەرچاویان هەبووە بۆ زنجیرە هزرێکی فەلسەفی بە درێژایی سەدەیەك، زەمینەیان دابین کرد و هێشتاش رنگدانەوەیان لە وێنا و بیردۆزەکانی ئایدیالیستەکانی هاوچەرخدا دەبینرێن کە هەوڵدەدەن رووناکی خوایی لە دڵی ئێمەی خاکیدا زیندوو بهێڵنەوە.

بەکورتی، دەکرێ فەلسەفەی رۆسۆ لە دوو رستەدا بەیانبکرێت: چاکەی خوا و یەکسانی ئادەمیزادەکان. رۆسۆ دەڵێت: خوا هەر هەمان چاکەو باشیی پەتییە“ "پرسیاری ئەوەم لێدەکەی کە چۆن بەو حەقیقەت گەیشتوم؟ دڵم شایەتی ئەوە دەدات." و روون دەکاتەوە کە بەڵگە ناخی یان دڵەکان لە بەڵگەکانی مێشك روونتر و دیارترن. لە یەکێك لە نامەکانیدا دەنووسێت: "ئاخ خاتوون، هەندێك جار لە خەڵوەتی ژووری کارەکەمدا، لە تاریکایی شەودا، لە کاتێکدا کە چاوە بەستراوەکانی خۆم بە هەردوو دەست دەگوشم، وا بە هزرمدا دێت کە خوا بوونی نییە بەڵام کاتێك بیر لە هەڵهاتنی خۆر دەکەمەوە کە ئەو هەور و مژە شەق دەکات کە جیهانی تەنیوەتەوە و پەرتەوازە دەکات و سروشت بە درەوشاوەیی و رووتی لە بەرامبەر چاومان رادەخات، لەو ساتەدا هەورە چڕەکانی گومان و دوو دڵی گیانم بەجێ دەهێڵن و بەرەولایەکی تر دەبنەوە و دووبارە بڕوا و خوای خۆم دەدۆزمەوە و بڕوا بە چاکە و بەخشندییەکەی پەیدا دەکەم. ستایشی دەکەم و نەبەردەمیدا بەدەم کڕنوشەوە دەکەومە سەر زەوی."





رۆسۆ بیروباوەڕ و بڕوای خۆی لە رێگەی "بەڵگە نانەوەی گومانـاویی فەلسەفی" بە دەستناهێنێت، بەڵکو ئەم حەقیقەتانە بە چاوی دڵ دەبینێت. بە بڕوای هەر ئەو تێروانینە توانای ئەوەمان پێدەبەخشێت تا بە وەئاگاهێنانەوەی ویژدانەکانمان بە ویست و ئیرادەی خوا رەفتار بکەین. بۆ ئەوەی ببین بە کەسێکی چاك پێویستیمان بە فێرکاری و پەروەردە نییە، "سوپاس بۆ خوا کە ئازادین و کوت و بەندی ئەقلمان لە (پێ)دا نییە. دەتوانین بەختیار بین بێ ئەوەی ببینە کەسانی شارستانی. بۆ تەمەنی خۆمان لە خوێندنی بنەما ئاکارییەکاندا بەفیڕۆ بدەین؟ بۆ ئەوەی لەناو کوێرە رێگەکانی پڕلە پێچاوپێچی بیری ئادەمیزاد دا بە شێوەیەکی ئاسان دەرباز ببین لەگەڵ رێنماییکەرێکی متمانە پێکراو ئاشنا بووینە." ئەم رێنماییکەرە متمانە پێکراوە غەریزەی ئێمەیە، فەلسەفەی دڵمانە.

رۆسۆ دەڵێت ئەگەر بەگوێی فەرمانی دڵمان بکەین گشتمان روو لە تاکە ئایینێك دەکەین، ئایینێك کە رزگاریەکی نەمر بۆ هەمووان دابیندەکات. ئایینێك کە خۆشەویستی سروشت، لەگەڵ یەك هەڵکردن و پێکەوە گونجانی گشتی و بەلاوەنانی بیروڕای چینایەتی و دوگمایی دەگرێتە خۆ و لە نێوان ئاشنا و بێگانەدا لێك حاڵی بوونێکی دۆستانە و یەکسان دێنێتە کایەوە. ئەو بانگەی کە لەم "ئایینە نوێیەی دڵ" لە ناو رابەرە کۆنە پارێزەکانی فەرەنسادا بڵاو بووە، وەکو بۆمبایەك تەقییەوە و دەربارییەکان و گەورەپیاوانی کلێسا هێرشیان کردە سەر روسو کە رایگەیاند بوو کەوا خواوەند بە یەك چاو سەیری هەموو بەندەکانی خۆی دەکات و هاوڕێبازەکانی بە حەقیقەت و رزگاری گەیشتوونە و لە خوا نزیك بوونەتەوە. رۆسۆ بە توندی دڵی بەو ئارەزووەوە بەند بوو کە خەڵکی جیهان لە ژێر یەك ئالآدا کۆ بکاتەوە و دڵیان بە تیشکی بڕوا رووناك بکاتەوە.

بیروڕا و بیردۆزە سیاسییەکانی رۆسۆ لە ئایینێکی نوێ پڕ دەنگە دەنگتر بوو. رۆسۆ دژایەتی هەرجۆرە بەکارهێنانێکی دەسەڵات و هێزی دەکرد جا چ لە لایەن تاکە کەسێکەوە بێت چ لە لایەن گرووپێکی خاوەن پلەکانەوە بێت و یانیش لە لایەن عەوامی خەڵکەوە بێت: "مرۆڤ بە ئازادی ئافرێنراوە" و دەبێت لەو مافەی کە لە دەستپێکی لەدایکبوونیەوە هەیبووە، هەردەم سوود وەربگرێت. هەندێك لە حکوومەتەکان، لاوازەکان لە پێناو بەرژەوەندی بەتواناکاندا دەکەنە قوربانی.

بەم شێوەیە ئازادی لە ڕێگەی دیلکردنی لەش و گیانی خەڵکەوە، دەکەوێتە ژێر گوشاری ستەم و زۆرداری. ڕێگە چارە، ڕێك خستنی گرێبەستێکی کۆمەڵایەتییە لە نێوان دەوڵەت و خەڵك و ڕێکەوتننامەیەکی هاوشێوەی ئەوەیە کە جۆن لۆك بانگەواز و بەرگریکەری بوو و گوزارشتی لەوە دەکرد کە خەڵك ڕێز لە یاسا ڕێك و ڕاستەکانی دەوڵەت بگرن و دەوڵەت پارێزگاری لە مافە مرۆڤییەکانیان بکات.

بە بڕوای ڕۆسۆ ئەم گرێبەستە کۆمەڵایەتییە ئایدیالییە، لە حکوومەتێکی دیموکراسیدا باشتر خۆی دەردەخات بەڵام ئەو کەش و هەوایە دیموکراسیەتەی کە تەواوی خەڵك تیایدا ڕای یەکسانیان هەبێت. حکوومەتێك کە لە سەر بناغەی ڕای خەڵك مکوم نەبێت حکوومەتێکی دیموکراسی نییە بەڵکو حکوومەتێکی ئەشرافیی هەڵبژێردراوە. لە دیموکراسیەتێکی ڕاستیەدا دەبێت خواستی خەڵك ڕاستەوخۆ و بە هۆی دەنگی یەك بە یەکیان، خۆی دەربخات نەك بە هۆی نوێنەرە دانراوەکان، "ئەگەر خەڵك زانیاریی تەواویان هەبێت، خۆیان بڕیار دەدەن... و بڕیاری بەکۆی زۆرینە هەمیشە خێر و چاکەی تێدایە." ڕۆسۆ خۆی ئەوە قبووڵ دەکات کە دیموکراسیەتێکی وەها پەتی و بێگەرد تەنیا دەتوانرێ لە وڵاتێکی بچووکدا پراکتیزە بکرێت چونکە دەنگدان بە شێوەیەکی ماشینی لە وڵاتێکی بەریندا لەوە ئێجگار کەم و کورتترە کە توانای ئەوە بە خەڵك ببەخشێت کە گشت کاربەدەستەکان هەڵبژێرن، یان چاودێرییەکی وردی جێبەجێ کردنی هەموو یاساکان بکات"

"هەرکاتێك نەتەوەیەك لە خواکان پێکبێت، حکومەتەکەیان دیموکراسیەکی پەتی دەبێت. حکوومەتێکی ئەوها تەواو و بێ کەم و کورتی بۆ ڕۆڵەکانی ئادومیزاد دابیننابێت."

بەڵام بەو سنووردارییانەی کە مرۆڤ هەیەتی، دروستکردنی حکوومەتێکی وا کە تاڕادەیەك بێ کەم و کورتی بێت کارێکی کردەییانەیە. بەر لە هەرشتێك دەبێت خەتێکی ڕاست و چەوت بە سەر (مافی خواییانە)ی دەسەلاتداراندا بهێنرێت. دووەم جار دەبێت مافە مرۆڤەکانی خەڵك دیاری بکرێن. سێیەم جار دەبێت بناغەکانی گرێبەستی کۆمەڵایەتی قایمبکەین واتا پێکهاتەیەکی یاسایی بێنینە کایەوە کە تیایدا ماف و ئەرکی هەموان بە گوێرەی گرێبەست دیاریبکرێت. ئەمە تەنیا حکوومەتێکە ئاغا و کۆیلەی تێدا نابێت.





- ٤ -

ئەم گرێبەستە کۆمەڵایەتییە هەروەك کە بێرتراند ڕاسل گوتوویەتی، بوو بە "پەرتووکی پیرۆزی زۆربەی ڕێبەرانی شۆڕشی فەرەنسا"و پێشەواکانی ئەو وڵاتەی هێندە توڕە کرد کە هەموویان بە دڵ و گیان بوون بە خوازیاری لەناوبردنی ڕۆسۆ. ڕۆسۆ هەڵهات و هەوڵیدا لە سویسرا پەناگەیەك بۆ خۆی بدۆزێتەوە بەڵام حکوومەتی سویسرا ڕووی قایل بوونی پیشاننەدا. پەرتووکەکانی ڕۆسۆیان لە شوێنە گشتییەکاندا ئاگر تێ بەردا و خۆدی خۆیشیان لەوێ دەرکردە دەرەوە.

ڕۆسۆ ماوەیەکی کورت کەوتە ژێر پارێزگاریی فریدێکی کە پیاوێکی ڕۆشنبیر بوو بەڵام گوندییەکانی ئەو سنوورە، هەر ئەو کەسانەی کە لە خەونە ڕۆمانتیکەکەی ڕۆسۆدا نازناوی "کێویە ڕەسەنەکان"یان وەرگرتبوو، بە نیازی کوشتنی کەوتنە خۆ. چونکە دەیانگوت ئەو "گیانی ئەوانی لە دژی ئایین ژەهراوی کردووە و ئێستاش بە تەمای ژەهراوی کردنی لەشیانە." ڕوسو بۆ ئینگلتەرا ڕایکرد و دڵی بە خۆشەویستی و جوامێری دەیڤید هیومەوە بەند بوو. بەڵام گیانی بە هۆی ئەو ڕەنجانەی کە تەحەمولی کردبوون لە پەل و پۆ کەوتبوو و شێتایەتییەکی توند توشی هاتبوو. تەنانەت گومانی خراپی بەرامبەر بە هیومیش پەیداکرد و وایدەزانی کە نیازی کوشتنی هەیە. لەو ساتانەدا کە هۆش و ئاگاییەکەی تەواو بوایا، خانەخوێ چاکەکارەکەی لە باوەش دەگرت و دەیگوت: "نە نە، هیوم ناپاك نییە." بەڵام سەرەنجام وەهمەکانی بەسەر ئەقڵیدا زاڵبوون و خۆی لە (گەلەکۆمە)ی یەکڕەنگترین هاوڕێی خۆی ڕزگار کرد و لەوێش هەڵهات. ڕێگەیان پێدا بۆ فەرەنسا بگەڕێتەوە چونکە بەو تێکچونە هزرییەی کە تووشی ببوو ئیتر وێنای ئەوە نەدەکرا کە مەترسییێك بۆ فەرەنسا بێنێتە ئاراوە.

پارێزوانانی شا ئەویان بە (مردووی بزۆك) دادەنا، بێ ئەوەی ئاگایان لەوە بێت کە هێشتا پەرتووکەکانی زیندوو بوون و گیانیان لەبەردابوو.

- ٥ -

ڕۆسۆ دوا ساڵەکانی تەمەنی بە نووسینی پەرتووکی (دانپیانانەکان) بە سەر برد- پەرتووکێك کە ڕەنگە نیوەی حەقیقەت و نیوەکەی تر خەیاڵی سواو بێت - لەو کاتەدا کە هەتاوی فیکرە لاوازەکەی ڕووی لە ون بوون بوو، سێبەری گوناهەکانی لە واقیع درێژتریان دەنواند تاکو

سەرەنجام هزری بە ناو تاریکییەکی پەتیدا رۆ چوو و ماوەیەکی کورت لە هەژاری و بێ ئاگاییدا ژیانی بە سەر برد و کاتێك ماڵئاوایی لە دونیاکرد ئەو گومانە هاتە ئاراوە کە رەنگە خۆی کوشتبێت.

بەداخەوە ناوی رۆسۆ زیاتر وەکو تاوانبارێك لە زەینی ئێمەدا جێی خۆی گرتووە تا فەیلەسووفێك. ناوی رۆسۆ وێردی سەر زمانی کەسانێکی جۆراوجۆرە.

دیکتاتۆرەکان بە بەرپرسیاری بلاوبوونەوەی بیرۆکە سوشیالیستییەکان دەزانن. سوشیالیستەکان بەوە سەرزەنشتی دەکەن کە بووە هۆی ئەوەی کە دیکتاتۆریەت بەهێز ببێت. دیندارە کۆنە پارێزەکان بە خوانەناس ناوی دەبەن و خوانەناسەکان بە دیندارێکی کۆنە پارێز دایدەنێن و بەهەرحاڵ ئەمە چارەنووسی هەموو ئەو بیرمەندانە بوو کە بیرۆکەی نوێیان بلاو کردووەتەوە کە لەگەڵ بیروباوەڕە کۆنەکان دژبەر بوو.

رەنگە بتوانین لە نێوان ئەم بیروڕا زیادەڕەوانە، هاوسەنگییێك بێنینە کایەوە و بڵێین هەرچەندە ئەو تووشی سەهوی گەورە بوو سەرەنجام چووە سەر شارێگای ئازادیی ئایینی و دادی کۆمەلایەتی.







# ڤۆلتێر و بەسەرهاتی پێکەنینەکەی

**(١٦٩٤ ـ ١٧٧٨)**

هاوچەرخەکانی ئەویان بە "فەیلەسووفی دەم بە پێکەنین" ناو دەبرد و ڤۆلتێر (Voltaire) ئاشکرای دەکرد: "پێدەکەنم تا خۆم لە خۆکوشتن لابدەم."

لەو رۆژگارەدا هۆیەکانی غەمباریی بۆ خەڵك زۆر بوون و زۆرداری، هەژاری، چەوتی، دەست درێژی، چاوبرسێتی و چلێسی، دەمارگیری، خۆشگوزەرانیی لە رادەبەدەر، خورافات و شەڕ و کێشمەکێش هەموو شوێنێکی تەنی بووە و شازادەکان شکو و گەوریی خۆیان بە نرخی ئەشکەنجەی پڕ لە ئازاری جوتیاران دابیندەکرد،. دیدێرۆ[*](Diderot) کە یەکێکە لە پەیامهێنەرانی رۆژگاری باشتر، وێنەیەکی زیندوومان لە بارەی تارمایی لویسی چواردەهەم، لەو بارەدا کە لویسی جوانییەکانی کۆشکی ڤێرسا بۆ تارمایی (هانری چوارەم)ی باپیری وەسف دەکات، لە بەرامبەر چاومان وێنە دەکێشێت: پاشای پیر و کەنەفت سەیرێکی کۆشکەکە دەکات و سەری دەلەقێنێت و دەڵێت: "راست دەکەی کورم، کۆشکێکی جوانە. بەڵام دەمەوێت سەیرێکی کوختەکانی جوتیارەکانی گونێس (Gonesse)یش بکەم."

"ئەگەر بیزانیبایە کە لەم وڵاتەدا، لە دەوروبەری ئەم کۆشکە بە هەیبەت و شکۆدارانە، جوتیاران لە ژێر ئاسماندا لەسەر کا دەخەون و بەخورتی خۆیان لە برسێتی رزگار دەکەن، چی دەگوت؟"

[*] زانای فەرەنسی (١٧١٣ ـ ١٧٨٤)





رەنجی راستەقینەی ڤۆلتێر لێرەوە پەیدا دەبێت کە وێنە لە هەردوو دیوەوە دەبینێت و لە نێوان خودی ئەم ئازار و ئەشکەنجەیەدایە کە لە قاقای پێکەنین دەدات. ئەو خۆی کردبوو بە (لێبۆك)ی نافەرمیی دەرباری فەرەنسا. چێستێر[*]تۆن قسەیەکی بەجێ دەکات کاتێك دەڵێت کە لێبوکەکان کەسانێکی ئێجگار جدینە کە توڕەیی خۆیان لەژێر پەردەیەك لە زەهرخەنە دەشارنەوە.

ـ ٢ ـ

پێکەنینی پڕدەنگە دەنگی ڤۆلتێر، گۆڕەپانی جیهانی لە خورافات، کونەپەرستی و لە مافە خواوەندییەکانی دەسەڵاتدارەکان پاککردەوە. ئەرکی رەخنەگری کە رۆسۆ لە ئەستۆی گرتبوو ئەو بە رەشبینی و بەدگومانی گەیاندە رادەی بەرکەماڵی. لویی شانزدەهەم بەرلەوەی سەری لەژێر (گ[*]یو تین)دا لە لەشی جیاببێتەوە، لە بارەی پەرتووکەکانی رۆسۆ و ڤۆلتێرەوە گوتی: "ئەو دوو پیاوە فەرەنسایان دایە دەست با." و مەبەستی ئەوە بوو کە حکوومەتی ئۆتۆکراتیان لە فەرنسا لەسەر کار لابرد. خەبات و تێکۆشانی ڤۆلتێر لە رێگەی ئازادی نەژادی مرۆڤدا، وەکو رۆسۆ، بە گرانی لەسەری راوەستا. لەم رێگەیەدا سووکایەتی راوەستێنران، تەندروستی خۆی لەدەستدا، چەند جارێك کەوتە بەر هێرش و ژیانی کەوتە مەترسی بەڵام ئەو هەموو ئەو ئەشکەنجە و مەترسیانەی بۆ پوختەکردنی جیهان بەنرخی گیانی خۆی کڕی. جۆرج[*] براندزی رەخنەگری دانیمارکی گوتوویەتی: "ئەو بە پێکە نینەکانی خۆی هەم برینەکانی خۆی سارێژ کرد و هەمیش زۆربەی گەمژایەتییەکانی سەردەمی خۆی دەرمانکرد."

با ئێستاش لە نزیکەوە سەردانی فرانسوا ماری ئەرویێ (Francois Marie Aroue) کە ناوە راستەقینەکەی ڤۆلتێرە، بکەین لە کۆشکی دوك دی سولی (Duc de Sully).

لێرەدا میوانداریێك بۆ رێزلێنان لە ڤۆلتێر رێکخراوە. ڤۆلتێر بەم دواییانە بەبۆنەی بلاۆکردنەوەی هۆنراوە یان مەنزومەیەکی داستانی لە بارەی ژیانی هێنری ناڤار ( Henry

[*] G. K. Chestertn (١٨٧٤ ـ ١٩٣٦) نووسەر و رۆژنامە نووسی ئینگلیزی

[*] گیوتین (Guillotine): دەزگایەکە بۆ بڕینی سەری مرۆڤ، لەساڵی ١٧٩٢ز لە فەرەنسا بەکار هات و.کوردی

[*] Gerege Brands (١٨٤٢ ـ ١٧٩٢) مێژوونووس و ئەدیبی دانیمارکی

Navarre) سەرکەوتنێکی گەورەی بەدەستهێناوە. هێشتا بەهۆی هێرشە دژوارەکانی نەخۆشی ئاوڵەوە، ناتوانێت بە تەواوەتی خۆی بە پێوە بگرێت، بەڵام موسی زمانی وەکو هەمیشە تیژ و بڕەر بوو.

زمانە بێباکەکەی خولێکی بەند کرانی بۆی لە زیندانی باستیل کڕیبوو، بەڵام ئێستا هەر ئەوکەسانەی کە خستبوویانە زیندانەوە لەناو میوانانی کۆشکدا ئامادە بوون و بە سەروورووییێك کە بێمەیلی و نابەدڵی پێیەوە دیار بوو، گوێیان بە قسە بریندارکەرەکانی دەدا کە دەیگوت: "کاری من ئەوەیە کە ئەوەی بیری لێدەکەمەوە بێنمە سەر زمان."، هەڵبەتە ئەم کارە لە سەردەمی فەرمانڕەوایەتی لویسی پانزدەهەمدا بازرگانییێکی ترسناك بوو. یەکێك لە کەسە نزیکەکانی سوڵتان بە ناوی شێڤالیە دی ڕۆهان (Chevalier de Rohan) نیازی وابوو سەربخاتە سەر ڤۆلتێر بەڵام ڤۆلتێر بواری نەدا و لەهەر بوارێکدا لە گۆڕەپان دەری پەڕاند. دواجار شێڤالییە لە جێی خۆی دەرپەڕی و بە توندوتیژییەوە پرسیاریکرد: "ئەم لاوە کێیە کە دەوێرێت ئاوا بە ئاوازێکی توندەوە لە گەڵمان بدوێت؟"

ڤۆلتێر بێ دواکەوتن وەڵامی دایەوە: "ئەو ئەوکەسەیە کە شانازی بە ناوی خۆیەوە دەکات و ناوی هیچ کەسێکی گەورە و پلەبەرزی بە دووخۆیەوە نەبەستووە.".

شێڤالیە ئەم دژوێنەی پێ قورس بوو و دانیشتنەکەی بەجێ هێشت تا یەخەی خۆی لە دەستی ڕاپسکێنێت.

بەڵام ئەمە تەنیا سەحنەی یەکەم بوو. چەند ڕۆژێك دواتر ڤۆلتێر دیسان لە هەمان کۆشکدا بوو کاتێك خزمەتکارێك ئاگاداری کردەوە کە کەسێك لە دەرەوەی کۆشك دەیەوێت قسەی لەگەڵ بکات. هەر کە ڤۆلتێر لە کۆشکەکە هاتە دەرەوە گرووپێك بەکرێ گیراوی ڕۆهان پەلاماریاندا. شێڤالییە کە بە خۆشحالییەوە سەیری ڕووداوەکەی دەکرد هاواریکرد: "باش دەردی پێبکەن تەنیا ئاگادار بن زەربە لە سەری نەدەن چونکە دەکرێ هێشتا شتی باشی لێببەدڵێت!"

ڤۆلتێر کە زمانی لاڵەپەتەی تێکەوت بوو بە نیوە گیانی و بە قاچی شەل توانی هەڵبێت و خۆی بگەیێنێتە ناو کۆشك و داوا لە دوك دی سولی و هاوڕێ (گەورە)کانی تری بکات کە لەگەڵی بچن بۆ فەرمانگەی پۆلیس بەڵام ئەوان تەنیابە پێکە نینێك وەڵامیان داوە. بۆچی هەوادارییێتی





شاعیرێك بکەن کە لە دەست پیاوێکی پلەبەرز لێدانی خواردووە؟ ڕۆژی دواتر ڤۆلتێر شێڤالیەی بۆ شەرێکی سنگ بەسنگ بانگکرد. بەڵام ڕۆهان ترسی لێنیشت و داوای هاوکاریی لە ئامۆزای خۆی کرد کە سەرۆك پۆلیس بوو. ڤۆلتێر دەزگیر کرا و جارێکیتر لە باستیل زیندانی کرا و دواتر ئازاد بوو و بۆ ئینگلتەرا دوور خرایەوە و ئەو خانەدانە فەرەنساییانە تەماشای ئەم سەحنەیان کرد و لە ناخەوە پێی پێکەنین.

لەم بەرەوارە بە دواوە، فەیلەسووفە لاوەکە بڕیاریدا بە چەکی خۆی شەڕیان لەگەڵدا بکات" "من پیشانیان دەدەم کە چ کەسێك دەتوانێت باشتر و بەرزتر پێبکەنێت!

ـ ٣ ـ

ڤۆلتێر لەکاتی دوورخستنەوەدا، تەمەنی سی و دوو ساڵ بوو و بۆ فێربوونی زمانی ئینگلیزی لە هەموو لایەنێکەوە ئامادە بوو. ئەو بە چاکی فێری ئەو زمانە بوو و بە زاراوەی پاریسی و ئارایشت و زەینە تویژەییەکانی زمانی فەرەنسیی ڕازاندەوە. دەڵێن ڕۆژێکیان کۆمەڵە خەڵکێك کە حەزیان لە ڕوخسارە بیانییەکەی ئەو نەدەکرد پەلاماریاندا. ڤۆلتێر بە ڕەحلەیەکدا هەڵگەڕا و دەستەکانی خۆی لە قۆڵی کراسەکەی دەرهێنا و گوتی: "هاوڕێ دلێرەکانم، لێتان دەپاڕێمەوە کە نەرمیم لەگەڵ بنوێنن ئایا هەر ئەو بێشانسیە بۆ من نییە کە لەم سەرزەمینەدا لەدایك نەبوومە و ئینگلیز نیمە؟" خەڵك هۆتافیان ڕاکێشا و ئەویان لە سەر شانی خۆیان بە سەرکەوتوویی بۆ ماڵەکەیی بردیان. ڤۆلتێر ئەڤینداری ئینگلتەرا بوو؛ "ئێرە وڵاتێکە کە خەڵکەکەی بە ئازادی و خەیاڵێکی ئاسوودەوە بیر دەکەنەوە و ترسی ئەوەیان نییە کە بکەونە بەر ئازار و ئەشکەنجە" ئەو بە زەوقێکی زۆرەوە بەرهەمەکانی پۆپ* و ئەدیسون** و کونگریڤ*** و سویفتی**** دەخوێندەوە؛ "لەم وڵاتەدا خەڵکێك دەژیت کە لە گوتنی ئەوەی کە حەزیان لێیە ناترسێت".

---

* Pope (١٦٨٨ ـ ١٧٤٤) شاعیر و فەیلەسووفی ئینگلیز.

** Addison (١٧١٩ ـ ١٧٧٢) شاعیر و نووسەری ئینگلیز.

*** Gongreve (١٦٧٠ـ ١٧٢٩) کۆمیدیانووسی ئینگلیز.

**** Swift (١٦٦٧ ـ ١٧٤٥) نوسەری ئێرلەندی.

ڤۆلتێر گرێبەستێکی خۆشەویستی لەگەڵ ئینگلتەرا بەست و وەکو شەیداییێکی بە شەوق و زەوق لە باوەشی گرت. ستایشی فەلسەفەی فرانسیس بێکۆنی دەکرد و چەوتییەکەی خودی ئەوەی لە بەرچاو نەدەگرت.

خۆشەویستییەکی توندی بەرامبەر بە کۆمەڵەی کوەیکەرەکانی ئینگلیزی هەبوو کە هەوڵیان دەدا نەتەوە کریستانەکان یەك بخەن بەلاّم راوە دوونان و دادگاییکردنیان لە لایەن حکوومەتی، لە بەرچاو نەدەگرت. لە هەڵسوکەوتی دۆستانەی ئینگلیزەکان بەرامبەر بەو بیانیانەی کە بۆ ئەو ولاّتە دەهاتن، خۆشحاڵ بوو بەلاّم لە بەرامبەر بینینی هەڵسوکەوتی دوژمنانەی ئەوان لەگەڵ ئامۆزاکانی خۆیان، لە ئەمەریکا، نابینابوو.

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، دەبێت بگوترێت ڤۆلتێر لەسەر حەق بوو و ئینگلیزەکان ئارەزوومەندی ئازادی بوون. ولاّتی ئینگلتەرا لەو بە بەراورد لەگەڵ فەرەنسا، ولاّتێکی ئازاد بوو و ئەنجوومەنێکی پێکهاتوو لە نوێنەرە هەڵبژێردراوەکانی خەڵکی هەبوو، لە کار و باری رامیاریدا نەرم ونیانی دەنواند. شەریفی و دەستپاکی باوی هەبوو و یاسای بێهێزەکانی لە بەرامبەر دەستدرێژیی بەهێزەکان دەپاراست.

ڤۆلتێر سەردانی سویفتی کرد و بە نووسەرێکی تەنزبێژ و بەگوێرەی دڵخوازی خۆی بینی. بەشداری لە رێورەسمی ناشتنی لاشەی نیوتندا کرد، ئەو رێزەی کە لەم زانا گەورەیە نرا کاریگەرییێکی گەورەی کردە سەر و نووسی: "... ماوەیەك لەمەو بەر کۆمەڵێك لە پیاوە هەڵبژێردراوەکان لە بابەت ئەو مەسەلە بێ واتایە قسەیان دەکرد کە لەنێوان سزار و ئەسکەندەر و تەیموری شەل و کرمول، کامەیان گەورەتر و پایە بەرزترە. کەسێك ئاشکرای کرد کە بێگومان ئیسحاق نیوتن لە هەمووان گەورەترە و راستیشی دەکرد چونکە ئیمە رێزێکی قووڵمان بەرامبەر بەم پیاوە هەیە کە گیانی ئێمەی بەهۆی هێزی حەقیقەتەوە داگیرکرد نەك بەرامبەر ئەوانەی کە بە خورتی و تەعداکاری خەڵکیان کردە کۆیلەی خۆیان."

ڤۆلتێر لە ستایش و چاکە بێژیی ئازادی و سەربەخۆیی لە ئینگلتەرا هەندێك بابەتی نووسی و لە پەرتووکی "نامە فەلسەفییەکان"دا بلاّوی کردەوە. ئەم یادداشتانە ئەو ئاورنگانە بوون کە ئاگری شۆڕشی فەرەنسایان گڕدا.



ڤۆلتێر دوای سێ ساڵ لە دوور خرانەوە گەڕایەوە نیشتمان و ماوەیەك بە نهێنی ژیا تا سەرەنجام نامەیەکی بۆ حکوومەت نووسی و داوایکرد رێگەی بدەن "تا درێژە بە کارەکەی بدات". ئەم مۆڵەتە تەنیا بە مەرجێك پێیدرا، ئەویش ئەوەی کە بەڵێن بدات هێرش نەکاتە سەر "نیزام و یاسا پەسندکراوەکان لە دونیادا". ئەو بەڵێنێکی ئەوهای دا و گەڕایەوە پاریس. بەلاّم زۆر زوو لە بیری چووە کە دەبێت دەمی خۆی دابخات.

- ٤ -

هەرچەندە ڤۆلتێر بە نەخۆشی لە دایك بوو و لە زۆربەی ماوەی تەمەنیدا نەخۆش و بێتوانا بوو، بەلاّم بە هۆی چالاکییە نائارامەکانیەوە جیهانی سەروبن کرد و لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکیتر، لە بیروڕاییێکەوە بۆ بیروڕاییێکیتر لە سەهوێکەوە بۆ یەکێکیتر گوێزرایەوە. بەرامبەر بە ژنە بەمێردەکان هەستی بە لاوازی دەکرد. بەلاّم دەبێ بگوترێت کە زیاتر پەیوەندییەکی دەروونی یان رۆحیی لەگەڵ ئەواندا هەبوو تا جەستەیی. لە سەردەمێکی وەهادا کە ئاشتی ئاکاریی گشتی بەتوندی دابەزیبوو بۆ ژنێك نائاسایی نەبوو کە مێردێك و دوو فاسقی هەبێت ـ مێرد بۆ دابینکردنی ئاسوودەیی ژیان، خراپکار (فاسق)ی یەکەم بۆ حەز و خۆشی دەروونی و چێژی مەعنەوی و هی دووهەم بۆ حەزی جەستەیی.

ڤۆلتێر تەمەنێکی زۆری نەبوو کاتێك گیرۆدەی "تکا ناخی یان دڵیەکان"ی خۆی بوو. لەکاتی گەڕانەوەی لە ئینگلتەرا ببوو بە ئوستازێکی تەواو و ئەڤینداریتی و مێبازییەکانی، بەتایبەت ئەو ئەڤینەی کە بەرامبەر بە ژنانی بەدناو پیشاندەدا، بەرەو لارێ و هەڵدێر بردی. یەکێك لەو رووداوانە دوای دووساڵ بەمانەوەی سەرلەنوێی لە پاریس روویدا.

ئەکتەرێکی شانۆ بە ناوی خاتوو ئادرینەلی کوڤرور (Adriennele Couvreur) کە بە توندی مایەی ستایشی ڤۆلتێر بوو، مرد. کلێسا سوور بوو لەسەر ئەوەی کە لاشەکەی ئەویش وەکو دەرکراوەکانی* تر، لە پارچە ئەردێکی ئاساییدا لە بەستێنی رووباری سێن بنێژرێت.

ڤۆلتێر لە هۆنراوە یان مەنزومەیەکدا بە توندی رەخنەی لەم کارە گرت بەلاّم بەر لەوەی دەستگیربکرێت، بۆ دێیەك لە نۆرماندی هەڵهات.

* مەبەست کەسی دەرکراوە لە بازنەی ئایین. و.کوردی





دوای ئەمە "نیشانەیەکی پووچێتی"تر لە تەوێلی درا. پەرتووکی "نامە فەلسەفیەکان" بە پێچەوانەی رەزامەندی ئەو لەلایەن بلاو کەرەوەیەکی چەوتەوە بلاو کرایەوە و زریانێکی دژوێنی لە دژی ئەو وروژاند. بەرپرسیارانی دادوەری فەرمانیاندا کە ئەم کتێبە کەوا "مایەی شوورەییە و هەم لە دژی ئایین و ئاکار هەمیش لە دژی دەسەلاتی جێبەجێ کردن بوو، لە ناو حەساری کۆشکدا، بەدەستی جەلادان" بسوتێنرێت. دوای ئەم پەرتووک سوتاندنە فەرمانێکی تر بۆ دوورخستنەوەی نووسەرەکەی دەرچوو.

ڤۆلتێر بە رەشبینییە ئاساییەکەی خۆی رووبەرووی ئەم فەرمانەش بووەوە و بە پێشنیاری خاتوو مارکیز دی شێتلی (Marquise de Chatelet) لەگەڵی هەڵهات و پەنای بۆ کۆشکەکەی برد لە سیری (Cirey). ئەم کۆشکە دەکەوتە سەر سنووری فەرەنسا نزیك شاری لۆرین (Lorraine) و ئەو هەرکاتێك بکەوتایە بەر راوەدوونانی جەندرمەکان بە ئاسانی دەیتوانی هەڵبێت. لێرەدا ڤۆلتێر بۆ ماوەی چواردە ساڵ لەگەڵ خانەخۆی و دلدارەکەیدا ژیاـ سەردەمێك کە لە مێژووی فیکریی فەرەنسادا ئێجگار درەوشاوە بووـ

مادام دی شێتلی هاوسەری پیاوێکی عەسکەری بوو و لەو کاتەدا کە ڤۆلتێر دەستی بەسەر ژن و کۆشکەکەیدا گرتبوو، ئەو لەگەڵ سەربازەکانیدا لە سەفەردا بوو و هیچ نارەزاییێکیشی لە بەرامبەر هاوسەرەکەی دەرنەبڕی. ژنەکەی، بۆ سەلیقەی پیاوێکی عەسکەری، فەیلەسووفێکی مەرجەعیانە بوو. ئەو ژنە کە خۆی فێری زمانی لاتین دەکرد و زانیاری درەوشاوەی لە بیرکاریدا هەبوو بەو جوانییە نائاساییەوە، بۆ ڤۆلتێر هاودەم و هاونشینێکی باش بوو. بەلام ئەم هاودەمیە بێجەنجاڵ و دەنگە دەنگیش نەبوو. لەو دژایەتیانەی کە لە نێوان ئەو دوو گیانە پڕ هەیەجانەدا روویاندەدا، هەندێك جار کار دەگەیشتە دژوێن و جنێودان. هەردووکیان نامزەدی وەرگرتنی ئەو خەلاتە بوون کە کۆلێژی زانستەکان لە بواری لێکۆڵینەوە لە سروشتی ئاگردا، پێشنیاریکردبوو و مارکیز لە بەردەم داخ و پەژارەی ڤۆلتێردا خەلاتەکەی بردەوە.

سەرەرای هەمموو ئەو کێشمانەکێش و ململانێیانەی کە لە نیوان هەردووکیاندا دەهاتە ئاراوە، تا ئەوپەری، ستایشی یەکتریان دەکرد. مارکیز ئەوی بە "گرانبەهاترین زەینەتی فەرەنسا" ناو دەبرد و ڤۆلتێر دەیگوت ئەو "پیاوێکی گەورەیە. تەنیا کەم و کورتییەکەی ئەوەیە کە ژنە!"



بەم شێوەیە ئەم دووانە لە هەمان کاتدا کە دژوێنیان بە یەکتر دەدا، ستایشی یەکتریشیان دەکرد و پێکەوە لە تاقیگەیەکی کیمیادا کاریاندەکرد کە لە سیری دروستیان کردبوو. ماڵی خۆیان کردبوو بە پەناگەی گیانە لاسارەکان و لەوێ شانۆی تایبەتی و میوانداری رازاوەیان بۆ خەڵکی بەرجستە و هەلبژاردە رێکدەخست و لە سەر بابەتەکانی ئەدەبیات و زانست و فەلسەفە و رامیاری و مۆسیقا و هونەر قسە و باسیاندەکرد. هەر لەو شارەدا بوو کە ڤۆلتێر توانی زنجیرە رومانێکی فەلسەفی بنووسێت کە هەریەکەیان گەوهەرێکی حیکمەت و زرنگی بوو و هاوڕێکانی لە چەندایەتی و چۆنایەتیی بەرهەمەکانی سەریان سوڕ دەما.

ڤۆلتێر نزیکەی نەوەد و نۆ پەرتووکی نووسی. ئەمە خۆی یەکێکە لە نهێنییەکانی جیهان کە پیاوێك بەو لاوازی و بێتواناییەوە چۆن توانی دەرەقەتی ئەم ئەرکە گەورە و برستبڕە بێت. گوایە گیانە سەرکەش و گڕگرتووەکەی بوو لەم کارەدا بەرگەگری و توانای پێ دەبەخشی نەك جەستە لاوازەکەی. دەیگوت: "دەبێت هەوڵبدەین ئەو ئاگرە هەردەم بە درەوشاوەیی بهێڵینەوە کە خواوەند وەکو ئەمانەتێك لە ناخماندا دایناوە."

ڤۆلتێر بێ وچان کاریدەرکرد. هەندێك جار بە یەك رۆژ نزیکەی پانزە هەزار وشەی دەنووسی شەوان دەنگێکی بەرز بۆ هاوڕێکانی دەخوێندەوە. وا باشە بەشداری لە یەکێك لە دانیشتنەکانیدا بکەین لە سیری و گوێ لە قسەکانی بگرین کاتێك حەقیقەتە تاڵەکان لەگەڵ جولە قۆشم و دڵگیرەکانی تێکەڵ دەکات.

روخسارە لاواز و بێبڕستەکەی لە هەمان کاتدا زیندوو و شادومانە، چەماوەی نامۆی کونجەکانی دەم، دەستە توڕە و لەرزۆکەکانی و چاوە گەش و سەماکەرەکانی سەرنجی مرۆڤ بەرەولای خۆیان رادەکێشن. هەر بەشێك کە دەخوێنێتەوە بە جووڵە و ئاماژەکان باش بەرجەستەی دەکات. ئەکتەرێکی زکماکییە کە گیانێکی پاك و رەشبینی و بەدگومانی پێکەوە لای هەنە ئێستا خەریکی خوێندنەوەی یەکێك لە دوایین چیرۆکەکانی خۆیە بەناوی (بێگوناه). ئەم پەرتووکە بریتییە لە تەنزێکی سەرنجراکێش لە بارەی حەزی مرۆڤ بۆ رێورەسمە هەڵە و رۆتینەکانی ئایینی. کۆمەڵێك توریست *کێوییەکی ئەمریکاییان هێناوەتە پاریس کە لەراستیدا هەمان (کێوی

* مەبەست مرۆڤی کێوی و دڕندەیە.





ڕەسەن)ی ڕۆسۆیە. قەشە بۆ بەجێهێنانی ڕێوڕەسمی ئایینی و چوونە سەر ئایینی مەسیح پەرتووکی ئینجیل دەداتە دەستی . مرڤە کێوییەکە بە شەوق و زەوق دەیخوێنێتەوە و بڕیار دەدات ببێت بە کریستیانی، بەمەش لە بابەت خەتەنە کردن و لە ئاو هەڵکێشان چەند پرسیارێك دەکات: "من لە پەرتووکە پیرۆزەکەی ئێوەدا کەسم نەدۆزیەوە کە خەتەنە نەکرابێت."

بۆی ڕوون دەکەنەوە (هەرچەندە قانعی ناکات) کە بۆ کریستیانێکی باش جارێ تەنیا لە ئاو هەڵکێشان بەبنچینەیی دادەنرێت.

ئەو بۆ جێبەجێ کردنی ڕێورەسمی دواتر ئامادە دەبێت. لەلای قەشە دان بە گوناهەکانی خۆیدا دێنێت بەلاّم هەر کە پێڵێنانەکەی تەواو دەبێت قەشە لە بری خۆی لەسەر کورسیی تۆبە دادەنیشێنێت و دەڵێت: "ئێستا نۆرەی تۆیە چونکە ئینجیل بە راشکاوی دەڵێت ئێمە دەبێت گوناهانی خۆمان بە یەکتر بڵێین.)

بەم چەشنە، ڤۆلتێر بەهۆی گێڕانەوە و حیکایەتەکانەوە کە لە ژێر تیشکی ڕەوانیی دەربڕینەکانی ئەو ڕوخسارێکی تایبەتی وەردەگرتن، ناتەبایی نێوان ڕێنماییەکان (یان دەستوورات)ی ئینجیل و کردەوەکانی تیرە جیاوازەکانی مەسیحیەت بەدیار دەخات.

شەوی دواتر دەست بە ڕوونکردنەوەی چیرۆکی زادیك دەکات کە بەسەرهاتی فەیلەسووفێکی بابلییە "کە لە هەموو چاخەکاندا لە هەرکەسێ زیاتر ئاگای لە نهێنی و هێماکانی ژیانە، کە خۆی لە خۆیدا ئێجگار ناچیز و لە حوکمی هیچ دایە." دەبێت بە ئەڤینداری خاتو شازادە و ژنێکی لادێیی، بەلاّم هەردووکیان وەك یەك، بێ بەری لە ئەڤین و خۆشەویستی و پڕلە فریو و تەڵەکەبازی دەرکەوتن. ڕەفتارە سەرکەشانەکەی زادیك بۆ هەر کونجێکی جیهان ڕایدەکێشێت و ڕوو بەڕووی هەر جۆرە ژن و مێردێك دەیکاتەوە. لە ڕووداوێکدا، زادیك ژنێکی لە ژێر لێدانەکانی مێردەکەی ڕزگار کرد، بەلاّم ژنەکە بەرووی زادیکدا هەڵدەشاخێت و نیازی لەناوبردنی ئەوی هەیە. زادیك دەکەوێتە خزمەتی پاشا و دوای ئەوەی کە بەسەرکەوتوویی ئاشتی و کامەرانی لەولاتدا دابیندەکات، بە تۆمەتی ئەوەی کە پەیوەندییێکی خۆشەویستی لەگەڵ شاژندا هەیە، دەبێتە مایەی تووڕەیی پاشا و دەست بۆ لەناوبردنی دەبەن. زادیك بۆ



هێندستان ڕادەکات و لەوێ (سوتی*) بەکارێکی پوچ و ڕەفزکراو ڕادەگەیێنێت و بەپێشنیارێکی سادە (شا) هان دەدات کە یاسایێك دابنێت کە بە گوێرەی ئەو یاسایە بێوەژنە لاوەکان بەر لە شەهید بوون چەند کارێزێك بە هاوددەمێتی لەگەڵ پیاوەلاوە قۆزەکان بەسەر بەرن.

بە ئەنجامی سەیرکردنی کارەسات و بەسەرهاتە جۆراوجۆرەکان، زادیك گەیشتە ئەو ئاکامەی کە "نەژادی مرۆڤ... گرووپێك مێروولەنە کە کەوتوونەتە سەر ڕووی گوێ زەلیلی زەوی یان خۆڵ و یەکتر هەڵدەدڕێنن... کاتێك ئەم وێنایە خۆی بە زینیدا کرد گوایە هەموو چارەڕەشیەکانی بە یەکجار لەناوچوون و هەستیکرد کە بوونێکی ئێجگار زەلیل و ناچیزە. باڵندەی گیانی لە ناکۆتاییدا بەرەو لوتکە بووەوە و سیستمی جێگیری جیهانی بەبێ یارمەتی ئاگایی بە چاوی دڵ بینی..."

با ئێستاکە گوێ بۆ چیرۆکی میکرۆمێگاس (Micromegas) ڕادێرین. لەم چیرۆکە خەیاڵییەدا کە بە لاسایی کردنەوەی پەرتووکی گەشتەکانی گولیڤەر (لە دانانی سویفت) نووسراوە، بوونەوەرێکی سەروو مرۆڤی لە جیهانی پان و بەریندا دەست بە سەیران و گەشت دەکات. یەکێك لە دانیشتوانی ئەستێرەی جمکە (جووت خوشك) کە بالاکەی پێنج سەد هەزار (پێ)یە لەگەڵ یەکێك لە دانیشتووە بەژن کورتەکانی هەسارەی زوحەل بۆ سەردانی گۆی زەوی دێن و لەکاتی دەربازبوون لە دەریای ناوەڕاست کە پێیان وەکو چاڵێکی بچووك دەبێت و تەنیا پاژنەی پێی دانیشتووی ئەستێرەی شیعری تەڕ دەبێت، لەگەڵ یەکتر خەریکی گوت و بێژ دەبن.

دانیشتوی جمکە: خەڵکی هەسارەکەی ئێوە چەند هەستیان هەیە؟

دانیشتوی زوحەل: بەداخەوە تەنیا ٧٢ هەست و بەم ڕێگایە تەنیا دەتوانین کەمێك لە نهێنیەکانی ژیان تێبگەین.

ـ چەند ساڵ تەمەن دەکەن؟

ـ مایەکی ئێجگار کورت، لە دەوروبەری هەڤدە هەزار ساڵ. واتا لەڕاستیدا هێشتا چاومان تەواو نەکردووتەوە دەمرین. وەك دەبینی بوونمان خاڵێك و ماوەی تەمەنمان ساتێك و هەسارەکەمان زەرەیەك زیاتر نییە.

* Suttee سوتاندنی ژن لە سەر لاشەی مێردەکەی.





لەکاتی دەربازبوون لە دەریا دانیشتوی جمکە کەشتییێك لە سەر رووی دەریا هەڵدەگرێت و لە سەر نینۆکی پەنجە گەورەی دادەنێت. سەرنشینەکانی کەشتییەکە لە دیدی ئەوانەوە وەکو وردیلکەکانی ئەتۆم دەردەکەون.

دانیشتووی جمکە وەکو هەورێکی ڕەش بە سەریاندا دەچەمێتەوە و ئەوان کە ئێجگار ورد و ناچیزن، بە بوونەوەری بەرز بانگ دەکات و دەڵێت: "ئەی وردیلکە خاوەن هۆشەکان کە خاوەند بە ئافراندنی ئێوە ویستویەتی حیکمەتی بێکەم و کورتی خۆی ئاشکرا بکات، گومان لەوەدا نییە کە ئێوە لە سەر زەوی خاوەنی شادی و چێژێکی بێگەرد و بەرزن چونکە دیلی جەستە نینە و ماددە لە بوونی ئێوەدا بەشێکی کەمتر لە رۆحی بەرکەوتووە. بەمەش دەبێت ژیانی ئێوە لە شادومانی و بیرکردنەوەدا بەسەر بچێت... من لە هیچ شوێنێك روو بەرووی خۆشی و بەختیاری نەبوومەتەوە، بەلاّم ئێستا لە سەر رووی زەویم دۆزییەوە." یەکێك لە سەر نشینەکانی کەشتی دەڵێت: (بە پێچەوانەوە، ئێمە لە بەختیاری و شادمانی شتێکی وامان بەر نەکەوتووە و هەردەم بە خراپەکاری و بەدبەختییەوە خەریکین. هەر ئێستاکە هەزاران کەس لە رۆڵەکانی ئادەمیزاد کە کلاّویان لەسەرە، خەریکی کوشتنی هەزاران کەس لە هاونەژادەکانی خۆیانن. کە مەندیلیان لە سەرە و ئەم کارە لە سەرەتای ئافراندنەوە هەروا درێژەی هەیە."

دانیشتووی جمکە دڵی دەرەنجێت و تورە دەبێت و هاوار دەکات: "ئەی زەلیلەکان، پێم خۆشە هێلانەی ئێوەی تاوانباری گالتەجار لە ژێر پێمدا بشێلم." سەرنشینەکە دەڵێت: "لە خوڕا خۆتان ماندوو مەکەن ئەم سەربازانە خۆیان دەزانن چۆن کاری تێکدەرانە بکەن. لە کۆتایی دە ساڵی داهاتوودا لە سەدا یەکی ئەم ژمارەیەش زیندوو نامێنن... بێجگە لەمە، بۆدەبێت سەربازەکان سزا بدەی؟ گوناهەکە لەو دڕندانەوەیە کە لە کۆشکەکاندا دادەنیشن و فەرمانی کوشتنی بە ملیۆنان کەس دەردەکەن و دواتر بە هۆی ئەو سەرکەوتنەی کە بووە بە رزقیان بە خەیاڵێکی ئاسوودەوە سوپاسی خوا دەکەن.

* * *

خەڵك بەم چەشنە شەوانە لە سیری کاتیان بەسەر دەبرد، بیروڕاکانی کە بناغەکانی بنەماڵەی بۆربۆن (Borbon)ی دەهەژاند گوێ بیست دەبوون و لە زهرەخەنەکانی بەهرەمەند دەبوون. ڕەنگدانەوەی ئەم ڕۆمانە پڕ تەنز و تەشەرە، هەرچەندە ئەمڕۆ کەمتر دەخوێنرێتەوە، لە زۆربەی



بەرهەمەکانی بیرمەندە ئەمریکاییەکاندا دەبینرێت. نووسەرانی وەکو مارك* تواین و ئاناتۆل فرانس** و بەرنارد شو لە سەرچاوەی هزری لە بن نەهاتووی ڤۆلتێر بنەما وەردەگرن، ڕەنگە هەروەك ڤۆلتێر گوتەنی: گۆی زەوی شێتخانەی شێتەکانی هەسارەکانیتر بێت بەلاّم دەبێت زۆر سوپاسی ئەوە بکەین کە دەتوانین بەو مەعنەویاتە کە پێمان بەخشراوە، لێومان بە پێکەنین بپشکوێت و تەندروستی خۆمان بپارێزین.

## - ٥ -

شادییەکانی ڤۆلتێر لە سیری بە تراژیدیایێك کۆتایی پێ هات.

مارکیز دی شەتێلیێ هەروەك دڵی لە مێردەکەی خۆی ڕەنجا بوو لە هاودەمە دەروونییەکەی خۆیشی ماندوو بوو و لە بری ئەوەی هەردووکیان روخسەت بدات ئەڤینداری سێیەمی بۆ خۆی پەیداکرد. ڤۆلتێر وەکو مێردی خاتوون، خۆی لەگەڵ ئەو ڕەنجەدا گونجاند چونکە بۆی دەرکەوتبوو کە ئەو "هەرچەند لە دەرستخستنی زانستدا بە توانایە بەلاّم لە بواری ئەڤینداری بێتوانایە."

مارکیز تەمەنی ٤٤ ساڵ بوو کاتێك کەوتە فیکری بە دایکبوون، ڤۆلتێر بە هەستێکی بە لە ڕوودان دەزانی کە ئەو لە باری سکپڕی بە زیندوویی دەرباز نابێت و هەرواش دەرچوو. مارکیز یەك حەوتە دوای دۆخی سکپڕی مرد.

ماوەیەك ڤۆلتێر لەو کۆشکەدا بە سەرگەردانی و لەو پەڕی نائومێدی و خەموکێتیدا ڕۆژگاری خۆی بە سەر دەبرد. یەکێك لە هاوڕێکانی لێی پرسی: هۆی مەرگی مارکیز چ بوو و ئەو هاواری کرد: "نازانی؟ بکوژەکەی، ئەو گیانەوەرە دڕندەیە بووکە سکپڕی کرد." بەلاّم دواجار زەوقی ژیانی دووبارە دەست خستەوە. لەم کاتەدا لە لایەن فریدریکی گەورەوە داوەتنامەیەکی پێ گەیشت کە داوای دەکرد بچێتە لای و لەگەڵیدا لە کوشکەکەیدا بژیت.

* Mark Twain (١٨٣٥ ـ ١٩١٠) ناوی خواستراوی دارامانووسی ئەمریکایی

** Anatole France (١٨٤٤ ـ ١٩٢٤) نووسەری ناوداری فەرەنسایی





ڤۆلتێر داوەتەکەی قبووڵ کرد تا پاشای وڵاتی خۆی کە دەیەویست لە کۆڵی ببێتەوە، ئاسودە بکات. لویسی پانزدەهەم دەیگوت: "گەمژەیەك بۆ دەرباری پروس زیاد بوو، و لە دەربارەکەی منیش گەمژەیەك کەم بووە."

بەڵام فریدریك بە شێوەیەکی تر بیری دەکردەوە. بەر لەوەی: بیرکردنەوە چاکەخوازەکانی بەرامبەر بە هەستی پلەپەرستییەکەی نشوستی بێنێت لای خۆی بیری دەکردەوە کە پیاوێکی وەکو ڤۆلتێر بەو بیروڕا درەوشاوانەوە هاودەمێکی باش دەبێت بۆی ڤۆلتێریش وای دەزانی کە لەوێ کیسەیەکی پڕ و بیرێکی ئازادی دەبێت و لە هاوڕێیەتی پاشا بەختەوەر دەبێت. چونکە وای دادەنا کە پارەی تەواوی دەدرێتێ و بە هەر شوێنێکدا تێپەڕێت خەڵك هەمووی لە بناگوێی یەکتردا دەڵێن: "ئەمە ڤۆلتێری گەورەیە کە بێرەدا دەرباز دەبێت."

ڤۆلتێر هەندێك دوژمنی لە کوشکەکەیدا هەبوو. هیچ شتێك بە قەد رکابەرێکی سەرکەوتوو دەرباریێك بێ خولق و رووگرژ ناکات. هەر بەندوباوی تۆمەتبارکەر بوو کە لە ئەنجومەنەکانی پیاوە خاوەن پلەکانی پوتسدامدا بلاۆ دەبوونەوە. پاشا خۆی بە شاعیر دادەنا و زۆربەی جار داوای لە ڤۆلتێر دەکرد کە نووسینەکانی چاکسازی بکات.

لە یەکێك لەو بارانەدا بە فریدیکیان ڕاگەیاند کە ڤۆلتێر گوتوویەتی: "ئەمانە جلی پیسن کە پاشا بۆ شوشتن ناردونەتە لای من."

هەر لەو کاتانەدا ئەوەیان بە گوێی ڤۆلتێر گەیاند کە پاشا گوتوویەتی:

"من تەنیا یەك ساڵ پێویستیم بەو دەبێت. ڕێگەی خواردنی مزرەمەنییەکان ئەوەیە کە ئاوەکەیان لێ هەڵبمژی و پاشماوەکەی فڕێبدەی." دواجار ئەم ڕەنجە کۆتایی پێهات. پاشا ڤۆلتێری لەم خزمەتکردنە گوماناوییە راوەستاند و رەنگە کارێکی بەجێشی ئەنجامدابێت چونکە مامەڵە داراییەکانی ڤۆلتێر هەمیشە بە روون و ئاشکرایی و بەدەر لە ئیشکال نەبوو. ڤۆلتێر لەبەر ئەوەی لە "بێ متمانەیی پاشا" رەنجا بوو، روون کردنەوەیەکی توندی بۆی نووسی کە بەتوندی پاشای تورە کرد. ئەم نووسینە بە دەستی جەلاد سوتێنرا و ڤۆڵتێر خرایەوە زیندان و دوای دەرچوونی لە زیندان فەرمانیان پێدا کە لەوێ دەربکەوێت.



ڤۆلتێر لەو کاتەدا کە لەڕووی کردارییەوە پیاوێکی بێ نیشتمان بوو، تەمەنی شێست ساڵ بوو و لای خۆی بیری دەکردەوە: "من لە ئەڵمانیاشدا ناتوانم زیاتر لە فەرەنسا تامی ئازادی بچێژم."

## ـ ٦ ـ

ڤۆلتێر زەوی و زارێکی لە بەستێنی دەریاچەی جنێڤ کڕی و لەو کاتە بە دواوە نامەکانی خۆی بە واژووی "ڤۆلتێری سویسرایی" نووسی. لێرەدا، لە فێرنی (Ferney) بۆ ماوەی بیست وپێنج ساڵ وەکو (مردووێکی بزێو) ژیانی بەسەر برد. پێکەنینەکانی ئارام و سووك ببوون و ئیتر ورەی جارانی نەبوو. بەڵام هەروا بە رێشخەند و گاڵتە پێکردن لەڕێگەی حەقیقەتدا بەردەوام بوو. تا پەیتاپەیتا پێکەنین و تیزەبزە لە سەر روخساری ون بوو. ئێستا کارە سەرەکییەکەی ئەو راستبیرکردنەوە و چاکەکاری بوو. ڤۆلتێر رەنگە بە شەوق و زەوقێکی زیاتر لە هی پێشوو، ئەو پارەیەی کە وردە وردە پاشەکەوتی کردبوو، خەرجی هاوڕێکانی کردبێت.

چەند پارچە ئەردێکی دەوری زەوی و زارەکەی کڕی، چەند خانوویێکی بۆ کرێکاران دروستکرد و بە مەرجی گونجاو و نرخێکی هەرزان دایە دەستیان. دەڵێت: "لە شوێنێکدا کە پێوەیستییەکی گشتی لە ئارادا بوو بەرادەیەکی فراوان نیعمەتم لێ بەجێ هێشت. راستە کە نرخی تەواو بوونی ئەم کارە بەرامبەر بە لە ناوچوونی من بوو، بەڵام مرۆڤ بە چ ڕێگایەکی لەمە باشتردا دەتوانێت ژیانی خۆی سەرف بکات؟"

چەند کارگەیەکی دامەزراند کە زۆرترین مووچە کە ئیمکانی هەبێت دەیاندا بە کرێکارانی و لە کەمترین قازانج قایلبوون. ڤۆلتێر هەست و سۆزی جوامێری و دۆستایەتی و پێکەوە هەڵکردنی لە نێوان کرێکارانیدا لەگەڵ هەر جۆرە بیروڕا و ڕێبازێکدا پەروەردە کرد:

"لە گوندەکەی مندا کەس بایەخ بەوە نادات کە لەوێ زیاتر لە ئاینێك باوی هەیە."

عادەتەن ڤۆلتێری دانیشتووی فێرنی بە ڤۆلتێری راستەقینە دادەنێن ـ ئەو پیاوەی کە پشتی لە فریوکاری و درۆ کردووە و تاسەبار و ئارەزوومەندی خوایە ـ بەڵام نەك ئەو خوایەی کە تیرە جیاوازەکان دەیپەرستن بەڵکو ئەو خوایەی کە ئافرێنەر و پارێزڤانی گوڵستانی جیهانە کە ناوی دنیایە. ڤۆڵتێر وەکو قەشەیەك خۆی بەو باوەڕە ئەقلانییە گەیشت و لە زنجیرە نامیلکەیەکدا کەبە ناوی جیاوازەوە بلاۆی کردنەوە دەری بڕی ئەوەی لەم نامیلکانەدا یەکبینە دووبارە دبوو و





"لەناوچوونی شوورەیی و ریسوایی" بوو واتا لەناوبردنی شێتایەتیی خوارفات و خورافات پەرستی و دانانی ئایین لە شوێنە شیاوەکەی خۆی.

پەرتووکی پیرۆز و ئاسمانییەکەی ئایین چییە؟ پەرتووکی گەورەی سروشت. ئەمە تاکە پەرتووکێکە کە دەتوانێت گەورەیی خواوەند بخاتە روو: (شکۆ و گەورەیی ئافراندن خۆی باشترین بەڵگەی بوونی خوایە. کەس ناتوانێت گومان لەو راستە بکات کە ئەم چاو پڕ نەخش ونیگار و ئەم بەرهەمە رەسەن و راستەقینەیە، کاری هونەرمەندێکی تەردەست "کاتێك لاسایی کردنەوەی پەردەی ڕەنگاوڕەنگی سروشت بە زادەی مێشکێکی زرنگ دادەنێن ئایا دەتوانین بڵێین کە ئەم پەردە ڕەنگینە بنەرەتییە بەرێکەوت دروستبووە؟"

لەو ڕووەوە حەقیقەتی ئایین، بریتییە لە ستایشی پەروەردگار و بەجێ هێنانی ئەو ئەرکانەی کە لە گوڵستانی جیهاندا بۆ مرۆڤ دیاریکراون. ئەم بیردوزە لەگەڵ یەکێك لە بەناوبانگترین بەرهەمەکانی ڤۆلتێر ئاشنا دەکات کە ئەویش پەرتووکی (کاندید)ە.

ڤۆلتێر ئەم پەرتووکەی لە وەڵامی گەشبینییە سادەکەی (*لایب نیتس)دا نووسی، ئەم فەیلەسووفە نووسیویەتی: "هەرشتێك لە دونیادا لە باشترین شێوە و لەڕادەی کاملیدایە."

ڤۆلتێر دەڵێت: "ئەم رایە چەوتە و مرۆڤ ناتوانێت لە ژوورەکەی خۆیدا پاڵ بە کورسییەوە بداتەوە و رای وا دیاریبکات کە گوایە هەموشتێك لە رادەی کاملیدایە. شتە کەم و کورت و ناتەواوەکانیش زۆرن ئەمە کاری مرۆڤە کە تەواویان بکات و چاکسازیان لەسەر ئەنجامبدات.

ڤۆلتێر بۆ سەلماندنی ئەم رایە و پیشاندانی دیمەنە ناشرینەکان و هەڵسوکەوتی نامرۆڤانەی خەڵك لەگەڵ یەکتر، جارێکیتر دەمامکی لێبۆکێك لە روو دەکات.

کاندید، تەمسیلێکی کۆمێدیە لەبارەی گەمژایەتی مرۆڤ. پاڵەوانی ئەم چیرۆکە کە پیاوێکی پایەبەرز (ئەشرافی)ی لاوە، قوتابی پانگلۆس (Pangloss) (لایب نیتس) و مامۆستای (زانستە سروشتییەکان و زانستی سەروو سروشتی و کائینات)ە. پانگلۆس بانگەشەی ئەوە دەکات کە: "بە باشی دەتوانرێ پیشانبدرێت کە هەرشتێك لە باشترین شێوە و لە رادەدەی (کاملی) دایە".

* Leibtnits (١٦٤٦ ـ ١٧١٦) فەیلەسووفی ئەڵمانی.



بۆ نموونە لووت بەم شێوەیە دروستکراوە تا بتوانرێ چاویلکە لە سەر دابنرێت. بەڵەك بەم چەشنە ئافرێنراوە تا بۆ لەپێکردنی گورەوی لە بار بێت، بەراز بۆ ئەوەیە کە گەدەی خۆمان لە گۆشتەکەی پڕ بکەین و کێچکەکان ئافرێنراون تا چێژی خواردنمان پێ ببەخشن، کەوا بوو پانگلۆس دەگاتە ئەو ئەنجامەی کە: "نەك هەر لە دونیادا هەموو شتێك باش و دڵپەسەندە بەڵکو دەبێ بگوترێت کە هەموو شتێك لە باشترین شێوە و لە رادەی (کاملی) دایە.

لەو کاتەدا کە کاندید لە مەحزەری وانەکانی پانگلۆسدا خەریکی فێربوونە، کۆشکی باوکی دەکەوێتە بەر هێرشی لەشکری بولگاریا و کاندید دیل دەکرێت و بە ناچاری دەبێت بە سەرباز. لە رۆژێکی خۆشدا کاندید بڕیار دەدات ئازادانە (لەو دونیایەدا کە هەوو شتێك لە باشترین شێوەیدایە) لە دەرەوەی سوپا (ئۆردو) پیاسە بکات بەڵام تۆش دەبێت و دادگای لەشکری پێی دەڵێت: "دەتوانی یەکەیێك لەم دوو سزایانە بە ویستی خۆت هەڵبژێری. یان تەواوی فەوجەکە دەبێت سی زەربەی قامچیت لێبدەن یان دەبێت بە دوو گوللەی قورقوشم، مێشکی خۆت بپرژێنی) بەڵام دەنگی نارەزاییی کاندید بەرز دەبێتەوە و دەڵێت: (هیچ کام لەم دوو سزادانە قبووڵ ناکەم.) بەڵام کاتێك ناچاریدەکەن (لە سایەی ئەو دیارییەی خوا کە ناوی (ئازادی)یە و بۆ رزگار بوون لە گوللەی قورقوشمی، بەرگەی لێدانەکانی قامچی دەگرێت.)

دوای ماوەیەك لە پانگلوس دەبیستێت کە خزمەکانی کوژراون و کوشکەکە یان سوتاوە و لەگەڵ زەوی تەخت بووە. بەڕای پانگلۆس "ئەمەش پێویست بوو چونکە لە بەدبەختە تایبەتییەکانی ئێمەوە چاکەیەکی گشتی بەرهەم دێت."

کاندید بۆ هەڵهاتن لە بەدبەختییە تاکە کەسییەکان "کە بەهەرحاڵ ئەنجامەکەی خێر و چاکەی گشتییە" بۆ لیسبون هەڵدێت بەڵام کاتێك دەگاتە ئەوێ کە بومەلەرزە سی هەزار کەسی کوشتووە بە بڕوای پانگلوس "ئەم مردووانە لەهەستکردن بەوەی ئەوانیتر زیندوو ماونەتەوە دەبێت چەندە کەیفخۆش بن!"

کاندید لە بومەلەرزە رزگاری دەبێت بەڵام گیرۆدەی پشکنینی بیروڕاکان دەبێت کە، "نموونەیەکی تری داد و باشترین جۆرێتی لە تەواوی جیهاندا."





لەوێوە بۆ وڵاتێکی ژێردەستی هۆڵەندییەکان دەڕوات و دەبینێت کە لەوێ خولامە ڕەشپێستەکان ژیانێکی تاڵ بەسەر دەبەن تا بۆ گەورەکانی خۆیان شەکر دابینبکەن. لەوێ خولامێك دەبینێت کە یەك دەست و یەك پێی هەیە و لێی دەپرسێت "چ ڕووداوێك وای لێکردووی؟" یەکێك لە خولامەکان وەڵام دەداتەوە: "کاتێك ئێمە لە قامیشەڵانی شەکردا خەریکی کارین و پەنجەیەکی خۆمان لەدەستدەدەین سزاکەی ئێمە ئەوەیە کە دەستمان ببڕن و کاتێك دەمانەوێت هەلبێین قاچێکی خۆمان لەدەستدەدەین."

بەم چەشنە، کاندید لە بەڵاییێکەوە دەگاتە بەڵاییێکیتر و بەدوای ئەوەدا دەگەڕێت کە ئەزمون و بینینەکانی خۆی لەگەڵ ئەو وێنەیەدا بگونجێنێت کە لەبارەی دونیای باش هەیەتی بەڵام لە هەر هەنگاوێکدا سەر سوڕمانەکەی زیاتر دەبێت، لە یەکێك لەگەشتەکانیدا لە هاوڕێیانی دەپرسێت: "ئایا لەو بڕوایەدان کە مرۆڤەکان هەمیشە یەکتریان کوشتووە هەروەك کە ئەمڕۆ یەکتر دەکوژن و هەردەم درۆزن، تەلەکەباز، ناپاك، سپڵە، ڕێگر، گەوج، دز، خراپەکار، چاوبرسی، مەیخۆر، چکووس، بکوژ، تاڵانکەر، کۆنە پەرست، ریاکار و گێل بوونە؟"

هاوسەفەرەکەی دەپرسێت: ئایا لەو بڕوایەدای کە کۆتر هەردەم خۆراکی شاهێن بووە؟

ـ بێگومان.

ـ زۆر چاکە، کاتێك کە شاهێن ئەم تایبەتمەندییەی هەردەم پاراستووە بۆچی دەبێت وا دابنێی کە ئادەمیزاد خۆی خۆی گۆڕیوە؟

بەڵام لە نێوان ئەم دووانە جیاوازییەکی لە رادەبەدەر هەیە چونکە مرۆڤ ئازادە...

گوت و بێژی ئەوان هەروا بەردەوام دەبێت تا هەردووکیان بە مەبەست دەگەن. کاندید لە پارچە زەوییێکی بچوکدا لە سەرخاکی عوسمانی وەکو جوتیارێك نیشتەجێ دەبێت. پانگلوس هێشتا لەگەڵیدایە و بە توندی هەوڵدەدات کە ڕای خۆی بسەلمێنێت و دەڵێت: "لەم جیهانەدا کە هەموو شتەکان لە ڕاددەی کاملیدانە زنجیرە ڕووداوەکان پێکەوە بەستراون. چونکە ئەگەر تۆ لە کۆشك دەرنەکرابای... ئەگەر لەبەر بومەلەرزە هەڵنەهاتبای... ئەگەر گیرۆدەی پشکنینی





بیروڕاکان نەبوایە... و ئەگەر خۆت لەگەڵ ئەم بەڵاو دژواریانەدا رانەهێنابا ئێستا نەتدەتوانی لێرە بی و لیمۆ و ناوکی فستەق بخۆی."

* * *

ئەمەیە پوختەی فەلسەفەی ڤۆڵتێر و وێنەی کاندید لە ناو کێڵگەدا، وێنەی کۆتایی ئەوە. باشترین ڕێگەی ڕزگاری بوون لە کوێرەوەری و ئازارەکانی تاکە کەسی و ستەمکاریی جیهانی ئەوەیە کە مرۆڤ ئەرکەکەی خۆی بە تەواوی و بە شەرافەتەوە ئەنجامبدات. هەرچەندە ڤۆڵتێر لاواز و بێتوانا بوو بەڵام تا دوایین سات کاریدەکرد. خۆی نووسیویەتی:

"هەرچەند زیاتر تەمەن بکەم زیاتر پەی بە پێویستی و زەرووری بوونی کاردەبەم."

دانانی پەرتووك، کار لە کێڵگەدا، درەختکاری و تێکەڵاویەتیی لەگەڵ هاوڕێیان "گەورەترین هۆیەکانی شادی" ئەو بوون:

"دەست بە پەروەردەکردنی باخ و تەواوکردنی تایبەتمەندییە دەروونییەکانی خۆت بکە. سوود لە زەوییەکەی خۆت وەربگرە و چاوی تەماعکاری مەبڕە زەویی هاوسێکەت. بڕوات بە خۆت هەبێت و نان بە ئارەقەی نێوچاوانی خۆت دابینبکە. تا گەیشتنی کاتی خەرمان سەبرت هەبێت. بۆ خەڵك هەندێك خانوو و بۆ ئاشتیش هەندێ پەرستگا دابمەزرێنە."

ڤۆڵتێر هەشتاوچوار ساڵ تەمەنی کرد و هێندە سەرقاڵی کاری خۆی بوو کە کاتی بۆ مردن نەبوو. یەکێك لەو ئارەزووانەی کە هەردەم دەهاتە سەر زمانی ئەوە بوو کە ڕۆژێك بێت فەلسەفە کۆتایی بە بەدوازی و خوێنڕێژی بێنێت، "من شەیدای حیکمەت و زانستم و لە شەڕ و کێشمانەکێش هەڵدێم.

# کانت (١٧٢٤ – ١٨٠٤)

## ئەو پشت کوورەی کە پاشای بەزاند

کانت (Immanuel Kant) لە سەردەمێکی پڕ ئاژاوەدا ژیانی بەسەر دەبرد. شەڕەکانی هەفت ساڵە، شۆڕشی گەورەی فەرەنسا و سەرشێتییەکانی ناپلیۆن لە سەردەمی ژیانی ئەودا ڕوویاندا. کانت لەم زریانانە بە سەلامەتی دەرچوو و دەڵێت: "من هێندە بچووك و ناچیزم کە ئەم با توندانە بە تەنیشت مندا تێدەپەڕن بێ ئەوەی زیانێکم پێبگەیێنن." ئیمانوێل کانت باڵایەکی زۆر کورت و مناڵانەی هەبوو کە بە خورتی مەتر و نیوێك دەبوو. بەڵام دەبێت بە (ژیرترین) کەسی سەدەی نوزدەهەم دابنرێت.

ئەو هەموو ڕۆژێ دوای نیوەڕۆ لە کۆنیکسبیرگ (Konigsberg)، لە ژێر دارەکانی زیزفوندا پیاسەی دەکرد و لەو ساتەدا کە لە خانووەکەی خۆی هەنگاوی دەنا بۆ دەرەوە، هاوسێکانی سەعاتەکانی خۆیان ڕێك لە سەر سێ و نیو میزان دەکرد و دەیانگوت:

"سەعاتی گیانداری ئێمە بەوێدا دەرباز دەبێت."

هاوسێکان گشتیان دەیانزانی کە ئەم پیاوە زگوردییە لەش بچووکە و پشت کوورە لە نەریتە شەخسییەکان و کاروباری ڕۆژانەدا وەکو سەعات ورد و ڕێکوپێکە بەڵام خەڵکێکی کەم دەیزانی کە ئەو بە چ وردییەکی سەرسوڕهێنەرەوە دەتوانێت کاژێری جیهانی گەورە ڕێکبخات. ڕۆژێکیان بە پێچەوانەی خۆی هەموو ڕۆژێك وازی لە پیاسەی ڕۆژانەی هێنا. هەموو گوتیان: (دەبێت ڕووداوێکی ئێجگار سەیر ڕوویدابێت.)



بەڵام ئەم ڕووداوە سەیرە کە ناوبەرێکی لە کاری ڕۆژانە و ڕێکوپێکدا هێنابوو ئاراوە هیچ نە بوو جگە لە پەرتووکی (ئیمیل)ی ڕۆسۆ.

ئەم ئوستازە لەش بچووکە بەرنامەی ڕۆژانەی خۆی تێکدا و چەند ڕۆژێکی یەك لە دوای یەك لە ماڵەوە مایەوە و پەرتووکەکەی خوێندەوە و دیسان لە سەرەتاوە دەستیپێکردەوە. ئەو بە ناسینی هاوسەفەرێکی سەرکەش، لە ناو تاریکستانی بێبڕوایی بێبیر و باوەڕیدا، ئێجگار کەیفخۆش بوو. هەردووکیان ئامانجی هاوشێوەیان هەبوو بەڵام هەریەکەیان بە ڕێگەی خویدا دەڕۆیشت.

ڕۆسۆ دەیەویست خوا بە هۆی ڕێنمایی هەستەکانیەوە بناسێت و کانت بە تەما بوو کە بە ڕێنمایی (ڕێبەری ژیری) پەی بە بوونی ببات. ئێستا لە پەرتووکی ئێمیلدا، ئەو فەیلەسووفەی کە گوێی بۆ بانگی دڵ هەڵخستبوو، یارمەتی ئەم پیاوەی (ئەقڵ)ی دەدا تا بناغەی فەلسەفەکەی خۆی دابڕێژێت، فەلسەفەیەك کە بە یارمەتی هەست و فیکری چوو بۆ ناو دونیای هێماداری بوون.

- ٢ -

کاتێك کانت لە خوێندنەوەی پەرتووکی ئێمیل بووە و پیاسەی ئێوارانی سەر لە نوێ دەست پێکردەوە، هاوسێکانی هیچ شتێکی نائاساییان لای ئەو نەبینی. هەر ئەو پیاوە پشت کوورەی جاران بوو کە بە چاوانی بچووك و کاریگەر و زەردەخەنەیەکی بە شەرم لەگەڵ گۆچانێکی خۆڵەمێشی بە دەستیەوە کە تکتك بەر بەردچنی شەقامەکە دەکەوت، بەوێدا تێپەڕ دەبوو بەڵام هەروەك هاینە* نووسیویەتی: "چ هاودژییێکی قووڵ لە نێوان ڕۆخساری پیاوە و بیرۆکە بناغە دەرهێن و هەژێنەرەکانیدا هەبوو. ئەگەر دانیشتوانی کونیکسبێرك دەرکیان بەو فیکرە گرانبەهایانە بکردایە، ئەوەندە بە ئامادە بوونی تووشی ترس و سامێکی قووڵ دەبوون کە گوایە جەلادێك ئامادە بوو. چونکە جەلاد تەنیا خودی مرۆڤی لەناو دەبرد بەڵام کانت ئاستۆن ماچ کردن و ستایشکاریی باوی خەڵك و ئەو وێنایەی کە خەڵك لە بارەی خوا هەیانبوو بە یەکجار هەڵاوگێر کرد و لەناوی برد.

* Heinrich Heine شاعیری ئەڵمانی (١٧٩٧ ـ ١٨٥٦)

کانت لەو کاتەدا کە خەریکی خوێندنەوەی پەرتووکی ئێمیل بوو و بەهۆی ئەوەوە بناغەی فەلسەفەکەی بەسەر یەکدا روخا، تەنیا سی و هەشت ساڵ تەمەنی بوو.

**ـ ٣ ـ**

باوباپیرانی کانت لە سکۆتلەنداوە هاتبوونە ئەڵمانیا. خێزانەکەی ئێجگار هەژار و ئایین پەرستبوو. باوکی کانت کە پیشەکەی زین فرۆشی و دروستکردنی قامچی چەرمین بوو، زۆربەی جار یانزە منداڵەکەی خۆی بە دروست کراوەکانی خۆی تەمێ دەکرد چونکە بڕوای وابوو.

"دەست پێوە گرتن لە بەکارهێنانی قامچیدا منداڵ لووس دەکات" دایکی کە شوێنکەوتووی تیرەی ئایینی *پیوریتین و ئێجگار دەمارگیر بوو ئەندامانی خێزانەکەی بە رەچاوکردنی دابونەریت و ڕێورەسمی ئایینی گەورە کرد. لە ژیانی خوێندنیی کانتیشدا وەکو ناوەندیی خێزانییەکەی بنەما دوگماییەکانی ئەم ئایینە برەوێکی بەرچاوی هەبوو و یەکێك لە ماموستاکانی دەیگوت: "من بە کەیفخوشییەوە سەد قوتابی دەکەم بە قوربانی لە پێناو ڕزگار کردنی یەکێکیان."

کاردانەوەی هەڵسوکەوتێکی ئەوها لە سەردەمی منداڵیدا، بوو بە هۆی ئەوەی کە کانت بە گەورەیی خۆی لە ئامادە بوون لە کلێسا لابدات بەڵام بە درێژایی تەمەنی هەستێکی قووڵ و تێنوێتییەکی توندی بۆ بەزاندنی سنووری مرۆڤی و گەیشتن بە حەق و ڕاستی هەبوو. کانت لە سەردەمی لاوێتیدا بەرهەمەکانی لۆك و هیومی خوێندەوە و لە نووسینەکانیاندا بەشێکی کەم و کورتی لە حەقیقەت بینی بوو لۆك رایگەیاندبوو کە زەین لە کاتی لە دایك بووندا لەوحێکی سادەی هیچ لێ نەنووسراوە و هەموو زانیارییەکانمان لە ڕێگەی ئەزموونەوە بەدەستدێن. کانت لای خۆی بیری کردەوە ئەگەر وا بێت، ئەی هەستی مرۆڤانە، هەست و تێگەیشتنی غەریزیانەی ئێمە لەوەی کە حەق لە تەعەدا بالاترە، چون روون دەکاتەوە. ئێمە پەیڕەوی لەم غەریزەیە دەکەین هەرچەندە ئەزموون پیشانیداوە کە هێزە ئەهریمەنییەکان

* تیرەیەك کە لایەنگری حکوومەتی یاسایی بوو و بەگژ پاشای ئینگلتەرا (١٦٠٣ ـ ١٦٢٥) داچوونەوە کە دەسەڵاتی پاشایی بە دیارییەکی خوایی دەزانی.



زۆربەی جار بەسەر راستی (حەق)دا سەردەکەون. کانت لەو بڕوایە دایە کە لۆك لە تێگەیشتنی واتای ڕاستەقینەی ژیاندا داماوە.

هیومیش بە هەمان ناواقیعبینییەوە بڕوای وایە کە زەین تەنانەت لەوحێکی سادە و هیچ لێ نەنووسراویش نییە بەڵکو ناوێکی ناڕوونە کە دەخرێتە سەر زنجیرە تێروانین و تێگەیشتنێك. واتا لاپەڕەی زەین لەراستیدا ئاوێنەیەکی بێگەردی ماددەکانە و ئەم ماددانە و ئەم ماددانەش هەر وەهمە رووتانەن کە خۆیان بە (زەین)دا دەکەن. کەواتە بە گوێرەی داخویانیی هیوم و بە پێی تێگەیشتنی بەشەری، جیهان خەونێك زیاتر نییە.

ئایا وێنە و بەرجەستە کردنی جیهان بەم شێوەیە، گزیکاری و جادووگەریی فەلسەفی نییە؟ هیوم دەڵێت: "بەهیچ شێوەیەك، بەڵکو ئەم وێنەیە دەسکەوتی باشترین و راسترین بیری مرۆڤانەیە" گەر وایە ئەگەر باشترین کار کە لە دەست ئەقڵی ئێمە دێت ئەوەبێت کە سەرەو ژێرمان بکاتە ناو خەرەندێکی خاڵی، ئایا کاتی ئەوە نەهاتووە کە خودی ئەقڵ بخرێتە ژێر وردبینی و لێکۆڵینەوە؟

ئەمە بوو شێوەی بیرکردنەوەی کانت بەر لەوەی کە لە هەوڵی رۆسۆ بۆ دەسەڵات بەخشین بە هەستەکان و لە سەرکارلابردنی ئەقڵ، ئاگادار ببێتەوە. بەڵام دوای ئەوە زنجیرەیەك بیرۆکە و بیروڕای بەهێز و نوێ هزری ئەویان بەخۆوە خەریك و پەریشان کرد و نزیکەی بیست ساڵ لە تەمەنی کانت لەوە بەسەر چوو کە ئەم بیروڕا نوێیانە لەگەڵ راو بۆچوونەکانی پێشو بگونجێت و لە کۆی هەموویان دەزگایێکی فەلسەفی ئێجگار تەواو بەرهەم بێنێت. وەکو دیار، کانت هەمان پشت کووڕە ئارامەکە بوو کە دەنگێکی نەرم و نیانی هەبوو لە چینی کۆمەڵگاوە سەری هەڵدا بوو و رادە و ئەندازەی خۆی باش دەزانی. ئەو مامۆستاییێکی بێ ناو بوو و دوو خوشکی بە کاری ماڵدارییەوە خەریکبوون. دونیا ئاگای لە کانت نەبوو. ئەو پانزدە ساڵی تەواو هەوڵی دەدا کە بۆ مامۆستاییێتی زانکۆی کونیکسبێرك هەڵبژێردرێت. بەڵام بێ ئاکام بوو چونکە دەیانگوت:

"ئەو کەسایەتیی ئوستادێکی نییە."





ئەو لە فێرکاریدا، بیروڕای تایبەتی خۆی هەبوو و دەیگوت: "من زیاتر بایەخ بەو قوتابیانە دەدەم کە ئاستی زیرەکیان ناوەندییە چونکە بیرتێژەکان ڕێگەی خۆیان دەدۆزنەوە و فێرکردنی هزر کوێرەکانیش بێسوودە."

ئەو مامۆستاییێکی ناوەندی بوو بۆ قوتابیانی ناوەندی. تەنانەت کاتێك گەیشتە پلەی ئوستادیش  کەس چاوەڕێی ئەوەی نەدەکرد کە هەرا و هوریا بورووژێنێت.

لەم کاتەدا تەمەنی لە پەنجا تێپەڕیبوو و خۆی نووسیویەتی: "من ئەڤینداریێکی بەشەرمی فەلسەفە بووم هەرچەندە دڵدارەکەم هێندە ڕووی گەشی پیشاننەدام" خەڵك کانتیان وەکو وانەبێژێکی زانکۆیی دەناسی کە بەیانێکی بێهەڵکی هەبوو و هەوڵیەدا بە وشەی قورس و درێژ "بیرۆکەی بێسوود بە هزری بیستەردا بکات." یەکێك لە قوتابییەکانی لە وەسفی مەحزەری وانەی ئوستاددا نووسیویەتی: "هەندێك جار لە بارەی بابەتی گرنگ و ناڕوون دەربڕینی کەمترین قسەی پێ بەس بوو و بابەتەکەی تەواو دەکرد و لەراستیدا لە بابەت هەموو شتێکەوە، هیچی نەدەگوت. هەندێك جار بۆ بابەتە ناچیز و سادەکان روون کردنە و درێژدادرپێکی زۆری دەکرد واتا لەبارەی هیچ هەموو شتێکی دەگوت. یەکێکیتر لە قوتابیەکانی گوتوویەتی: "ئەو ئێمەی لە سەر کەشتییێکی بێ چارۆگە بە سەر دەریاییێکی بێ سنوردا دەبرد."

کانت مامۆستایێك بوو کە ئاستی زانیارییەکانی نەك هەر لە مەراق و ئاگایی یان زانیاری قوتابییەکان، بەڵکو لە ئاستی زانیارییەکانی ناوەند و دەوروبەری سەردەمەکەی خۆیشی بەرزتر بوو. بەڵام کەس نەیدەزانی کە لە مێشکی ئەم پیاوە بە شەرم لەش بچووکەدا، بیرۆکە گەلێك وەك چیای گڕکان لە کوڵان و جۆش و خرۆشدان.

ئەم گڕی ئاگرە لە تەمەنی پەنجا و حەوت ساڵیدا بلێسەی دا و جیهانی بە رووناکییێکی نوێ رۆشنکردەوە.

- ٤ -

ئەو پەرتووکەی کە دونیای فیکری وەرچەرخاند "رەخنەگریی ئەقلی رەها"ی ناوە کە واتاکەی بریتییە لە "رەخنەی شیکاریانەی ئەقل لە بارەی رەها بووندا و بەدەر لە ئەزموونە





هەستییەکانی ئێمە" بە واتاییێکی تر لێکۆڵینەوە لەبارەی ئەو زانیارییانەی کە لە رێگەی بینین و ئەزموونە کەم و کورتی و رووکارییەکانی ئێمەوە بە دەست نەکەوتوون بەڵکو سەرچاوەی تریان هەیە. تێگەیشتن لە پەرتووکەکانی کانت وەکو ناونیشانەکانیان بێ ئەندازە دژوارە چونکە زاراوە و گوزارشتی نوێ بەکار دەبات و هەندێك جار بابەتەکانی بەشێك لە رستەیەکی کورتدا جێ دەکاتەوە.

کانت دانەیەکی پەرتووکی "رەخنەگریی ئەقلی رەها"ی ناردە لای یەکێك لە هاوڕێکانی بە ناوی هێرتز کە لە زانا دیارەکان بوو بەڵام ئەو بەر لەوەی خوێندنەوەی پەرتوکەکە تەواو بکات گێڕاندییەوە و بۆی نووسی: "دەترسم ئەگەر درێژە بە خوێندنەوەی بدەم شێت ببم!" لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا لە سەرەتاکانی پەرتووکەکەی رووبەرووی خاڵێکی روون و ئاشکرا دەبینەوە کە لە تیگەیشتنی بیرۆکە ئاڵۆز و دژوارە کانیدا رێنماییمان دەکات. کەواتە وا باشە بە دوو ئەم نیشانەیەدا برۆین. کانت فەلسەفەی خۆی بە بەگژداچوونەوەی فیکرەکانی لۆك و هیوم دەست پێدەکات و دەڵێت: بە پێچەوانەی رای ئەم دووانە، دەبێت بگوترێت کە زانیارییەکانمان بە یەکجاری و بە تەواوەتی لە رێگەی ئاگاییەوە دەستناکەوێت و زەین بەشێوەیەکی پەتی ناوی زنجیرە کاریگەری و کار لێکراوێکی فیکری نییە. بابەتێکی دیار و ئاشکرا و پەی پێبردنێکی رەها هەیە کە بە هێزی ئەقلانی ناوی دەبەین. ئەم هێزە ئەقڵانییە پشت بە ئاگایی ئێمە لە چەشنی بینین و بیستن و بەرکەوتن و بۆن کردن نابەستێت، بەڵکو سەر بە زانستە پێشووەکانە. واتا بەر لە ئەزموونە هەستییەکانمان هەبووە "حەقیقەتە بەڵگەنەویستەکان... هەر لە خودی خۆیاندا بەڵگەنەویست و پەسەندکراون" بێ بایەخدان بەوەی کە هەستە کەموکورتییەکانمان هەستی پێدەکەن.

"بە هۆی بەڵگە بیرکارییەکانەوە ئاشکرا دەبێت کە تا چ رادەیەك دەتوانین بەبێ یارمەتی ئەزموونە هەستییەکان، لە زانیارییە پێشینەکاندا بەرەوپێش بچین." هەرچۆنێك بڕوانین و شێوەی بیرکردنەوەی ئێمە هەرچییەك بێت، ئەو راستییە گومان هەڵنەگرە کە دووجاران دوو دەکاتە چوار. کەواتە لۆك کە بڕوای وایە بەدەر لە ئەزموونی هەستی هیچ زانستێك دەست نادات، بە هەڵەدا چووە و هیوم کە نکۆڵی لە بوونی حەقیقەتەکان لە جیهاندا دەکات، سەهودەکات. زەین بە شێوەیەکی پەتی ناوی کۆی بینین و ئەزموونەکان نییە، بەڵکو

ڕێنماییکەر و ڕێکخەریانە. زەین بە هۆی زانیاری پێشین و هۆیەکانی بیرکارییەوە جیهان یەك دەخات و قابیلی لێ تێگەیشتن دەکات. زەینی ئێمە ئەو توانایەمان پێدەبەخشێت کە ڕوانینی پەرتەوازە و ئەزموونە بێ ئامانج و تێکەڵ و پێکەڵەکان بخەینە سەر شێوەی زانیاریی ڕێك و پێك و فۆرم وەرگرتوو و تێگەیشتنی بەشەکی و کەسێتی بۆ زانستی سەرتاپایی و گشتی بگۆڕین و لە زانستی ئادەمیزادییەوە بەرەو ڕووناکی خوایی بچین.

بە پێی ئەم وەسفە ئەقڵی مرۆڤانە دەزگاییێکی فۆرم وەرگرتوو و هێزێکی بە تەدبیرە کە لە حەقیقەتەکان دەگات و کاروباری ژیان ڕێك دەخات و تەنسیقی پێ دەبەخشێت. مرۆڤێکی گەوج دونیا بە هەمان ئەو شێوەیە دەبینێت کە شێکسپیر لێی دەڕوانێت و جیاوازییان تەنیا لەوەدایە کە شەێکسپیر دەتوانێت تێڕوانینەکانی خۆی سەروبەری پێ ببەخشێت و بە شێوەیەکی جوان و واتادار ڕێکیبخات.

بەم شێوەیە، دەبێت پشت بەستنی ئێمە بە هێزی تێگەیشتنی خۆمان زیاتر و بە هەستەکانمان کەمتربێت. هەستەکانمان دونیای دەرەوە و ڕووکارەکانمان بۆ دەخاتەڕوو بەڵام هێزی تێگەیشتن، بەرە و ئەو ڕاستییە کە لەپشت ڕووکارکانەوە شاردراوەتەوە- واتا خودی شتەکان- ڕێنمایی دەکات.

شوپنهاوەر نووسیویەتی: "گەورەترین خزمەتی کانت بۆ فەلسەفە جیاکاریی نێوان جیهانی ڕووکار و جیهانی جەوهەری (ناوەکییە".

دونیای ڕووکار کە لەڕێگەی هەستەکانەوە هەستی پێدەکرێت لە شێوەی کەرستەکانی وەکو کەرپوچ، ئاسن، شووشە، دار و بەرد دایە کە تێکەڵ و بێ شێوە و فۆرم لە سەرزەوی بڵاوبوونەتەوە. بەڵام دونیای ناوەکی، بینایەیەکی تەواوە کە لەم کەرستانە دروستکراوە و شێوەی یەکەیەکی بیناسازیی جوانی بە خۆوە گرتووە.

ئەمە کاری زەینە کە بگات بەو ئەنجامەی چۆن ئەم کەڵەکە تێکەڵ و پەرتەوازەیە ڕێك بخاتەوە و لەم ڕێکخستنە کۆتاییەوە: بگات بەوحەقیقەتەی کە لە سنووری دەست پێ ڕاگەیشتنی هەست و ڕوانینە کەم وکورتەکانی ئێمە بەدەوە، واتا بە خود و حەقیقەتی شتەکان بگات.



بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، دەبێت دان بەوەدا بنرێت کە ئێمە مەحکوومین بەوەی کە لە تێگەیشتنی تەواوەتی بێ بەری بمێنینەوە واتا ئێمە هەرگیز ناتوانین لە خود و حەقیقەتی شتەکانەوە بە یەقینێکی تەواو بگەین.

"... ئەو ڕاستییەی کە دونیا لە خودی خۆیدا و لەڕاستیدا– جیا لەوەی کە بەهۆی هەستەکانەوە وەری دەگرین — چییە، هەمیشە بۆمان بە نەزانراوی دەمێنێتەوە. چونکە هیچ هۆییێك بۆ پەیبردن بە حەقیقەتەکەی لەبەر دەستماندا نییە،" ئێمە تەنیا دەزانین کە دونیاییێك بوونی هەیە. بەڵام ئاخۆ ئەم دونیایە چۆن جلی بوونی لەبەر کردووە ئایا دەبێت بە ئافرێنراوی هونەرمەندێکی تەڕدەست دابنرێت و ئەوەی کە ئاخۆ هەستێکی باڵا بەڕێوەی دەبات، بەڕای کانت "ئەقڵ توانای وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانەی نییە." بەڵام دەکرێ بە شێوەیەکی تر، لە ڕێگەی "هەستەکانی دڵ"ەوە وەڵامێك بۆ ئەو پرسیارە بدۆزرێتەوە. بۆ نموونە دەکرێ هەستی حەق و ڕاستی بە شایەت بێنینەوە.

ئایا لە ئاکاردا بنەما ڕەهاکانی، وەکو ئەوانەی کە لە بیرکاریدا هەنە، بوونیان هەیە؟ هەر ئەم بابەتەیە کە کانت لە پەرتووکەکەی تریدا بەناوی "ڕەخنەگریی ئەقڵی ڕەهای کرداری" بە دوایدا دەڕوات و دەست بە ڕوونکردنەوەی دەکات.

بنەما ئاکارییەکان، وەکو بیرکاری، فیترینە. ئەم بنەمایانە سەر بە زانستە پێشینەکانن واتا لەسەر ئەو ئەزموونانە بەند نینە کە لەڕێگەی هەستەکانەوە بەدەستدێن.

ئەم بنەما ئاکاریانە بناغە و بنچینەی ئایین و پێویستییەکی ویژدانی و ناوەکی بوونی ئێمەیە.

دڵبەندی ئێمە بۆ کاری چاکە بابەتێکی ڕەهایە کە لە ناخەوە هەڵدەقوڵێت. خۆشەویستیی نێوان دوو کەس پێویستییێکی دەروونییە. ئێمە هەستدەکەین کە لە ڕووی گیان و دەروونەوە وابەستەی یەکترین و ئەم هەستە لە سەرەتای لە دایکبوونەوە لە بوونی ئێمەدا هەیە. ئێمە بە هۆی هەستێکی فیتری و غەریزییەوە دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە دەبێت ئەرکەکانی خۆمان بەجێ بهێنین. ئەم هەستکردنە بە بەجێهێنانی ئەرکە کۆمەلایەتییەکان (ئەو بنەمایەی کە لەو دونیایەدا کە یەك خراوەنەتوە برەوی هەیە) نە تەنیا دڵمان بەرەو مەبەستێکی تەواو و شایستە ڕێنمایی دەکات، بەڵکو ئەستێرەکانیش لە ڕەوتی دیاریکراوی خۆیاندا ڕێبەرایەتی دەکات.





"ئاسمانە پڕ ئەستێرەکان لەسەرەوە و بنەما ئاکارییەکان لە ناخی ئێمەدا" دوو ڕوخساری یەك بنەمانە کە دەتوانن ئەقڵ و هەستەکانمان بەرەو تێگەیشتنێکی باشتر لە جیهان ڕێنمایی بکەن. بنەماکانی بیرکاری کە ئەستێرەکان بەڕێوە دەبەن و بنەما ئاکارییەکان کە بە سەر بوونی خاکی ئێمەدا زاڵە هەردووکیان دیارکەری یاساییێکی خواوەندین. مانای ئەم یاسایە بە گوزارشتێکی ئادەمیزادانە، ئەوەیە کە دەبێت ئێمە ژیانی خۆمان لەگەڵ ڕەوتی ڕێکوپێکی سروشتدا بگونجێنێن؛ "وا هەڵسوکەوت بکە کە گوایە ئەو ڕێسایەی کە لە ڕەفتار و کرداری خۆتدا هەڵبژاردووە، بە ئیرادە و خواستی تۆ، دەکرێت بنکەیەکی پەسەندکراو بێت بۆ جیهان." بە واتایەکی تر خۆت لەوشتە بپارێزە کە ئەگەر هەموو خەڵك پەسەندی بکەن و بەکاری بێنن، ژیانی کۆمەڵایەتی ببێتە کارێکی نەکردە." ئەوکاتەی کە لە ڕێ دەردەچی و نیازت وایە بەڵێن شکێنی بکەی، ویژدانی تۆ کە لە شوێنی وەرگێڕێکە کە بنەمای سەرتاسەری و گشتیت بۆ دەگێڕێتەوە، ئاگادارت دەکاتەوە کە ئەو دونیایەی کە تیایدا بەڵێن شکێنی دەکەن دەبێت بە دارستانێکی گیانەوەرە دڕندەکان. هەر ئەو "یاسا دەروونییەکەی ئاکارە کە دەستدرێژی، پاشەکەوت کردنی سامان، دەمارگیری، بەرتیل خۆری، بەدوازی، ناپاکی، کوشتن و دزی مەحکوم دەکات."

هەر بەو هۆیەوە، دەبێت یاسای ئاکار بە زامنی جێبەجێ بوونی چاکە و چاکەکاری دابنرێت کە لەگەڵ خراپە و خراپەکاری لە دژایەتیدایە. ویژدانمان ڕێنماییکەری چەوتی هەڵنەگری کردەوەکانی ئێمەیە. ویژدانی ئێمە نەك تەنیا لەو کاتەدا شەرافەت و دەستپاکی بەرەوا دەبینێت کە لە بەرژەوەندی ئێمەدا بێت بەڵکو هەمیشە و لە هەموو بارێکدا بە چاکترین ڕێگە و شێواز دادەنێت. ڕەفتاری ڕاست ڕەنگە هەندێك جار زیانێکی کاتی لێبکەوێتەوە بەڵام هەمیشە بەرژەوەندی مرۆڤایەتیدا تەواو دەبێت. ئامانجی ئاکار ئەوەیە کە هەر کەسێك ئەرکی خۆی بۆ بەختیاری و شادومانی ئەوانیتر بەجێ بهێنێت، چونکە بەم ڕێگەیە مرۆڤ شایانی بەختیاری و خۆشبەختی دەبێت.

بە کورتی، ویژدانی ئێمە فەرمانمان پێدەکات کە جیهان لەسەر بناغەی کاری دیایکراو (سنوردار) بۆ خەڵك و بەخشینی دەستحەقی تەواو پێیان، ڕابگرین (مکوم بکەین). لێگەڕێن با هەر تاکەکەسێك خۆی ئامانج بێت نەك ئەوەی وەکو ئامرازێك بە دەستی ئەوانیتر



بەکاربرێت. نابێت هاوسێکەت بچەوسێنییەوە" "هیچ کارێك لەوە ناشیرینتر و نابەجێ تر نییە کە کردەوەکانی کەسێك پەیڕەوکاری ئیرادە و ویستی ئەوانیتر بێت."

ئەم حوکمەی ویژدان کە سەر بە زانستی پێشینەیە و ئەم فەرمانە ڕەهایەی بەجێهێنانی ئەرك سێ ئەنجامی گرنگی لێدەکەوێتەوە:

ئازادیی ئیرادە ـــ نەمریی گیان ـــ بوونی خوا.

### ١ـ ئازادیی ئیرادە

هەستی ئەرکناسی و هەستکردن بەوەی کە ئەرکی سەرشانمانە کاری چاکە و ڕاست ئەنجامبدەین، کاتێك واتا دەبەخشن کە لە هەڵبژاردنی چاکە و خراپەدا ئازاد و بە ئارەزووی خۆمان بین. دەتوانین بوونی ئازادیی ئیرادە نەك هەر بەهۆی ئەقڵی نەزەرییەوە، بەڵکو لەڕێگەی کردەوەکانی ڕۆژانەشەوە بسەلمێنن.

لەکاتی ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ مەسەلەیەکی ئاکاریدا، لە ڕێگای هەستی ناوەکییەوە نەك بەهۆی هەستەکانەوە، بۆمان دەردەکەوێت کە ئەگەر بمانەوێت، دەتوانین ڕێگەی ڕاست هەڵبژێرین. ئەم هەستە ناوەکییە (باطنی)، ئەم زانیارییە پێشینانە کە توانای بەجێهێنانی ئەرکمان پێ دەبەخشن و لە هێزی ئافرێنەری خودی ئێمەوە سەرچاوە دەگرێت ـ ئەو هێزەی کە ئەزموونە هەستییەکان و تێگەیشتن (وەرگرتن)ە پەشۆکاو و تێکەڵ و پێکەڵەکانمان پێکدێنێت و دەیخاتە سەرشێوەی دونیای تەواو و مایەی ئارەزووی ئێمە ـــــخۆی گوزارشت لە ئیرادەیەکی ئازاد دەکات و ئەم حەقیقەتە وەکو بنەماییێکی بیرکاری گومانهە لێنەگرە. لە هەر بابەتێکی ئاکاریدا، وەکو پرسی بیرکاری، لەیەك وەڵامی ڕاست زیاترمان نییە، ئێمە بە هۆی هەستی ناوەکییەوە ئەم حەقیقەتەمان بۆ دەردەکەوێت نەك بە یارمەتی ئەقڵ و بەڵگە هێنانەوە. لە بوونی ئێمەدا غەریزەیەکی حەقیمەت خوازی ویستێکی غەریزی بۆ دۆزینەوەی و هێزێکی غەریزی بۆ پەیڕەوێ کردنی هەیە، بە واتاییەکی تر ئێمە لە ئیرادەیەکی ئازاد بەهرەمەندین.

### ٢ـ نەمریی گیان

هەروەك لەبابەت هەڵسوکەونی خۆمانەوە باسمان کرد، بە هۆی هەستی ناوەکی (باطنی) و غەریزییەوە بۆمان دەردەکەوێت کە گیانێکی نەمرمان پێبەخشراوە. کاتێك سەرنجی درامای

ژیانی مرۆڤ دەدەین، دەبینین کە جیاوازییەکی بنچینەیی لە نێوان ئەو و ئەوەی کە لە سەر سەکۆی تیاترۆ پیشاندەدرێت هەیە. لە سەر سەکۆی تیاترۆ بارودۆخێك هاتۆتە ئاراوە کە لەوێ بۆ هەر چاکەیەك پاداشتێك و بۆ هەر گوناهێك سزایێك دیاریکراوە و جێبەجێ دەبێت. بەڵام لە درامای ژیاندا عەدالەتێکی شاعیرانەی وەها بوونی نییە.

بەڵکو بە پێچەوانەوە، حەقیقەت هەردەم غەوەبی لێگیراوە و تووشی نەگبەتی بووە و بێعەدالەتیش دەسەڵاتدار و سەرکەوتوو بووە.

لەو رووەوە تێبینی دەکەین کەوا درامای ژیان هەستی ناوەکی ئێمە لە چاکەکاری، دوور دەخاتەوە. سەحنەکانی پارچە پارچە و بە نەگونجاوی و بێ واتا دێنە بەرچاو و چاك تێدەگەین کە ئەمە هەمووی چیرۆك نییە. هەستی ناوەکی و ئاکاریی ئێمە فەرمانمان پێدەکات کە سەرەرای ئەو رەنجەی کە بەرگەی دەگرین، کاری چاك بکەین وبێ ئەوەی چاومان لە پاداشتێك بێت، پشت لە خراپە بکەین. بۆچی؟ چونکە هەستدەکەین کە ژیانی سەرزەوی تەنیا بەشێکی بچووکی ئەم درامایەیە و کۆتاییەکی گونجاو و تەواو و جێی رەزامەندی دەبێت. دڵبەندی ئێمە بۆکاری چاکە و بەجێهێنانی ئەرك لە بەرامبەر دزێوی و گڵاوی، بەهۆی ئەوەوەیە. کانت دەڵێت: ئەم ویست و حەزە تەنیا کاتێك واتای دەبێت و قابیلی لێکدانەوە دەبێت کە ئێمە بەهۆی هەستی غەریزی و ناوەکییەوە بزانین کە مردن کۆتایی بەشێکی درامای ژیانە و لە دونیاییێکی تردا ژیانێکی تەواوتر و شادی بەخشتر چاوەڕێی ئێمە دەکات.

### ۳ ـ بوونی خوا

تێگەیشتنی ئاکاریانە و هەستی ناوەوەیی (باطنی) ئێمە دەلێت کە دەبێت هێزێکی بە تەدبیر وەدێهێنەر و ئافرێنەری درامای ژیان بێت.

ئێمە هەستدەکەین کە رەنج و ئازاری ئەمرۆ بەهۆی شادی و ئاسوودەیی سبەینێوە هەموار دەکەین. مەتەڵی ژیانی هەنووکەیی و گومان و دوو دڵی و چارەنووسی هەڵواسراوی ئێمە، لە پەردەی دووهەمی دراماکەدا، واتا لە جیهانێکی تردا، ئاشکرا دەبێت. هەستی ناوەوەییمان واتا زانیارییە پێشینەکانمان، نەرمی بە شتێکی گومان هەڵنەگر و راستەقینە دادەنێن و ئەم "ئەم نەمرییە بە راستەقینە دەرچووە بەرەو وێناکردنی بوونی هۆکارێکی تەواو بۆ ئەم هۆ



ئەنجامە رێنماییمان دەکات. بەواتایەکی تر ئەم مەسەلەیە بوونی خوا بە گومان هەڵنەگر و راستەقینە دادەنێت."

ئێمە بە هۆی هەستی ناوەوەیی ـ بەهۆی چاوی دڵەوە ـ وەستایی و زیرەکی ئەم هونەرمەندە تەردەستەمان بۆ دەردەکەوێت بەڵام لە رێگەی ئەقڵاندن (بەکارهێنانی هێزی ئەقلی)و بەڵگە هێنانەوە ناتوانین بوونی بیسەلمێنین. هەستی ناوەوەیی ئێمە لە هێزی ئەقڵاندنی ئێمە لە پێشترە و سەربەخۆیە لێی. تێگەیشتنی ئاکاریانە، لە تێڕوانینە ئەزمونییەکان، ناکەم و کرتتر و راستترە.

کانت لە رێگەی بەکاربردنی ئەقڵەوە نەیتوانی بوونی خوا بسەلمێنێت، بەڵام لەرێگەی دڵەوە توانی بەم ئامانجە بگات. هاینە بە ئاوزایێکی تەنزاوییەوە نووسیویەتی کە فەیلەسووفی کونیگسبێرگی خوای بۆ خاتری "لامپ"ی نۆکەری ئافراندووە. دەنووسێت: "کانت تا ئەو کاتە بت شکێنێکی مۆنە و رەفتار توند بوو. لە ئاسمانەکاندا زریانێکی بەرپا کرد، مەلەکوتییەکانی خستەبەر دەمی شمشێر و فەرمانڕەواکانی جیهانی بێ بەزەییانە لە خوێندا گەوزاند. ئیتر هیچ باسێك لەبارەی خێر و سۆزی باوکانە و پاداشتی رۆژی کۆتایی بۆ کارەچاکەکانی ئەم دونیایە لە ئارادا نەبوو.

نەمریی گیان لە گیانەڵادابوو و مردن چرنوك و دانی لێگیرکردبوو.

لامپ ـ خزمەتکاری پیر ـ وەکو تەماشاکەرێکی غەمبار، لە کاتێکدا کە سەیوانی لەبن هەنگلی هەڵگرتبوو و ئارەقەی پەشۆکاوی بە تەوێڵی و دڵۆپە فرمێسك بە کۆڵمەکانیەوە بوون، لە تەنیشتی راوەستا بوو. ئیمانوونێل کانت دڵی نەرم دەبێت و لەو کاتەدا لە بەرگی پیاوێکی چاکەخوازدا دەردەکەوێت نەك فەیلەسووفێکی رەفتار توند و ئەو هزرە خۆی بە مێشکیدا دەکات کە دەبێت ئەم پیرەمێردە بڕوای بە خوایێك هەبێت، ئەگەرنە ژیان بۆی رەش و ناخۆش دەبێت و خەڵك بەراستی دەبێت لە ژیاندا شاد بن. هەست و سۆزە مرۆڤییەکان بە شێوەیەکی کرداریانە خوازیاری ئەمەنە. زۆرچاکە، کەواتە لێگەڕێ با ئەقڵی کرداری بوونی دەستەبەر بکات."





هاینە وەکو هەرجار لە بەرگی تەنز و گاڵتەدا، حەقیقەتێکی ئاشکرا کردووە. ڕاستە کە نەرمی نواندن و خۆشەویستییکانت ئەوی بەرەو گریمانی بوونی خوا ڕێنمایی کردووە بەڵام ئەم خۆشەویستییە تایبەت بە نۆکەرەکەی نەبوو بەڵکو ڕۆڵەکانی مرۆڤ گشتیان هەڵگری بوون. لە دەڵێت خوا هەیە، چونکە پێویستییەکی جیهانی و گشتی بۆ بوونی ئەو هەست پێدەکرێت. لە دونیایێدا کە عەدالەت شێوە و ڕوخساری خۆی گۆڕیوە و تووشی لادان بووە، بەبێ بڕواداری بە ئیرادەیەکی خوایی، جێ بۆ بەختیاری و ئومێد نامێنێتەوە هەستی دڵ لە لۆژیکی سەر باشتر ڕێبەرایەتی دەکات و هەروەك کە پاسکاڵ* گوتوویەتی: دڵ هەندێك بەڵگەی بۆ خۆی هەیە کە مێشك توانای تێگەیشتنیانی نییە.

- ٥ -

کانت فەلسەفەی خۆی کە ئاوێتەیەکی مێشك و دڵ بوو لە تەمەنی ٦٩ ساڵیدا کۆتایی پێهێنا و ئومێدەوار بوو کە ڕۆژگاری پیریتی خۆی لە ئاسوودەییدا بەسەر بەرێت بەڵام ئەم ئومێدە بوو بە بلقی سەر ئاو و بیردۆزەکەی کە ئایینی لە سەر بناغەی هەستی ناخی (دڵی) ئاوا کردبوو نەك لە سەر بنچینەی ئەقلاندن، زریانێکی تووڕەیی و دژوێنی ورووژاند و پیداگرییەکەی لەسەر ئەوەی کە دەبێت لەبری پەسندکردن و بەجێ هێنانی دەستووراتە دوگمایی و ڕۆتین خوازەکانی ئایینی مەسیح، دەست بە بەجێهێنانی ئەرك و وەزیفە ئاکارییەکان کرێت، ئەم زریانەی گەیاندە لوتکە. زاهیدە وشکەکان بە سەگ ناویان برد و هەندێك کەس ناوی (ئیمانوێل کانت) یان لە سەگی خۆیان نا.

بەڵام کانت بە ئارامی و گەردەنیشە تایبەتییەکەی خۆی بە تەمابوو کە ناتێری (بێ کەفایەتی) ئاین، بەو شێوەیەی کە لە وڵاتەکەیدا جێبەجێ دەکرا، بسەلمێنێت و دیاریدەکرد کە: "مەسیح پاشایەتی خوایی لەسەر پانتایی زەویی جێگیر کرد بەڵام تێگەیشتنێکی تەواو لە بارەی مەبەستەکەی نەهاتەدی و لەبری ئەمە حکوومەتی قەشەکانمان بەسەردا سەپێنرا." واتا ڕاستەکەی ئاین پەیوەندی دڵەکانە. بەڵام لەبری ئەوەی خەڵك بەهۆی داوی خۆشەویستی و ئەڤینەوە پێکەوە ببەسترێن، پەرتەوازە بوونە و بەسەر تیرەی جیاجیادا دابەش بوونە ستایشی

* Pascal (١٦٢٣ ـ ١٦٦٢) بیرکاریزان و فەیلەسووف و نووسەری فەرەنسایی



ئایینی بە یەکجار هەڵاوگێڕ و تووشی بەدگۆڕان بوو و بۆ "جۆرە خزمەتێکی دەرباری خوایی گۆڕا و مرۆڤ کەوتە ئەوەی کە بە ڕووپامایی سەرنجی فەرمانڕەواکانی جیهان بەرەو لای خۆی رابکێشێت." فریدریك ویلهێلم دەیگوت: ئەم جۆرە دەربرینانە نەك تەنیا سووکایەتی کردنە بە فەرمانڕەوای ئاسمانەکان، بەڵکو ناپاکی کردنە لەگەڵ پاشاکانی سەر زەوی. بەمەش فەرمانی دەرکرد کە ئەم جۆرە دەستوورات و پڕوپاگەندە (تێکدەرانە) لە پروس قەدەغە بکرێن. لەم کاتەدا کانت گوتارێکی دیکەی لە بارەی ئایینەوە نووسی بوو کە خەریك بوو لە بلاکراوەیەکی مانگانەی بەرلێندا چاپ بکرێت. پاشا فەرمانیدا کە ئەم گوتارە لە ڕۆژنامەکە لابرێت، بەڵام ئەو، ئەم پیاوە باڵا چەمیوە لاسارە کە لە تەمەنی هەفتا ساڵیدابوو بە تەواوەتی نەناسی بوو. کانت گوتارەکەی بۆ یەکێك لە هاوڕێکانی نارد کە لە یێنا (Iena) دەژیا ئەو شارەی کە لە ناوچەی دادوەریی پروس بەدەر بوو و داوای لێکرد کە لەوێ چاپی بکات. گوتارەکە چاپ کرا و پاشا بە توندی تووڕە بوو و بۆ فەیلەسووفەکەی نووسی. "زاتی پیرۆزی ئێمە ئێجگار نارازییە لەوەی کە دەبینیت تۆ فەلسەفەکەی خۆت بۆ سووکایەتی پێکردن و بێنرخ کردنی هەندێك لە بیروباوەڕ و بنەما ئێجگار گرنگەکانی پەرتووکی پیرۆز و مەسیحیەت بەکار دەهێنی، داواتان لێدەکەین ... کە لە ئاییندەدا خۆتان لەو کارانە بە دوور ڕابگرن کە هەستی تووڕەیی ئێمە دەوروژێنێت... ئەگەر سەرپێچی لەم فەرمانە بکەن ئەوا دەبێت چاوەڕێی چارەنووسێکی نەویستراو و ناخۆش بکەن."

بەڵام کانت دوایین قسەی خۆیشی لەبارەی دینەوە کردبووی و بێ باکانە بەئاوازێکی گاڵتەئامێزەوە بۆ پاشای نووسی: "خاوەن شکۆ، من یەك و شەش ناخەمە سەر ئەوەی کە گوتیتم!"

- ٦ -

کانت کەسایەتییەکی نایابی هەبوو و گەشەو کامل بوونە دەروونییەکەی بە پێچەوانەی یاساکانی سرشت داتە بەرچاو. لەبری ئەوەی کە لە ئازادی خوازیی سەردەمی لاوێتییەوە بگات بە قۆناغی کۆنزەڤاتیڤی ڕۆژگاری پیری، ڕێك بە پێچەوانەوە کاریکرد. واتا لە سەرەتادا کۆنزەڤاتیڤێکی دەستەمۆ (یان خۆ بەدەستەوەداو) بوو بەڵام لە کۆتاییدا بوو بە ئازادیخوازێکی بەگوڕ. لەکاتی دەرکەوتنی شۆڕشی گەورەی فەرەنسا زۆربەی پرۆفیسۆرەکانی ئەورووپا





دڵبەندی و ئەمەکداری خۆیان بۆ پێکهاتەی پاشایەتی خستەڕوو بەڵام کانت کە هەفتا ساڵ تەمەنی بوو بە چاوانی فرمێسکاوی و شەوق و زەوقێکی لێوێژەوە، بەهای پیرۆزێتی بە شوڕشەکە بەخشی و گوتی: "ئێستا دەتوانم وەکو پێترۆس حەواری* بڵێم: ئەی پەروەردگار، لێگەڕێ با بەندەکەی تۆ چاولێك بنێت و بە خەوی ئاسوودەییدا روو بچێت چونکە رزگاری و رایسکانی بەچاوی خۆی بینیووە."

یەکێك لە دوا دانراوەکانی کانت کە لە تەمەنی هەفتاویەك ساڵیدا نووسی، نامەیەکە بۆ دروستکردنی فیدراسیونێك لە وڵاتانەی ئازاد، لەسەر بنەمای رێکەوتنێك، بۆ نایاسایی ناساندنی شەڕ. کانت لەم پەرتوکەدا کە ناوەکەی "ئاشتیی ماییندە" یە سکاڵا دەکات کە: "فەرمانڕەواکانی ئێمە هیچ بودجەیەکیان نییە کە بۆ رێنماییە گشتییەکان (فێرکاریی گشتی) خەرجبکەن... چونکە هەموو داهاتەکان ئێستاکە بۆ خەرجی شەڕێکی تر پاشەکەوت کراوە." ئەو نەتەنیا پێشنیاری کەمکردنەوەی هەرجۆرە دەسەڵاتێکی عەسکەریی دەکرد، بەڵکو لە بنەڕەتدا داوای هەڵوەشاندنەوەی دەکرد، "پاراستن و هێشتنەوەی هێزە عەسکەرییەکان، وڵاتەکان هاندەدات کە بۆ زیادکردنی هێز رکابەرایەتی یەکتر بکەن." کە ئەنجامەکەی توند بوونی دوژمنایەتی و هاتنە ئاراوەی خەرجییە ناپێویستەکانە. بۆ خۆ دوورخستنەوە لە هاتنە کایەوەی دوژمنایەتی و خەرجیی زیاد، کانت سوورە لەسەر ئەوەی کە ئێمە دەبێت وڵاتانی خۆمان لەسەر بنەمای دیموکراسیەت ئاوا بکەین "راگەیاندنی شەڕ دەبێت گرێدراوی رای هەمووخەڵك بێت."

چونکە ئەرکی حکوومەتیش وەکو ئایین ئەوەیە کە "رێز لە هەر تاکێك وەك خودێکی جیا و بەشێوەی یەکەیەکی تەواو" بگرێت و "هەموو خەڵکی جیهان لە دونیایێکی ئاشتی و تەباییدا پێکەوە ببەستێتەوە." کانت دەڵێت: ئەمە هەمان ئەو ئامانجەیە کە تاکەکانی مرۆڤ بەخواستی خوا، بەرەو لای دەجوڵێن.

* یارمەتیدەر، بە ژمارەیەك لە یاوەرانی حەزرەتی عیسی دەگوترێت کەبە نییەتێکی پاکەوە یارمەتییان دا.





ئێمە لەو روانگەیەوە پێویستیمان بە خوا هەیە کە رێنماییمان بکات. هەربوونی ئەم رێنماییکەرەیە کە ئامانجەکانی ئێمە لەگەڵ یەکتر ئاشت دەکاتەوە و لە رادەی کێشمەکێشی نێوانمان کەمدەکاتەوە. یەکێك لە نووسەرانی بایۆگرافیی کانت نووسیویەتی: ئەو حەقیقەتەی کە مێشکە گەورەکەی کانت نەیتوانی لێی تێبگات، دڵە بەهێزەکەی چووە ناوی و هەستی پێکرد.

# فەلسەفەی گوتە، بەسەر هاتێك بەرەو رووناكی

**(١٧٤٩ ـ ١٨٣٢)**

گۆتە (Johann W. Goethe) فەیلەسوف (بە واتا زاراوییەكەی) نەبوو لە هیچ زانكۆیێكدا وانەی نەگۆتەوە و هیچ جۆرە دەزگایەكی نارِوون و ئالۆزی فیكریی نەهێنا ئاراوە، بەڵام هزرەكانی هاوكارییەكی فیكریی كاریگەریان بە فەلسەفە كردووە. گۆتە لە گشت چالاكییە ماددی و مەعنەوییەكانی خۆیدا، بە شێوەیەكی غەریزی، بەرەو رووناكی رادەكێشرا.

نووسینەكانی، بەتایبەت هۆنراوە دراماتیكییەكانی لە پەرتووكی فاوست (Faust) دادەبێت بە فەلسەفەی ژیان ناوببرێن.

لەو رووەوە، بە بڕوای ئێمە، جێی خۆیەتی كە گۆتە لە بەسەرهاتی مەعنەوی و هزریی ئادەمیزاد دا جێگەیەكی گرنگ داگیر بكات.

**ـ ٢ ـ**

گۆتە كەسایەتییێكی سەرنجڕاكێشی هەبوو. رۆژێكیان كە لە خواردنگەیەك لەستراسبۆرگ (stras bourg) وەژووركەوت، خزمەتكار چەقۆ و چەنگاڵی فرێدا سەرمێز و لەو بیانییە سەرنجڕاكێش و شكۆدارە مۆر بووە. یەكێك لە كڕیارەكان لە ژێر لێوەوە گوتی: "ئەم پیاوە هەرئێستا لەبنكەی خوایان دابەزیوە." هاوڕێكەی بۆی زیادكرد: "ئەرێ، ئەو دەبێت (ئاپۆلۆی) خوای نوور بێت!"



گۆتە هەم یەكێك لە قۆزترین و بەتواناترین و هەمیش یەكێك لە نائارامترین ئەڤیندارانی سەردەمی خۆی بوو. یەكەمین خونچەی ئەڤینەكەی لە تەمەنی چواردەساڵی و دواترینیشیان لە هەفتاوچوار ساڵیدا پشكوت. سەرتاپای ژیانی لێوڕێژ بوو لە گۆڕ و هەیەجانی نوێ، كارە تازەكان و بەدواداگەڕانێكی نائارام بۆ دەستكەوتنی ئەو رێگا نوێیانەی كە بە دۆزینەوەی نهێنیی جیهان كۆتایی بێت.

گۆتە هەم سەرپێچی كار بوو هەمیش كۆنزەڤاتیڤ، هەم كریستیانی بوو، هەمیش بێ دین، هەم موریدی شەیتان بوو و هەمیش شوێنكەوتووی پاكڕەوان. بۆ ئەوی تامی هەموو شتێك بچێژێت، تەنانەت كەوتە عیشقبازی كردن لەگەڵ هزری خۆكوژیشدا و"ڕەنگە ئەمە گەورەترین رووداوی ژیانی ئەو بێت."

بەڵام بڕیاریدا كە زیندوو بمێنێت چونكە لای خۆی بیری كردەوە: "ئەگەر مردن دوا قوناغی ژیان بێت ئەوسا چ روو دەدات؟" بەمەش بەخۆیی گوت: خۆت لەم كارە لابدە وا باشترە بە پیر پێشهاتەیەك لاكەرەوە و گومان هەڵنەگرەكانەوە بڕۆی و پشت لە لەناوچوونی هەتاهەتایی بكەی ئەو دەبێت ژیانێكی كامل و تەمەنێكی درێژی هەبێت و "ژیانی كامل و درێژ بەمەرجێك وەدی دێت كە ئامانجێكمان هەبێت كە لە گۆڕان و (شێوەگۆڕكێ) دابێت و هەردەم لە رۆیشتندا لە مرۆڤ لە پێشتر بێت." ئەو چییەتییەی كە ئێستا هەتە ئامانج نییە. بەڵكو ئامانج ئەوشتەیە كە دواتر دەبێ بەو و هەر ئەو ئامانجەی كە لەبەرچاوتە شەوق و زەوقی تۆ بۆ ژیانێكی پڕ لە شادی دەوروژێنێت.

گوتەش وەكو فاوست تامەزرۆی ئەوەی هەبوو كە تامی هەموو جۆرە ژیانێك بكات. بەو تێنوێتییەی كە بۆ ژیان هەیبوو بە ئاسانی تێنوێتییەكەی نەدەشكا و نەیدەتوانی بۆ ماوەیەكی درێژ لە پیشەیەكدا بمێنێتەوە.

دڵی بە پزیشكی، یازرگانی، پارێزەرایەتی، مامۆستایەتی، ئەدەبیات و نیگاركێشییەوە بەند بوو بەڵام سەرئەنجام لە دووبەشەكەی دواییدا سەقامگیر بوو. ئەو بۆ ئەوەی بتوانێت بیروڕا و مەبەستەكانی خۆی بە روونی و ئاشكرایی دەربڕێت و وێنە بكێشێت، دەبوایە یان نووسەر و یانیش نیگاركێش بێت. رۆژێكیان لە بەستێنی رووباری راین پیاسەیدەكرد و گیانی بوو بە شەیدای جوانیی دیمەنێك كە لە بەرچاوی راخرابوو: كوێستانی تەم و مژاویی چوار دەور،





گردێکی بەردین لەژێر پێیدا و رووبارێك لەژێر درەختەکانی خەرتەلە و چنار لە قوولایی دۆڵێکی تەنگەبەردا. خۆزگا بیتوانیایە ئەم دیمەنە دڵبزوێنە وێنە بکێشێت و یانیش چەندە باشترە کە لە تۆیی وشەکاندا جێی بکاتەوە و ژیان ببەخشێتە ئەو دیمەنە! قەڵەمتاشەکەی لە گیرفانی دەرهێنا و گوتی: "با بەختم تاقی بکەمەوە. ئەم قەڵەمتاشە فڕێ دەدەم بۆ ناو رووبارەکە، ئەگەر کەوتە ناو ئاو دەبم بەنیگارکێش و ئەگەریش لە ناو دەوەندەکانا ون بوو ئەوا تەمەنی خۆم بۆ نووسەری تەرخاندەکەم."

وەڵامێکی راست لەم تاقیکردنەوەیەوە دەستنەکەوت. کەوتنی قەڵمتاشەکەی بۆ ناو ئاوەکە نەبینی بەڵام دەنگی کەوتنی شتێکی بۆ ناو ئاوەکە بیست. بەمەش گەیشتە ئەو ئەنجامەی کە دەبێت هەم ببێتە نیگارکێش و هەمیش نووسەر. ئەو ژیانی خۆی بۆ وێنەکێشانی مرۆڤ و سروشت تەرخانکرد و بەوشە بێگیانەکان ژیانی پێبان بەخشی. بەم چەشنە، گۆتە لە روونکردنەوەی باری ژیانی خۆیدا پێمان دەڵێت کە چۆن لە سەردەمی ژیانیدا بڕیاریدا ببێت بە نیگارکێشێکی شاعیر و فەیلەسووف.

- ٣ -

گۆتە وەکو نووسەرێکی رۆمانتیکی یاخی دەستی بەکار کرد و بوو بە پێشەوای بزوتنەوەیەکی زریاناوی و دژوار لە راپەڕین دژبە سوننەت و داب و نەریتە باوەکان و گشت زەوق و حەزی ئاگرینی خۆی لە درامایێکدا سەبارەت بە ژیانی گوتز ڤۆن بێرلی شینگێن ( Gotz von Berlichingen) دەربڕی کە لەڕاستیدا روبین هودی ئەڵمانییە و لە پێناو لاوازەکاندا لەگەڵ بەهێزەکان (یان دەوەڵەمەندەکان) لەشەڕ و جەنگدا بوو. گۆتە بە راشکاوی دەڵێت: ئەمەیە ژیان، واتا راپەڕین لە دژی ستەمکاری، هەرچەندە ئەگەری ئەوەش هەیە کە ئەنجامەکەی کەوتنە زیندان و مەرگیش بێت.

بەڵام گۆتە وەکو فاوست هەردەم لە بە دوا گەڕاندایە و دەڵێت: ئەم گوتزە تەنیا یەك رووی ژیان دەنوێنێت کە بریتییە لە یاخی بوون (یان سەرپێچکاری) و شۆرش. لە بابەت لایەنەکانیتری ژیان وەکو گۆشەگیری و نکۆڵی نەفس چ دەزانین؟ لەم کاتەدا گۆتە لە زریانی ئەڤینێکی بە مەرام نەگەیشتوو سەری دەرهێنابوو و خاتوونێکی لاو کە دڵدارەکەی بوو لە پیاوێکی تر مارە کرابوو. دەبێت لە دۆخێکی بەم چەشنەدا چ بکرێت؟ ئایا دەبێت واز لە ئەڤینەکەی بهێنرێت و



ئاواز بچێژرێت یانیش دەبێت دەست لە جیهان بشۆرێت؟ ئەو ئەم پرسەی بە دەربڕینی ئازارەکانی خۆی لە پەرتووکێکدا بە ناوی "بەسەرهاتی وێرتەر" خستوتە روو.

وێرتەریش وەکو گۆتە، بووەتە ئەڤیندار و لە ئامانجەکەیدا سەر نەکەوتووە بەڵام بە پێچەوانەی گۆتەوە کۆتایی بە ژیانی خۆی دێنێت. چونکە بێبەرییە لە توانای ئافرێنەرانەی شاعیر کە بەو هۆیەوە بتوانێت ئازارەکانی خۆی بۆ وشە و ئاواز بگۆڕێت. ئەو سەرکەوتنەی کە بوو بە بەشی ئەم پەرتووکە سەرسوڕهێنەرە. هەرچەندە سەرکەوتنێکی تاڵ و ژەهراوی بوو و بوو بە هۆی زنجیرەیەك خۆکوشتن.

زۆرێك لە لاوانی ئەڵمانی بە کچ و کوڕەوە کە شەیدا و سیحرگرتووی رەوانی قسەکانی گۆتە ببوون لە سەرنەکەوتنی عیشقدا جگە لە فەنا و لە ناوچوون رێگەیەکی تریان شك نەدەبرد. بەڵام گۆتە باش دەزانی کە ئەگەر لاری یان رێگرێکی دژوار ببێت بە کۆسپ لە رێگەدا نابێت وەکو حوکمی مەرگ لێی تێبگەین بەڵکو دەبێت لە هۆیێك دابنرێت کە بە رێگەیەکی تر (رەنگەش باشتر و تەختتر) کۆتایی دێت بەڵام ئەم بلیمەتی و بەتوانایییە لە هەموو کەسێکدا نییە کە وەکو گۆتە دوای نشوستیهێنان هەستنەوە سەر پێ و درێژە بە خەبات بدەن. گوتە ئاشکرا دەکات: تەنانەت مێروولەش کاتێك دەزانێت ناتوانێت خۆی بگەیێنێتە سەر گابەرد ئەوا بە دەوریدا دەسوڕێتەوە. گۆتە لەو ئەنجامە زیانبەخشانەی کە رۆمانەکەی بە دوای خۆیدا هێنا ئاراوە گەلێك ناراحەت بوو. مەبەستی ئەو لە نووسینی بەسەرهاتی وێرتەر ئەوە نەبوو کە پاڵەوانێك دروستبکات کە ببێتە نموونەی پێڕەوی لێکردنی ئەوانیتر، بەڵکو نیازی ئەوە بوو کە مرۆڤێکی لاواز بناسێنێت کە شایانی بەزەیی پیاهاتنەوە و سەرزەنشتکردنە.

بەڕای گۆتە، گۆشەگیری و وازهێنان لە دڵبەندییەکان، خۆلادانە لەو کاروبارانەی کە دەستخستنیان مەحاڵە. بەڵام لەبری ئەمە دەبێت چالاکی مرۆڤ بەرەو ئەو بابەتانەی کە دەستخستنیان ناکردە نییە رێنمایی بکرێت. گۆتە هەرچەندە بەرامبەر بە کەسانی شکست خواردوو دلۆڤان بوو، خۆی شکستی پێ شوورەیی بوو و بەرەبەرە کە تەمەنی بەرەو ژوور دەرۆیشت هێور دەبوو و لاسارییەکەی دەنیشتەوە و پەیتا پەیتا فێردەبوو کە چۆن خۆی لەگەڵ جیهان بگونجێنێت و لەگەڵ خاوەن هێز و بەتواناکان نەخشەی هاوڕێیەتی و ناسیاوی دابڕێژێت





"کاتێك مرۆڤ لە ژیاندا ئاسوودە بێت دەاوانێت هاوکاری خەڵك بکات و چاکەیان بەرامبەر ئەنجام بدات."

بۆیە پۆستەی سکرتێریەتی کارل ئاگوستی گرتە دەست، لە باخێکی نزیك بە کۆشکی ڤایمار نیشتەجێ بوو و بەشێك لە کاتی خۆی بۆ ئەدبیات و بەشەکەی تریشی بۆ پاشا تەرخانکرد.

گۆتە لە ژیانی خۆی ئێجگار رازی بوو و دەیگوت:

"دەبێت لە دەرباردا هەردەم رەفتارێکی بە ئەدەب و بە ویقارمان هەبێت" رۆژێکیان بە هاورێیەتی بێتهوڤن سەرقاڵی گەران بوو کاتێك شا و هاورێکانی رێیان کەوتە ئەوێ. موسیقازانە لاسارەکە، سنگی دەرپەڕاند و بێ ئەوەی سەری رێز لێگرتن دابنوێنێت لە بەردەمیاندا تێپەری. بەڵام فەیلەسووفە شاعیرەکە لاچوو، کڵاوی خۆی لەسەر هەڵگرت و سەری رێزی بۆی دانەواند. دواتر، کاتێك بێتهۆڤن دۆستەکەی بەهۆی ئەم رفتارە نۆکەرایەنەوە سەرزەنشت کرد، گۆتە بەدەم زەردەخەنەوە وەڵامیداوە: "دەبێت بەرامبەر بە سزا رەفتارێك بنوێنی کە شایستەی ئەو بێت." و بەرامبەر بە خواش رەفتارێك کە شایستەی ئەوە.

لەو کاتەوە کە گۆتە گۆشەیەکی خەڵوەتی لە ڤایمار هەڵبژارد، هزری پەی بە جیهانێکی بێکۆتایی برد و برپاریدا پەی بە هێمای ژیان ببات. لەو رووەوە کەوتە توێژینەوە لەبارەی داب و نەریت و رێساکانی سەردەمی خۆی و دەستکەوتی خوێندنەوەکانی خۆی لە رۆمان و شیعر و گوتار و دراماکانی خۆیدا نووسی. ئایا باشترین رێگەی نزیك کەوتنەوە لە خوا ئەمە نییە؟ ئایا ژیانی ئێمە لەم دونیا سەرگەردان و سەرسامکەرەدا، رووی لەرێگەی راستەوخۆ و راستە؟

بەرهەمە نووسراوەکانی ئەو لە روانگەی خوێنەرەکانیەوە شاکارەکانی بواری ئەدەبیات بوون. بەڵام لە روانگەی خۆیەوە جووڵەی نائومێدانە بوون بۆ دۆزینەوەی رێگەی راست.

لە پەرتووکی (ستێلا) و پەرتووکی (پێکبەستە هەڵبژاردنەکان)دا لە نەریتی ژن و مێردایەتی ورد دەبێتەوە و رەخنەیەکی توند لەو داوە قایمە دەگرێت کە زۆربەی جار لە دەست و پێی ژن و پیاو دەئاڵێت بێ ویستی خۆیان (ئەوەی سەرنجراکێشە ئەوەیە کە خۆی چەندین ساڵ لەگەڵ ژنێك ژیا بەبێ مارەیی (گرێبەست) یێکی فەرمی. گۆتە لە پەرتووکی (ئێگمونت) و پەرتووکی (ویلهێلێم مایستەر" و پەرتووکە بچووك و گەورەکانی تریدا لە خۆی دەپرسێت (بۆ کوێ



دەڕۆین؟ بۆچی دەڕۆین؟" و هەردەم هەوڵ دەدات وەڵامێکی گونجاو بۆ ئەم پرسیارانە بدۆزێتەوە بەڵام هەرگیز قایل نابێت.

لاساری، هزری گۆشەگیری، خۆ بەدەستەوەدان، دەستدرێژی، سەرکەوتن، نشوستی... هیچ کامێك لەمانە نهێنییێکی ئەم مەتەڵە هەتاهەتاییە هەڵناهێنن. دونیاییێکی بێ واتا و بن پێ کەوتوو و سیخناخە بە رق وکینە و کارە بێ سوودەکان و ئومێدە سواوەکان کە گشتی بێسوود و نا هاوگونجاو و بێ ئەقڵانەیە. ژیان گشتی فرمێسکی چاو و خوێنی دڵە، "بەخورتی بۆ جیهان هێنراوین، بە ناچارکردن و بەپێچەوانەی ویستی خۆمان گوناە دەکەین و لەو گوناهە کە بە نابەدڵی تووشی بووینە رەنج و ئازار دەچێژین." لە دارستانێکی بێ تەکوز و تێکەڵ و پێکەڵدار رێمان لێ ون بووە و کەس نازانێت کە شوێنگەی مەبەست کوێیە.

بەڵام گۆتە دەست لە تەقەلاکردن هەڵناگرێت و هەوڵ دەدات رێگەیەکی رزگاری بدۆزێتەوە. تا سەرەنجام هەروەك ئیمێرسون* گوتویەتی لەم تاریکستانەدا"هەنگاوێکی بوێرانەی هەڵگرتووە" و نیگاییێکی لە رۆژ بریوە.

لە سەدەیەکدا کە هەمووان بە شوێن دۆزینەوە و گەشت و سەیرانەوە بوون، گوتە لە دۆزینەوەیەکی ئێجگار گرنگدا سەرکەوتنی بە دەست هێنا. واتا پەی بە واتای ژیان برد.

گوتە دۆزینەوەی بێ بایەخەکانی تریشی لە بواری زانستدا ئەنجامدا. چەند گوتارێکی لە بواری رووەکناسی و کارئەندامزانیدا نووسی و بیردۆزێکی نوێی زانستی لە بارەی رەنگەکان تەواو کرد. بەڕای ئەو رەنگ تێکەڵەیەکی رەش و سپییە هەروەك کە ژیان لە رووناکی و تاریکی، ناشیرینی و جوانی و رەنج و ئاسایش پێکهاتووە. شادی کاتێك چێژبەخش دەبێت کە بەرامبەر بە ئازار (یان نەخۆشی) بێت. رزگاریی بێ گوناه بێ بنەمایە. گۆتەش وەکو سپینۆزا کە مایەی رێزێکی قوڵی ئەوبوو، گەیشتە ئەو ئەنجامەی کە رەنگ گۆڕکێی رەنگەکانی ژیان لە چاوئەندازی ئەبەدیەتدا باشتر دەتوانرێت ببینرێت.

ئەمە بوو فەلسەفەی گۆتە. لەبری ئەوەی دەزگاییێك لە هزرە روونەکان بێنێتە کایەوە فەلسەفەکەی خۆی لەسەربناغەی بەسەرهاتی راستەقینەی مرۆڤ دامەزراند. بەسەرهاتی فاوست

* Emerson (١٨٠٣ ـ ١٨٨٢) فەیلەسووفی ئەمریکایی





دوا وەڵامی گوتەیە بۆ ئەو پرسیارەی کە مەبەست لە ژیانی پڕ لە رووداوی مرۆڤ لەم خۆڵدانەدا چییە. گۆتە دەڵێت: مرۆڤ لەسەر پەڕەی شەترەنجی ئەبەدیەتدا وەکو پیادەیەکە لە دەستی خوا و شەیتاندا. بەسەرهاتی فاوست کە گۆتە لە نووسینیدا پانزە ساڵ زەحمەتی کێشا، بە پێشەکییەك لە ئاسماندا دەستپێ دەکات. خوا و شەیتان لە بارەی گیانی مرۆڤانە گرەو دەکەن، خوا ئافرێنەری ژیان و شەیتان تێکدەرێتی. شەیتان بانگەشەی ئەوە دەکات کە تێکدان لە ئاوەدان گرنگترە و عەدەم (نەبوون) لە بوون باشترە، "من نەشتەرکاری ئەو دۆمەڵەمە کە ناوی ژیانە." و سوورە لەسەر ئەوەی کە ژیان هەر جۆرێك بێت، ئەوەندە ناهێنێت کە هەبێت و هیچ مرۆڤێك هێندە باش نییە کە بهێنرێتە جیهان.

خوا: ڕات لەبارەی فاوست چییە؟

شەیتان: ئەویش وەکو خەڵکی تر.

و بۆ سەلماندنی لاف لێدانەکەی خۆی بڕیاری لەڕێ لابردنی فاوست دەدات و پێشنیار دەکات: "بۆ ماوەیەکی کورت بە منی بسپێرە تا گیانی تووشی نەفرەتی هەتا هەتایی بکەم."

خوا ئەم داواکارییە قبوڵ دەکات چونکە لە سەرکەوتنی فاوست دڵنیایە. مرۆڤ لە هەموو ئەو وەختانەی کە لە تاریکیدا وێڵ و پەرێشانە بەهۆی هەستێکی غەریزییەوە بەرەو لای رووناکی رادەکێشرێت.

- ٤ -

دوای ئەم گرەو کردنە، شەیتان بۆ لەسەرێ لابردنی فاوست دادەبەزێتە سەر زەوی و فەیلەسووفە بەناوساڵ کەوتوو (کەنەفت) دەبینێت کە دڵی بە ژیانەوە نەماوە و ئامادەی ئەوەیە کە باروبنەی سەفەر بۆ دونیای تر رابکێشێت، "من کەوتمە ئەوەی کە بە هۆی بیرخستنەوەی شەوق و زەوقی لاوێتی، وەهمەکانی سەردەمی پیرێتی لە هزری دەربێنم."

کەوابوو مژدەی ژیانێکی تازە، زانستە نوێکان، ئیلهامەنوێکان، بەسەرهاتە نوێکان و ئومێدی نوێیی پێدەدات و دەڵێت کە سەردەمی لاوێتی بۆی دەگێڕێنێتەوە و مل دەداتە بەر خزمەتکردنی تەنیا بەمەرجێك: "لەم دونیایەدا نۆکەری تۆمە ئەگەر قایل بی کە لە دونیاکەی تردا ببی بە بەندی من" فاوست: بۆ چەندێك لەم دونیایەدا دەبێ بە خزمەتکاری من؟



شەیتان: ماوەکەی بەگوێرەی دڵخوازی تۆیە.

فاوست: باشە، قبووڵمکرد. بەناو خۆشییەکاندا رۆدەچم و تا ئەوپەڕی لە چێژ بەهرەمەند دەبم تا ئەوساتەی کە بڵێم: "ئەی زەمان راوەستە، چەندە جوان و شکۆداری!" دوای ئەمە ئیتر بەندەی هەتاهەتایی تۆ دەبم .

ئەو ئەم پەیمانەی بە پێنوسوێك کە بەخوێن ئاڵودە بوو واژووکرد و لەو ساتەوە تا داهاتنی ئەو ساتە هەستیار و گرنگە کە لوتکەی چێژ و شادیی زەمینییە، شەیتان مل دەداتە بەر خزمەتکردنی. ئێستاکە ئەو ساتە هەستیارەکەی دادێت، نە فاوست دەزانێت و نە شەیتان. بە خستنە رووی توانا جادووئاساکەی شەیتان، فاوست بۆ سەردەمی لاوێتی دەگەڕێتەوە و لەدوای دۆزینەوەی ژیانێکی پڕ لەشادی شەوق و زەوقی لاوێتی جارێکی تر خۆی بە کەللەیدا دەکات. خوێنەران ئاشنایەتیان لەگەڵ نیوەی یەکەمی ئەم چیرۆکە هەیە. فاوست لە هاودمیەکەیدا لەگەڵ شەیتان لە هەموو جۆرە چێژێکی جەستەیی بەهرەمەند دەبێت، مەی دەخواتەوە، سەرخۆش دەبێت، خواردنە بەتامەکان و خواردنەوە بەچێژەکان دەخوات و هەڵدەدات، لە دەریای شەهوەتدا رۆ دەچێت و سەرەنجام گشتیانی پێ بێزارکەر و ماندووکەر دەبێت و لە هیچ کام لەم چێژانەدا ناگات بەو شادی و خۆشحالییەی کە بەشوێنیدا دەگەڕا.

دوای ئەوەدیسان فاوست بە ڕێنمایی شەیتان بەسەرهاتە دڵبزوێن و لەهەمان کاتدا شومەکەی خۆی لەگەڵ مارگرێت دەستپێ دەکات. دوای هەڵخەڵەتاندنی خۆشەویستەکەی، وازی لێ دەهێنێت و ئەو دڵدارە لە ناو گوناە و خەم و دەردا وەك خۆی بەجێ دەهێڵێت و جارێکی تر بەناو دەریا گوناە و چێژە جەستەییە کاندا رۆ دەچێت. گشت سامان و شادومانییەکانی سەر زەوی لەژێر دەسەلاتی ئەودان. بەلام لە هەمان کاتیشدا دەستی بەو ساتەڕا ناگات کە گیانی رازی و کەیفخۆش بکات. لەکاتی رابواردن و خۆشگوزەرانیدا بەدوای کچێکی جوان دەکەوێت و دەبینێت کە مشکێکی رەنگ سوور لە دەمیەوە بازدەداتە دەرەوە، ناشیرینی لەناو جوانیدا سەردەردێنێت ئەم نیشانەیە بە نیشانەی کۆتایی ژیان دادەنێت.

بۆ بینینی مارگرێت بە هەڵەداوان بۆ زیندان تاودەدات بەلام ئیتر گەڵێك درەنگ بووە و ناتوانێت قەرەبووی ئەو زیانانە بکاتەوە کە بووەتە هۆی روودانیان. ئەو ناوی مارگرێتی





زراندووە و دایکەکەی ژەهرخوارد کردووە و براکەی لە دوێلدا کوشتووە و ئەو منداڵەی کە لە مارگرێت هەیبوو نخرۆکردووە و مارگرێت بە تۆمەتی کوشتن و تاوان کەوتووەتە زیندان.

بەشی یەکەمی فاوست ـ بەسەرهاتی پیاوێك کە تینوێتییەکی لە شکان نەهاتووی بۆ چێژەکانی ژیان هەیەـ لێرەدا تەواو دەبێت. بەرهەمی ئەم هەموو شەهوەتبازی و گەیشتن (یان پەی بردن) بە چێژەکان چ بووە؟ تاڵی و کوێرەوەری! نەخۆی لە شادییێکی پایەدار شتێکی بەرکەوتووە و نە بۆ ئەوانیتر شادی و خۆشحاڵی دابینکردووە. ئەو ساتەی کە فاوست، واتا مرۆڤ، بتوانێت بڵێت "ئەی زەمان راوەستە چەندە جوان و شکۆداری!" نەهات.

* * *

بەشی دووەمی فاوست هەرچەندە ناوبانگێکی وای نییە، لە روانگەی فەلسەفییەوە لە بەشی یەکەم گرنگترە.

لەکاتی نووسینیدا گۆتە پیرەمێردێکی کەنەفت بوو و وەکو فاوست تەمەنێکی دەرێژی بەسەر بردبوو و ئازارێکی زۆری بینی بوو و خۆی دەڵێت: "ئەوەی نەم کردبێت هەرگیز نەهاتووتە سەرزارم." بەشی دووەم شیلە و پوختەی هەشتا ساڵ ژیانی پڕ لە شەوق و زەوق و ئارەزوو و هزرە قووڵەکانی ئەون.

لە کەرتی یەکەمی بەشی دووەمدا کە گۆتە لە هەشتاو دووساڵیدا کۆتایی پێهێنا (١٨٣١) پاڵەوانەکەی خۆمان لەسەر بڵندایی گردێکی پڕ لە گوڵ دەبینین کە لە جیهانی خەوێکی ناراحەت و پەرێشاندا بەم لاو بەو لادا وێڵە. رۆحە دلۆڤان و میهرەبانەکانی سروشت لە ژوور سەری ئاوێزانن و هەوڵدەدەن کە دەردە رۆحێەکانی هێور بکەنەوە. قسەیەك لەبارەی ئەوەی کە ئەو گونەهکاری یان بێ گوناه بەگۆڕێ نییە. بۆ ئەوان هەر ئەوەندە بەسە کە ئەو بە کەسێکی چارەڕەش و بەدبەخت دەزانن. لەو رووەوە لە جیهانی خەوەوە دەرمانی لەبیرکردن بۆی دێنن. بۆچی زەحمەتی تۆبەکردنی بۆ دروستبکەن؟ ئایا لەم رێگەیەوە ئەو گوناهانە قەرەبوو دەکاتەوە کە ئەنجامی داون؟ کەڵەکە کردنی خەمەکانی دوارۆژ لەسەر گوناهانی رابردوو چ سودێکی هەیە؟ "ئادەمیزاد لەو رێگایانەدا کە لەبەر دەمیدانە گیرۆدەی چەوتی و سەهو دەبێت بەڵام سروشت لێیان خۆشدەبێت و لە بیریان دەکات."



فاوست وەکو بەهار کە لە خەوی زستانە هەڵدەستێتەوە، لە خەو سەرهەڵدەبڕێت و سەر لەنوێ دەست بە ژیان دەکاتەوە.

گوڵە نوێکان لە تۆوی رزێووەوە و ئومێدە نوێکان لە نائومێدییە دێرینەکانەوە سەرهەڵدەدەن (سەردەردێنن). سروشت هێشتا چاوەڕێی بەسەرهاتە نوێکانە.

فاوست سەیری ئاسمان دەکات و دەبینێت کە پەلکەزێڕینەیەك لەسەر هەورەکان دەرکەوتووە. بەبیریدا دێت کە پەلکەزێڕینەش وەکو کاروباری ئادەمیزادیانەیە، هەمیشە ون دەبێت و دووبارە دەگەڕێتەوە. ژیان، مردن، دیسانیش ژیان. بەڵام ئەم ژیانە چەندرۆژەییە لەم ماڵە کاتییەدا بۆ چییە؟

تا ئەو مەبەست لەم لەڕێ لادان (گومڕایی و چەوتیانەی فاوست لە تووش بوون بە گوناهەکان چییە؟ رادەیەی کە فاوست دەتوانێت ببینێت و بیربکاتەوە هیچ مەبەستێك لە ئارادا نییە. کۆمەڵە نابینایێك بەناو تاریکیدا کوێرکوێرانە بەرەو پێش دەچن و بەر یەك دەکەون. کەواتە چەندە باشترە کە لەهەمان ئان و ساتدا کۆتایی بە ژیانی خۆی بێنێت.

پیاڵەیەکی ژەهر هەڵدەگرێت و بە لێویەوە دەنێت و لەو ساتەدا کە نیازی خواردنەوەی هەیە، بانگێك لە ئەنجامدانی ئەم کارە رایدەوەستێنێت و ژیانی نوێ بانگی دەکاتەوەـ بانگێك کە یادەوەرییە ئایینییەکانی ئەو کە ماوەیەکی زۆر بەرلەوە لە هزریدا سڕابوونەوە دێنێتەوە یادی ـ لای خۆی بیردەکاتەوە: "دیارە دیسانەوە ژیانێکی بێ سوود." بەڵام دڵی دەداتێ، تا بچێتە سەر رێگەیەك و چاوی بە رووناکی بکەوێت.

بەم چەشنە، لە ژیانی نوێدا بەسەرهاتی نوێ روودەدەن. بە یارمەتی شەیتان، فاوست، لە دەربارەدا دەگاتە پلەی راوێژکاری و دەستی بە سامان و شانازییەکان و شکۆ و سەرکەوتن لە شەڕەکاندا دەگات بەڵام هەموو ئەمانەی پێ پووچ و بێ نرخ دەبن شکۆ و سەرکەوتن، مردن و لە ناوچوون بۆ بەزیو و زاڵبوو بە یەکسانی دێنێت.

بەسەرهاتی ئەڤینێکی تر بۆ فاوست روو دەدات بەڵام ئەم جارەیان فاوست کە لەڕاستیدا خودی گوتەیە بەیارمەتی گیانی هێلێن کە شاژنی (ترۆی)ە هەوڵدەدات هێمای ژیان لەئاوێتە کردن (یان تێکەڵ کردن)ی جوانیی کلاسیکی یۆنانی کۆن و ژیانی رۆمانتێك و نائارامی سەردەمی





خۆیدا بدۆزێتەوە. هەردووکیان (فاوست و هێلێن) بۆ ژوور هەورەکان هەڵدەکشێن تا ڕەنگە لەوێ گوێ بیستی وەڵامێك بن بۆ پرسیارەکەی خۆیان.بەڵام فاوست دیسان تووشی دڕدونگی دەبێت و هەرکە بڕیاردەدات بەدوای هێلین بکەوێت، هێلین لەناو هەور و تەم و مژدا ون دەبێت و تەنیا باڵاپۆشەکەی خۆی بەجێ دەهێڵێت. جوانیی یۆنانی دێرین هیچ نییە جگە لە شکۆی ڕۆژی دابڕان. تۆ ناتوانیت بە ئاوردانەوەی دواوە و سەرنجدان لە ڕابردوو ڕێگەی خۆت بەرەو داهاتوو پەیدا بکەیت.

فاوست بەسەرهاتەکەی تری خۆی لە جیهانی ئابوریدا درێژە پێ دەدات تا ڕەنگە بتوانێت بە چالاکییەکانی لە دروستکردنی بینا، فراوانکردنی کاروبار، گەشەپێدان و پێشکەوتن، بە بەرزترین ڕاددەی خۆشحاڵی و ڕەزامەندی بگات بەڵام دیسان نائومێد دەبێت. لە بازاڕی پەشۆکاوی بازرگانیش بانگی حەق نابیستێت بە گەشت و گەڕان دەکات بەڵام هەڵهاتن لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تریش هیچ بارێك لەکۆڵ هزری ناکاتەوە. ناوەند و بارودۆخ هەرچەندێك بگۆڕێن فاوست هەمان فاوستە.

ڕۆژێکیان، لە دامێنی چیاییێك، وێنەیەك لە (ڕێگەی ڕاست) واتا ڕێگەی لەخۆ هەڵهاتن لە زەینیدا ڕەنگدەگرێت. هەروا کە لە دوورەوەڕا سەیری هەڵکشان و داکشانی ئۆقیانوسی دەکرد کە بەرز و نزم دەبووەوە ئەو هزرە بۆی هات کە ئایا ژیاندنەوەی ئەم بەستێنە بێ دانیشتوانە و لەبارکردنی بۆ ژیانی خەڵك بەلایەنی کەمەوە خزمەتێکی شایستەی مرۆڤ نییە؟ بەم نەخشەیەوە خەریکدەبێت و دەست بە وشك کردنەوەی زەلکاوەکان و دروستکردنی خانوو دەکات بۆ ئەو خەڵکەی کە دەبێت بەرەنگاری باو زریان و هەڵکشان و داکشانی ببنەوە و ئازادی خۆیان بپارێزن.

سەرکەوتنە یەك لەدوای یەکەکان ئەو مەترسییەیان بەدواوەیە کە زەمینە بۆ شەڕ و ململانێیەکی نوێ دابینبکەن.

ئەمە هەوڵ و تێکۆشانە لە پێناو گەیشتن بە مەبەست کە دەبێتە هۆی ڕزگاری گیان نەك خودی ئامانجەکە. فاوست دواین قسەی حیکمەت ئامێزی بیستووە. مرۆڤ دەبێت واز لە بوونی سووکایەتباری خۆی بێنێت و پەیوەندی بە کۆمەڵەوە بکات و لە هەندێك کاروباردا



بەشداری لە هەوڵەکانیاندا بکات و بۆ ئەوەی شایستەی هەبوونی ژیان و ئازادی بێت دەبێت ڕۆژانە نوێیان بکاتەوە.

فاوست بە وێناکردنی ئەوەی کە ژیانێکی ئەوها ئاسوودە بە ملیۆنەها کەس دەبەخشێت، پێی ئەردی ناگرن لە ئاکامی هەوڵەکانی ئەودا چەند نەوەیەکی مرۆڤ لەناو ئەو مەترسیانەی کە ئێستاکە بەرز بوونەتەوە و ئەو مەترسیانەی کە لە دوارۆژدا بە سەریدا زاڵدەبن، ژیانێکی پاڵەوانانەیان دەبێت. ئەم هەوڵە نائارام و بەردەوامە و ئەو شادی و خۆشحالییەی کە لێیەوە پەیدا دەبێت. گەورەترین خۆشی و شادییە کە مرۆڤ دەتوانێت بەدەستی بێنێت. فاوست دواجار چووە سەر ڕێگای ڕاست و ئەو ساتە هەستیارە داهات کە بتوانێت بڵێت "ئەی زەمان ڕاوەستە چەندە جوان و بە شکۆی!"

ئەمە هەمان ئەو ساتەیە کە بەگوێرەی پەیمانەکە، کۆتایی ژیانی فاوست و سەرەتای کویلایەتییە هەتا هەتاییەکەی لە دەستی شەیتاندا دەستپێدەکات. وا دیارە کە شەیتان گرەوەکەی بردۆتەوە. کەواتە بۆ دیلکردنی ڕۆحی فاوست دێت بەڵام فریشتەکانی خوا وەکو بارانی گوڵە سوورەکان دادەبەزن و گیانی فاوست بۆ ئاسمانەکان دەبەن. سەرکەوتنی کۆتایی هی فاوستە نەك شەیتان. چونکە ئەو ساتەی کە بە گەورەترین شادومانی دەگات ساتێکە کە زۆربەی هەوڵ و تەقەڵلا و خەباتی بۆ خۆشبەختی و شادیی ئەوانیتر سەرفدەبێت نەك ئەوکاتەی کە مەیلەکانی خۆی قایلدەکات، ئاوازی فریشتەکان دەگاتە گوێ: "ئەوەی کە فێر بووە هەردەم لە هەوڵ و جموجۆڵدا بێت، شایانی لێۆش بوون و لێبوردنە"

ئەرکی فاوست لە ئاسماندا ئەوە دەبێت کە وانەی ژیان فێری گیانی ئەو منداڵانە بکات کە لەکاتی منداڵیدا جیهانیان بەجێ هێشتووە و لە بەشداری کردن لە بەسەرهاتی ژیاندا بێبەری بوونە ـ ئەو جۆرە ژیانەی کە خەباتی بەکۆمەڵ دەگرێتەوە دژ بە وێرانکاری و ڕق و کینە ـ لە ئاسمانیشدا وەکو گەورەترین شادی بۆ ڕۆحی مرۆڤ ئەوەیە کە بۆ سەقامگیرکردنی ئاشتی و ئارامی لە تێکۆشان و خەباتێکی هەتا هەتاییدا بێت.

ـ ٥ ـ

گۆتە لەسەرتاپای ژیانیدا لێوانلێو بوو لە سۆزێکی ئاشتیخوازانە. کاتێك کارل ئۆگست، کە بە تەمای شەڕ بوو لەگەڵ فەرەنسایییەکاندا داوای لێکرد هۆنراوەی داستانی (حەماسی) بۆ





ورووژاندن و هاندانی سەربازانی ئەڵمانی بهونێتەوە گۆتە ئەمەی رەفز کردەوە و گوتی: (چۆن دەتوانم هۆنراوە لەبارەی شەڕ و نەفرەت بهۆنمەوە لەکاتێکدا خۆم لێی بێبەشم."

ئەو یەکێك بوو لەو کەسانەی کە دڵبەندێکی سەروو مرۆڤیان بۆ دۆستی هەیە بەتایبەت بەرامبەر بە ئەو کەسانەی کە هەژار و برسی و نەخۆشن و زیاتر لە هەر کەسێك پێویستیان بە یارمەتی ئەو هەبوو.

هاوڕێتییەکەی ئەو تەنیا پەیوەندییێکی دڵی و دەروونی نەبوو، بەڵکو بەشێوەیەکی کردارییانەش پیشانیدەدا. بەو یەك هەزار دۆلارەی کە داهاتی ساڵانەی بوو بەردەوام پارێزگاریی لە دووکەسی بێگانە دەکرد کە پێویستیان بە یارمەتی ئەو هەبوو. دەرگای ماڵ و گیرفانی هەردەم بە رووی هەژاراندا کراوە بوو و دەیگوت: "رەنگە لە دیدی خواوە ئەم چینەی خەڵك پلەیەکی بەرزتریان هەبێت".

گوتەش وەکو فاوست دوایین رۆژەکانی تەمەنی خۆی خەرجی بەهێزکردنی ورەی ئەو کەسانە دەکردکە لە کیشمەکێشی ژیاندا پێویستیان بە نوێکردنەوەی هێز هەبوو.

دڵبەندی و خۆشەویستی ئەو بەرامبەر بە چارەرەش و هەژاران وەکو دڵبەندیی والت ویتمەن* بوو، لەگەڵ ئەو جیاوازییەی کە بەپێچەوانەی ئەو کە بە هەر کەسێك کە لە خەباتی ژیاندا دەدۆڕا (هەر بژی)ی دەگوت، گۆتە ئەوانەشی کە دوای شکست خواردنیش درێژەیان بە خەباتی خۆیان دەدا بە شایانی رێز لێنان و ئافەرین پێگوتن دەبینی؛ "تەنیا کاتێك دەتوانین بە دەرچوون لە تاریکی ئومێدەوار بین کە دوای هەر کەوتنە خوارەوەیەك دوبارە هەستێتە سەرپێ و دوای هەر نشوستییێك باڵای خۆمان راست بکەینەوە." لەو کاتەدا کە لە ناو پێخەفی مەرگدا راکشابوو دوایین خواست و تکا و داخوازیی ئەو لە خوا ئەوە بوو کە: "خواوەندا، ړووناکی زیاترم پێ ببەخشە".

* Walt whitwan (١٨٠٧ ـ ١٨٩٢) شاعیری ئەمریکایی







# هەوڵی شوپنهاوەر لە دژی نائومێدی

**(١٧٨٨ ـ ١٨٦٠)**

ئارتور شوپنهاوەر (Arthur schopenhauer) فەیلەسووفی دونیاییێکی وێران و لێك ترازاو. ئەو لە دونیاییێکدا دەژیا کە پێکچونێکی زۆری لەگەڵ دونیای هەنووکەیی ئێمەدا هەبوو و بۆ تێگەیشتن لەم پێکچونە واباشە بەکورتی چاوێك بە رووداوەکانی ساڵی ١٨١٩ دا بێنین. ئەمە ئەو ساڵەیە کە تیایدا شایەتی بڵاوبوونەوەی داستانی نائومێدی شوپنهاوەر دەبین بە ناوی (جیهان وەکو خواست و بیرۆکە).

شوپنهاوەر کاتێك سەیری دەوروبەری خۆی دەکرد کە مێگەلی مرۆڤ بەترسەوە لە کوشتنگاییێکەوە بۆ کوشتنگایەکی تر پاڵی پێوە دەنرێت.

ئادەمیزاد بە یەکجاری رێورەسمی خۆی لە بیرکردبوو. رابەرە ویژدان کوێرەکان، یەك لەدوای یەك، خۆیان و شوێنکەوتووە ویژدان کوێرەکانی خۆیان بۆ نیشتمانی عەدەمیەت رەوانە دەکرد. گیانی دەسەڵاتخوازی کە سەرەتا لە لای رۆبسپێر* و دواتر لای ناپلیون خۆی بە دیار خست بە شکستێکی کاملێ کۆتایی هات. رۆبسپێر لەناو چوو ناپلیۆنیش بە دەردی شکست و بەدناوی لە سەرەمەرگدا بوو، بەڵام هێشتا خەڵك لە ژێر قامچییەکانی دیکتاتۆریەتدا ئەشکەنجە و ئازاریان دەچێشت. ئەم جارەیان قامچی بە دەست تزار ئەلێکساندەری دیکتاتۆری روسیاوە بوو کە بە

* Robespierre یەکێکە لە پێشەوایانی شۆڕشی گەورەی فەرەنسا






ناوی (یەکێتییەکی پیرۆز)و هێنانە کایەوەی برایەتییێکی گشتی لە ناو ئادەمیزادەکاندا بە شوێن ئەوەدا دەگەڕا کە گشت خەڵکی جیهان گیرۆدەی قەید و بەندی دیلێتی بکات.

بە هۆی ئەم وەسفەوە بە باشی پەی بە رەشبینی شوپنهاوەر دەبەین لە سەدەی نۆزدەهەمدا هەروەك رەشبینی هێمزنگوای (Hemingway) لە سەدەی بیستەمدا دەتوانرێ بەباشی پەی پێ ببرێت.

**ـ ٢ ـ**

فەلسەفەی شوپنهاوەر راستەوخۆ لەو حەزە لەدایکبووە کە دەست درێژیکەران بۆ سەپاندنی خواستی خۆیان بەسەر هاونەژادییەکانی خۆیاندا هەیانە و دەڵێت کە دەسەڵاتخوازی خراپەی هەرە گەورەیە کە لە جیهاندا پەیدا بووە. چونکە بە رای ئەو جیهان لە ژێر دەسەڵاتی خوای خێرخوازدا نییە و بەڵکو لە لایەن شەیتانی بەدوازەوە بەڕێوە دەبرێت. ئەم گیانە شەیتانییە حەزێکی توندی، وەکو تاعونێکی گشتی، بە سەرماندا سەپاندووە کە بە توندی دڵ بدەینە ژیان و بۆ پاراستنی ئەوانیتر لە ناو بەرین.

شوپنهاوەر حەقی خۆی بوو لەم هێزە ناماقوڵە هەڵبێت و رق و قینی لە بەرامبەریدا هەبێت چونکە ئەو هێزەی نەك هەر لە وێرانکردن و لە ناو بردنی ئەورووپادا بینی بوو بەڵکو لە نەهاتنەدیی خولیا و حەز و ئارەزووەکانی خۆیشیدا رووبەرووی ببووە. باوکی کە بازرگانێکی کامەران و بەدخولق بوو، هەوڵی دەدا ئەویش وەك خۆی بکات بە بازرگان بەڵام ئەو رق و قینی بەرامبەر ئەم پیشەیە هەبوو و گەڕان بە ناو بەسەرهاتە مەعنەوییەکانی پێ لەو بیرکردنەوانە باشتر بوو کە لە ئالۆویێردا لامان پەیدادەبێت.

بەڵام تەنانەت دوای مەرگی باوکیشی، کە دەیانگوت خۆی کوشتووە، نەیتوانی ئاسوودەیی بەدەستبخات. دایکیشی بەدخولق و لەوەش بترازێ رۆماننووسێکی بە توانا بوو و ئێرەییەکێ ناماقوول و توندی بە توانای ئەدەبیی کوڕەکەی دەبرد و دەیگوت: "کێ هەرگیز گوێی لێبووە کە لە خێزانێکدا دوو بیلمەت هەبن؟"

چەندەها جار بووە بە کێشمەکێش و دەمە تەقێیان و لێکدابڕان و دیسان هاتبوونەوە لای یەکتر تاکو دایکی سەرەنجام لە تاو تووڕەییەوە شۆپنهاوەری بە پلەکانەکاندا فرێدایە خوارەوە چونکە

شۆپنهاوەر گوتبووی کە ناوبانگی دایکی بەهۆی ناوداریی فەلسەفەکەی ئەوەوەیە نەك بەهۆی ڕۆمانەکانی خۆیەوە.

ئیتر هیچ دیداریك لە نێوان ئەم دایکە بە گەرم و گوڕە کوڕەکەی نەهاتە ئاراوە. ڕق و کینە بەرامبەر بە هێز و سووکایەتی کردن بە ژنان ناوکی بنەرەتی بیروڕاکانی شۆپنهاوەری پێکهێنا و ئەم ڕق و سووکایەتییە لە ماوەی ساڵەکانی خوێندندا توند و بەهێز بوو.

ئەو لە خۆپەرستی و فریودانی خەڵکی عەوام کە لە سیفەتەکانی ئۆستادەکانی بوو هەڵدەهات و ئەوانیش لە بایەخ پێنەدان و شێوازی پڕ لە سووکایەتیی ئەم قوتابییە ناڕازی بوون. بوو بە ئەڤیندار و تاکە ئەنجامێك کە لێی وەرگرت ئەوەبوو کە ئاشکرا بوو مرۆڤێکی "کەم تەرخەم و بێ هەست"ە.

ماوەیەك هەوڵیدا پەزیرایی لە هاوسێکانی بکات. ئاخر، باوکی داهاتێکی شایانی باسی بە ویراسی بۆی بەجێ هێشت بوو، هاوسێکان دەربەستی نان و ئاوی بوون، بەڵام قبووڵی فیکرەکانی ئەویان نەدەکرد. لەو ڕووەوە شۆپنهاوەر چووە ناو خۆ و بوو بە پیاوێکی میزاج توند و دگومان و ڕەشبین کە لە خەڵك دووره پەرێز بوو و هەرکەسێك کە هەوڵیدەدا لێی نزیك بکەوێتەوە بە تانە و تەشەر دەیڕەنجاند.

هەرگیز ژنی نەهێنا و هیچ هاوڕێیەکی نەگرت" خەڵك هەتا ئەوکاتە دۆستی تۆنە کە بتوانن سودێك لێی وەربگرن، دۆستێك کە بۆ پێویستیی خۆی دۆستایەتیت بکات لە ڕاستیدا دوست نییە بەڵکو قەرزکەرە."

شۆپهاوەر هەموو تەمەنی بە تەنیا ژیا و دەرگای ماڵ و گیرفانی خۆی بەڕووی ئەوانی تردا داخست. خۆشی سەرو ردێنی خۆی دەتاشی چونکە متمانەی بە سەرتاش نەبوو کە سەری خۆی بە گوێزانەکەی بسپێرێت.

کاتێك دەیویست بخەوێت هەفت خۆرێکی* پڕی لەژێر سەری دادەنا. عادەتەن خۆی لەو گوتار بێژانە دوور دەخستەوە کە جگە لە "دەنگە دەنگێکی بێ واتا" ئەنجامێکی تریان نەبوو. بە

* جۆرێکی دەمانچە کە حەوت گوللە دەخوات. و. کوردی



توندی لە هەر جۆرە هەرا و هۆریایێك بێزار بوو کە بێ گومان بە هۆی هەستیارییە لەرادە بەدەرەکەیەوە بوو. بەڵام خۆی ئەوەی دەدایە پاڵ هۆشە لێوانلێوەکەی و دەیگوت: "بڕی ئەو دەنگە دەنگەی کە هەرکەسێك دەتوانێت بێ ئەوەی ناراحەت بێت بەرگەی بگرێت پەیوەندییێکی پێچەوانەی بە زەرفیەتی ڕۆحی (دەروونی) ئەو کەسەوە هەیە... دەنگە دەنگ بۆ هزرمەندان ئەشکەنجەیەکی بە ئازارە."

لەگەڵ ئەمەشدا، جۆرە دەنگێك هەبوو کە ئەو حەزی دەکرد بە درێژایی تەمەنی بە بەردەوامی گوێی لێبێت و ئەویش بریتی بوو لە دەنگی هاندان (چەپڵە)و ڕێزلێنانی خەڵك. بەڵام چەندەها ساڵ پشتی لەو شادیەش بوو و تا کۆتایی هەروا بە نەناسراوی و تەنیایی مایەوە. شۆپنهاوەر ئەو پیاوەیە کە هەموو ژیانی خۆی لە ناو بێدەنگی و کڕی فەلسەفەکەی خۆیدا بردە سەر.

چەند پەرتوکێکی، یەك لەدوای یەك نووسی و لەناو ئەو کۆمەڵگایەدا بڵاوی کردەوە کە ئاوڕێکی ڕووخۆشانەی لێ نەدەدایەوە و تاکە کرێ و دەستحەقێك کە دەستیکەوت، چەند بەرگێکی بەڵاشی پەرتوکەکانی بوو کە جارناجارێ دەبوون بە نسیبی. بەشێکی زۆر لە پەرتووکەکانی وەکو پەڕە (کاغەز)ی پوچ و بێکەڵك فرۆشران و خۆی دیاریدەکرد کە: "دەبێت چاوەڕێی چ بکەی؟ پەرتووك ئاوێتەی گیانی هەر یەکە لە نووسەر و خوێنەرە. ئەگەرکەرێك لێی ڕوانی نابێت چاوەڕێ بکەی وێنەی فریشتەیەك تیایدا دەربکەوێت!"

ماوەیەکی کورت بە تەما بوو لە کونجی بێزارکەری گۆشەگیری بێتە دەرەوە. بۆیە لە زانکۆی بەرلیندا پیشەی مامۆستایەتیی هەڵبژارد و زنجیرە بابەتێکی درەوشاوە و دڵگیری ئامادەکرد و لە هۆڵە بەتاڵەکاندا خوێندیەوە. خەڵك بە قەد خوێندنەوەی فیکرەکانی لە بیستنی دەربڕینەکانیشی هەڵدەهاتن.

لەو ڕووەوە بڕیاریدا کە وەك تیمۆنی ئەسینایی* واز لە خەڵك بێنێت تا بەهۆی گەمژایەتییەوە خۆیان بە سێدارەوە هەڵواسن. لەوێوە بۆ فرانکفورت ڕۆیشت و سی ساڵی پاشماوەی تەمەنی خۆی لەوێ، لە ئاپارتیان (شوقە) بێکی دوو ژووریدا کۆتایی پێهێنا. تاکە هاودەمێکی سەگێکی بچووك بوو. "بەد گومانێکی تر وەك خۆم"

* Timon of Atheens لە یۆنانییە کۆنەکان کە بە توندی لە خەڵك هەڵدەهات.





شۆپنهاوەر ناوی سەگەکەی کردە ئاتما (Atma) کە وشەیەکی هیندییە بە واتای (گیانی جیهانی) بەڵام خەڵکی شار بە "شۆپنهاوەری لاو" ناویان دەبرد.

زۆربەی کات لە ژوورەکەیدا دەمایەوە بەڵام نانی نیوەڕۆی لە هوتێلی ئینگلیزی دەخوارد. کاتێك شۆپنهاوەر لەگەڵ سەگەکەی کە پەتێکی لە مل بوو لە هوتێلەکە وەژوور دەکەوت، خزمەتکاران (گارسۆنەکان) لەبن گوێی یەکتریاندا دەچرپاند: "دوو فەیلەسووف هاتنە ژوورەوە!" کاتێك لە پاڵ مێزەکەی دادەنیشت هەردەم پارچە پارەیەکی زێڕی لە سەر دادەنا و کاتێك خواردنی تەواو دەبوو پارچە پارەکەی دەخستە گیرفانییەوە. جارێکیان گارسۆنێك لێی پرسی: "جەنابی شۆپنهاوەر دەکرێ بفەرموون بۆچی ئەوها دەکەی؟

شۆپنهاوەر وەڵامی دایەوە: "گرەوم لەگەڵ خۆمدا کردووە کە یەکەم رۆژ کە لەم رێستورانتەدا کڕیارەکان سەبارەت بە بابەتێك قسەبکەن جگە لە بابەتی ئەسپ و ژن و سەگ، ئەم پارچە پارەیە بخەمە سندوقی یارمەتیدانی هەژارانەوە!"

روو قایمییە لە هەستدەرەکەی ببوو هۆی ئەوەی کە نەك تەنیا لای خەڵکی گشتی بەڵکو لە ناو کەسانی تێگەیشتوو و بیرمەندیش وەك "توخمێکی نەویستراو" بناسرێت.

زانکۆکان وەریان نەدەگرت چونکە نووسین و قسەکانی روون و ئاشکرا بوون و مەزە (یان چەژە) یەکی باش و گاڵتە و گەپی تێدا بوو و ئەنجوومەنی فەلسەفییەکانی ئەو سەردەمە ئەم دوو سیفەتەی ئاشکرایی و گاڵتەکاری وەکو کردەوەی تاوان ئامێز، بە چاوێکی خراپەوە سەیر دەکرد. زانایانی رووکارخوازی زانستی سەروو سروشتیش شۆپنهاوەریان بە رەفزکراو دادەنا چونکە هزرە فەلسەفییەکانی بە جەسارەتێکی تایبەتییەوە دژ بە بیردۆزەکانی ئەوان بوو "ئەمە هەمان ئەو ئازارە دێرینەیە کە لە نێوان دوو بەد فەرادا هەیە." کەسانی سەر بە قوتابخانە و زانکۆکان لەسەر بە خۆیی فیکرەکەی توڕە بوون و ئەو پوختە و شیرەی بیردۆزێك کە ئەوان دوای چەندەها ساڵ زەحمەت و رەنج لێی تێدەگەیشتن، بەگورجی لێی تێدەگەیشت.

شۆپنهاوەر لە سووکایەتی کردنی ئەوان بە فیکرە نائەکادیمیەکانی خۆی ناراحەت بوو.

لە پەرتووکی "جیهان وەك خواست و بیرۆکە" رەخنە توندەکانی خۆی بە باسکردنی چیرۆکێك لە بارەی ئەکتەرێکی ئەو سەردەمە بە ناوی ئونزێلمان (Unzelman) دەربڕیوە.





ئونزێلمان خووی بەوەوە گرتبووکە لەسەر سەکۆی تیاترۆ بێ رامان قسەبکات و هەندێك قسەی خۆی بۆ دیالوگەکان زیادبکات. بەڕیوەبەری تیاترۆ لەپای ئەم رووقایمییەوە سەرزەنشتی کرد و لە درێژەدان بەم کارە قەدەغەی کرد.

کاتێك ئەو لەسەر ئەسپ لە سەر سەکۆی تیاترۆ دەرەکەوێت یەکسەر دوای هاتنە ژوورەوەی، دەنگێکی نابەجێ لە ئەسپەکە دەردەچێت کە پێشتر پێشبینی نەکرابوو، ئامادە بووان لە ژێر لێوەوە دەکەونە پێکەنین و ئونزێلمان بە ئاوازێکی جیددییەوە ئەسپەکە سەرکۆنە دەکات و دەڵێت: مەگەر نازانی کە قسەی* بێ رامانمان لێ قەدەغەکراوە.

سەرتاپای فەلسەفەی شۆپنهاوەر وەکو رەفتاری ئۆتێلمان، بە شتی سەیر و رەخنەکانی بارگاوییە، ئەگەر حوکمێکی تەواو بدەین، ئەوا هەندێك جار بێ سوود و نەگونجاون. لەگەڵ ئەمەشدا فەلسەفەکەی وێنەیەکی راست و واقیع بینانەی جیهانە و ناشیرینی و جوانیی پێکەوە تیایدا ئامادەنە جیهان وەکو خواست، کاتێك لە چاویلکەی تاریکی شۆپنهاوەر سەیربکرێت. جیهانێکی پڕ لە خەم و ترسناکە و هیچ دراماییێکی دڵگیر تیایدا نییە. کەس بەرلە شۆپنهاوەر نەویراوە روخساری حەقیقەت ئەوها بێ پەردە و لە رووبەرووە ببینێت. ئەوەی هاتۆتە بەرچاوی هەمووی کێشمەکێش و دوژمنکاری و نائومێدی و ئازار و رەنجە.

- ٣ -

شۆپنهاوەر دەڵێت گەورەترین بەدبەختی لە دونیادا دوژمنایەتیی ئادەمیزادەکان و خواست و حەزیانە بۆ درێژەدان بە ژیان. ئەمە حەز و خواستێکی کوێرانە و پووچە. چونکە ژیانی ئادەمیزاد شتێکی بێ نرخە و مرۆڤ لە بنەڕەتدا ئافرێنراوی ئازار و رەنجە.

ئێمە دیلی ژیانین و لە بەرئەوەی حەزی ژیان ئێمە بۆ درێژە پێدانی رادەکیشێت ناچارین هەردەم بەشوێن بابەتێکەوە بین بۆ سەرقاڵ بوونی خۆمان.

بە پێی ئەم وەسفە، لەو ساتەدا کە بە مەرام دەگەین هیچ ئەنجامێك دەستناکەوێت و جگە لە بارێکی قورس و بڕست بڕ و لەهەمان کاتدا بێ کەڵك و پوچ شتێکی ترمان لەسەر پشت نییە.

* Improvisation قسەکردن بێ بیرکرنەوە و دەربڕینی ئەو قسانەی کە پێشتر ئامادە نەکراون.

بەم جۆرە ژیانی ئێمە بریتی دەبێت لە زنجیرەیەك وەهم و ئەو کارانەی کە یەکبینە بەدوایدا دەڕۆین. وەکو ئاونگ (مێلاق) بەردەوام لەنێوان ئازاروڕەنجی دەست کەوتوو لە حەز و ئارەزوو و هەوڵ و تەقەڵلای پووچ و بێ کەڵك لە لاییێکەوە بۆ لاییێکیتر لە جووڵەداین، چونکە هەموو خۆشحاڵی و شادمانییەکانی ژیان مۆرکێکی نێگەتیڤیان هەیە. هەرکە بە مەبەست دەگەین وەکو ئەوە وایە کە تبنوێتیمان شکابێت بەڵام یەکسەر تراویلکەیەکی تر بەر چاو دەکەوێت و بەرەو لای خۆی رامان دەکێشێت، هەروەك کە شۆپنهاوەر وەبیر دەخاتەوە و رێك بە پێچەوانەی رای گشتی (باو)، نەبوونی شادی و بەختیارییە کە ئێمەی بەم چەشنە شەیدای ئەو کردووە. ئێمە زیاتر لە هەموو شتێك دڵمان بەو شتانەوە بەند دەبێت کە بە دەستمان نەهێناون، شادی و بەختەوەری هیچ نینە جگە لە خەونێك و تاکە حەقیقەتێك کە بوونی هەیە ئازار و رەنجە. ئەمەیە ئەو دونیایەی کە تیایدا دەژین. دونیای ئیدیالەکانی

ئەفلاتوون، لە فەلسەفەی شۆپنهاوەردا، دەبێتە دونیای تاکە وێنایەك کە بریتییە لە حەز و خواستێکی هەتا هەتایی لە سور بوون لەسەر درێژەدان بە ژیانێك کە پڕە لە بێهیوایی و نائومێدی. ئێمە ناتوانین لە ئاییندەدا دڵ بدەینە شتێك و جگە لە بە دووکەوتنی خەونەکان کارێکی ترمان نییە، هەوڵێکی بێسوودە بۆ بە دەستهێنانی ئەم خەونانە بەکار دەبەین و پاشان ویستی ئیرادە ئەوەیە کە بە شوێن بابەتێکی پۆچ و بێ نرخێکی ترەوە دابین.

ئایا کۆتاییێك بۆ ئەم کارە هەیە؟ ئایا تەنانەت مەرگ لە توانایدایە رێ لە بەدووکەوتنی ئەم نژادە شێتە بگرێت بۆ سێبەرە پوچ و رەوکەکان بگرێت ئایا شتێك لە شێوەی "نیروانای بودا"و لەگەڵ بەستێی لەبیرکردن بوونی نییە کە لەم مەوتەکە زریاناوییەی بوونەوە بۆ ئەوێ پەنا بەرین؟ بەداخەوە نەخێر. ئارەزوو و حەزی توند بۆ ژیان، هەتا هەتاییە.

شۆپنهاوەر دەڵێت: تەنانەت مرۆڤ بەهۆی خۆ کوشتنیشەوە ناتوانێت کۆتایی بەم تێنوێتییە گشتیەی درێژەدان بە ژیان بێنێت چونکە هەریەکەمان بەشێکە لە بوونێکی ئەزەلی و هەتاییی و هەرچەندە ئەگەری ئەوە هەیە بەشێك بمرێت، بەڵام بەشە ئەزەلییەکە بە رووپامایییەوە دریژە بە ژیان دەدات.

مەرگ دەشێ دوژمن، یان باشتروایە بڵێین، دۆستی کەسانی زیندوو بێت بەڵام خواستی جیهانی بۆ دریژەدان بە ژیان، دوژمنی سەرسەخت و دەستەمۆ نەبووی مردنە ـ دوژمنی ئاسوودەییێکی



بێ دڵنیگەرانی، دوژمنی کۆتایی پێهاتنی تەواوەتیی ئازار و رەنج. بەم چەشنە خواستی جیهان گاڵتەیەکی هەتا هەتایی لەگەڵ ئێمەی هەیە. ناچارمان دەکات، بەرلەوەی بمرین، نەوەیەکی تر بدەینە دەست ئەم دونیا بە خەمداگرتووە.

"پەیوەندییە سێکسییەکان ناوەندی سەرەکی و نادیاری گشت کردەوە و رەفتارەکانمانە، هۆی رووداني شەڕ و ئامانجی ئاشتییە. لەهەر ساتێکدا وەکو فەرمانڕەوایێکی رەها سەیری دەکەین کە لەسەر تەختی فەرمانڕەوایی دانیشتووە کە پێکەنینێکی گاڵتەئامێز بۆ کردەوە و جوڵە پووچەکانی ئێمە دەکات کە بۆ هێنانەکایەوەی ئەم پەیوەندییە یان سنووردارکردنی و پووشاندنی بەکار دەهێنین."

شوپنهاوەر بڕوای وایە کە تێنوێتییە روو لە زیاد بووەکەی مرۆڤ ئەوی بە بەردەوامی بە زنجیر بە چەرخی ژیانەوە بەستووەتەوە. سروشت هەڵی خەڵەتاندووین کە ئەم بەدبەختییە هەمیشەییە لە رەگەزی خۆماندا بپارێزین: "سروشت چەندەها ساڵ سامانێکی جوانی و دڵڕفێنی (فریودەری) بە نرخی پاشماوەی تەمەنی بەژن بەخشیووە تا لەو ماوەی ئەو ساڵانەی دڵڕفێنی و گەشاوەییدا بتوانێت سەرنجی هەندێك لە پیاوان بۆلای خۆی رایکێشێت بە رادەیەك کە ئەوپیاوە بۆ لە ئەستۆگرتنی ژیانی هاوبەش و چاودێریکردنی ئابڕوودارانەی ئەو پەلەبکات... دوایی، هەرکە یەك دوو منالی بوو، رێك وەکو مێروولەی مێ کە دوای سك پڕی باڵەکانی دەوەرێن، جوانی خۆی لەدەستدەدات چونکە ئیتر ئەرکەکەی تەواو بووە." ئەو کەسەی کە دەبێتە ئەڤیندار ئامرازی بێ ئیرادە و کارکەری کوێری سروشتە. هەرکە سرووشت بە مەبەستەکەی خۆی گەیشت و ئەو گرووپەی کە مەبەستی بوو بۆ بۆ گۆڕەپانی ململانێی مانەوە نارد، بینایی بۆ چاوی ئاشق دەگەرێنێتەوە. لەم کاتە بەدواوەیە کە تا لێی هەڵخەڵتان و شەیدایی لە دەمدا دەردەکەوێت پیاوەکە ئیتر نیوە خوا نییە بەڵکو گیانلەبەرێکی دڕندەیە کە ناوی مێرد (شۆ)ی پێبڕاوە و ژنەکەش کە فریشتەیەك بوو، دەبێت بە بوونەوەرێکی (جەستە بچووك، لاواز باریکەڵە)، کورت" کە بە خێزان (ژن) ناو دەبرێت. بەم شێوەیە مرۆڤ بۆی دەردەکەوێت- بەڵام گەلێك درەنگ ـ کە مایەی پێکەنین (گاڵتەجاڕ) یان قەشمەری چارەنووس بووە."





ئیتر ئاوازە دڵبزوێنەکانی خۆشەویستی وەکو قیرە قیری قەل بێکەڵك و (گوێ ئازاردەر)ن. "ئەگەر شەهوەتی پێترارك* قایل ببایە، ئاواز و گۆرانییەکانی لە ناو بێدەنگی و کرپیدا ون دەبوون." کەواتە بە پێی ئەمە ئیرادەی ئازاد یان ئیختیار بۆ مرۆڤ لە ئارادا نییە. مرۆڤ وەکو گەڵاییێك لە دەستی (با) یەکانی ژیان بۆ ئەم لا و ئەولا پەرش و بڵاوە. وەکو رووبارێك بەو روتگەیەدا دەڕوات کە سرووشت بۆی ئامادە کردووە. مەشخەڵێکە کە بۆ ماوەیەکی کورت لەناو بڵێسە سەرکەشەکاندا دەدرەوشێتەوە. "هەرکەسێك وا دادەنێت کە بە تەواوەتی ئازادە... بەڵام لە ئەنجامی ئەو ئەزمونانەی کە بەدەستدێنێت بۆی دەردەکەوێت کە تەنانەت لە کردەوە شەخسیەکانیشدا ئازاد نییە بەڵکو مەحکومە بە پابەندی و زەرووەرت و سەرەڕای ئەو هەموو بڕیار و ڕێ و شوێنانەی کە دەگرێتەبەر، لە بواری گۆڕینی خولق و خووی خۆیدا بێ توانا و داماوە و... ناچارە ئەو خولق و ئەو سیفەتانەی کە مەحکووم کراوە بە هەبوونیان، هەروا لەگەڵ خۆی بهێڵێتەوە." مرۆڤ هیچ جۆرە دەسەڵات و ئیختیارێکی بە سەر ئەو خولق و ئاکارەدا نییە کە لە ناو تراژیدیای ژیاندا دەستیکەوتووە ـ ژیانێك کە بە شەڕە سامناك و یەك لە دوای یەکەکان بارگاوییە.

ئەمەیە وێنەیەك لە ژیانی سەردەمی شۆپنهاوەر هەروەك ئەمڕۆش شتێکی لەوە زیاتر نییە. هەرکەسێك بۆ داگیرکردنی "سامان و شوێن و پلە"ی کەسێکی تر، لە شەڕ و جەنگدایە.

مێروولەکانی بولدۆگ (Buldog)ی ئوسترالیا ئەم حەقیقەتە بە شێوەیەکی ئاشکرا بەدیار دەخات. چونکە کاتێك ئەم مێروولەیە دەبێتە دوو لەت، لە نێوان بەشی سەر و کلك شەڕ دێتە ئاراوە، سەر، کلك بە ددان دەگەزێت و کلك، بە پێوەدانی سەر، بەرگری لەخۆی دەکات و ئەم کێشمەکێش و مل ملانێیە ئەوەندە بەردەوام دەبێت تا هەردووکیان دەمرن یان ئەوەتا مێروولەکانی تر ناوبژی بکەن و هەدووکیان لە یەکتر جیا بکەنەوە.

ئەم تینوێتییە بۆ کوشتن و خوێنخۆری لە گشت جۆرەکانی گیانلەبەراندا هەیە و لەجۆری مرۆڤدا بەشێوەیەکی ئێجگار شەیتانی و گڵاو رەگی داکوتاوە.

* petrarch ( ١٣٠٤ ـ ١٣٧٤) شاعیری گەورەی ئیتالیایی



مرۆڤایەتی بۆیە گەیشتۆتە رادەی بەرکەمالی تا شێتایەتی جەنگ بگەیێنێتە بەرزترین رادە و ئەو شێتایەتییە لە بەرامبەر خواست و حەز بۆ ژیان، بخاتە بەردەم دید و روانین.

شەڕ و مل ملانێ هۆی سەرەکی خراپەن لەم ژیانە بە ئازارەدا. لەو دونیایەدا هیچ ژان و ئازارێك لەوەی لەم دونیایەدا هەیە، بە ئازارتر نییە. "مەگەر دانتی بابەتەکانی بەشی دۆزەخی پەرتوکەکەی خۆی لە شوێنێك جگە لەم ژیانە خاکییەی ئێمە ئامادەکردووە؟"

ئەم ژیانە خاکییە تراژیدیاییێکی پێکەنیناوییە ـ ئەگەر بە شێوەی بەشەکی لێی بڕوانین پێکەنیناوی دەبێت، هەرکاتێکیش وەکو گەشتێك سەیری بکەین ئەوا تراژیدی دەبێت.

کەواتە چار چییە؟ شۆپنهاوەر دەڵێت: دەبێت ژیرانە و ئارام چارەنووسی خۆمان قبوول بکەین. دەبێت وا بێنینە بەرچاومان کە "ژیانی ئێمە بازرگانییێکە کە سوودەکەی لە خەرجەکەی کەمترە." کەواتە لێگەڕێن با ئەم تینوێتییە توندەی رکابەری و هەڤڕکی دامرکێنینەوە و غەریزەیەکی بیرکردنەوە لەخۆماندا پەروەردە بکەین . "رێگەی راست دەست خستنی حیکمەتە نەك کۆکردنەوەی سامان."

وەرن با بایەخ بەو بابەتە بدەین کە ئێمە چین؟ نەك ئەوەی چمان هەیە؟ لەم دوو بارە بەدەر نییە: هەر کەسێك یان دیلی خواستێکی دژوار و بێ باکە و یانیش خاوەنی زانیاری ئارام و روونە. ئێمە دەتوانین گیانی خۆمان وەها پەروەردە بکەین کە خۆی لە گوێ رایەڵی خواستی ئێمە لا نەدات "هەفسار لەگەڵ ئەسپی کێوی و دەستەمۆ نەبوو هەمان ئەوکارە دەکات کە هۆش لەگەڵ پیاوێکی خاوەن ئیرادەی بەهێز دەکات." هۆش و توانای هزریی خۆت پەروەردە بکە بەڵام نە لەرێگەی خوێندنەوەی پەتی بەڵکو بە رێگەی بیرکردنەوەی هاورێ لەگەڵ کردار. شۆپنهاوەر رەخنە لە شێوازی ئەکادیمیانە دەگرێت و دەڵێت: "حەز و مەیلی زۆربەی ئەم خاوەن فەزلانە بۆ خوێندنەوە وەکو ترۆمپەوایە" بۆش بوونی مێشکەکانی خۆیان رابکێشن“ "هەر کەسێك کاتێکی زۆر بە خوێندنەوەوە بە سەر ببات بەرە بەرە توانای بیرکردنەوە لە دەست دەدات." ژمارەیەکی کەم پەرتووك بخوێنەوە بەڵام باشترینیان هەڵبژێرە. ئەزموون و بینینەکانی خۆت لە بری دەقی پەرتووك دابنێ و خوێندنەوەش لە حوکمی راڤەکردنیاندا دابنێ. چونکە دواجار ئەمە ئەزموونەکانی رۆژگاری رابردوونە کە دەبن بە رێنماییکەری ئاینده. "سەرەنجام هەر کەسێك بە تەنیا دەمێنێتەوە." لە هەمو کەسێ بەختەوەرتر ئەو کەسەیە کە توانای خۆی





لە خودی خۆیدا بدۆزێتەوە. لە خودی خۆیدا بەڵام نەك بۆ خۆی. مرۆڤی هزرمەند رێنماییکەر و چاودێری خۆیەتی و فەرمان بە سەر ئەوی تردا نادات. تەنیا بەم ریگەیە ئازادیی تەواو و رزگار بوون لە باڵادەستیی خواستی لە گۆڕان نەهاتووی درێژەدان بەو ژیانەی کە خراپییەکانی کۆتاییان پی نایێت، دەستدەدات. ژیانی ژیرانە بەسەرهاتێکە لە رەنج و ئازار کە بە ئارامی و ئاسوودەیی کۆتایی دێت؛ "ئەم ئاشتی و ئاسوودەییە لە وێنابەدەرە، ئەم ئارامییەی گیان و ئاسوودەییە قووڵە، بنەما و حەقیقەتێکی تەواو و لە شکان نەهاتووە. لەم بارەدا ئیرادە بەیەکجاری لە ناو دەچێت و جگە لەزانست شتێك بەجێ نامێنێت.

- ٤ -

"بەرزترین شێوەی زانستی بەدەر لە کۆنترۆڵی خواست، بلیمەتییە." بلیمەتی بەپێچەوانەی ئەوەی کە زانایان وەسفیانکردووە، توانایێکی نادیاریکراو بۆ بەرگە گرتنی رەنج و ئازار نییە. بەڵکو "هێزێکە کە مرۆڤ لە کۆت و بەندی دڵبەندی و ئارەزوو و ئامانجە تایبەتییەکانی (شەخسییەکان) رزگاردەکات و کەسەکە بە یارمەتی ئەو زانیارییە بێگەردانەی کە بەدەستی هێناوە روانینێکی روون یان گەش لە بارەی جیهانەوە پەیدا دەکات."

هەر ئەو جۆرە بلیمەتییە بوو کە شۆپنهاوەر وای دادەنا کە لەلای ئەو هەیە. فەلسەفەی ئەو بەشێکی، راڤە و روونکردنەوەی سەردەمێکە کە لە پای بە فیزی کۆمەڵە کەسێکی کەمی ئۆتۆکرات، تووشی پەشۆکاوی و بێ سەروبەری ببوو و بەشەکەی تر لە ڕاستیدا روونکردنەوەی هەڵسوکەوت و کرداری خۆی بوو کە وایدەنواند دووره پەرێز بووە و حەز و دڵبەندیی بۆی نەماوە.

بەڵام لەراستیدا رەفتار و کرداری شۆپنهاوەر گوزارشتی لە هەموو شتێك دەکرد جگە لە واز هێنان لە دونیا و بێ مەیلی بەرامبەری. نەك بە ئارامی و گەردەنیشتێکی بیرمەندانەوە، بەڵکو بە ئاوازێکی توند و تیژ رەخنەی لە دەوروبەر و ناوەندی ژیانی خۆی دەگرت و هەندێك جار رەخنەکانی ئەو دەبوونە هۆی شەڕ و پێکدادان. ئەو کوڕی خۆسەر (تاك رەهەند)ی باوك و دایکێکی کەللەرەق بوو. رۆژێکیان لەگەڵ خزمەتکارەکەی بەشەڕهات و بە پلیکانەکاندا فڕێیدا خوارەوە و قۆڵی شکاند. ژنەکە لە دژی شۆپنهاوەر لای دادگا سکاڵای کرد و رای دادگاکە دیاری کرد کە تا ئەو ژنە لە ژیاندایە شۆپنهاوەر ناچارە چاودێرییەکەی لە ئەستۆبگرێت.



شۆپنهاوەر هەردەم لە ژیانی خۆی دەترسا و بە توندی لەو بڕوایەدا بوو کە دوژمنەکانی بەتەمای کوشتنین ئەون و دەیانەوێت بەهۆی خواردن و دەرمانی زیادە و ئەنفییەی ژەهراوی ژەهر خواردی بکەن.

شۆپنهاوەر خۆی بە دێوەزمەیەك دەزانی کە لە ناو نەژادێکی بچووك و نزم (زەلیل)دا دەژیت. ئیشتیای وەکو پێداویستییە رۆحی (دەروونی) یەکانی بێ کۆتایی بوو. رۆژێکیان بە پیاوێك کە بە سەرسامی سەیری مێزی نان خواردنەکەی دەکرد گوتی:

"بەڵێ من سێ هێندەی تۆ خواردن دەخۆم بەڵام سێ هێندەی تۆش بیردەکەمەوە!"

لەکاتی خواردندا بە بەفیزی و غرووری‌کی تایبەتیتیەوە سەبیلەی دەکێشا. بۆری سەبیلەکەی یەك مەترونیو دەبوو. لەوکاتەدا کە مژێکی درێژخایەن و قایمی لە سەبیلەکە دەدا لە جیهانی بیرکردنەوەدا لە تارمایی دووگیانی هاوبیر و هاوحەزی بوودا و کانت مۆر دەبێتەوە و چاوی دەبڕییە چاوەکانی ئاتمای سەگی کە تاکە بوونەوەرێکی زیندوو بوو کە دەربەستی و دڵبەندی خۆی بەرامبەر پێشان دەدا و دەیگوت: "من لە پاڵ دوونیوە خوا و سەگ هەست بە ئاسوودەیی دەکەم. تەنیا ئەمانەن کە لە کەم و کورتییەکانی ئادەمیزادیانە بێ بەرین."

شۆپنهاوەر بەرامبەر بە سەهوەکانی خۆی و ئەوانیتریش ئێجگار هەستیار بوو. چاوەکانی نزیك بین بوون کەچی خۆی لە بەکارهێنانی چاویلکە دووردەخستەوە. کاتێك شانی لە شانی رێبوارێك دەدا ئەوا بەرامبەرەکەی بەبێ تەرکیزی وبێ ئاگایی تۆمەتبار دەکرد و پرتەپرتی دەکرد کە: "گەمژە نازانی بە رێوەش بڕۆی؟" لەو ناکۆکیانەدا کە لەگەڵ خەڵکدا بۆی دروستدەبوون هەمیشە خۆی بە خاوەن حەق و ئەوانیتری بە شایستەی سەرکۆنەکردن دەزانی وای دادەنا" "گیانێکی ناسکە کە لەسەردەمی ئاسن" دا ژیان بەسەر دەبات و یەکێك لە رەخنەگران گوتوویەتی: "بەڕاستی شوێنی ئەو پشت میلە ئاسنینەکانە." رەشبینیەکەی شۆپنهاوەر لەڕاستیدا نیشانەی گیانێکی بریندار بوو. ئەو دونیای کردبوو بە بابەتی گاڵتەجاڕی چونکە دونیا لە ئاوڕدانەوە لەو سەرپێچی کردبوو تاکو کات دەرباز بوو و زۆر درەنگ داهات. لەوکاتەدا کە پیر و پەککەوتە ببوو، لە چاو وگوێیدا بینایی و بیستن نەمابوو، ددانەکانی بە یەکجاری کەوتبوون و تێنوێتی ناو بانگ خوازی و ئیشتیای بۆ خواردن رووی لە کەمی کردبوو دواجار ناودار بوو و لەراستیدا رێزلێنان و ئافەرین بێژیی خەڵك رووی لە مردوویێکی بزۆك





کرد. شۆپنهاوەر بە زەهرخەنەیەك وەریگرت و گوتی: "ئێستا، دوای ئەوەی کە ساڵانێکی دوور و درێژ لە دوورە پەرێزی و تەنیایی و بێ ناویدا ژیانم بەسەر بردووە، خەڵك بە (دەهۆڵ و زورنا) بەرەو گۆڕم دەبەن!)

ئیتر خەڵکی دونیا دەهۆڵ و زورناکەی ئەویان بۆ شەڕ و خوێنرێژی لێ دەدا و فێرکاری ئەو، خواستی شەیتانی بۆ زاڵبوون و سەرکەوتن، لە گوێی خەڵك بەجێمابوو.

لەساڵی ١٨٦٠ پەندە لاتینییەکەی "مرۆڤ گورگی مرۆڤە" لە وڵاتانی ئەڵمانیا، فەرەنسا، ئیتاڵیا، نەمسا و وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا ببووە پەندێکی راستبێژ. بەڵام نەك ئادەمیزادەکان، بەڵکو درندەی مرۆڤ ئاسا بوون کە کەوتبوونە ئاوێزی یەکتر و گەروی یەکتریان دەگۆشی (دەستیان خستبووە بیناقاقای یەکتر).

لەم بگرە و بەردەیەی بەئەرك کردن و ناچاری لە دایکبوون و جۆش و خرۆشی ژیان و ئارامی و بێدەنگی مەرگدا، رەنگە کاری ژیرانە ئەوە بێت کە رەگەزی مرۆڤ دەست بە خۆکوشتن بکات و یانیش ئەوەی کە بە هەر رێگایەك و بە بەرگەگرتنی هەر جۆرە دژوارییێك شان بدەنە بەر زگوردێتی و هاوسەر نەگرتن تا زەوقی درێژەدان بە ژیانێکی پڕ ئاژاوە و خراپە لە مرۆڤدا بکوژرێت و لەناو بچێت.

بەڵام ژیان، تەنانەت ژیانی شۆپنهاوەریش، بەسەرهاتێکی جۆشدار و پڕ لە هەیەجانە. خۆشەویستی نواندن و بە موراد نەگەیشتن، ژیان بەسەر بردن ئەوجا مردن، تاڕادەیەك باشترە لەبێ بەش بوون لە ئەڤین و بێ بەری بوون لە ژیان.

پێکەنینی دڵگیری منداڵ، جوانییە دڵخۆشکەرەکەی هونەر، زەوق و چێژی تێگەیشتن، دوبارە لەدایکبوونەوەی بەهاری دوای مەرگی زستان، ئایا ئەم هەموو شادییە گیانپەروەرە بای ئەوە ناکەن کە مرۆڤ رەنجی ژیان و زیاتر لەوەش بەگیان بکرێت؟

شەوق و زەوق و چێژی تێگەیشتن، لەدایك بوونەوەی سەر لە نوێی بەهار. چ دەبوو ئەگەر جۆرە پەیوەندییێك لە نێوان ئەم دوانەدا دەربکەوتایە و تێگەیشتنی کامل و لەدایکبوونەوە پێکەوە کۆببانەوە. لە بری نەبوونێکی رەها، مرۆڤ لە بوونێکی نەمردا نقوم دەبوو. رەنگە خواست و حەز بۆ ژیان مانای تەواو وردی بوون و ژیانیش دوایین وشە بێت بۆ گەیاندنی ئەم واتایە.



شۆپنهاوەر بە ئاسوودەیی کەوتبووە سەرکورسییەکەی و سەری بە سەر سنگیدا چەمابووە. خاتوونی خاوەنی خانوو پرسیاری کرد: "بەرێز شۆپنهاوەر، نەخۆشی؟" بەڵام کاتێك هیچ وەڵامێکی نەبیست و لێی چووە پێش بینی کە رەشبینە بە ساڵدا چووەکە ماڵئاوایی لە دوونیا کردووە بەڵام بەلایەنی کەمەوە لە دوایین ساتدا زەردەخەنەیەك لەسەر لێوی نیشت بوو.





# گەشتی ئۆگوست کۆنت

## لە خۆ کوژییەوە بەرەو پاکی

**(١٧٩٨ ـ ١٨٥٧)**

ئۆگوست کۆنت (Auguste Conte) گوتوویەتی مرۆڤ بە شێوەیەکی پەتی زادەی دەوروبەرەکەی خۆی نییە بەڵکو تووش بەقەد خاك بایەخی هەیە لەیەك پارچە زەویدا داری مێوە و دەوەنی دڕکاوی و گوڵ و گیا پێکەوە دەڕوێن.

ژیانی ئۆگوست کۆنت شایەتێکی راستگۆی ئەم بانگەشەیەیە. ئەویش کە لە هاوچەرخەکانی شۆپنهاوەر بوو، لەو ساتەدا کە لە سەر لێواری هەڵدێری چارەڕەشی و بەدبەختی بوو، جیهانی بە هەمان چاویلکەی شۆپنهاوەر سەریر دەکرد، بەڵام لەبری ئەوەی پشتی تێبکات و بێزاری خۆی لە بەرامبەریدا بە دیاربخات، بڕیاریدا کە دونیا بە گوێرەی حەز و ئارەزووی خۆی بگۆڕێت ئەویش وەکو شۆپهاوەر لەو بڕوایەدا بوو کە بە بوونی ئەم هەمو زوڵم و ستەم و بێ عەدالەتییە لە ژیانی ئادەمیزاددا ناتوانرێ بڕوا بە خێروخوازیی خودێکی بەرز و بوونێکی باڵا بکرێت. بۆیە بڕیاریدا ئایینێك دابمەزرێنێت کە شوێنێك بۆ خوا تیایدا نەبێت. ڕێبازی نوێی مرۆڤدۆستییەکەی ئەو زادەی خودی ئەم هزرە بوو. ئەم ڕێبازە فەلسەفییە لە ژیانێکی زریاناوی و پڕ ئاژاوەوە سەری دەرهێنا: ژن هێنانێکی سەرنەکەوتوانە، بە ئامانج نەگەیشتن لە ئەڤینێکدا کە بەرامبەر بە ژنی پیاوێکی تر دەری دەبڕی، شێتی، لەدەستدانی پیشە، هەوڵی خۆکوژی و دوای ئەمانە ئەو ئاسودەییەی کە لە لەخۆبردوویی لە پێناو ئەوانیتردا هەستی پێکرد، ئەمانە گشتیان لە دەرکەوتنی ڕێبازە فەلسەفییەکەی ئەودا دەستیان هەبوو؛ (ئەی ئەو هاوڕێیانەی کە





هەموومان لە کۆت و بەندی چارە نووسێکی بێبەزەییدا گرفتارین، وەرن با لەگەڵ یەکتر میهرەبان و خەمخۆربین.)

لەو ساڵانەدا کە چارەڕەشی و بەدگومانی جیهانی لە خۆ پێچابووەوە، ڕێبازەکەی ئۆگوست کۆنت لێوانلێو بوو بە چاکە و خۆشەویستی.

**ـ ٢ ـ**

ئۆگوست کۆنت مرۆڤێکی بەژن کورت بوو بەڵام ناوێکی درێژی هەبوو:

ئیزیدۆر ئۆگوست ماری فرانسوا ئیگزاڤیەر کۆنت ( Francois Xavier conte Isidmre (Isidre Auguste Marie

لە ساڵی ١٧٩٨ لە مونپیلە لەدایکبوو. بەرامبەر بە بنیامین فرانکلین* کە بە (سۆکراتی چاخی نوێ)ی ناودەبرد ڕێزێکی تایبەتی لەدڵدا هەبوو و هەوڵیدا لە ژیاندا ئەم "ژیرترین ئەمریکاییە" بۆ خۆی بکاتە نموونەی پێڕەوی لێکردن؛ فرانکلین لە تەمەنی بیست و پێنج ساڵیدا بڕیاریدا فێری هەموو زانستەکان بیبێت "... منیش هەرچەندە تەمەنم بیست ساڵ زیاتر نەبوو وێرام و ئەم ئەرکەم گرتە ئەستۆ."

بۆ بەدەستهێنانی ئەم زانیارییانە، ئۆگوست کۆنت وەکو سەرەتایەك سکرتارێتی سانت سیمون ـ ئەو خۆش باوەڕ (ساویلکە) بەناوبانگەی کە لەو بڕوایەدا بوو هەموو قوتابخانە فەلسەفیەکان دەبێت لەرێگەی کاملکردن و پێشکەوتنی کۆمەڵایەتیانەی مرۆڤدا ڕێبەری بکرێن ـ ی پەسەند کرد. هەرچەندە کۆنت لە کاتۆلیك پەروەردە ببوو، فیکرە و پێشنیارەکانی ڤۆلتێر کاریان تێکرد کە دەیگوت: "شوورەیی و ریسوایی لە ناو ببە)، مەبەستی لێی ئایین و خورافاتی ئایینی بوو. بەڵام سەرەرای هەموو ئەمانەش (باڵایی)ی ئایینی ناسیی و بەتایبەت ستایشی زەوق و دەربەستی و دڵبەندیی قەشەکانی کرد لە چاکسازیی دێرە چیاییە کاندا.

"هەندێك جار مرۆڤ، زیاتر لەوەی کە وادیارە سرووشت دەیەوێت، میهرەبان دەبێت." بەڵام تەنیا لە بارێکدا کە وازی لێبهێنرێت تاگوێ بۆ بانگی دڵی خۆی رادێرێت و بەگوێرەی ئەو

---

* Benjamin Franklin (١٧٠٦ ـ ١٧٩٠) سیاسەتمەدار و فیزیازانی ئەمریکایی

هەڵسوکەوت بکات“ "بۆ دەبێت لە چاوەڕوانی بەهەشتی بەڵێن پێدراوی ئەگەریدا بین؟ ئێمە خۆمان دەتوانین بەهەشتێکی راستەقینە لە گۆڕەپانی زەویدا دروستبکەین." بەڵام دامەزرێنەرانی ئەم بەهەشتە زۆربەی کەسانێك بوون کە کەوتنە بەر راوەدوونان و تۆمەتبار کردن و ئازار. چاو خشاندنێك بە چارەنووسی کۆندروسە* و لەڤۆلیزیە** داکۆکی لەم حەقیقەتە دەکات. زانست و فێرکاری و پەروەردە هەردەم لەژێر گوشار و دەسەڵاتی ترس و تیروردا بوونە. کوشتار و خوێنڕێژییەکانی شۆڕشگێڕان لە ستەمکاریی پاشاکان باشتر و ژیرانەتر نەبووە. جیهان بە گیانەوەرە بێهزر و مێشك سووکەکان ئاخنراوە و ئەمە لە ئەستۆی فەیلەسووفەکاندایە کە مرۆڤگەلێکی بیرمەندیان لێ پەروەردە بکەن. بەڵام پێداویستییە ماددییەکان بوارێکی ئەوەندە بۆ بیرکردنەوە بە مرۆڤ نادەن.

کۆنت لە ئەنجامی بەشەڕهاتن و کێشمەکێشیێ لەگەڵ سانت سیمون، پیشەی خۆی لەدەستدا. کێشەکانی ژیانی کە بەتوندی گیرۆدەی پەشێوی و پێویستی ببوو بە بەهاوسەرگرتنی ژنێکی نەگونجاو زیادیان کرد. ئەو پیشەیەی کە لە کۆلێژی پۆلیتەکنیك بەدەستی هێنابوو بەهۆی ئەوەی کە بۆ ناو دونیای سیاسەتەکانی زانکۆیێك پەلکێشبکرێت کە رق و قینی بەرامبەر هەبوو. دوایین جار کە لەگەڵ سەرپەرشتیارانی کۆلیژەکە بەشەڕهات و بوو بە هۆی دووبارە بێ کار بوونەوەی. بەمەش ناچاربوو کە بۆ دابینکردنی بژێوی لە خێزانێکدا ببێت بە پەروەردەکاری تایبەتی منالان.

کۆنت کە لە منداڵییەوە گیرۆدەی بەدهەرسی بوو، سەرەنجام لەرووی جەستەیی و دەروونییەوە لە پەل و پۆ کەوت و ماوەیەکی کورتی لە شێتخانەدا بەسەربرد لێرە مرۆڤ دەتوانێت وەکو شێتێك لە ناو شێتەکانی تردا بێ جاڕسی، ژیان بەسەر بەرێت و باش بیربکاتەوە ئایا بەراستی ئەویێ جیاوازی لەگەڵ شوێنەکانی تری دونیادا هەیە؟

دوای ماوەیەکی کەم، هەرچەندە تەواو چاك نەببووە، شێتخانەی بەجێ هێشت و گەڕایەوە ماڵ.

---

* Condorcet (١٧٤٣ ـ ١٧٨٤) فەیلەسوف و بیرکاریزانی فەرەنسی.

** lavoisier (١٧٤٣ ـ ١٧٩٤) کیمیازانی فەرەنسایی.



کۆنت لەبەرئەوەی تووشی زیان و کوێرەوەریەکان ببوو ئازاری دەچەشت بەڵام بەشێوەیەکی گشتی دڵی ئارام و هزری رووناك بوو هەر لەو کاتانەدا بوو کاتێك سەردانی (کلوتید دوو)ی کرد. کۆنت لەو کاتەدا تەمەنی ٤٨ ساڵ بوو. دووساڵ بەر لەوە لە ژنەکەی جیاببووە و دەستی دابووە وانە وتنەوەی تایبەتیی. لە یەکێك لەو ماڵانەی کە بۆ وانەوتنەوە دەچوویێ بە کلوتید ناسێنرا کە خوشکی یەکێك لە قوتابیەکانی بوو مێردی ئەم ئافرەتە کە ماموری باج بوو، بە تاوانی پارە دزین لە فەرمانگە حوکمی زیندانی هەتا هەتایی بەسەریدا درابوو و لە زیندان دابوو. کلوتید خاوەنی هەندێك باڵایی بوو کە بە دەگمەن لە کەسێکدا کۆدەبنەوە، واتا جوانی و هۆش و خۆشەویستی بەکۆ لای هەبوون. کۆنت بە توندی گیرۆدەی ئەڤینی ئەو بوو بەڵام ئەمە ئەڤینێکی زوو تێپەڕ بوو و ئاکامێکی داخهێنەری هەبوو. کلوتید یەك ساڵ دوای ئەم ئاشناییە کۆچی دوایی کرد.

کۆنت لە تاو نائومێدی و نامورادییەوە دەیەویست دەست لە خۆکوژی بدات بەڵام پەنای بۆ کونجی دوورە پەرێزی برد و دوایی ئەڤینێکی تر، ئەڤین بۆ نەژادی مرۆڤ، دڵی داگیرکرد. کۆنت، زیاتر بە چاوی ئەقل و حیکمەت نەك بە دڵێکی ئومێدەوارەوە، شاهیدی شۆڕشی ١٨٤٨ بوو. مرۆڤ بە یەك یان چەند لێدانێکی یەك لەدوای یەك بە چەرخی بەختیاری و خۆشبەختی ناگات. ئاشتی بە شمشێر دابین نابێت. ئەوەی ئادەمیزاد پێویستی پێیەتی فێرکاری و پەروەردەیەکی رێکوپێکە ئەویش نە زنجیرە فێرکارییێك کە ئاگری رك لە دڵی و دوژمنایەتی داگیرسێنێت، بەڵکو هۆییێك کە ویژدانی مرۆڤ بە ئەڤینێکی بێ کۆتایی وە ئاگا بێنێت و پەروەردە بکات.

## ـ٣ـ

بەم چەشنە دەبینین کە ئۆگوست کۆنت رێبازێکی نوێی دامەزراند. مەسیحیەتێك بەبێ بوونی مەسیح، ئایینێك کە لەسەر بنگەهی تێبینییە زانستییەکان و لە دژی خورافاتی ئایینی و مەسەلە ئەبستراکتەکانی سەروو سروشت بوو، بڕواییێك کە زادەی فەلسەفەیە و رەگەکەی لە زانیارییە ئەرێنییەکان و گوڵەکانی لە سیفەتە باشەکانی مرۆڤدۆستی پێکهاتوون و دەبێت بە جیهانی و گشتی بکرێت.





فەلسەفەی ئۆگوست کۆنت هەم دەتوانرێ بە ئەرێنی گەرایی (پوزەتیڤزم) و هەمیش بە ئومانیزم ناوبنرێت. پۆزە تیڤیسم، لەبەرئەوەی کە سەر باسەکانی بابەتە زانستییەکان دەگرێتە خۆ و ئومانیزمیشە چونکە سیستەمێکی ئەخلاقییە.

* * *

کۆنت دەڵێت: گەوهەر و ماددەی بنەڕەتیی پوزەتیڤزم، زانیارییە پەتییە زانستییەکانن. بۆ ئاواکردنی دونیای دوارۆژ دەبێت رابردووی خۆمان بناسین. رابردووبینی پێشەکی ئایندەبینییە. بۆ ئەوەی روانینێکی روون و ئاشکرامان لە رابردوو دەستکەوێت کۆنت زانستە جیاوازەکان شیدەکاتەوە و یەکێتییەکی لوژیکی لە نێوانیاندا بەرقەرار دەکات و ئەوان هەم بە گوێرەی سادەییان کە بەرە بەرە روو لەئالۆزی دەکەن و هەمیش بەپێی کاملبوونی بابەتەکانیان، پۆلێن دەکات، بەم شێوەیە: بە بیرکاری، ئەستێرەناسی، فیزیا، کیمیا، بایولۆژی، خەڵکناسی، کۆمەڵناسی.

بەم چەشنە کۆنت تێبینی کرد کە زانستە ئەرێنییەکان لە رووی مێژووییەوە، بیرکاری و لەسەر بناغەی بیرکاری دەستپێ دەکات و یەك لە دوای یەك روو لە ئالۆزی و کاملی دەکەن تا لە کۆمەڵناسیدا دەگاتە ئەوپەڕی (لوتکەی خۆی). هەر زانستێك لەسەر بناغەی زانستی پێشین قایم بووە و کۆمەڵناسی کە لەم دابەشکردنەدا، دواییینیانە، ئەنجامی کۆی زانستەکانە.

کۆنت لە هەریەکە لەم زانستانە، لەبیرکارییەوە تا کۆمەڵناسی، سێ قۆناغ دیاریدەکات و وەکو یاسایێك جیادەکاتەوە. دەڵێت: لە قۆناغی یەکەمدا تێگەیشتنێکی خواییانە بۆ زانستەکان هەبوو، هەرشتێك وەکو کەس، ستایش دەکرا یان بە ئامێر و ئامرازی دەستی خویان دادەنرا بەم چەشنە خۆریان بەخوا و ئەستێرەکانیش بە سوارکارەکانی ئەو وێنا دەکرد.

لە قۆناغی دووەمدا روانینێکی میتافیزێکی بۆ زانستەکان هەبوو و جیهان کە لەوەوبەر شوێنی ئەفسانەکان بوو، بوو بە دونیای "وەهمی ئەبستراکتەکان". بۆنموونە دەیانگوت کە ئەستێرەکان ئەو گۆیانەن کە تیایاندا ئامێرەکانی مۆسیقا دابین دەکرێن چونکە گۆیان هەسارەیان بە کاملترین شێوە و مۆسیقاشیان بە کاملترین هونەر دادەنا.



لە قۆناغی سێیەمدا بابەت و دیاردەکانی جیهان دەکەونە بەر لێکۆڵینەوە و بەشێوەیەکی زانستی تێبینی دەکرێن و بەگوێرەی یاسای هۆکار و هۆئەنجامشی دەکرێنەوە.

بەم شێوەیە پەرەسەندنی زانستەکان لە دونیای ئەفسانەکانەوە بۆ جیهانی (نموونەکان)ی ئەفلاتوون و لەوێوە بۆ ئەو راستەقینەیە رامان دەکێشێت کە یاساکانی سروشت تیایدا حوکم دەکەن. هەروەك لە ئەفسانەکانی سەردەمی منالییەوە دەگەین بە قۆناغی چەواشەیی و بەڵگە هێنانەوەی چەوتانەی سەردەمی لاوێتی، پاشان ئامادە دەبین بۆ لێکۆڵینەوەی حەقیقەتەکان. واتا پێ دەنێینە ناو دونیای پێگەیشتوویی خاڵی کاملبوونی پێگەیشتنی زانستی یان بەواتایەکی تر لوتکەی ئەو زانیاریانەی کە دەستدەکەوتن کە گشت زانستەکانی تر بە بناغەی ئەو دادەنرێن، زانستی کۆمەڵناسییە واتا زانستی پێشکەوتن یان باشتربوونی مرۆڤ. گرنگترین بابەتی لێکۆڵینەوەی مرۆڤ، بوونی خۆیەتی" وا باشە لە ئاسمانی خەونەکانەوە بۆ زەوی دابەزین و هزرەکانی خۆمان بۆلای ئادەمیزادەکان چڕبکەینەوە کە بەدرێژایی سەدەیەك لەدوای یەکەکان هەستان بە شەڕ و جەنگ لەگەڵ یەکتر تا بە ژیانە ئافرێنەرەکەی ئەمڕۆ گەیشتن." لە فەلسەفەی ئۆگوست کۆنتدا کۆمەڵناسی پلەیەکی بەرزتری لە بەرزترین رادەی زانستە کۆنەکان هەیە. ئەم زانستە دەستپێکی ئایینێکی نوێیە. درەختی ئەو زانستەی کە ئۆگوست کۆنت وێنەی دەکات لەوەی کە لە پەرتووکی (چاخی کۆن) داهاتووە تەواو جیاوازە.

کۆنت دەڵێت: خواردنی مێوەی ئەم دارە نەك هەر نابێتە هۆی دەرکردنت لە بەهەشت بەڵکو بەپێچەوانەوە دەچییە ناو بەهەشتی بەرین کە دەستکەوتی خێرخوازییەکانی خەڵکە و لە سەر بناغەی تێگەیشتنێکی باشتر لە سروشت و خواستە ناخییەکانی مرۆڤ قایم بووە. کۆمەڵناسی مەودای نێوان زانست و ئایینە.

کۆنت چاکتربوون و چاکسازیی ئاکار و رەفتاری مرۆڤ بە مەبەستی کۆتاییی زانستەکان دەزانێت و دەڵێت: مرۆڤ لەبنەڕەتدا ئافرێنراوێکی کۆمەڵایەتییە. ئەم غەریزە کۆمەڵایەتییە لە گیانلەبەرە نزمەکانەوە بۆ مرۆڤ ماوەتەوە و پاشان لەو پەرەسەندنەدا کە بە درێژایی سەدەکان بە سەریدا هاتووە، پاکژی کردووتەوە و لە ئەقل نزیکی خستوتەوە، پاشان ئەقل بۆی زیادکراوە. هەستی دلوڤانی و بەزەیی، سۆزە توندوتیژەکان و حەز و هەستە توند و لاسارەکانی ئێمەی





ئارام کردووە و نەرم و نیانی پێبەخشیوە و سەرەنجام غەریزەی ئێمە بۆ شەڕخوازی و بەشەڕهاتن، بەرامبەر بە دادخوازی ئێمە دەدورێنێت.

کۆنت لە نەخشەی ئەم وێنە نموونەییەی مرۆڤدا، گیرۆدەی ئەندێشەی پەتی و وەهمە بێ بنەماکان نەبوو. ئەو باش ئاگای لەوە بوو کە مێژووی جۆری (نەژاد)ی مرۆڤ لە بەسەرهاتنێکی لێوانلێو لە رکابەریەکان و رق و رك لە دڵەکان پێکدێت. ئەو هێندە واقیع بین بوو کە بتوانێت دووپات بوونەوەی دەستدرێژیەکانی ناپلیون، لە هەموو کاتێکدا و بەرادەدیەکی توندتر لەپێشو، ببینێت.

چونکە پەرەسەندنی هۆیەکانی پەیوەندی، زیاتر لە جاران دونیا بەرەو دونیاییێکی تاك و پێکەوە بەستراو دەبات لە ئائیندەدا زۆر ئەستەمە کە شەڕێکی خۆجییێی هەروا بە سنووورداری بمێنێتەوە و نەبێت بە شەڕێکی جیهانی، لەو رووەوە ئەگەر کەسێك رووداوی شەڕە جیهانییەکانی ١٩١٤ و ١٩٣٩ ی پێشبینی بکردبا و پێی بگوتایە، سەری سوڕ نەدەما بەڵام بێگومان تەنانەت لە هەلومەرجێکی هەنوکەییشدا کۆنت متمانەی بە سەرکەوتنی کۆتایی ئومانیزم هەبوو. ئەو لەم مەسەلەیەدا پێداگری دەکرد کە جیهان رووی لە یەکتایی و یەکێتییە و غەریزەی مرۆڤانە بەدەو هەرەوەز و هاوکاری لێیدەخورێت.

نابێت هێندەش لە رکابەری و کێشمەکێشەکانی ئادەمیزادەکان نائومێد بین. ئەمە گشتیان ئەو پێشهاتانەن کە بۆ کومەڵگاییێکی لەباری گەشەکردن و پەرەسەندندا دێنە پێش. ئەو بوەرانەی کە سۆزو هەیەجانی توندیان نییە: ناتوانن کۆمەڵگاییێکی تێك چڕژاو و پێکەوە بەستراو دروستبکەن. بۆ ئەوەی ئاسن سوور ببێتەوە و بۆ بەکارهێنان لبشێت، بوونی ئاگر پێویستە. کەواتە واباشە سەبر و ئارامیمان هەبێت و بۆ داهاتنی ئەو رۆژگارە خۆشە لەڕادەبەدەر، پەلە نەکەین.

ئۆگۆست کۆنت دیدێکی مێژوویيانەی بۆ ژیان هەیە. پێشکەوتن و پەرسەندنی مرۆڤ بە هێواش و لە هەمان کاتدا بە شتێکی بێ گومان و سەداسەد دەزانێت و لەو بڕوایە دایە کە چەندەها سەدە خایاندووە تا هەنگاوێکی راست و دروست هەڵنراوە و هەڵبەتە هەر هەنگاوێکیش کە هەڵنراوە دروست و بەجێ نەبووە. مرۆڤ بەدرێژایی زەمان زۆربەی جار تووشی چەوتی و سەهو بووە بەڵام سەرەڕای گشت ئەم کارە ناشارەزاییانانە و ئەو کەوتنانە، پێشکەوتن هەروا



بەردەوام بووە. کۆنت پێشبینی کردووە کە رۆژێك یەکێتی پاشا نشینەکانی ئەوروپا، وەکو وڵاتە یەگرتووەکانی ئەوروپا پێکبێت: مرۆڤدۆستیی ئۆگوست کۆنت ئاییینێکی ناخی و یەکڕەنگی بوو کە خێرا لە سەرتاپای ئەوروپادا بڵاو بووەوە. کلێساکانی ئەم ئایینە نوێیە لە چەند پاشانشینێك بە تایبەت لە ئینگلتەرا بەرپابوون. ئەوکەسەی کە خوایەتیی رەت دەکردەوە زیندو و مایەوە تا شوێنکەوتووانی بیگەیەنێتە پلەی خوایەتی. وردنووسێك (تێبینیکەری شتی ورد) گوتوویەتی: "هیچ خوایێك بوونی نییە، بەڵام ئۆگوست کۆنت پێغەمبەریەتی!) بەڵام ئایینی ئەویش کەوتە بەر هەمان ئەو ئەستەمی و دژواریانەی کە تووشی ئایینەکانی تر ببوون. شوێنکەوتووانی ئەویش حەقیقەتەکانیان لەبیرکرد و دڵیان بە رێورەسمە رووکارییەکانەوە بەست؛ ئەوان هەموو ئەوەی کە پەیوەندی بە ئایینی مرۆڤدۆستییەوە هەبوو پەسەند کرد جگە لە مرۆڤ بوون".

بەڵام ئەم رەخنەیە هێندە راست نییە و هەرچەندە ئەمڕۆ ناوی ئۆگوست کۆنت بە یەکجاری لەبیرکراوە، بۆ نموونە بێرتراند راسل لە پەرتووکی (مێژووی فەلسەفەی رۆژئاوا) ناوی نەهێناوە، فێرکارییەکانی ئەو تەقریبەن کاریگەر بوو لەسەر هەموو رووداوە نوێە سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئاکارییەکان. رێکخراوی نەتەوەکان، گشتاندنی پزیشکی، هاوکاری بە توێژینەوە زانستییەکاندا، زۆربەی ناو و بابەتەکانی کۆمەڵناسیی نوێ و بە ئاگا هێنانەوەی ویژدانی کۆمەڵایەتی لە زۆربەی کلێسا مەسیحییەکانی ئێستایی، هەموو ئەمانە لە دەرکەوتەکانی ژیانی نوێنە کە کاریگەریی قووڵی فیکرەکانی ئەم پێخەمبەرە فەیلەسووفە دەخنە روو. تەنانەت بێرتراند راسلیش کە خۆی لە باسکردنی ناوی ئەو لایداوە، فێرکارییە ئاکارییەکانی ئەوی پەسەند کردووە و بنەما بیروڕاییەکەی ئەو واتا "خۆ پەسەندییێکی بەئاگایانە" شتێك نییە جگە لە مرۆڤدۆستییەکەی ئۆگوست کۆنت کە لە ژیانی تاکە کەسیانەدا پێشنیاری کردووە. چونکە ئەم رێبازە بۆمان ئاشکرا دەکات کە ئەو خۆشەویستییەی کە بۆ ئەوانیتر دەخەینەروو ئەنجامەکەی بە قازانجی خۆمان دەگەڕێتەوە. هەمیشە ئەو پارە کانزایەی کە بەم دەستە دەدەین بەو دەستە وەردەگرینەوە. تەنانەت باشتر وایە بڵێین لەو ئاوێنەیەدا کە دونیا لە بەرامبەر ئێمە رایگرتووە هەموو سەر و رووی خۆمان دەبینین. ئەنجامی هەموو کردەوە و رەفتاری ئێمە، بۆ خۆمان دەگەڕێتەوە. غەریزەی ئادەمیزادانە بۆ چاودێری و پارێزگاریکردن لە یەکتر زامنی بەردەوامی ژیانی خەڵکە. ئەگەر





قامچی لەوانی تر بدەین ئازارمان بە خۆمان گەیاندووە و ئەگەر بە شوێن فێرو تەلەکەبازییەوە بین ئەوا ئەمە فریودان و سوکایەتی پێکردنی خۆمانە.

بەم شێوەیە ئاکار بریتییە لە: یارمەتیدانی ئەوانیتر کە لەڕاستیدا یارمەتیدانی خۆمان و لەم مەسەلەیەدا نزیکەی گشت بنەما ئاکارییە نوێیەکان لە کۆنتەوە هەوێنیان وەرگرتووە. وا بژی کە تەواوی کردەوە و ڕەفتارەکانت هەمیشە لەو مەترسییەدان کە چاڵی سەرەڕێ نەبینن و زیان بە خۆیان بگەیەنن. مرۆڤدۆستیی کۆنت ئایینی گۆشەگیری و لە خۆبوردن نییە بەڵکو ڕێبازی دەستکەوتنی تاکە، بەواتایەکی تر ڕێبازێکە کە پێشکەوتن و بەرز هەڵگەڕانی تاکەکەس لە قازانجی هەموو تاکەکانی کۆمەڵگادا دەبینێت.

ـ ٤ ـ

ئۆگوست کۆنت دوایین ساڵەکانی تەمەنی خۆی لە ئاسایشدا بەسەر برد هەرچەندە ئاسوودەییەکی تەواویشی نەبوو. هەوادارانی ئەو بۆ نموونە مەکسیمیلین لیترێ* و جۆن ستوارت میل**، برەپارەیەکی بەردەوامیان بۆ دیاری کرد. دانی ئەم پارەیە لە ڕێگەی یارمەتیدانەوە نەبوو بەڵکو لە ناخی دڵەوە بەم کارە هەستان تا ئەو بتوانێت بە ئازادییەوە هزر و بیروراکانی خۆی پێشکەش بە جیهانیان بکات.

ئۆگوست کۆنت بەم شێوەیە درێژەی بە ژیان دا تا وەکو پێغەمبەرێك بوو بەمایەی ڕێزلێنان و بەهێژا دانان لە لایەن هاوڵاتیان و هاوچەرخەکانی. شوێنکەوتووانی چاوەڕێی ئەو پەرجووانەیان لێدەکرد کە دەدرێنە پاڵ عیسای مەسیح و وایان دادەنا کە بەو زووانە هەرێمبەری ئاسمانی بە دەست دەخەن. بەڵام کۆنت زەردەخەنەیەکی بۆ دڵسادەیی و گەشبینی ئەوان دەکرد و دەیگوت: "هاورێ ئازیزەکانم، لە بەرامبەر کاتژمێری زەماندا، سەدەیەك وەکو یەك چرکە وایە. لە ماوەیەکی وەها کورتدا ئومێدێکی هێندە درێژتان نەبێت" یەکێك لە شوێنکەوتووانی بە جۆش و هەیەجانەوە ڕایگەیاند:

ـ بەڵام جیهان ئێستاکە بۆ پەسەند کردنی ئەم ڕێبازە ئامادەیە.

* Maximilien Litter (١٨٠١ ـ ١٨٨١) فەیلەسوف و دەروونناسی فەرەنسەوی

** John stuert Mill (١٨٠٦ ـ ١٨٧٣) فەیلەسوفی ئینگلیزی



ـ من گومانم هەیە کە وابێت.

ـ بەشێوەیەك کە گونجاوی پەروەردە سەرەتاییەکەی بێت کە بە کاتولیك پەروەردە کرا بوو درێژەی پێدا:

ـ تەنانەت مەسیحیەتیش چاوەڕێی ئەو ساڵانەی دەکرد.

ـ بەڵام مەسیحیەت لەناو چووە!

ـ نە هاورێکەم، مەسیحیەتیش وەکو ڕێبازی مرۆڤدۆستی هێشتا پراکتیزە نەبووە.





# سۆرۆ و ژیانێکی سادە

**(١٨١٧ ـ ١٨٦٢)**

سۆرۆ (Henry David Thoreau) دەڵێت: "جەماوەر ژیانێکی ئارامی تێکەڵ بە نائومێدی و ناراحەتی بەسەردەبات" بەڵام خۆی ژیانێکی ئارام و ئیلهام بەخشی هەبوو سۆرۆ بە هەڵبژاردنی ژیانێکی ئەوها فەلەسەفەی لە رەوتە مەعنەوییەکەیدا دەوڵەمەند کرد. ئەو خۆی بە "چاودێر بەسەر زریان و بەفر و باران" و چاودێریکەری ئەو شارێگەیە دەبینی کە بە خوا کۆتایی دێت.

سۆرۆ یەکێك لەو کەسە کەمانەیە کەبە فێرکاری فەلسەفە هەڵنەستان بەڵام ژیانیان پێبەخشی. دەیگوت: "فەیلەسووف بوون تەنیا بەوە نییە کە قوتابخانەیەکی فەلسەفی دابمەزرێنێن و هزرگەلێکی ورد بێنین بەڵکو فەیلەسووف ئەو کەسەیە کە شەیدای ئەقل وحیکمەت بێت و ژیانێکی سادە و بێ رازاوە (ئارایشت) و ئازاد هاورێ لەگەڵ دەوڵەمەند کردنی خولق و متمانە و ئاسودەیی فیکر بگرینەبەر" "ژیانی سادە وبێ ئارایشت" سۆر و بۆی دەرکەوت کە ئەم جۆرە ژیانە کورتترین رێگەیە بۆ گەیشتن بە بەهەشت. دەڵێت: "کاتێك کە بێ مەبەست لە والدن پۆند (Walden Pond) پیاسەدەکەم، هەست بە بوونی خۆم دەکەم و ژیان بەیەکجار لەبیردەکم. بۆ ئەوەی بەم حەقیقەتە بگەی، تەنیا ئەوەندە بەسە کە ئەم بنەما سادەیەت هەردەم لەیاد بێت و بزانی کە کەمترین رادەی پێداویستییەکانی تۆ چییە و هیچ لەو هزرەدا نەبی کە چەند و تا چ رادەیەك پێویستیت هەیە." لەساڵی ١٨٤٩ کاتێك زێری کالیفورنیا خەڵکی شێت کردبوو ئەو بەسەرسامییەوە دەپرسی: "ئەم هەموو جۆش و هەڵا و هۆریا و هەیەجانە لەبەرخاتری چییە؟"





لە روانگەی ئەوەوە تیشکی زێڕینی هەتاو کاتێك لە دڵۆپی بلووریینی ئاونگ دەدات تاڕادەیەك لە کانزا و بەردە گرانبەهاکان دڵبزوێنتر بوو. کلوەکانی بەفر لەبەرچاوی ئەو بە شێوەیەکی وەها بوون کە گوایە "بانی ئاسمان گسك دەدن"و ئەو چۆلەکەیەی کە لەسەر شانی دادەنیشت زیاتر لەهەر پلەیەکی عەسکەری شاد و شاگەشکەی دەکرد.

ئەم پێغەمبەرە ئەمریکاییە کە زەینێکی ئەوها ئارام و رووناك و گیانێکی بێ خەوشی هەیە کێیە؟

ـ ٢ ـ

هێنری دێیڤیدسۆرو لەساڵی ١٨١٧ لەیەکێك لە دەوروبەرکانی شاری کۆنکۆرد (Concord)ی ماساچوست (Massachusetts) چاوی بە دونیا هەڵێنا و لە تەواوی ژیانیدا خۆی لە شەڕ و کێشمەکێش و پلەپەرستییە ئادەمیزادییەکان بە دوور راگرت. لەسەردەمی لاوێتیدا بووبە یاریدەدەری باوکی کە بۆ دابین کردنی بژێوی بە کاری دروست کردنی پێنوسە قورقوشمییەکانەوە خەریکبوو. خێزانەکەی کە لە ناوەندە ئارامەکەی ڤیلاکانی نیوئینگلەند دەژیان بەهەژاری و جوامێری دڵیان خۆش بوو.. شاری کۆنکۆرد کە زاناکانی وەکو ئێمێرسون* هاوتورن** و (ئالکوت***)ی پێشکەش بە خەڵکی جیهان کردبوو، ناوبانگی خۆی زیاتر لەڕێگەی ئەو فیکرانەی کە بڵاوی کردبوونەوە بەدەست هێنابوو نەك لەرێگەی گۆڕینەوەی شمەکی بازرگانی.

بەم شێوەیە سۆرۆ لە ناوەندێکدا ژیا و پەروەردە بوو کە دەوروبەرەکەی بە ژیانێکی سادە و بێ ئارایشت و فیکرەی ئازاد و پایەبەرز ئابلوقە درابوو.

سۆرۆ تەماعی بۆ خوێندنەوە هەبوو بەڵام تەنیا بە خوێندنەوەی بەرهەمی شاعیر و فەیلەسووفەکان رانەدەوەستا بەڵکو لەهەموو شتێك گرنگتر سوودی لە "پەرتووکی جۆبارە رەوانەکان، ئامۆژگارییەکانی پارچە بەردەکان و لەو باشی و جوانییەی کە لە هەموو شتێکدا دەیبینی" وەردەگرت. بەڕای ئەو ئەمانە هەموویان راڤەکەری راشکاوانەی سروشت و نهێنی هەڵهێنی حەقیقەتی ژیان بوون.

---

* Emerson (١٨٠٣ ـ ١٨٨٢) فەیلەسووفی ئەمریکایی.

** Hawthorne (١٨٠٤ ـ ١٨٦٤) رۆماننوسی ئەمریکایی.

*** Alcots (١٨٣٢ ـ ١٨٨٨) نووسەری ئەمریکایی .

دیمەنی بەرزەفڕیی باڵندەیەك هێندە لە شادی و خۆشحاڵیدا نقومی دەکرد... کە دەکرێ هۆنراوەکانی هۆمێر یان شەکسپیر شادییێکی ئەوها لە دڵدا بئافرێنن."

لە تەمەنی ١٦ ساڵیدا چووە زانکۆی هارڤارد کە کەعبەی ئارەزووەکانی لاوە ڕێزدارەکانی ئەو شارە بوو. لەوێ، هەروەك کە خۆی دەڵێت: "ناچاریان کرد لە تەواوی بەشەکانی زانست، هەندێ زانیاری رووکەش نەك قووڵ" کۆبکاتەوە. لەو کاتەدا داوایان لێکرد وتارێك پێشکەش بکات و ئەویش بوونی "گیانی بازرگانی" لە خەڵکدا خستە بەر رەخنە و بە "ئەڤینێکی کوێرکوێرانە و خۆنەویستانە بۆ کۆکردنەوەی ماڵ و سامان" ناوبرد.

کاتێك گەیشتە تەمەنی پێگەیشتوویی ماوەیەك لە قوتابخانە گشتییەکاندا بە وانە وتنەوەوە سەرقاڵ بوو و بەهۆی ئەو دژایەتییەی کە بەرامبەر بە جێ بەجێ کردنی تەمێی جەستەیی دەربڕی، پیشەی خۆی لە دەستدا.

لەو رووەوە بە هاوکاری براکەی قوتابخانەیەکی تایبەتیی کردەوە بەڵام ئەم هەوڵەش رووبەرووی شکست بووەوە. براکەی بە نەخۆشی دەردەکۆپان کۆچی دوایی کرد ئەو ئەوەندە بەم رووداوە غەمبار بوو کە قوتابخانەکەی داخست.

جارێکیتر پەیوەندی بە خێزانەکەی خۆیەوە کرد وەکو ئەوان کەوتە دروستکردنی پێنووسە قورقوشمییەکان بەڵام کارە سەرەکییەکەی "دۆزینەوەی خوا" بوو. لەو رووەوە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر دەرۆیشت و هەڵبەتە بێ مەبەست و ئامانج نەبوو بەڵکو هەمیشە رووی لە بەهەشت بوو سۆرۆ هاتەلای ئێمیرسۆن و لە ناو خێزانەکەیدا بەکارەوە سەرقاڵ بوو.

هاتورن لەبارەی ئەوەوە نووسیویەتی: "سروشتێکی کێویانە و رەسەنی هەبوو، لووتی درێژ بوو، دەمی سەیر بوو و وەك گوناه ناشیرین بوو بەڵام سەرەڕای هەموو ئەمانەش دەبێت بە چاودێرییێکی ورد و بیرتیژ دابنرێت لە کاروباری سروشتدا و سروشت ئەو نهێنییانەی پێ پیشان دەدا کە کەسانێکی کەم توانای بینینیانی هەیە." لە ماڵی ئێمێرسۆنەوە بەرەو دورگەی ستاتێن (Staten) کەوتە رێ و لەوێ ماوەیەك لەگەڵ برای ئێمێرسۆن کە ناوی ویلیام بوو ژیا. لەوێ کاری پەروەردەکردنی کوڕی ویلیام بوو و کاتە بۆشەکانی خۆی بە وێنەکردن و تەماشاکردنی سروشت بەسەر دەبرد و هەندێك جار بۆ شاری نیویۆرك سەفەری دەکرد ـ شارێك کە لە ناو



ملیونەها خەڵك یەك مرۆڤی نەدەبینی ـ سەرەنجام بۆ شاری کۆنکۆرد گەڕاوە و بڕیاریدا کە ماوەیەك بەتەواوەتی لە دونیا دوورەپەرێز ببێت.

ئەم دوورەپەرێزییە لەو رووەوە نەبوو کە لە کۆمەڵ هەڵهاتبێت بەڵکو بە پێچەوانەوە ئێجگار تاسەباری تێکەڵاویەتی هاودەمی بوو. چێژی لە سەما و ئاواز و گوتوبێژە شادیهێنەرەکان وەردەگرت و بەچەشنێك کە یەکێك لە هاوڕێکانی بەناوی ئێلێری چانینگ (Ellery channing) گوتوویەتی: کەس وەکو ئەو لە گاڵتەی بەجێ لەناخی دڵەوە نەکەوتۆتە پێکەنین. سۆرو زیاتر لەوەی بە تێکەڵاویەتی و هاموشۆکردن لەگەڵ ئادەمیزادەکان بەختەوەر ببێت، چێژی لە هاودەمە دارستانییەکانی خۆی وەردەگرت. رێوی، مشکی چیایی، سمۆرە، باڵندەکان، دارەکان، هەور و ئەستێرەکان گشتیان مایەی شادی ئەو بوون. ئەو هەستی دەکرد کە لە بوونەوەرەکانی دارستان نزیکترە وەك لە خەڵکی شار، لەو رووەوە پشتی دەکردە ناسیاوەکانی خۆی لەلادێکان و بۆ لای "دۆست و خزمەکانی سروشت" دەرۆیشت بەمەش لە شاری کۆنکۆرد هاتە دەرەوە و لە والدن پوند، خانوویەکی بۆ خۆی ئاواکرد. بەکاربردنی وشەی خانوو سەبارەت بە نیشتنگەکەی راست نییە. مەبەستی ئەو لە رۆیشتن بۆ والدن ئەوە بوو کە بۆی دەربکەوێت کە کەمترین رادەی ئەو پێویستییە چەندە کە بۆ بەختەوەریی تەواوی ئادەمیزادێك بەشدەکات.

کوختەیەك ژوورەکەی ئەو کە تەواو بوونەکەی ٢٨ دۆلاری تێچوو، دەتوانرێ تەنیا بە "داپۆشەرێکی گوشاد" ناو بنرێت ـ کوختێکی ئێجگار بچوك و شڕ کە ئەوی لە باران و بەفر و سەرما دەپاراست.

رووبەری کوختەکە لە پانزە مەتری دوجا تێپەڕ نەدەبوو و دوو پەنجەرە و زوپاییێك و ئاودەستێك و دەرگاییێکی هەبوو. لە دەورووبەری کوختەکە، لە باخێکی بچووکدا سەوزەی دەچاند و خواردنە سەرەکییەکەی ئەو سەوزە بوو. نرخی گشتی ئەو خواردنانەی کە لە یەکەم ساڵی مانەوەی لە والدن کڕی، تەنیا ٨,٢٥ دۆلار بوو.

سۆرۆ بۆ گەڕان و گەشتکردن لە دونیای بێکۆتاییدا، تەنیا پێویستی بەم کوختە سست و لاوازە و ئەم پارە کەمە هەبوو.

سۆرۆ دووساڵ لە والدن ژیانی بەسەر برد ئەو دووساڵەی کە پڕ لە جۆش و هەیەجان بوون و لە وێنەیان بۆ کەس لەسەدەی نۆزدەدا نەهاتۆتە پێش ـ چونکە ئەزموونەکانی ئەم دوو ساڵە بۆ





سۆرۆ و زۆرێك لە موریدانی وەکو گاندی و تولستۆی سەلماند کە مرۆڤ کاتێك بەو پەڕی بەختەوەری دەگات کە لە ژێر دەسەڵات و هێزی تایبەتی خۆیدا ژیان بەسەر بەرێت.

ئەو نووسیویەتی: "ئەگەر بتوانی، هیچ کاتێ پشت بەوانیتر مەبەستە. من خۆم خانووەکەم ئاوا دەکەم، نانم لێدەنێم و جلەکانم دەشۆم، چ لە ئاسماندا بم چ لەسەر زەوی."

لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، سۆرۆ تەنانەت لە والدنیش کەسێکی گۆشەگیر و دوورەپەرێز نەبوو و لە قسەکردن و هاودەمێتی لەگەڵ کۆمەڵێکی زۆر کە بە تامەزرۆ بوون بۆ بینینی "موریدی نوێی مەسیح لە نیوئینگلەند".

بەختەوەر دەبوو. خەڵك ئەویان بەڕادەیەك کە لە وێناکردن بەدەر بوو بە دەوڵەمەند دەبینی، پیاوێك بوو کە بە دەسمایەیەکی کەم لەو پەڕی ڕەزامەندی و شادومانیدا ژیانی بەسەر دەبرد.

سۆرو ساڵانە تەنیا شەش هەفتە لە کاتی خۆی بۆ دەستەبەرکردنی پێداویستییەکانی ژیانی تەرخاندەکرد و پاشماوەی کاتی لەرێگەی ئاشنا بوونێکی زیاتر لەگەڵ ژیاندا بەسەر دەبرد. ژیانی ئەو بە شتی سەیر و شادومانییە چاوەڕێ نەکراوەکان بارگاوی بوو.

ئەو گیانەوەرە بچووك و ناسیاوانەی کە لە بەرامبەر کوختەکەی ڕادە وەستان تا پارچە خواردنێك بەدەستبێنن و بن بەلایەنی گوت و بێژی، شەپۆلە دەوروشاوەکانی ئەو جۆبارەی کە لە والدن، لە ژێر سێبەری دارەکان و پانیش لە ژێر ڕووناکی هەتاودا، ڕەوان بوون، جووڵە بێ وێنە و خزۆکەکانی ماسییەکان، لە ئاوادا دەنگە دەنگی مراویە کێوییەکان لە نیوە شەودا، ئەمانە گشتیان، بۆ ئەو شادیبەخش و خۆشیهێنەر بوون. شەڕ و ململانێی مێروولەکان، ئەم واتەرپۆلۆ خوێنینەی جیهانی مێرووەکان، تووشی سەرسوڕمانی دەکرد. و لای خۆی بیری دەکردەوە ئەم جەنگاوەرە ورد و بچووکانە لە پێناو هەمان ئەوشتەدا شەڕ دەکەن کە مرۆڤەکان لە پێناویدا لە شەڕ و جەنگدان لەگەڵ یەکتر. کاتێك لە کوختە شڕەکەی خۆیدا دادەنیشت و کاتی ڕۆژئاوا بوون بلوێری بە دمیەوە دەگرت و دەیژەنی، هەستیدەکرد کە سروشتیش پڕە لەدەنگی ئاوازێکی یەکبیە و موسیقایەکی ئاخراندی بەردەوام و بانگی خوایی هەموو شوێنێکی لە خۆپێچاوەتەوە کە: ئەی مرۆڤ! تۆش لەم ئاوازەدا جێگەیەکت هەیە، تۆش ژێیەکی لە ژێیەکانی بوون و خوا ڕێنماییکەری تۆیە تەنیا بە مەرجێك کە چاوێکی بینا و گوێیەکی بیستەر و دڵێکی ڕووناکت هەبێت.



سۆرو هەموو ئەم بابەتانەی لە پەخشانە ڕەوان و بەناوبانگەکەی خۆیدا بە ناوی "والدن" دا جێ کردۆتەوە کە ناو نیشانە باشترەکەی "گەڕانەوە بۆ بەهەشت"ە.

**- ٣ -**

سۆرۆ سەرەڕای "والدن" سی و نۆ بەرگ پەرتووکی تری نووسی کە هەموویان گوزارشت لە بیرکردنەوە و بینینەکانی ئەو دەکات لە بارەی ژیان و بوونەوەرکان. لەم پەرتووکانە تەنیا دووانیان لە سەردەمی ژیانی ئەودا بە چاپ گەیشتن و هەر ئەوانیش بەس بوون تا بیروڕا فەلسەفییەکانی ئەو بە خەڵکی جیهان بناسێنن.

لەڕاستیدا دەتوانرێ بە شێوەیەکی پەرنسیپیانە بیروڕاکانی ئەو لە ڕستەیەکدا کورتبکرێنەوە: "هێنانە کایەوەی شادی و قایلی (ڕەزامەندی) لەرێگەی سادەیی و بێ ئارایشتییەوە) ئەو دەڵێت: "هەرچەند. ژیانخۆت سادەتر لێبکەی، بەختەوەرتر دەبی"

ئەمە ئەو دروشمەیە کە لە تەواوی بەرهەمەکانی ئەودا بەرچاودەکەوێت. هەموو دڵبەندی و ئارایشتە کۆمەڵایەتییەکان بخەرە لایەکەوە و هەوڵبدە کە خۆت بی. ئەو لەو ڕووەوە ڕووی لە ژیانی لە والدن کرد تا لەگەڵ خۆیدا بکەوێتە خەلوەتنشینی.

هەرکاتێك واتکرد، ئەگەر خۆت ناسی تێدەگەی کە لە سروشتدا بوونەوەرێکی بچووك و ناچیزی "من لە ڕێورەسمی ئادەمیزاد دەگەرێمەوە تالە سروشتدا ون ببم (لەناوبچم). سەرنج دان لە حەقیقەتی ڕەها، بێ ئەوەی کە مرۆڤ و پێداویستییەکانی مەبەست بن، لە حەقیقەتەکانی تری وەکو ڕۆژ و مانگ و ئەستێرەکان، یان هەڵهاتنی بەیانی و بەسەرداهاتنی شەو و هەرشتێك کە بکەوێتە ئەو نێوانەوە، بەشکۆتر و لێهاتووترە. مرۆڤ بەپێچەوانەی ئەوەی کە لە ڕووی خۆپەرستیەوە بۆی دەچێت، هەموو بوون و ئامانجی ئافراندن نییە و ئەم گۆیە خاکییەش ناوەندی جیهان نییە لە نەخشەی هەتا هەتاییدا بوونی پاشایەك نرخی لە بوونی پشیلەیەك زیاتر نییە و ئەگەر پاشا پەی بەو خاڵە ببات کە لە گۆڕەپانی پڕهەیەجانی قوماری ژیاندا هەردووکیان، ئەو و پشیلە، دوو هاوگەمەی بچووك و شادومانن، بەختەوەرتر دەبێت. سۆرۆ باش ئاگای لە هاوڕێیەتی گیانلەبەرە (وەك ئێمە پێی دەڵێین) زەلیلەکان بوو. لە یەکێك لە نووسینە پڕلە هەیەجانەکانیدا ئەو پێشبرکێیە ڕوون دەکاتەوە کە لەگەڵ ڕێویەك ئەنجامیداوە و





دەڵێت  نابێت ئەمە بە راو ناوببەین بەڵکو واباشترە بە پێشبڕکێیەك ناوببەین کە لە بارەی هۆش و خێرایی لە نێوان دوو هاوڕێدا روویدا" "... بۆ خوارەوە، لە رووبارەکەم روانی لەناکاو چاوم بە رێویەك کەوت کە لەو نزیکانە، لەسەر گردێك لەلای دەستە چەپی من راوەستابوو... سەری خۆم دانەواند و بە چست و چالاکییەوە هەنگاوم نا. گوایە دیانا و هەموو ئەفسانەکان هاواری شادی سەرکەوتنیان لێ بەرز دەبێتەوە. لە رێویەکە نزیك کەوتمەوە بەڵام رێوی ئامادەییەکی زەینی سەیری پیشاندا و لەبڕی ئەوەی رێگەی گردەکە کە بێ درخت بوو بگرێتە بەر بەرەو دارستان رووی لە نشێوی کرد، هەرچەندە رێگەی لێ ونبوو بەڵام بەجۆش و هەیەجانەوە رای دەکرد. منیش خێرایی خۆم زیاد کرد تا دواجار رێگەی هەڵهاتن لێگرت.

کاتێك بەراددەی پێویست لێی نزیك کەوتمەوە، هەمان ئەوکاتەی کە بۆ ناو دارستان دەخشی. بە سوپاسەوە دەستی دۆستایەتیم بۆی درێژکرد".

سۆرو ژیانێکی خۆشی لەگەڵ هاودەمە دارستانییەکانی خۆیدا هەبوو و بنەمایەکی هاوبەشی لەژیانی هەردوکیاندا بەباڵادەست دەبینی.

کلیفتۆن فادیمەن (Clifton Fadiman) نووسیویەتیکە: سۆرو لە بەسەر بردنی دە خولەك لەگەڵ باڵندەیەکدا هێندە شاد و شاگەشکە دەبوو کە خەڵك رەنگ لە بەسەر بردنی شەوێك لەگەڵ پرەنسیس  کلیوپاترادا ئەوها بەختەوەر بن. هەرچەند دەبێت ئەم دەربڕینە بە زیاد پێوەنان دابنرێت بەڵام لەهەمان کاتدا حەقیقەتێك ئاشکرا دەکات. سۆرۆ زەوقێکی وای بۆ چێژە جەستەییەکان پێشیان نەدەدا و هەرگیز ژنی نەهێنا، بەڵام بێ سنوور تامەزرۆی تێکەڵاییەتییێکی گەرم و گیانی بەگیانی بوو لەگەڵ هەموو جۆرە بوونەوەرێك. ئەو لە هەر جۆرە بوونەوەرێکدا جۆرە لێهاتوییەکی هاوشێوەی دەبینی و زیاتر لە هەموو شتێك دڵبەندیی بۆ گیانلەبەران هەبوو چونکە ئەوانی لە کەم و کورتی بینییێکی بێ واتا بێ بەری دەبینی. ئەو نەیدەویست مرۆڤ و سەگ بە یەك چاو ببینێت چونکە ئەمەی بە سووکایەتی پێ کردنێك دەزانی بۆ سەگ بلاوکەرەوەی رۆژنامەی سۆرو دەڵێت: "ئەگەر بڵێین کە یەکێك لە هاوسێکانی بەراددەی مشکێکی بیابانی مایەی سەرنجدانی ئەوە، ئەوا لە حەقی ئەو هاوسێیەدا زمانلووسیمان کردووە. هیچ یەکێك لەو گیانلەبەرە دڕندانە (وەك ئێمە ناوی دەبەین)، هەرگیز گوێی ئەویان لە هاواری خۆپەرستی و خۆدەرخستن و لووتبەرزی نەرەنجاندووە." سۆرۆ بە یەکێك لەو کەسانەی



کە هاتبووە سەردانی و بەو تەنیایی و ناوەندەکڕ و بێ دەنگەکەی هەستی بەزەیی پیاهاتنەوەی بزوا بوو، گوتی: "تۆ بێ ئاگای لەوەی کە لەوالدن پوند چ روودەدات" و بە یەکێکی تر لە هاوڕێکانی گوتوویەتی کە: "مشکی بیابانیش خۆی جۆرێکی تری مرۆڤە، هەرئەوەندە".

ئەو دڵبەندی و دەربەستییەی کە سۆرۆ بەرامبەر بە سروشت پیشانیدەدات لە بیروڕا فەلسەفییەکەی یان باشتر وایە بڵێین لە بڕواکەیەوە سەرچاوە دەگرێت کە لەو بڕوایەدایە کە هەر بوونێکی بچوك و ناچێز، بەشێکە لە بوونی رەها. لە یەکێك لە گوتارەکانیدا دەنوسێت. "کێ دەتوانێ دەنگی ماسییەکان ببیستێت کاتێك کە گۆرانی دەڵێن؟" بەبڕوای ئەو ماسییەکانیش لە نەخشەی گشتی بووندا رۆڵ دەبینن تەنانەت ئاوازەکەشیان لە ئاوازی هەتا هەتایی ژیاندا بەشێکی شایستە و گرنگی هەیە.

لەو رووەوە، بوونی گەورەترین مرۆڤیش لە دیدێکی فەردییەوە رووداوێکی ناچێز بێ بایەخە. بەڵام هەرکاتێ بابەتەکە وەکو بەشێك لە گشت سەیر بکەین تەنانەت بچووکترین و زەلیلترین بوونەوەرەکانیش تان و پۆی سەرەکی و پێویستی ئەم نەخشەیەنە. هیچ شتێك لە یەکتر جیا و دابڕاو نییە. هەموو شتێك لە "ئافرێنەری جیهان"ەوە سەرچاوە دەگرێت. تەنانەت ئەوکڵووە بەفرانەی کە لەسەر شانت دەنیشنەوە سەر بە ئەون "ئێمە تەنیا دەبینین کە کڵووە بەفرەکان لە هەوادا بەدەم خوڵانەوەوە پێکەوە دەنوسین و پاشان لەسەر زەوی دەنیشنەوە بەڵام لەراستیدا ئەم کڵووە دڵپەسەندانە گشتیان زادەی مستیك و شادینە کە بە دەستی سەنعەتکارێکی ئێجگار تەردەست ئامادەکراون." هەمووومان دەستکردی "ئەو گیانە بە تەدبیرەی جیهانین کە لەوکاتەدا کە ئێمە لە خەودابین ئەو بەئاگایە و بیردەکاتەوە."

ئەمە ئەو حەقیقەتەیە کە سۆرۆ بە هۆی بیرکردنەوە و هزرەکانی خۆیەوە لە گۆشەگیریی والدن پونددا پێی گەیشتووە. "دونیای گەورە بۆ شادمانی و کەیفخۆشیی بچووکترین ئافرێنراو هاتۆتە بوونەوە."

## - ٤ -

بەڵام ئەمە نیوەی چیرۆکەکەیە. سۆرۆ هەروەها بە فێرکاریی چۆنیەتی بەکاربردنی ئەم وانەیە هەستا لە ژیانی رۆژانەدا. دەڵێت بۆ ئەوەی بە شادمانی بژی، دڵت لە کار و باری رابواردن و





ناپێویستەکان دابڕە و بۆ ناو ناخی سروشت و دڵی خۆت ڕێ خۆت بکەرەوە. خۆت لە ڕکابەری کردن لەگەڵ هاوسێکانت لابدە و هەوڵبدە کە باشتر ئاشنای خۆت و ئەوان ببی. کاتێك ئەوهات کرد بۆت دەردەکەوێت کە زۆربەی خەڵك تەندروستیی خۆیان لە هەوڵدان بۆ دەستخستنی ماڵ و ساماندا لە دەست دەدەن و دەبێ بە (ئامێری دەستی دروستکراوەکانی خۆیان) مەبەست لە داهێنانی ماشێن ئەوەیە کە خێراتر سەفەر بکەین، بەڵام ئەم ماشێنانە ئێمە خێراتر لە هزرەکانمان بەرەو پێشدەبەن. لەڕاستیدا "ئێمە سواری ماشێنەکانی خۆمان نین بەڵکو ئەوان سواری ئێمەنە" بورج و بینا بەردینە گەورەکان ئاوا دەکەین بەڵام لە دیدی منەوە "یەك سات تێگەیشتن و هەستی چاکە لە بینایەیەك هێژاترە کە سەر لە هەوران هەڵدەسوات." ئێمە لەم گۆیە خۆڵیەدا نیشتەجێ بووین و ئاگامان لە بەهەشت نەماوە.

سۆرو لەو بڕوایەدایە کە گەورەترین نەگبەتی کە یەخەی ئێمەی گرتووە ئەو چاوچنوکی و تەماحیەیە کە بۆ سەرکەوتن و کامەرانی هەمانە، "ئێمە هەوڵدەدەین میوەی ژیان زیاتر لەوەی کە لە توانای جویین و هەرسکردنی ئێمەدابێت بخەینە دەممانەوە و بێ ئاگاین لەو خاڵەی کە دەوڵەمەندی و بەهێزی مرۆڤ بەستراوی ئەوەیە کە بتوانێت ئەو شتانە دەستەبەر بکات کە نەبنە ڕێگر لە تەنیاییەکەی" ئێمە تەمەنی خۆمان بە ژماردنی ئەو کاروبارە بەشەکییەکانەوە خەرج دەکەین کە وا دادەنێین کە پێویستیمان پێیانە.

"من دەڵێم کارەکانی خۆت بۆ دوو تا سێ دانە کەم بکەرەوە و هەوڵبدە کە ژمارەیان زیاد نەکات... هەوڵبدە حیسابەکانت، بۆ نموونە، لە پێنج و شەش تێپەڕ نەکەن تا بتوانی بە پەنجەکانت حیسابیان بکەی... بە کورتی تەنیا شتێك کە ئامۆژگاری و دووبارەی دەکەمەوە ئەمەیە: سادەیی، سادەیی، سادەیی..." خۆت لە پەلەکردنی بەتاو و بێ سەبرانە بپارێزە و گوێ بۆ ئەو سەنعەتکارە ڕادێرە کە لە پاڵ تۆیە، ئەو سەنعەتکارەی کە هەمووومان ئافرێنراوی ئەوین." بۆکارێکی ئەوها پێویست ناکات پشت بکەینە کۆمەڵگا و خەڵك ـ دەبێت لە بیرمان نەچێت کە خودی ئەویش تەنیا دووساڵ لە والدن ژیا ـ لەهەرکوییەك دەتوێت بمێنەوە و سنوردایی کات و شوێنی خۆت قبوول کە؛ "ژیانت هەرچییەك بێت ڕووبەڕووی ببەوە و لە باوەشی بگرە. خۆت لێی دوور مەخەرەوە و بە ناوەکانی ئەستەم و توندوتیژ ناوی مەبە (بانگی مەکە). ژیان بەقەد خراپی تۆ خراپ نییە." سۆرۆ هەرگیز ئەو نیازەی نەبوو کە خەڵك





فێربکات بچن و لە ئەشکەوتدا بژین. چونکە "ئەشکەوت... بۆ خۆشگوزەرانی و ئاسوودەیی خەڵکی ئەم ڕۆژگارە گونجاو نییە و هەڵبەتە واباشترە هەمووومان سوود لەو فەزلانە وەربگرین کە داهێنان و پیشە سازییەکان خستوویانە بەر دەستی ئادەمیزادەکان. خۆت لەگەڵ ناوەندی ژیانی خۆت بگونجێنە بەڵام هەوڵبدە نەبی بە کۆیلە و دیلی.

لە سەروو هەمووو شتێکەوە ئاگادار بە نەبی بە کۆیلەی حەز و ئارەزووی خۆت بۆ بەدەستهێنانی ماڵ و سامان و پلە و پایە. "بەهۆی سامانێکی لە ڕادەبەدەر ناپێویست تەنیا دەکرێ شتە ناپێویستەکان بکرین."

نابێت چاوەڕوانێی ئەوەت هەبێت لە پارە و سامان کە پێداویستییە دەروونی (ڕۆحی) یەکانت پڕ بکاتەوە. سۆرۆ، زەوق و تێنوێتییە سوتێنەرەکەی مرۆڤ بۆ دەستخستنی سامان بە دزێو و سووك (زەلیل) لەقەڵەمدەدات: "ئەو ڕێگەیەی کە بۆ دەستکەوتنی ماڵ و سامان لە بەردەمتدایە تەقریبەن بەبێ ئاوارتەیی ڕووی لە نشێوییە." لە ڕاپەڕاندنی حیساباتی شادی و بەختەوەریەکاندا بەدوای ئەوەوە مەبە کە داهاتی خۆت زیاد بکەی بەڵکو هەوڵبدە لەڕادەدەی زیادە خوازی کەم بکەیەوە. بۆ کڕینی پێداویسیتەکان و پڕکردنەوەی پێویستییەکانی ژیان بڕێکی کەمی پارەی ئامادە بەشدەکات."

"پیاوێك دەوڵەمەندترە کە شادییەکانی نرخێکی کەمتریان تێچوبێت" سۆرۆ وەبیردەخاتەوە کە ژیرترین خەڵك سادەترین ژیانیان هەڵبژاردووە. فەیلەسوفە کۆنەکان، هەروەها کۆمەڵێك چاکسازی نوێ سەربە چینێکن کە "وا دەردەکەوێت کە کەس لەوان هەژارتر نییە بەڵام لە ناوەوە (باتنیانە) کەس لەوان دەوڵەمەندتر نییە.

چارەڕەشترین کەسان ئەوانەن کە "خۆیان بە زنجیرەکانی زێڕ و زیو بەند کردووە"

ـ ٥ ـ

ژیانی سۆرو خۆی لەو پەڕی ئازادی و سەربەستیدا بەسەرچوو. لە سەرتاپای ئەو ماوەیەی کە لە والدن ژیا دەرگا و پەنجەرەی ژوورەکەی بێ قفل و بەند بوون. هیچ ترس و سامێکیش لە ئارادا نەبوو. چونکە هیچ شتێکی نەبوو کە لەدەستبدات. دەرگای ماڵەکەی وەکو دەرگای دڵی بۆ هەمووو کەسێك لەسەر پشت بوو:

"من هەرگیز لە کاتی شەو و ڕۆژدا دەرگاری خانووی خۆم ناگرم هەرچەندە چەندین ڕۆژ ماڵ بەجێ بهێڵم و بچمە دەرەوە. ڕێبوارە ماندووەکان خۆیان بە ئاگری ماڵەکەم گەرم دەکەنەوە و دەربەستەکان سوود لە خوێندنەوەی ئەو چەند پەرتووکە وەردەگرن کە لەسەر مێزەکەم داناون و ئەوانەش کە زانخوازن (کونجاون) کاتێك دەرگای سندووقی ماڵەکەم بکەنەوە پاشماوەی خواردنی نێوەڕۆم دەبینن و دەزانن کە بۆ خواردنی ئێوارە چم داناوە."

سۆرۆ تەنیا لە یەك مەسەلەدا کەمتەرخەمی دەکرد، ئەویش نەدانی باج بوو بە دەوڵەت. ئەم کارەی ئەوە پشت بە بنەمایێك دەبەست. ئەو پارێزگاریەتی ئەو دەوڵەتەی ڕەفز دەکردەوە کە کۆیلایەتی و دیلێتی دابیندەکرد و "ژن و پیاو و منداڵانی وەکو مێگەل" دەخستە بازاڕی کڕین و فرۆشتنەوە. لەو ڕووەوە دەستگیر کرا و شەوێکی لە زینداندا بەسەر برد تاکو ڕۆژی دواتر خوشکەکەی باجەکەی دا و ئازاد بوو.

لەو کاتەشدا کە والدنی بەجێ هێشت ئەم گیانەی یاخی بوونی نەرمی بۆ هەموو شوێنێك لەگەڵ خۆی برد. هەرچەندە لەو بڕوایەدا بوو کە هەر پێکهاتە و دامەزراوێك، تەنانەت کلێساش، بۆی هەیە کاری بە ئاکامێکی ستەمکارانە بگات و لە ناو بچێت بەڵام سەرتاپای ژیانی بە ڕەچاوکردنی کاملی بنەما و ڕێورەسمەکانی پەرتووکی پیرۆز بەسەر برد" "چ سوودێك بە مرۆڤ دەگات هەرکاتێك جیهانێك بەدەستبهێنێت بەڵام گیانی خۆی ون بکات؟"

ئەو بە گەڕانەوەی دیسان بۆ دابینکردنی بژێوی بەکاری دروستکردنی پێنووسی قورقوشمیەوە خەریك بوو. هەروەها پیشەی چاودێریکردنی شاری پەسند کرد. سەرەڕای ئەم بارەش کاتی بەتاڵی بەشی ئەوەی دەکرد کە سەرێك لە "خزمە دارستانییەکانی خۆی" بدات لە والدن کە دەکەوتە کەناری ڕووباری مێری ماك (Merri mack) و هەندێك بەشی نیوئینگلەند کە دانیشتوانی پەرتەوازە بوون.

هەرکاتێك کە سۆرۆ ڕووی لە سروشت دەکرد گوایە بۆ ماڵی خۆی دەڕۆیشت و دەبێت ئەمە وەك گەشتێکی دۆزینەوەکان دابنێین کە سۆرۆ بەو هۆیەوە زیاتر لەگەڵ خۆدی خۆی ئاشنا دەبوو.
سۆرۆ لە بەشی کۆتایی پەرتووکی والدن ئامۆژگاریی خوێنەران دەکات کە ئەوانیش وابکەن:





"وەکو کریستوفەر کۆلۆمبس ڕێگەگەلی نوێ لەو قارە و وڵاتانەدا بدۆزەرەوە کە لە خودی خۆتدا هەن" بەڵام نەك ڕێگەگەلی بازرگانی بەڵکو ڕێگافیکرییەکان." ئەو دەیگوت: "ئەو جلەی کە لە بەرتایە بفرۆشە بەڵام هزرەکانی خۆت بپارێزە."

"کاتێك تەواوی ڕۆژگاری وەکو جاڵجاڵۆکە لە کونجی کوختەکەم بەندکراو بووم، دونیا هەروا لە دیدی منەوە گەورە و فراوان بوو چونکە من لە دونیای هزرەکانمدا ژیانم بەسەر دەبرد."

دەوڵەمەندی و هەژاری، شوورەیی و ناوبانگ، بەختەوەری و بەدبەختی، ئەمانە گشتیان بابەتگەلی ناچیزن: "هەڵهاتنی خۆر لە پەنجەرەی کوختەیەکی شڕەوە بە هەمان ئەو درەوشاوەییە لە ناوەوە دەدات کە بۆ ناو کۆشکی پیاوی دەوڵەمەند دەڕوات و بەفر لە بەردەم دەرگای ماڵەکانیان لە یەك کاتدا دەتوێتەوە. من لەوێش لە گیانێکی ئارام و قایل بەولاوە شتێکی تر نابینم. لەوێش هەمان ئەو هزرە شادیبەخشانە هەن کە لە کۆشکدا ئامادەن.

لەو ڕووەوە سورۆ پێشنیار دەکات کە: "بە هەمان هەژاری خۆتەوە ئەڤینداری ژیانی خۆت بە. لەکەم وکورتی گەڕەکان تەنانەت لە بەهەشتیشدا کەم وکورتی دەدۆزنەوە" لەهەر کوێیەك بی و لەهەر قۆناغێکدابی قەدەر وەهایە کە "لەگەڵ ئافرێنەری جیهان هاوهەنگاو بی" دڵنیا بە کە خوا لەگەڵ تۆدایە.

**-٦-**

سورۆ هەنگاو بە هەنگاو تا دوایی لەگەڵ خوا بوو. لە تەمەنی ٤٥ ساڵیدا کەوتە بەر نەخۆشی سیل بەڵام هەرگیز شەوق و زەوقی بۆ ژیانی لەدەستنەدا، تەنانەت دوای شەوێك شەونخونی و ئازار بە ڕوویەکی خۆشەوە ڕووبە ڕووی هەموو کەسێك دەبووەوە و "بەیانی باش" ی دەگوت سوڕ بوو لەسەر ئەوەی کە نانی بەیانی لەگەڵ خێزانەکەی بخوات و دەیگوت: "ئەمە بەپێچەوانەی دابی کۆمەڵایەتییە کە من بە تەنیایی نان بخۆم."
کاتێك یەکێك لە هاوڕێکانی باسی لە ژیانی دوا ڕۆژ دەکرد، گوتی: "جارێ ئەم دونیایە بەش دەکات (بەسە)." لە بابەتێکی تردا کاتێك یەکێك لە ئەندامانی ماڵەوە لێی پرسی کە ئایا لەگەڵ خوادا ئاشت و تەبایە وەڵامی دایەوە: "هەرگیز لەبیرم نییە لەگەڵ خوا کێشمەکێشم هەبووبێت" و کاتێك ڕۆژی دوایی نزیك دەکەوتەوە، ئەو بیری لەو بەسەرهاتە دەکردەوە کە لە دوارۆژدا هەیبوو.

## هاڤلۆك ئەلیس و سەمای ژیان

**(١٨٥٩ ـ ١٩٣٩)**

ئەلیس (Havelock Ellis) دلێری و بێباکیی لە باوباپیرە دەریاوانەکانیەوە بۆی مابووەوە. سێر هێنری (Sir Henry) یەکێك بوو لە پالەوانە ناودارەکانی راپەڕینی هیندییەکان. ئێدوارد پێپێن ئەلیس (Edward Peppen Ellis)ی باوکی کە ناوە خواستراوەکەی (پیر)ی هەڵبژاردبوو، کاپتەنی کەشتی بوو و بەسەر یاخی بوونی دەریاوانانی خۆی و زریانەکانی "هەفت دەریا"دا زاڵبوو. بەم چەشنە هاڤلۆك بۆ گەشت و گەڕان لەو دونیایەی بیروڕانوێیەکان کە لە زەنازەنا و دەمارگیری و رك لە دڵی بێ بەری بوو، لە هەموو لایەنەکەوە ئامادە ببوو.

سەرتاپای ژیانی ئەلیس بە ململانێکانی دژ بە دەمارگیری بارگاوی بوو و هەردەم لە هەوڵی ئەوەدا بوو کە کەشتیی مرۆڤایەتی بۆ بەستێنی ئاشتی و ئارامی رێبەریبکات. لەو ئەزمونانەوە کە پاشەکەوتی کردبوون دەیزانی کە پێشەوای هەر فیکرێك لە رێگەی خۆیدا رووبەرووی مەترسی گەلێك دەبێتەوە و بڕوای وابوو: "چاوێکی روناکبین (بینا)، بەزەیی نواندنێکی هەموو لایەنە، بوێری و شەهامەتێکی تەواو و ئارمێکی بێکۆتایی لە پێویستییە هەردەمییەکانی ژیانێکی رەسەن و خانەدانە."

هەر لە سەرەتای ژیانیەوە تایبەتمەندییە بەرزەکانی خۆی خستەڕوو. کاتێك هەشت ساڵان بوو رۆژێکیان لە قوتابخانەوە لە کاتێکدا گوتی کە ئەو کونە بەهۆی زەربەی قەلەمێکەوە پەیدا بووە کە یەکێك لە هاوپۆلەکانی بە گاڵتەوە لێی داوە.



دایکی هاواریکرد: "هیوادارم حەقی ئەوت کردبێتە بەری دەستی!"

نە دایە چونکە لەو بارەدا منیش وەکو ئەو شەیتان و بێ رەوشت دەبووم.

ئەمە بوو رەفتارەکەی لە سەرتاپای ژیانی، "هەرگیز ناکرێ خراپە بە خراپە چاکسازی بکرێت. لە ناو گشت سۆز و هەستەکانماندا هیچ شتێك لە نەفرەت و رك لەدڵی پوچتر نییە"

لە قوتابخانە ئەویان بە منالێکی بەناز پەروەردەکراو، دەناسی بەڵام منالەکان هەم هیچ توند و تیژییەکیان لە ناو تایبەتمەندییە ئەخلاقییەکانی ئەودا نەبینی و هەمیش لە نزاکەی ئەو نەگەیشتن کە لە منالیدا داوای لە خوا دەکرد "توانایێکی وا پێ ببەخشێت کە بتوانێت گیانی خۆی لە ناو وشەکاندا جێ بکاتەوە".

لە ساڵی ١٨٧٥ کە شانزە ساڵ زیاتر نەبوو کەوتە بەر هەڕەشەی نەخۆشیی سیل و بە پێشنیاری پزیشك لە قوتابخانە هێنرایە دەرەوە. کەشتیی باوکی لەم کاتەدا بەرەو ئوسترالیا بەرێوە بوو و پزیشکەکە رای گەیاند کە رەنگە گەشتی دەریایی بۆ تەندروستی ئەو سوودبەخش بێت.

دەتەوێت وەکو سکرتێری کاپتەن لەگەڵم بێی؟

ـ بێ گومان.

ـ ٢ ـ

سەرفەرێکی درێژ لە زێدەکەیەوە، شەپۆڵەکانی ئەو زریانەی کە لەشی دەسەر پشتی کەشتی دەشوشت، ئەو خۆرەتاوەی کە لە لەشی دەدا، ئەو خوێندنەوە کافی و پەرەسەندنە رۆحییە کە لەو فەزا پان و بەرینەی نێوان دەریا و ئاسماندا بۆی دەستەبەر دەبوو، رێك هەمان ئەو شتانە بوون کە جەستە و گیانی بۆ بەهێز بوون پێویستیان پێ بوو. لە ئوسترالیا لە دوو قوتابخانە کە کەوتبوونبە دوو گوندی دوور لە یەکترەوە، ماوەیەك بە وانە گوتنەوەوە خەریك بوو. لە هەریەکە لەو دوو قوتابخانەیەدا سێ رۆژ وانەی دەوتەوە و هەر هەفتە دوو جار رێگە شاخستانیەکەی نێوان ئەو دوو گوندەی بە پێی پیادە دەبڕی.

"شوێنێك کە ئادەمیزاد خوای خۆی لەم بیابانەدا لە خۆی نزیکتر دەبینێت" ئەلیس لە بارەی ئەو ئەرکە بڕیاریدا کە لە ژیاندا دەگرێتە ئەستۆ. واتا بەدڵ و گیان بەدوای ئەوەدا دەگەڕا کە





دونیای راستەقینە بدۆزێتەوە تا بۆی دەربکەوێت کە ئایا لە پشت میکانیزمە دەرەکییەکەی جیهان واتاییێك بۆی هەیە یان نە" "دونیاییێك کە زانست لە پێش چاومان رادەخات و بە حەقیقەتی ئەو دونیایەی کە دێتە بەر چاومان، لە قەڵەمی دەدات چییە؟ دونیاییێك کە وەکو گۆڕ سەرد و تارێك و چەشنی بەرد کڕ و بێدەنگ و جیوە ئاسا لەرزۆك بێت. ئایا ئەمەیە حەقیقەتە واقیعیەکەی ئەم دونیا پڕ شکۆوە؟ رەنگە بڵێیت مەبەستی بێتهۆڤن لەو ئاوازە دڵپەسەندانەی کە دایهێناوە ئەوەیە کە چەند تاڵە موویێکی ئەسپ بە رووی ریخۆڵەی پشیلەدا بکێشێت و ویزەویز بکات!"

سەرباری ئەمە ئەلیس تا ئەو کاتە هێشتا متمانەی بە خۆ نەبوو.

هزرەکانی هێشتا لە زەینیدا شێوەی بلووریان وەرنەگرتبوو.

لەو رووەوە، ماقوول نەبوو کە بە تەواوەتی ئومێدەوار بێت ئەو دونیایەی کە تیایدا دەژیت ناوەندێکی دۆستانە نە دوژمنکارانە و هەر لەو کاتەدا نووسیویەتی: "من لە وێنەی مناڵێکی نەزان و بێ نیشتماندا ئاوارە و بێ ئۆقرەمە"و وەکو (هوزمەن)ی پاڵەوانی نووسەری ئینگلیز ئەلفرێد ئێدڤارد* "لەو دونیایەدا کە خۆی دەستی لە دروستکردنیدا نەبوو، نامۆ و ترسنۆك بوو."

گیانی ئەو گۆڕەپانی ململانێی هزرگەلی ئەو زانایانە بوو کە نکۆڵیان لە بوونی خوا دەکرد لەگەڵ ئەو عارفانەدا کە بە دوایدا دەگەڕان. لەو کاتەدا بێ پڕوبڕوایی و بڕوا زەینی ئەلیسیان کردبوو بە گۆڕەپانی غارغارێن (تاودان)ی خۆیان . ئەو لە زانکۆی سیدنی دەخوێند.

ناوەندی رووناکبیرانی ئەو سەردەمە هێشتا بە زەربەی بیردۆزی شۆڕشیانەی داروین، نارەحەت و سەرلێشێواو ببوو. هەندێك لە زانایان هێندە بە وردەکارییەکانەوە سەرقاڵ ببوون کە پرسە گشتییەکانیان بە تەواوەتی لە بیر کردبوو. ئەلیس خۆی لە دونیاییێکی ئەوها پڕ لە نائومێدی و گومان و بێهیواییدا بە فەوتاو (لە دەست چوو) بینی.

---

* Alfred Edvard (١٨٥٩ ـ ١٩٣٦) شاعیر و زانای ئینگلیز.



خۆشبەختانە لەو کاتەدا پەرتووکێکی دەستکەوت کە ئەوی خستەسەر رێگا و لەو سەرسامی و پەرێشانییە رزگاریکرد. پەرتووکی "ژیان لە ناو سروشتدا" لە دانانی جێمز هینتۆن* توانای ئەوەی پێبەخشی کە هزرە مادییەکان و بیروڕا عیرفانییەکان کە لە زەینیدا لەشەڕ و ململانێدا بوون، ئاشتبکاتەوە. ئەم پەرتووکە ئەوی بەو حەقیقەتە گرنگە ئاشناکرد کە لە شیکردنەوەی کۆتاییدا، لە نێوان ماددە گەری و تەسەوف هیچ جیاوازییێك نییە. هاڤلۆك ئەلیس لە پێناو زانستدا، ئایینی خۆی لەدەستدابوو، بەڵام دووبارە بە تێگەیشتنێکی باشتر لە زانست، بەدەستیهێناوە. ئەو بۆ یەکێك لە خزمەکانی خۆی نووسی: (لە ژێر رووناکی پەرتوکی ژیان لە سروشتدا) دواجار گشت گومان و دوودڵییەکانم لە ناو چوون."

ئەلیس لە یادداشتەکانی رۆژانەی خۆیدا ئاماژە بەو وەرچەرخانە دەکات بەڵام ئەم وەرچەرخانە هیچ پەیوەندییێکی بە بیردۆزی خەڵکەوە نییە لە بارەی وەرچەرخان کە بە گۆڕانێکی لە ناکاو و پەرەسەندن لە گوناهەوە بۆ پاکژی و لە گلاوییەوە بۆ پاکی دادەنێت.

بەڵکو دەبێت بە گەڕانەوەی بۆ تەندروستی و لەشساخی (یان راست و دروستی) ناوببرێت.

ئەلیس چەندین ساڵ دواتر لە بابەت ئەم وەرچەرخانەوە ئەوها دەنووسێت: "ئەم پەرتووکە فێری کردم کە میکانیزمی جیهان هەمان میکانیزمی کارگەیەك نییە. شتێکی گیاندارە و جوانی و شکۆی ژیانی تیایە."

"کێشمە کێشە دەروونییەکان و ئەو ناتەباییەی کە بۆ ناو بوونم تەشەنەی کردبوو بوون بە هاوگونجانێکی ناسك... بینیم کە دونیای مەعنەویات بەراستی لەسەر بناغەی زانست خۆی قایم کردووە و جیهانی زاستی تەنیا نیشانە و نمونەی دونیای روحی یان دەروونییە."

ئەلیس دەڵێت: ئەم تێکەڵبوونەی بیروڕا مادییەکان لەگەڵ رایە عیرفانییەکان لە بابەت جیهانەوە، بە یەکجاری ژیانە هزرییەکەی ئەوی هەڵاوگێڕکرد" "ئیتر هیچ نیشانەیەك لە رەفتاری دوژمنکارانە و ترس و سام بەجێ نەما و ئەوەی مابوو ئەڤین و دڵنیایی بوو."

---

* James Hinton (١٨٢٢ ـ ١٨٧٥) شاعیر و زانای ئینگلیز





لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا، دەبێت ئەوەش بگوترێت کە ئەم گۆڕانەی ڕەوشی نەبوو هۆی ئەوەی کە ئەلیس بڕوا بە ئایینێکی تایبەت بێنێت: "هیچ تاکە بنەماییێك نەچووە ناو بنەما بیر و باوەڕییەکانی من چونکە بڕوام بە هیچ ئایینێکی تایبەتی نەبوو. من بۆم دەرکەوتبوو کە بنەما و بیر و باوەڕی رووکەشانە دوگمایی نە ڕاست بوو و نە هەڵە، بەڵکو هەموو ئەمانە سێبەرەکانی بینین و ئەزموونە تەواو شەخسی و تایبەتییەکان بوون. من ئیتر سەروکارم لەگەڵ سێبەرەکان نەبوو چونکە حەقیقەت و گەوهەرم دەست خستبوون. لەوە بەدوا دەمتوانی بەدڵنیایی و شادییەوە ڕووبەڕووی ژیان ببمەوە چونکە دڵم لەگەڵ جیهان یەك خستبوو."

بابزانین دونیا، لەم قۆناغەدا چۆن دێتە بەر چاوی و چ واتاییێك پەیدا دەکات. دەڵێت: "من دونیا بە جوان و بەدەو دەبینم و جوان و بەدەو بینینی دونیا ئامانجی ژیانە"

لەو کاتەدا کە ئەلیس بەم پێگەیشتنە فەلسەفییە گەیشت لە بارەی ژیان، تەمەنی ١٩ساڵ زیاتر نەبوو.

ـ ٣ ـ

ئەلیس لە ساڵی ١٨٧٩ دا کە تەمەنی بیست ساڵ بوو، بۆ ئینگلتەرا گەڕاوە. ژیانی ئەو بۆ برەو دان و جێگیرکردنی جوانی و لە ناو بردنی ناشیرینی تەرخان بوو. یەکێك لەو ناشیرینییە ئەبلەقکەرانەی کە بەر چاوی ئەلیس کەوت ئەو ئازار و ڕەنجە بوو کە لە پەیوەندییەکانی نێوان ژن و مێرد دا هەبوو کە بەهۆی نەبوونی یەکڕەنگی و لێك حاڵیبوون و ڕەفتاری نەویستراوەوە بوو. ئەو باش ئاگای لەوە بوو کە لێکۆڵینەوە لەم بابەتە بۆ فێریارێکی لاو مەترسی گەلێکی بەدواوەیە. بەڵام ئەو هەم کەسێك نەبوو کە لە مەترسی هەڵبێت و هەمیش بۆی دەرکەوتبوو کە خۆی لە گەلێك مەسەلەی بنچینەییدا دەمارگیر نییە؛ "کاتێك بەو ئاکامانە گەیشتم گیانی دژبەر منی دەستەمۆ نەکرد (داگیری نەکردم)، هەروەها نەبووم بە جادوو لێکراوی ئەم بیر و ڕایانە. بەڵکو بە پێچەوانەوە، لە زۆر باردا لە بوونی ئەم جۆرە بیروڕایانە داخدار و نەشاد بووم."

بەڵام هەرچۆنێك بێت دەبێت پەردە لەسەر ئەم حەقیقەتانە هەڵبدرێت و ئەنجامەکانی بۆ خەڵکی جیهان ئاشکرا بکرێن.



بۆ ئەوەی لە هەموو لایەکەوە بۆ لێکۆڵینەوە زانستییەکان لە بواری کردەوە سێکسییەکاندا بەرهەڤ و ئامادە بێت، بڕیاریدا دەست بە خوێندنی پزیشکی بکات و دوای ئەوەی توانی بەکالۆریۆس لە پزیشکیدا بە دەستبێنێت، بە دەگمەن بیری لەوە کردەوە کە سوود لەم هونەرە وەربگرێت و نووسی: "ژیانی پزیشکێك مەیلێکی توند لە مرۆڤدا قایلدەکات کە بریتییە لە زانین و بەکارهێنان. بەڵام بۆمن کار بریتییە لە تێگەیشتن لەو شتانەی کە ڕۆژێك بتوانم ئاشکرایان بکەم و بە دیاریان بخەم و تەنانەت ناتوانم زانستی پزیشکیش لەم دستوورەیەدا بە ئاوارتە دابنێم"

یەکێك لەو بەشە پزیشکییانەی کە بوو بە مایەی سەرنجی تایبەتیی ئەو پەرستیاری بوو. ئەو زیاتر ئەم خزمەتەی خۆی بە هەژاران و نەداران پێشکەش دەکرد؛ "لەڕێگەی پەیوەندی کردن بەو خەڵکەوە فێر دەبم کە ئەوان چۆن دەژین و چۆن بیر دەکەنەوە. و هەروەها دەبینم کە ئەوان چۆن ڕووبەڕووی پرسگەلی لە دایکبوون و زۆربوونی دانیشتو دەبنەوەوە کە پەیوەندیان بە هەلومەرجی مادیانەوە هەیە."

لە بارێکدا ڕووبەڕووی ژنێك بووە کە بێ هەست و بە نهێنی لە ناو ژمارەیەك مناڵ کە قیژە و هاواریان بوو کەوتبووە سەر ئەردی ژوورەکە و دەست کورتی و ئارەزوو، شەوق و زەوق و هەژاری، چالاکیی ژیان و نائومێدی کە زادەی بێبەش بوون بوو لە فەزلەکانی ژیان، سێبەری خستبووە سەر ئەو ناوەندە؛ "دەبێت لە ڕەوشی ئەو خەڵکەی کە لە نەخۆشخانەکانی هەژاراندا نوێنراون بە دوای ڕەگ و بنچینەی زانستە کۆمەڵایەتییەکاندا بگەڕێین"

بەهەر حاڵ ئەمە ئەو بابەتە بوو کە ئەلیس سەرنجیدا بەڵام کاری لەڕادە بەدەر بە یەکجار لە پەل وپۆی خست. ئەم هەموو داماوی و لاوازییە بۆ هاوکاریکردن لە بەرامبەر ئەم هەموو بەدبەختی و چارەرەشییە! بەدوای شەونخونییەکاندا، تای سوور پەلاماریدا و هەرچەندە خۆی لەم نەخۆشییە دەرباز بوو بەڵام دایکی کە ئەم نەخۆشییەی لەو گرتبووە، مرد.

توندوتیژی و نالەبارییەکانی سروشت لە لایەکەوە و نەبوونی هەستی مرۆڤدۆستی و نەژادخوازی لەلایەکیترەوە ئازاری دەدا. کاتێك لە نەخۆشی ڕاستبۆوە پەرتوکێکی نووسی بە ناوی "گیانی نوێ"و تیایدا هەموو زانیاری و فێربوونەکانی خۆی بۆ پیشاندانی "ڕێگای باشتری ژیان" بەکار هێنا. هەوڵی ئەلیس ئەوە بوو کە هاوگونجانێك لە نێوان کاروباری دەروونی و جەستەییدا





دروستبکات، بەڵام لە زۆربەی شوێنەکاندا پەرتووکی ئەویان بە"بانگکردن بۆ دۆزەخ، دانراوێکی ناگونجاوی بارگاوی بەبێ شەرمی و بێ ئەدەبی، نواندن و خستنە رووی بێ شەرمانەی مەسەلە سێکسییەکان" ناو برد و بڵاوکەرەوەکان بە کەیفخۆشییەوە ناوی ئەم پەرتووکە "بێزار کەر و شیاوی سەرکۆنە کردن"ە یان لە لاپەڕەکانی بلاۆ کراوەکانی خۆیان لابرد.

بەڵام ئەمە هێشتا سەرەتای لافاوی ئەو جنێو و سووکایەتی پێکردن و زەلیل کردنە بوو کە ئەلیسی لە پاشماوەی ژیانیدا گرتە ناوخۆ. ئەلیس پەنای بردە ژێر سایەی ئەڤینی "ئەدیت لی" کە ژنێکی هەیکەل بچووک بوو بەڵام بۆ ڕووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ گەمژایەتی و نەزانینەکاندا وەکو چیاییێک قایم و مکوم بوو. هەردووکیان لە ساڵی ١٨٩١ ئەلقەی هاوسەرێتیان لێک گۆڕییەوە و بەڵێنیاندا کە لەگەڵ یەکتر یەک ڕەنگ و بە ئەمەک بن و لەکاروباری داراییدا سەربەخۆیی خۆیان بپارێزن.

ئەلیس ماوەیەکی کورت دوای ژنهێنان، دەستی بە نووسینی پەرتووکی گرنگ و نایابی "چەند خوێندنەوەیەک لە بواری دەروونناسیی کاروباری سێکسی" کرد. ئامانجی ئەم لێکۆڵینەوەیە وەک خوێندنەوەکانی تری پێشاندانی ئەو ڕاستییە بوو کە "ڕاستە کە ئێمە بەم گۆیە خاکییەوە بەندین بەڵام بەدوو باڵی سادەیی و بێ گەردی (دڵسۆزی) دەتوانین لە بەرزییەکانی ئاسماندا لە ژوور ئەم هەسارە خاکییە بکەوینە فڕین"

بڵاوبوونەوەی بەرگی یەکەمی ئەم پەرتوکە هەراییێکی نایەوە و ئەلیسیان بە تۆمەتی نووسینی پەرتووکێک "بە پێچەوانەی داوێنپاکیی گشتی و لەڕێ لادەر (گومڕاکەر)" پەلکێشی دادگا کرد. بڵاوکەرەوەی پەرتووکەکە بە تۆمەتی هاوکاریکردن لەگەڵ نووسەر بە دانی سەد لیرەی ئینگلیزی مەحکووم بوو تەنانەت ڕێگەی ئەوەشیان بە ئەلیس نەدا کە بەرگری لە تایبەتمەندییە زانستییەکەی بەرهەمەکەی خۆی بکات. پەرتووکەکە لە ئینگلتەرا گلدرایەوە و ئەلیس لە هەموو شوێنێک وەکو پیاوێکی گڵاو ناسرا.

ئەو هەوڵی ئەوەی نەدا کە بەرپەچی خەڵک بداتەوە و لەو بڕوایەدا بوو کە "لەم بارەدا منیش وەک ئەوان گڵاو دەبم"



بەم جۆرە خۆی لەگەڵ زیانە ماددەییەکان و لەدەستچوونی هاوڕێیاندا گونجاند و بایەخی بە هەڵاو هۆریای کورت فامەکان نەدا کە نووسەری بەرهەمێکی زانستییان خستبووە ڕێزی نووسەرە بێنرخەکان.

بەڵام بڕیاریدا خەباتی خۆی دژی بەدزەوقی (بێ سەلیقەیی) یەکانی پۆلیس "کەسانی فزولی چینێکی چارەڕەش کە خواکانیش لە کاریاندا داماون" درێژە پێبدات و پەرتووکەکەی خۆی لە ئەمریکا بە چاپ بگەیێنێت" "من سوورم لەسەر ئەوەی کە کاری خۆم بەشێوازی خۆم درێژە پەیدەم و حەزناکەم هیچ جۆرە تێبینییەک ناچارم بکات کە ڕای خۆم بەرامبەر بە ژیان بگۆڕم" ئەو بە ئاسانی دەیتوانی چاو لە ئاست پلە و ساماندا بنوقێنێت بەڵام بڕیاری وا بوو ئاسوودەیی و دڵپەسەندیی گیان کە پێی لە هەموو شتێک بەرزتر بوو هەروا بپارێزێت.

- ٤ -

"ژیان فەوتانگە و ریسکێکی بەردەوامە ... خەبات و هەوڵێکی بەردەوامە بۆ دەستخستنی چارەنووسێکی نایاب. ڕێگە چارەی گشت کێشەکانی ژیان تەنیا لە هونەردا دەدۆزێتەوە. تەنیا هونەرەکە... ڕەنج و ئازارەکانی ژیان لێکدەداتەوە... غەم و دەردەکانی ژیان بە جوانیی دۆستایەتی قەرەبوو بکەنەوە." ئەمەیە هەوێن و کرۆکی سەرەکی فەلسەفەی ئەلیس.

خوێندنەوە و لێکۆڵینەوە زانستییەکانی ئەو لە بابەت مەسەلە سێکسییەکان، شادی و ڕەنجەکانیان، دەستدرێژی و شنە حەرام کراوەکانیان، جۆش و خرۆش و شوستییەکانیان و ئەو هێزە گەورەیەی کە تێیاندا شاراوەیە بۆ کارە باش و خراپەکان، هەموو ئەمانە تەنیا پێشەکییەک بوون بۆ خوێندنەوەیەکی قووڵی ئەو لەبارەی گشت سیماکانی ژیان.

ژیان، چاوئەندازێکی جوانە. وەکو "دایکێک کە بۆ هێور کردنەوەی منداڵە بێئارامەکەی خۆی لەبری ئامۆژگاری لەیستوکەکانی ئەو بۆ هەوا هەڵدەدات تا سەرنجی منداڵەکە ڕابکێشێت." ئەلیسیش دەیەویست "چاوئەندازی جوانی" ژیان باشتر بخاتەروو و دەرد و ئازارەکانی بە هۆیێک لێکبداتەوە" "گشت کوێرەوەری و شێتایەتییەکان، تەنانەت گڵاوی و شوێنە ناپاکژەکان" لە فەلسەفەی ئەلیسدا وەردەچەرخێن (ئاوەژوو دەبن)و دەبن بە گەوهەرگەلێکی درەوشاوە.





ئەمەیە شێوەی روانینی ئەلیس کە دەیەوێت پەردەیەکی رەنگاورەنگی نویٚ لە جیهان وەکو بەسەرهاتێك لە جوانی و بەدەوی، لە بەردەم چاوان رابخات. ئەلیس ئەم تێروانینەی خۆی لە پەرتووکێکدا بەناوی "سەمای ژیان" کە ناوێکی ئێجگار لەبارە، دەربڕیوە.

ئەو دەڵێت: جووڵە و بزوتنەوەی ژیان لە ئاوازە کێشدارە یەکبینەکان دەکەن هیچ رووداوێك ، هیچ ژیانێکی تاکەکەسیانە مەسەلەیەکی سەربەخۆنییە و لە حەقیقەتی بوون دابڕ نییە. هەر ئاوابوونێکیخۆر نیشانەی هەڵهاتنێتی لە شوێنێکی تر" "ساتێك نییە کە تیایدا بەرە بە یانێك لە گۆی زەویدا هەڵنەیێت" ئەو بازنە بێکۆتاییەی سەما و گەڕان (سووڕان)ی رووناکی لە بارەی سەمای ژیانیش راستە، "لە جیهانی ئاکاردا، خۆمان مەشخەڵدارین و بڵێسەیەکی درەوشاوەمان لە دەروونی خۆماندا هەڵگرتووە.

بۆ ماوەیەکی کورت موڵەتمان پێدراوە تا ئەگەر بمانەوێت رووناکییێك بخەینە سەر ئەو تاریکییەی کە ئابلووقەی داوین. وەکو پێشبڕکێی مەشخەڵ کە کاتی خۆی باو بوو و دەتوانرێ وەك ژیان حیسابی بۆ بکرێت ئێمەی مەشخەڵ بە دەست لە رەوتی خۆماندا بە هەڵەداوان بۆپێشەوە دەڕۆین. یەکسەر راکەرێك لە دواوە دەگاتەجێ و دەمانخاتە لایەکەوە.

گشت هونەری ئێمە لەوەدایە کە مەشخەڵەکە هەروا درەوشاوە و بە بریقەداری، بخەینە دەستیەوە و خۆمان لە ناو تاریکی و نوتەکیدا لەبەر چاو ون ببین"

تەنانەت لە پێشبڕکێی ژیانیشدا کە خۆی بەشێکە لە سەمای ریتمداری بوونەوەرەکان، ئێمە هەندێکجار لە خەم و ئازاردایین و هەندێك جاریش شادمانین. هۆستۆن پێترسۆن کە نووسەری بایۆگرافیی ئەلیسە گوتوویەتی هاڤلۆك ئەلیس "چاك دەزانێت کە تاکە سەماکەرێکی تەڕدەست و بە ئەزمونە کە دەکرێ پێیەکانی خۆێناوی بن" و هەروەها ئەوەی کە "سەمای ژیان سەمای مەرگیشی لە ناو خۆیدا هەڵگرتووە."

ئادەمیزاد بە هەستان و کەوتن و دووبارە هەستانەوە فێری سەماکردن و ژیان دەبێت.

وەرن هەرچەندە تامی تاڵی رەنج و ئازارمان لە زاردایە با ئەو شادی و کەیفخوشی و سەمایە لە یاد نەکەین کە خۆمان تیایدا بەشدارین و بە سەهو گرێیەك لەو داوە نەدەین کە دەستی لە






نەخشەی گشتیدا هەیە و بەشدارە "هەرکاتێك لێگەڕێین دیدی ئێمە بۆ سروشت بەهۆی شێوەی بینینی مرۆڤانەی ئێمە تێکەڵ و پێکەڵ و پەرێشان ببێت. وەکو ئەوە وایە کە گوایە وردیلکەیەکی لەرادە بەدەر بچوکمان لە گەورەیێکی بیٚ کۆتایی باڵاتر داناوە" ئێمە لە نەخشەی دڵبزوێنی سەمای هەتا هەتاییدا وردیلکەیەکی ئێجگار ورد و ناچیز (حیساب بۆ نەکراو) ین.

تێگەیشتن لەم سەمایە و بەگوێرەی ئەو ئاوازەی کە جیهانی لە خۆ پێچاوەتەوە هەنگاونانە لە فەلسەفەی ئەلیسدا واتا بنەما بنچینەییەکانی و هونەری ژیان. ژیانی هاوڕێ لەگەڵ ئاسوودەیی و بەختەوەری و ئازایی و تەقوا هێزێکە کە سەرەڕای رەنج و ئازار و چەشتنی دەرد و مەینەتی، دەبێتە رێنماییکەر بۆ بەدەستهێنانی ئەم هونەرە.

ئەلیس خۆی ئاسودەیی و ئارامی دەروونی لە سایەی بیرکردنەوە لە سروشت، لە رێکی جووڵە ریتمدارەکانی، لە ژیانەوەی بەردەوام و لە لێدان (ترپە)ی بێوچان و یەکبینەی ژیانەوە دەستکەوت. بەهار، هاوین، پایز، زستان و پاشان دیسان بەهار ئەویش وەکو ئاینشتاین هەستی دەکرد کە، "لە هەر لێکۆڵەرێکی راستەقینەی هێماکانی سروشتدا، جۆرە رێز و حورمەتێك بۆ ئایین هەیە." لە ناو گیرودەیی و تووشبوونەکانی شەڕی یەکەمی جیهانی، ئەلیس بەو بیروڕا ئایینییە دڵی خۆی دەداوە کە لە سروشتدا مەرگ و نەوبوون بوونیان نییە و ئەوەی کە هەیە جۆرە گواستنەوەیەکی رێکوپێك و ریتدارە لە ژیانێکە بۆ یەکێکیتر.

ئەو بە چاوی دڵ سەر و رووی نەمری و جوانی و بەدەویی لەپشت دەمامکی مردوو و بیگیانی ناشیرینی دەبینی.

ئەلیس (لەساڵی ١٩١٥) نووسیوویەتی: "هەروا کە رێگای جوانیم دەبڕی چاوم لە کێڵگەدا بە دەوەنگەلی خەشخاش کەوت و هاواری تامەزرۆیی و زەوق لە ناخم هەستا. دۆستێکی غەمبار گوتی کە بەرای ئەو شەڕ، جوانی و پاراوی (تەڕوتازەیی) لە نەرگسەکانەوە رفاندووە. بەڵام من لەم بابەتە ناگەم و هزرێکی پێچەوانەی ئەوەم هەیە. گوایە لە بەرامبەر نەساغیی ئادەمیزاد، سروشت دڵبزوێنتر و نەزمە بێدەنگەکەی ئاشتی ئامێزتر بووە. لەو رووەوە کاتێك بۆم دەگێڕێتەوە کە چۆن لەکاتێکدا کە تا ئەژنۆ لە خوێنی مرۆڤدا چەقی بوون، لە سەنگەرەکاندا گوزەرانیان کردووە، لای خۆم بیرم دەکردەوە کە سروشت چۆن دلۆپە درشتەکانی خوێنی بێگەرد و نەمری بەسەر ئەم خاکە سەوزرەنگ و شێوە زەردەدا پرژاندووە! هەرکاتێك لە سروشت و گۆڵە

جوان و دڵپەسەندەکانی مۆڕ ببینەوە ئێمەش دەبین بە هاودەنگ کە ئەو چەندە بێبایەخ بووە! سروشت هەروا درێژە بەژیانەوەی خۆی دەدات و ئەوەی کە بەسەر ئادەمیزاد (کە یەك وردیلکە زیاتر نییە) دابێت بایەخێکی ئەوتۆی نییە."

ئەم ژیانەوەیە واتا سەمای هەتا هەتایی ژیان، هەڵپەڕکێ و سەمای شادی خولقێنی منالأن، جووڵەی ریتمداری گوڵەکان بە دەم هەڵکردنی شنەباوە، لەرینەوە و خاڵی لوتکە و نزمترین خاڵی هزرگەلی فەیلەسووفەکان و رووناکی ئەو ئومێدەی کە بەردەوام دڵی ئێمەی ئادەمیزاد رووناك دەکاتەوە. ئەمانە گشتیان دەرکەوتە و سیماکانی ئەم سەمایەنە.

ئەم سەماکردنە لە هەمان کاتدا هەم نزای خێر و هەمیش ستایشە و ئێمە لە هەر شتێك زیاتر لە خوا نزیك دەکاتەوە. هەروەك کە ئەلیس وەبیر دەخاتەوە کە هەر ئایینێك لەڕووی کردارییەوە بە سەما دەستپێدەکات.

ئەلیس ئایین و عیرفانٍ بە پەیوەندییێکی هاوگونجاو و هاوڕێ لەگەڵ ئەڤین و لەخۆبردوویی تاك لەگەڵ گشت، پەیوەندیی بوونێکی سنووردار لەگەڵ بوونی رەها، پێناسە دەکات. ئەم پێناسەیە (هەروەك کە خۆیشی لێی ئاگادارە) هاوشێوەی ئەو پێناسەیەیە کە زانست بۆ ئایین هەیەتی.

واتا "پێکهاتەیەك کە پەیوەندییێکی ئاگایانە لە نێوان تاك و جیهاندا دروستدەکات و... ئەو هێزە بە ئادەمیزاد دەبەخشێت کە دەست بەسەر سروشتدا بگرێت." بەم چەشنە، دین و زانست کە یەکێکیان لە دڵ سەری هەڵداوە و ئەویتریان لە مێشك، ئەو توانایەمان پێدەبەخشێت کە بزانین لە ئاوازی بنچینەیی و کێشداری موسیقای جیهاندا وەکو تاکەکەسێك، چ پلەیەکمان هەیە.

"بە هەبوونی سروشتێکی دەست کەوتوو یان فیتریی هاوگونجاو لەگەڵ سروشتی جیهاندایە کە زانایانی وەك فارادای یان ئەدیسۆن" گوایە ئەلیس دەیەوێت ئەوەش بۆ زیادبکات کە پێغەمبەر و کەسە پیرۆزەکانیش "دەتوانن بەو ئەنجامە گەورانە بگەن". تەنیا ئەوکەسانەی کە زانیاری تەواویان نییە، هەروەها ئەو کەسانە کە بڕوایان کامل نییە وا دادەنێن کە جیاوازی و جیایی لە نێوان زانست و ئاییندا هەیە. زانایان و پێشەوایانی گەورەی ئایینی، وەکو هاوسەفەرانی



ڕێگەیەکی نهێنیدار کە بە خوا کۆتایی دێت، ڕێزێکی شایانیان بۆ یەکتر هەبوو. پشکنەر و بەدواداگەڕانی ئەم ڕێگەیە برایانی هاوخوێنی پێغەمبەرانن.

ئەم سەفەرەی کە لە پێش پێغەمبەران و بەدواداگەڕەکانی ڕێگەی حەقەوگشت مرۆڤایەتیدایە گشتی بە ئاوازی ریتمداری ئەم سەمایە، ئاوازێك کە ئەستێرەکان دەخاتە جووڵە و دڵی مرۆڤەکان دەخاتە لێدان، تەی دەکرێت.

بەڵام دەبێت هەرکامەمان ئەم ڕێگەیە بە زەحمەت و لە خۆبوردوویی خۆیەوە بدۆزێتەوە. "ڕێگەی ترمان نییە بۆ رزگاری" بەهەشتی بەڵێن پێدراو، "هەردەم دەکەوێتە ئەو دیوی ئەم ڕێگەیەوە"

بەم چەشنە دەکرێ هەریەك لە ئێمە بە شێوازێکی تایبەت بە خۆی فێرببێت کە لە ڕێگەی پڕ لە کوێرەوەریی ژیان بەرەو خوادا، ببێتە سەماکەرێکی گەرموگوڕ و بە تین، لە هاوئاهەنگ کردنی ژیاندا ببێتە هونەرمەندێکی لێهاتوو و لە تەواوکردنی فەلسەفەی جوانی لەرێگەی ئەڤینەوە ببێتە کەسێکی تەردەست. "هونەرمەندێك کە بابەتی هونەرەکەی ئەو خوویەتی. ژیانێك کە بەهۆی کوێرەوەری و رەنجەوە بە زانست دەگات و لە ڕێگەی هەستکردن بە ئەرك، بە جوانی و بەدەوی دەگات و لە رەنجی جەستەییەوە بە سەرکەوتنێکی روحی و دەروونی دەگات."

بۆیە خۆت ئامادە بکە کە وەکو ئەکتەرێك لە شانۆی ژیاندا، باری رەنج و کوێرەوەری لە کۆڵ بکەی و لەخەم و دەردی ئەوانیتر کەم بکەیەوە و یارمەتی ئەوە بدەی کە چاوئەندازی ژیان بە شکۆدارترین شێوە بکەوێتە پێش چاوان.

لەسەرووی هەموو شتێکەوە، هەوڵبدە کە مەیل بۆ گاڵتەجاڕی و قەشمەری کردن بە ئەوانی تر لە ناخی خۆیدا بکوژی و بەدەم رەنجەکانی خۆتەوە پێ بکەنی؛ "ئەگەر دەتەوێت لەم چاوئەنداز و جوانیانە و دەوڵەمەندییە جۆراوجۆرە کەی بەهرەمەند ببی و سوود لە هەموو شتێك وەربگری چ پێکەنیناوی بێت و چ غەمبار، ژیان ئەوەندە بە جیددی وەرمەگرە. تەنانەت ئەوکاتەش خەمبار مەبە کە بەجێی دەهێڵی و پەردەیەکی تاریك دەخەنە سەر چاوە ماندوو و هیلاکەکانت و بۆ هەتا هەتایە لە بینینی ئەو دیمەنە جوانە  بێبەشت دەکەن."





ئەمەیە کورتەی دەستووری ئەو کارەی کە ئەلیس بۆ رووبەروو بوونەوە لەگەڵ بەسەرهاتی ئێجگار نایابی ژیان پێشنیار دەکات. هەرگیز لە داهاتنی دوا ساتی ژیان. ئەو ژیانانەی کە لەم هەسارەی بەدەم سەماوەدا هەنە کە گۆی زەوییە نائومێد و خەمبار مەبە. گۆی خاکیی ئێمە بە بەراورد لەگەڵ گەورەیی کائینات وردیلکەیەکی بە حیساب نەهاتوو زیاتر نییە و کێ نالێ لە خوڵەمێشی جیهانێکی کەنەفت و بە ساڵداچوو جیهانێکی تازە پەیدا نابێت.

چونکە ژیان زنجیرەیەکی پێکەوە بەستراوە. هیچ شتێك کۆتایی پێنایێت "ئاوابوونی خۆرەتاو بەڵێنی بەرە بەیانمان دەداتێ."

**-٥-**

ئەلیس هزرە فەلسەفییەکانی خۆی وەکو فەیلەسووفێکی پرۆفێسیۆناڵ (پیشەگەر) بلاّو ناکاتەوە یان برەوی پێنادات و لەو بڕوایەدایە کە: "بیرمەندە گەورەکانی جیهان بەزۆری لە ناو ئەو کەسانە هەڵکەوتوون کە بە زەوق و خۆشییەوە دڵیان داوەتە ئەم کارە. چونکە هزرە گەورە و نایابەکان هۆ ئەنجامی ژیانێکی ئازاد و سەربەخۆن و لەو رووەوە ئوستادێکی پیشەگەر تەنیا هزرە باوەکان بلاّو دەکاتەوە و لە ئاست خستنە رووی هزرە ناباو و نامۆوەکاندا داماوە."

ئەلیس هەرگیز کورسییێکی وانەوتنەوەی داگیرنەکرد و پێی خۆش بوو ئازادانە بیربکاتەوە و بێ کوت و بەند ژیان بەسەر بەرێت. فەلسەفەی ئەو دەربڕی بەسەرهاتی ژیان و مێژووی پەرەسەندنی هزریی خۆی بوو.

ئەو بە ئاسوودەیی و بێ دەنگە دەنگ و بێ خۆ دەرخستن و خۆ نواندن ژیا.

بایەخی بە شکۆ و گەورەیی کۆمەڵ و ستایش و ئافەرین بێژیی خەڵك نەدەدا. زۆربەی کاتی خۆی بە وەلاّمدانەوەی ئەو نامانەوە بەسەر دەبرد کە کەسانی جۆراوجۆر لەبارەی بابەتی جیاجیاوە بۆیان دەنووسی و لەبەر ئەوەی دەرەقەتی دانی مووچەی سکرتێر نەدەهات بە ناچاری خۆی نووسینی وەلاّمی نامەکانی گرتە ئەستۆ.

بەشداریی لە هیچ پارتی و گرووپێکدا نەکرد و کاری وانەوتنەوەی نەگرتە ئەستۆ و تەنانەت دەستە جلێکی رێکیشی نەبوو.



دوای مەرگی ژنەکەی لە ساڵی ١٩١٦، بە تەنیایی تەمەنی بەسەر برد. بەلاّم سەرەڕای ئەمەش، مرۆڤێکی گوشەگیر نەبوو. گەورەترین دڵخۆشی ئەو تێکەلاّیەتی و هاودەمێتی بوو لەگەڵ هاورێکانی و حەزی دەکرد لە بابەت جوانییە راستەقینەکانی جیهان بیربکاتەوە و بەختەوەر ببێت بێ ئەوەی خۆی گیرۆدەی کاروباری بێ بایەخ و خەڵك ـ فریودەر بکات. هەندێك جار دەیبینین کە لەگەڵ چەند هاورێیەکیدا بە ناو کولاّنەکانی گوندێکدا پیاسە دەکات و لەبارەی گەشەی پەرجو ئاسای گوڵێك یان ئاواز و نەوای باڵندەیەك، سەرقاڵی گوتوبێژە.

ئەلیس پیاوێکی بالاّبەرز، بێ کلاّو، سوور و سپی، چاوشین و ریش سپی و ئێدڤارد [*] کارپێنتەر گوتەنی" هەمیشە نقوومی گەورەیی و شکۆی سروشت بوو. وەکو پێغەمبەران بە جیهانی مستیك و بیرکردنەوەدا رۆ دەچوو و وەك خەڵکی ئاسایی شادی و گاڵتە و گەپی دەکرد.

ئەلیس بەم ورەیەوە لە مردن نزیککەوتەوە، سکی بە حاڵی خەڵك دەسووتا و هانی دەدان کە واز لە نەزانی بێنن و چاو لە جیهانی سەرەوە ببڕن. هاواری تانە و گاڵتە ئامێز و گاڵتە (ئایرونی) بریندارکەرەکانیانی بە گەردەنیشەوە قبووڵدەکرد؛ "ئەو نووسەرەی کە پەیامگەلێکی نوێ دێنێت دەبێت بۆ پەسەندکردنی تانە و دژوێنی خەڵك ئامادە بێت" ئەو هیچ بە رەفتارە نارێك و نائاساییەکانی خەڵك نەدەرەنجا" "کاتێك خەڵك لە هەموو لایەکەوە هاوار دەکەن کە لە سێدارەی دەن، هونەرمەند، هەرچەندێك رەوشێکی ناوەندی هەبێت، بە گوێی دڵ ئەو بانگە ئاسمانییە دەبیستێت کە دەڵێت ئەمە منالە خۆشەویستەکەی منە."

---

[*] Edvard Carpenter (١٨٤٤ ـ ١٩٢٩) نووسەری بەریتانی





# ویلیام جێمز (١٨٤٢ ـ ١٩١٠)

## ئەو فەیلەسووفەی کە

## فەلسەفەی لە ژیانی ڕۆژانەدا بەکارهێنا

لە ساڵی ١٨٩٨ (William James) لە زانکۆی کالیفورنیا بە پیشەی وانەوتنەوە خەریك بوو. ڕۆژێك بەیانی بەرگوللە کەوتنی ڕێویەکی بینی کەبەمەرگی کۆتایی هات و ئەم ڕووداوەی لە نامەیەکدا بۆ منالآنی خۆی نووسی.

ئەم نامەیە کورتەیەکی فەلسەفەی ئەو دەگرێتە خۆ کە بریتییە لە بەسەرهاتێکی بێباکانە لە بەرامبەر ڕەنج و ئازارەکانی ژیان.

دەنووسێت: "ئەم گیانەوەرە قارەمانە بچووکە، بەو گوێ خەز ئاسایانە و ددانەسپی و خاوێن و لەشە چست و چالاك و چاپووکەیەوە، نزیك بە هوتێل خلّتایە سەر زەوی و ژیانە زەلیل و هەڵەشەکەی لە ناوچوو. بینینی ئەم ڕووداوە منی خستە بیرکردنەوە و بەخۆمم وت ئەم بوونەوەرە زیندووانە چەندە بێباك و دلێرن. ئەم ڕێویە زەولیل و بچووکە نەجلێکی هەبوو و نە ماڵێك. نە پەرتووکێك و نە هۆییێك. هیچ شتێکی نەبوو جگە لە بوونە ناچیزەکەی خۆی و تەنیا دەبێت بەهەمان هۆ ریگەی خۆی بە زەوق و هەیەجان بدۆزێتەوە و ژیان بەسەر بەرێت. ئەو دەبێت چاوپۆشی لە گیانی خۆی بکات تا بتوانێت پارچە گۆشتێك لە شوێنێکەوە دەستبخات. ئەو باش دەرەقەتی ئەرکی ڕێویەتی خۆی هات. ئێوەش دەبێت کارە منداڵانەکانی خۆتان و منیش ئەرکە پیاوانەکانی خۆم بە دلێرییەوە بە ئەنجام بگەیێنین ئەگینا بەقەد ئەو گیانەوەرە بچوکە نرخ و بەهەمان نییە."

"ئێوە کارە منالآنەکان و من ئەرکە پیاوانەکانی خۆم بە دلێرەییەوە ئەنجام بدەین" ئەمەیە پوختە و کرۆکی فەلسەفەی ویلیام جێمز و خۆی حەزی دەکرد سەرباری ئەو ئێش و ئازارە جەستەییەی کە هەیبوو، ئەرکەکانی خۆی بە دەربەستی و دلێرییەوە بەجێ بهێنێت. جێمز زۆربەی ڕۆژگاری تەمەنی خۆی وەکو نەخۆشێك بەسەر برد و چەندەها ساڵ بیری لە خۆکوژی دەکردەوە. دەڵێت مرۆڤ لەرووی ڕۆحی و دەروونییەوە تەواو نییە مەگەر ئەوەی کە هەندێ جار هزری لەناو بردنی خۆی، خۆی بە مێشکیدا کردبێت. بەڵام پیاوی کامل لە لێواری هەڵدێر دەکێشێتەوە و بە بوێری و دلێرییەوە ڕووبەڕووی حەقیقەتەکانی ژیان دەبێتەوە.

ویلیام جێمز فەیلەسووفێکی پراکتیکییە و فێرمان دەکات کە چۆن لە قوماری ژیاندا "قایم و خوڕاگربین و دڵی خۆمان ئارام و بێ تاتێ بهێڵینەوە"

ـ ٢ ـ

ویلیام جێمز لە نیویورك چاوی بە دونیا هەڵهێنا و لە ناوەندێکی شاریدا، بە پەروەردە توند و تیژ و پەشوکاوە تایبەتیەکەیەوە، بۆ ژیان لە ناو کۆمەڵد گەورەبوو ـ ناوەندێکی پەشۆکاو و تێکەڵ و پێکەڵی وا کە تیایدا هیچ گوڵێکی ڕەگدار ناڕوێت بەڵکو جێی ئەو زەردەوڵە بێ ئوقرە و زانخواز (کونجکاوا) نەیە کە لەلایەکەوە بۆ لاییێکی تر لە فڕیندانە ـ لە سەردەمی منالّیدا دەستەو یەخەی دژواری و چارەڕشی بوو و بەبرا بچووکترەکەی کە (هێنری)ی ناو بوو و لەو ئارامتر بوو گوتبووی... بەڵام سەبارەت بە خۆم، من پێم خۆشە لەگەڵ ئەو منالآنەدا یاری بکەم کە دژوێن و جنێو دەدەن"

هێنری جێمزی باوکی زەوقێکی زۆری لە سەفەرکردن بوو، سەفەری بۆ لەندەن. پاریس، بوردو، جنێف و بۆن کرد بوو و لەگەڵ خەڵك و دابونەریت و هزر و زمانە جیاوازەکاندا هۆگری و ئاشنایی پەیدا کردبوو و ئەزمونی جۆراوجۆری پاشەکەوت کردبوو. ویلیام جێمزیش لەم نیعمەتە شتێکی بۆ بە نسیب و سەردانی وڵاتە ئەوروپاییەکانی کرد و دەمی خۆی بە شیلەی حیکمەت







شیرین کرد، لەگەڵ زمانە جیاجیاکاندا ئاشنایی پەیداکرد و لە ئەنجامدا رایەکی گشتی و دیدێکی جیهان بینانەی سەبارەت بە ژیان دەستخست.

جێمز دەربەستی و دڵبەندییێکی زۆری بۆ مۆزەخانە هونەرییەکانی ئەوروپا هەبوو و سەردەمێك خۆی کەوتە هزری ئەوەی کە بێتە ریزی هونەرمەندانەوە.

ماوەیەك لای ویلیام مۆریس هونت (William Morris Hunt) بە فێربوونی نیگارکێشانەوە خەریك بوو بەڵام ئۆستادەکەی بەشێوەیەکی دۆستانە رێنمایی کرد کە بۆ ئەم کارە ئامادە نییە. ئەویش دەستی لە بەدواداچوونی ئەو بەشە کێشاوە و بۆ بڕینی خولێکی زانستی ئامادە بوو.

جێمز کە لەو کاتەدا لاوێکی نۆزدە ساڵان و بە زەوق و نەخۆش ئاسابوو، دوای چەند ساڵ لە رەنجکێشان لە بەشی نیگارکێشان، ناوی خۆی لە قوتابخانەی زانستی لورێنس نووسی لە کەمبریج لە شاری ماساچوست چاوی ئومێدی بڕیە دوا رۆژ.

"ساڵێك خوێندنی کیمیا، پاشان ماوەیەك خانەنشینی... پاشان بەدەستهێنانی زانیارییە پزیشکییەکان، ئینجا پێنج یان شەش ساڵ هاوکاری کردن لەگەڵ ئاگاسیز (Agassiz) کە سروشت زانی گەورەی هارڤاردە و پاشان... رەنگە مردن...)

خوێندنەکەی لە زانکۆدا بە زۆری وەکو خوێندنە سەرەتاییەکەی تووشی راوەستان دەبووەوە. کاتێك شەڕە ناوخۆییەکان لە ئەمریکا روویاندا ئەو لە کۆلێژی پزیشکیی هارڤارد سەرقاڵی خوێندن بوو. ناو نووسین لە سوپادا بۆ ئەو کە بێ بەری بوو لە تەندروستیی جەستەیی بابەتی باس نەبوو بەڵام لەگەڵ ئاگاسیز کە بۆ لێکۆڵینەوە زانستییەکان بەرەو بەرازیل بەڕێوە بوو، کەوتەڕێ و لەشاری ریو نەخۆش کەوت و تەقریبەن کەوتە باری مردنەوە. کاتێك بۆ ئەمریکای باکوور گەڕاوە بە تەواوەتی لە پەل و پۆ کەوتبوو. بەمەش بەرەو ئەوروپا کەوتە رێ تا تەندروستیی خۆی بە دەست بخاتەوە. جێمز سەرەڕای نەخۆشیی جەستەیی و لاوازیی دڵ کە لە مناڵیەوە تووشی ببوون، گیرۆدەی قەیرانێکی دەروونیش بوو بە رادەیەك کە بەرەو هەڵدێری خۆکوژی رایکێشا. کاتێك نەیتوانی لە ئەوروپا تەندروستی خۆی بە دەستبێنێتەوە، گەڕایەوە کەمبرج و بەخورتی توانی خوێندنی پزیشکی تەواو بکات (١٨٦٩) بەڵام هەرگیز بە پیشەی پزیشکییەوە خەریك نەبوو. چونکە نە حەزی لێی بوو و نە توانای ئەوەی هەبوو کە ژیانی دژوار



و نالەباری پزیشکایەتی بگرێتە ئەستۆ. بۆیە کەوتە کونجێکەوە تا کۆتایی بە "دوا ساڵەکانی ژیانێکی پڕ لە رەنج و کوێرەوەری" بێنێت. رۆژانە تەنیا چەند کاتژمێرێك دەیخوێندەوە چونکە بەهۆی چاوئێشەوە دکتۆر کاری زۆری لێ قەدەغەکرد بوو و فەرمانی پێدرا بوو کە تێکەڵایەتی و هاموشۆی خۆی لەگەڵ هاوڕێکانی سنووردار (کەم) بکاتەوە ـ ئەم سەردەمە خراپترین سەردەمی تەمەنی بوو و ئەو خۆی وێنەیەکی زیندوو لە بارەی ئەو گیانە نائومێد و پڕلە بێزارییەی کە لەو رۆژگارەدا هەیبوو، پیشاندەدات؛ "رۆژێکیان لەکاتی خۆر ئاوا بووندا چوومە ژوورەکەم.... لەناکاو ترسێکی سەیر بەسەر بوونمدا زاڵبوو... وێنەی نەخۆشێکی لاوی ئیفلیج کە لە شێتخانەدا بینی بووم لە زەینمدا زیندوو بووە کە بە قژێکی رەش و پێستێکی سەوزرەنگ تەواو گێژ و بێ بڕست، هەموو رۆژێ لە قەراغ دیوار لەسەر رەحلە دادەنیشت و ئەژنۆی خەمی لە باوەش دەگرت و باڵای بە باڵاپۆشێکی خۆڵەمێشی زبر کە تاکە لەشپۆشی بوو دادەپۆشرا ئەم وێنەیە جۆرە پەیوەندییێکی لەگەڵ ئەو هەستە ترسەی کە سەرتاپای منی تەنی بووە بەست و لە ئەنجامدا خۆ بەخۆ هەستم کرد کە ئەمە وێنەی خودی منە. لەشم لە ترسا لەرزەی تێکەوت... چەندەها مانگ نەم دەتوانی بە تەنیا بچمە شوێنێکی تاریك. ئەم ترس و سامە هێندە زڵ و بەهێز بوو کە ئەگەر پەنام بۆ پەرتووکی پیرۆز نەبردبا و خەمی خۆم بە وشەگەلی وەك "پەروەردگاری ئەزەلی پشت و پەنای منە... ئەی بەندەی من کە بارێکی قورست لەسەر پشتە بەرەو رووی من وەرە... " نەرەواندباوە بەراستی ترسی ئەوە لە ئارادابوو کە بەتەواوەتی تەندروستی خۆم لە دەستبدەم."

ئەوەی کە سەرەنجام بوو بە هۆی رزگاربوونی گوتاری رێنووڤیە بوو لە بارەی ئازادیی خواستەوە. رێنوڤیە وەبیری خستبووە کە بەگەڕ خستنی خواست "دەبێتە هۆی بەهێز بوونی هزر، چونکە کاتێك دەتوانم ئیرادەم بیخمە گەڕ و هزرێك هەڵبژێرم کە هزر گەلێکی ئازادم هەبن."

جێمز هۆیێکی بۆ بەردەوامی ژیانی خۆی دۆزییەوە و بڕیاریدا کە ئیرادەی بە کار بهێنێت و ئەو بڕوایە بە خۆی بداتە قبووڵکردن کە تەنیا خۆی دەتوانێت ببێتە هۆی رزگاری خۆی. سەرەڕای هەموو ئەو رەنج و کوێرەوەرییەی کە ئابلووقەی داو "ژیانی من دەبێت لەسەر بنەمای کارکردن و زەحمەت کێشان و تازەگەری مکوم ببێت" جێمز ئیتر پشتی بەخۆ دەبەست





"من دەبێت ئەرکە پیاوانەکەی خۆم بە دلێرییەوە ئەنجامبدەم"- ئەرکێکی تێکەڵ بە بوێری و دلێری نەك بەبێ بڕستی و خەمۆکێتی، خەباتێکی گەرموگوڕ نەك بەرگرییێکی ترسنۆکانە- بەم جۆرە جێمز هەرچەندە لەڕووی جەستەییەوە نەخۆش بوو بێترس و سام هاتە ناو ململانێ و هەراوهوریای ژیانەوە.

**- ٣ -**

لەو رووەوە ژنی هێنا و لە زانکۆی هارڤارد دا بە دانەوەی وانەی کار ئەندامزانی (فەسلەجە) یەوە خەریکبوو و لەوێوە رووی کردە دەروونناسی و ئینجا فەلسەفە بەڵام جێمز لەو ساتەوە کە لە رزگارکردنی خۆیدا سەرکەوت بۆ رزگارکردنی خەڵکانیتر هیمەتیکرد. ئەو چەندەها جار وەبیری قوتابیانی دەخستەوە کە فەلسەفە، بەدەستهێنانی وەڵامێکی کۆتایی بۆ کێشە گەورەکەی کائینات نییە. بەڵکو لەراستیدا فەلسەفەرێنماییکەرێکی کرداریانەیە بۆ ئەوکێشە و ئەستەمیانەی کە لە چالاکییەکانی رۆژانەدا رووبەروویان دەبینەوە. ئەو بەدوای ئەوەوە نەبوو کە قوتابخانەیەك دابمەزرێنێت یا موریدگەلێك لە دەوری خۆی کۆ بکاتەوە، ئەو قسەیەی حزقێل کە یەکێك لە چوار پێغەمبەرە گەورەکەی عیبرییەکانە کەوتبووە دڵی کە: "ئەی رۆڵەی ئادەم هەستە سەرپێ، دەمەوێت لەگەڵت بدوێم."

جێمز بە زمانێك لەگەڵ خەڵکی جیهان کەوتە دوان کە هەموو کەس لە مەبەستەکەی حاڵی بن. ئەو شکل و شێوەی فەیلەسووفێکی نەبوو و بەو هەیکەلە لاواز و باریك و کورتە و پڕجووڵەیەوە زیاتر لە "منالێکی بەردێن" دەکرد. لەگەڵ قوتابیانی زۆر خوویی بوو و ئەوان ئەویان وەکو "مرۆڤێکی لۆژیکی" دەناسی. گیانە قوشم و گەپبێژەکەی هەندێ جار وەپێش پلەی ئۆستادێتییەکەی دەکەوت. یەکێك لە قوتابیانی لە رادکلیف لە ئەزموونی کۆتاییدا وەرەقەی خۆی سپی دایەوە دەست و تیایدا نووسی: "پرۆفسوری ئازیز جێمز، راستییەکەی من حەزم لێ نییە تاقیکردنەوە ئەنجامبدەم."

پرۆفیسور لەکاتی خۆیدا وەرقەکەی دایەوە و تیایدا نووسی:

"خاتوونی ئازیز، راستییەکەی حەز ناکەم وەرقەکەتان سەحبدەم."



سەرەڕای ئەمەش نمرەیەکی ناوەندی پێیدا و کاتێك حیکمەتی ئەم کارەیان لێ پرسی گوتی: "خاتوونێکی خۆش فیکرە. ئەگەر وەڵامی پرسیارەکەی بدابایەوە کێ دەڵێ کە نمرەیەکی خراپی وەردەگرت."

ویلیام جێمز کە تاسەخوازی وریاکردنەوەکانی قوتابیانی بوو، لە زانکۆی هارڤارد دا وەکو کەسێکی نا ئاسایی دیار بوو. واتا "ئوستادێك بوو کە وەکو کەسێکی ئاسایی گوت و بێژی دەکرد" ـ مرۆڤێکی لۆژیکی (ماقووڵ) کە "بابەتە لوژیکیەکان"ی فێری قوتابییانی دەکرد ـ ئەو فەلسەفەی لە پۆلەکانی وانەوە هێنا هێنادەرەوە و لە ژیانی رۆژانەدا بەکاریهێنا. دەیگوت هەریەك لە ئێمە فەیلەسووفێکە. بەئاگاییەوە بێت یان لەبێ ئاگاییەوە بێت هەردەم بەدوای ئەوەوەین کە دەربارەی ئەو کاروبارانەی کە پەیوەستن بە ئێمەوە، رای خۆمان دیاریبکەین. هەر ئەم پێویستییەی بڕیاردان، ئەم کێشکردنەوە غەریزییە بەرەو کردار و بیروڕا ژیرترەکان، هەمان ئەو هۆکارەیە کە فەیلەسووفێکمان لێ دروستدەکات.

جێمز بە لەبەر چاوگرتنی ئەم حەقیقەتە کەوتە کاملکردنی ئەو فەلسەفەیەی کە لە چارە کردنی ئەستەمیەکانی رۆژانە و رزگار بوون لە سەرگەردانی و سەرسامییەکانی رۆژانە، بەکەڵکی خەڵك دێت. ئەوفەلسەفەی خۆی بە پراگماتیزم ناوبرد کە لە وشەی یونانیی پراگما داتاشراوە کە واتای کار و فرمان دەگەیێنێت. ئەم فەلسەفەیە لەسەر بنەمای کار مکومە. فەلسەفەی بازرگانییە بەڵام نەك بە واتا دیاریکراوەکەی کە بریتی بێت لە ئالوگۆڕی شمەك. بەڵکو مەبەست لێی هەر جۆرە ئالوگۆڕێکی هزری و مەعنەوییە کە دەکرێ لە نێوان رۆڵەکانی مرۆڤ بێتە ئاراوە. بنەما هزرییەکەی ئەم قوتابخانەیە ئێجگار سادەیە و پێوەرێکی سادەی بۆ گشت کاروبارەکان هەیە.

دەڵێت دەبێت تێبینی بکرێت و بزانرێت کە ئەوکارەی کە حەز دەکەین ئەنجامیبدەین چ نرخێکی هەیە. با سەهو نەکەین، مەبەست بەهای ماددی و دانی پارەی ئامادە (کاش) نییە بەڵکو مەرام ئەوەیە کە بزانین ئەوکارە تا چڕادەیەك کاریگەری لەسەر تەندروستیی جەستەیی و بەهێز بوونی گیان و شادیی ژیان هەیە و چەند دێنێت (بەهایچەندە).

هەروەك بینیمان، نەخشەی ئەم فەلسەفە کردارییە لەسەر بنچینەی پێویستی خودی جێمز داڕێژرا. لەو رۆژانەدا کە گیرۆدەی نائومێدی بوو بە ناو (خود)ی خۆیدا روو چوو و فەلسەفەکەی





هۆییێك بوو بۆ بەرگری لە خۆکردن. ململانێ و تەقەلاییێك بوو کە بتوانێت گیانی خۆی لەو گەرداوە رزگاربکات. جێمز سەرەتا بە تەدبیرەوە لەم فەلسەفەیە نزیککەوتەوە، چونکە پیاوی کارو عەمەل بوو. دەیەویست بەرلەوەی پەسندی بکات بەهاکەی بزانێت.

لەو رووەوە لە چالاکییە جیاوازەکانی ژیانی خۆیدا بەکاریهێنا و کاریگەریەکەی بۆی دەرکەوت. ئەم فەلسەفەیە هێزێکی زیاتری بۆ درێژەدان بە ژیان، خۆگونجاندن و هەڵکردنێکی زیاتر لەگەڵ رای ئەوانیتر، هزرێکی فراوانتر لەبارەی جیهان، ئاسۆی هزریی کراوەتر، رەزامەندییێکی قووڵتر و ئاسوودەییێکی زیاتری پێبەخشی. بەمەش بڕیاریدا کە فەلسەفەی خۆی پێشکەش بە خەڵکی جیهان بکات، "ئێستاکە ئەم فەلسەفەیە بۆ رەوشی من بەکەڵك بووە ئەگەرێکی زۆر لەئارادایە کە بۆ حاڵ و وەزعی ئەوانیتریش بە سوود ببێت."

وا چاکە ئێستا ئەم فەلسەفەیە بەهۆی ئەزمونەکانی خۆمانەوە تاقیبکەینەوە و تێبینی بکەین کە ئەم فەلسەفە پراکتیکە چۆن ئێمە لە کارەکانماندا، لەو هەڵس و کەوتەدا کە بەرامبەر بەخێزان هەمانە، لە بیر و باوەڕیان بێ بیروباوەڕی ئێمە بەرامبەر بە خوا، یارمەتیمان دەدات و دواجار بزانین ئەم فەلسەفەیە بۆ ئەم پرسیارە بنچینەییەی ئێمەکە ئایا ژیان ئەوەندە دەێنێت کە درێژەی پێبدەین، چ وەڵامێکی پێیە.

سەرەتا با بزانین فەلسەفەی پراگماتیزم لە بارەی کارەکانی ئێمەوە چ دەڵێت. جێمز ئاگادارمان دەکاتەوە کە لە بارەی گرینگیی "سەرکەوتن..." زیادە ڕەوی نەکەین و لە پێناو گەیشتن بە سەرکەوتن هەموو شتێك نەخەینە لایەکەوە و دەستبەرداری هەموو شتێك نەبین. دەڵێت چ کارکەر بێت و چ بەڕێوەبەر، پەیوەندیی نێوان ئێوە زیاتر هاوکارییێکی دۆستانەیە نە کاربەرییێکی سنووربەزێن و دەستدرێژکارانە. "هەرچەند زیاتر گەشە دەکەین گەورەتردەبین، ناوپووچتر و توندوتیژتر دەبێین. لەو رووەوە من نەیاری هەر سەرکەوتنێکی گەورە و هەر شتێکم کە ئەنجام گەلێکی گەورەی لێبکەوێتەوە و هەردەم هەواداری ژێر دەست و دوڕاوەکانم.

نابێت لە کۆکردنەوەی ماڵ و ساماندا کە بە بەهای نەداری و هەژاریی هاوسێکان تەواو دەبێت چاو چنۆك بین چونکە زیانبەخشە. ئەو کارەی کە هاونەژادیی من دەخاتە بەردەم ئەستەمی و لەناوچوونەوە چ سوودێك دەتوانێت بە من بگەیێنێت؟"





پیشەکەت هەرچییەك بێت، تۆ بۆ کۆمەڵگا کار دەکەی نەك بۆ خۆت و گەورەترین شادی و بەختەوەری تەنیا دەتوانی لە کۆمەڵگاییێکدا بەدەستبێنی کە راستی و دروستی و هاوکاری و هەرەوەز تیایدا برەوی هەیە لە کۆمەڵگاییێکی وادا کە دروستبوونی پەیوەندی بە کاری تۆوە هەیە، گەورەترین مووچە (حەقدەست) بەرامبەر کارەکەی خۆت وەردەگری کە بریتییە لە دڵئاسوودەیی (دڵنیایی).

فەلسەفەی پراگماتیزم لە هەموو شوێنێك، چ لە ماڵەوە چ لەکاروباری دەرەوەی ماڵ، کاریگەرە. جێمز دەڵێت: "فەلسەفەکەم فێریکردم کە تارادەیەکی زۆر لە ماڵەکەی خۆمدا ئارامتر بم" گەرچی پیاوێکی کۆمەڵایەتیی بوو، لە ناو ئەندامانی خێزانەکەیدا هەستی بە رەزامەندییێکی تەواو دەکرد. لە خێزانێکی لەبار و پەسەند دا سەرمایەیەکی گەورەی ئەڤینی پاك پاشەکەوت بووە. لویز مۆمفۆرد لە روون کردنەوەی فەڵسەفەی ویلیام جێمزدا دەڵێت: "ژیانی مرۆڤانە جووڵەیەکی بەردەوامە بەرەو سەرەوە" و دین ئینگ (Dean Inge) کە پراگماتیستێکی ترە دەستنیشاندەکات کە: "رێگەی باڵاڕوویی بە هۆی خۆشەویستییێکی تاکەکەسییەوە تەی دەکرێت."

جێمز دەڵێت تا ئەو کاتەی کە دەتوانین خۆشەویستی دەربڕین و تا ئەوکاتەی کە ماڵ و هێلانە و خێزانێکمان هەبێت کە بتوانین پێیانەوە سەرقاڵ بین، نابێت ترس و سام بخەینە دڵمانەوە. ئەوەندەی کە پەیوەندی بە کاروباری خێزانییەوە هەبێت ئەمەیە واتای فەلسەفەی پراگماتیزم.

ژیانی خێزانی تێنوێتییە گشتییەکەی ئێمە بۆ لەگەڵ "خزم و کەسە نزیکەکان" دا بوون دەشکێنێت. هەر تاکێك بە خزمەت کردنی خەڵکی گشتی بە بەرزترین رادەی گەشەی مەعنەوی خۆی دەگات و دەبێت بۆ شادمانی ئەم هێلانەیە، بە ئەڤینێکی گەورەوە ئەرکی خۆی بەجێ بهێنێت.

جێمز ئەم بیرورا کردارییە لە پەیوەندییە خێزانییەکاندا بەرفراوان دەکات (گەشە پێدەدات) و هەموو خەڵکی جیهان وەکو خێزانێکی گەورە سەیردەکات جیهان هەمووی بەماڵێك دادەنێت و هەموو خەڵك بە ئەندامانی ئەم ماڵە دادەنێت. لە دیدی ئەوەوە ئەو کارە هەرە سوودبەخشانەی کە لە جیهاندا بە ئەنجامدەگەن بریتین لەو خۆشەویستییە دۆستانە و خێرخوازانانەی کە لە نێوان تاکەکانی کۆمەڵگای مرۆڤیدا ئاڵوگوڕ دەبن.

ئەم وتانە بەرەو ئەو شێوەیەی پراگماتیزم رێنماییمان دەکات کە لە ئاییندا بەکار دەبرێت، کەواتە ئایینی تەواو ئەوەیە کە بتوانێت گشت خەڵك بکات بە تاکە خێزانێك کە یەك خوا بپەرستن. حالی حازر ئێمە روومان لە ئایینە جیاوازەکان کردووە چونکە وێنای جۆراوجۆرمان بۆ خوا هەیە. کەس بەو زانیارییە کەم و کورتانەی کە هەیەتی، ناتوانێت بەتەنیا بەتایبەتی حەقیقەت بخاتە بەردەستی خۆیەوە هەریەك لە ئێمە تەماشاڤانێکە کە لە روانگەیەکی تایبەتییەوە دەڕوانێتە جیهان و کەس مافی ئەوەی نییە وا دابنێت کە تەنیا رای ئەو لە کەموکورتی بێ بەرییە، "گشت حەقیقەت و چاکەی پەتی بەرچاوی تەماشەڤانێك ناکەوێت هەرچەندە دەکرێ ئەو تەماشەڤانە هەلومەرجێکی تایبەتیی بۆ سەیرکردن هەبێت"

لەو رووەوە، لەبری ئەوەی لە پێناو پاراستنی راوبیر و باوەڕکانی خۆماندا بکەوینە شەڕ و ململانێ و دەمارگیری پیشانبدەین وا باشترە کە بە رێنمایی خوا ئەم بیروڕا جۆراوجۆرانە یەك بخەین و بیکەینە بە شتێك کە شیاوی سەیر کردن و لێ تێ گەیشتن بێت.

بەڵام لە ژیانی رۆژانەدا، بڕوای هەر تاکە کەسێك، کڵێسای هەر تاکێك و خوای هەر تاکێك ئەگەر ئەو توانایەی پێ ببە خشێت کە بەسەر دژوارییەکانی رۆژانەدا زاڵببێت. بە حەقیقەت دادەنرێت ئێمە هەرگیز پەی بە حەقیقەتی زاتی خوا نابەین بەڕای جێمز بیر و رای ئێمە لە بارەی خودی خوا وەکو ئەو (را)یە وایە کە دەکرێ گیانەوەیێك لە بارەی مرۆڤ هەیبێت بەڵام نابێت نائومێد و دڵسارد بین.

جێمز لە بارەی سەگێگ کە لەگەڵیدا هاومالّ بوو ئەوها بۆ کچەکەی نووسی: "ئەو نازانێت کە من کێم و چمە بەڵام هەستدەکات کە من دۆستی ئەوم. یەکبینە دەمی خۆی دەخولێتنێت و وەکو فریشتەیەك کە لە پشت هەورەکانە کاریگەرییێکی خۆش لە زەینمدا بەجێ دەهێلێت ئەو ئارەزووی وایە کارێکی باش ئەنجامبدات."

ئێمەش وەکو ئەو فریشتانەین کە لە پشت هەورەکاندا شاراوەن. ئێمەش وەکو جووڵەکەر (خشۆك) لە ماڵی خواداین. گەرچی هەور و تەمومژی ناڕوونی و دوودڵی ئابلوقەی داوی بامتمانەت بە شتێك هەبێت. هەر کاتێك بڕوات بەخوا هەبێت، هەر ئەم بڕوایە خۆی لە خۆیدا، خوا لە ژیانی تۆدا دەئافرێنێت. لە وورووەوە، بەها زانستییەکەی ئایین سەرمایەیەکی مەعنەوییە و لەسەر بناغەیەکی ئەخلاقیی قایم راتدەگرێت.





هەبوونی بڕوا بە خوا سەرمایەیەکی باشە، چونکە ژیانی ئێمە مەبەست و ئامانجێکی دیاریکراو و ئاشکرا بەدەستدێنێت و ئێمە بە هێزێکی گەورە چەکدار دەکات تا بە ئارەزووی بنەڕەتی خۆمان بگەین. بەڵام ئەگەر چاوەڕێ بکەین کە خوا لای ئێمە بێت، ئێمە دەبێت بە ئاراستەی ئەو هەنگاو بنێین و بەم شێوەیە بەو رایە هەرە گرنگە دەگەین کە جێمز لە فەلسەفەی پراگماتیزمدا دەری بڕیووە.

ئایا ژیان شایستەی مانەوەیە؟ جێمز بە ستایلە ئاسایی و گاڵتە ئامێزەکەی خۆیەوە وەڵام دەداتەوە: ئەم مەسەلەیە پەیوەندی بە کەسەوە هەیە."

پاشان دەکەوێتە خۆی تا وەڵامێکی ئیلهام بەخش بەو پرسیارە بداتەوە و رادەگەیێنێت کە ژیان شیاوی مانەوە دەبێت هەرکاتێك بەدوای ئەوەبین کە بە پشتبەستن بەخوا بژین و لە رێگەی ئەودا هەنگاو بنێین.

جێمز نە لەگەشبینەکانە و نەش لەرێزی رەشبینەکانە. بەڵکو سەربە گرووپی مێلیوریستەکانە*. فەیلەسووفێکە کە چاوی لە ئاست بینینی ئەو خراپەکاریانەی کە لە جیهاندا هەنە نابینایە و لەو بڕوایەدایە کە ئەگەر بمانەوێت دەتوانین جیهانێکی باشتر دروستبکەین.

چونکە ئەو جیهانەی کە تێیداینە هێشتا کاملنییە و کارێکی زۆری دەوێت هەتا کاملبێت. خوا دەیەوێت کە ئێمە لەم رێگەیەدا، کارکەری راستگۆ و بە ئەمەك بین. هەروەك کە ئێمەش پێویستیمان بە یاوەری و هاوکاری ئەو هەیە.

کاتێك کارێکت گرتە ئەستۆ و باش ئەنجامتدا دەبی بە هاوکاری خوا. یارمەتی بدە تا کەم و کورتییەکانی ئەم دونیایەی کە هێشتا ئاواکردنی تەواو نەبووە لەناو بچن و خەبات بکە بۆ ئەوەی بیکەی بەشوێنێکی ئەمن و جوان بۆ ژیان. بۆیە، دەبێت ئامانجی ژیانی تۆ ئەوەبێت کە بینا کۆنەکە لابەی و بینایێکی نوێ لە شوێنی ئاوا بکەی، ئەمە خۆی بەسەرهاتێکی راستەقینەیە بە مەترسییێکی زۆرەوە... "ئایا حەز دەکەی بەشداری لەم کارەدا بکەی؟ ئایا

* Meliorist ئەوانەی کە بڕوایان بەو بیروڕایە هەیە کە جیهان لە ژێر رووناکی هەوڵی مرۆڤدا دەتوانرێ باشتر ببێت.

متمانەت بە خۆ و بەوانی تر کە هەنگاویان ناوەتە ئەم ڕێگەیە هەیە کە ڕووبەڕووی کێشمە و گرفتەکان ببینەوە؟"

فەلسەفەی پراگماتیزم بەکورتی بریتییە لە بانگکردن بۆ چالاکیی تاکەکەسانە بۆ تەواوکردنی کاری ئاواکردنی دونیایێکی باشتر. لەو هەولّەدا کە بۆ باشترکردنی جیهان بەکار دەبرێت بێ گومان هۆیەکانی شادی و ئاسوودەیی خەلّکیش دابیندەبێت.

جێمز دەلّێت: باشترکردنی جیهان و ژیانی گەلان کارێکی تەواو قابیلی ئەنجامدانە. بەهەرحالّ مەسەلەی گرنگ، شکۆ و گەورەیی فەتح و سەرکەوتن نییە بەلّکو گرنگی لەو گەرم و گوڕییەدایە کە کەسی خەباتکار لە ناو خۆیدا هەیەتی.

بە تایبەت کاتێك خەبات لە دژی جیاوازی و نایەکسانییەکان بێت هەمیشە دەرفەت بۆ سەرکەوتن هەیە. جێمز ئەم حەقیقەتە بە وەرگێڕانی پارچەیەکی هەیەجانهێنەر لە یونانییەوە دەردەبڕێت کە لەسەر کێلی گۆڕێك نووسراوە: ئەی کەشتیوان، فەرماندەی ئەو کەشتییە تێك شکاوەی کە لەم بەستێنەدا خەوتووە فەرمانت پێدەکات کە بۆ پێشەوە باژۆی. دوای ئێمە، جەنگاوەرە دلێرەکان لە بەلەمەکاندا بە ناو سنگی زریاندا بە هەلّەداوان بۆ پێشەوە دەچن." کەواتە کاتێك ئەوانیتر نشوستیان هێنا تۆ لە شەڕەکە مەچوو دەرەوە بەلّکو چاروکەکان بخەرە جوولّەوە و درێژە بە بەسەرهاتی خۆت بدە.

ـ ٤ ـ

جێمزیش لە سەرتاپای ژیانی خۆیدا بە دوای بەسەرهاتی خۆیەوە بوو. ئەو هەردەم بە کارە پراکتیکیەکانەوە سەرقالّ بوو و دەستی بۆ چالاکی جۆراوجۆر برد تا هەلومەرجی ئابووری و کۆمەلاّیەتی و سیاسی جیهان وەرچەرخێنێت و بیگەیێنێتە پلەی بەرکەمالّی. گەرم و گوڕیی ئەو لەدژی لاوازیی میزاجی خۆی، بلێسەیەك بوو کە ئەوانی تریشی گڕدا و بۆ تامەزرۆیی و چالاکی پالّیانی پێوەنا. ئەو دەلّێت: هەموومان هێزێکی پاشەکەوت کراومان هەیە کە زۆربەمان هیچ کاتێ بەکاری ناهێنین. سوود لەم سەرچاوە لێوڕێژە وەربگرە تا بەو توانایە سەرسام بی کە بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانت هەیە. خۆت لەسەر پێی خۆت ڕابگرە و بەگژ هەر مەترسییێکدا بچۆوە کە ڕوو لە تۆ بکات.



"ژیان بە گۆڕپانی خەبات دابنێ" و لە دژی پەرێشانیی خۆت و بۆ لەناوبردنی گلاّوی و ناشیرینییەکانی جیهان بەجەنگ هەلّسە.

جێمز بە پێی بنەماکانی فەلسەفەی خۆی بەرامبەر بە دادگاییکردنی دریفوس، ئەو بێعەدالّەتییەی کە دەرحەق بە کرێکاران دەکرا، بەرامبەر بە دەستدرێژییەکانی ئیمپریالیزم و شێتایەتی شەڕ خەباتی کرد. ئەو ڕقی لە شەڕ و خوێنرێژی بوو بەلاّم پێی وا بوو کە ڕەنگە نەتوانرێ غەریزەی جەنگاوەری لە سروشت (نیهاد)ی مرۆڤدا بکوژرێت. بەو بۆنەیەوە پێشنیاری دەکرد کە ڕەوتی ئەم غەریزەیە بەرەو "شەڕ لەگەلّ سروشت" دا لابدەین. دەیگوت لێگەڕێن با هەر لاوێك دوو سالّ لە خزمەتی عەسکەریدا بەسەر بەرێت بەلاّم نەك بۆ کوشتنی ئەوانیتر، بەلّکو بۆ ئاوا کردنەوە. واتا بەو هۆیەوە دارستانەکان خاوێن ورێك و پێك بکەین و زەلکاوەکان وشك بکەینەوە و زەوییەکان ئاو بدەین. پرد لەسەر ڕووبارەکان دروستبکەین و هەلّچونی ئاوی ڕووبارەکان جلّەو بکەین و وزە و سەرمایە ماددییەکەی خۆمان کە ئەمەندە لە شەڕ و کوشتاردا بە فیڕۆ دەچێت بۆ چارەسەری و دەرمان خەرجبکەین کە کارێکی تەواو مرۆڤانەیە وەرن با بۆ هاتنە ئاراوەی نەوەیەکی تەندروستتر و بەختەوەرتر و شادومانتر یەکبگرین.

تەندروستیی ویلیام جێمز کە هەردەم بەرەو خراپی دەرۆیشت دواجار شێوا و بە ناچاری لە سالّی ١٩٠٧ لە وانەوتنەوەی لە زانکۆی هارڤارد دەستیهەلّگرت. بەلاّم هێشتا بە پێوە بوو و خۆی بە فەیلەسوفێکی شاد و دەم بە پێکەنین پیشاندەدا. لەگەلّ هەموو ئەمانەشدا، دۆستەکانی دەیانزانی کە ڕۆژانی کۆتایی تەمەنی نزیکن. جێمز بۆ دواجار سەفەری ئەوروپای کرد و تازە لەسەفەر گەڕابووەوە کاتێك باروبنە سەفەری بۆ جیهانەکەیتر تێکنا.

یادداشت گەلێك لە جێمزەوە بە یادگاری ماونەتەوە کە بۆ نووسینی پەرتوکێك بەناوی "دەروونناسیی شۆڤینیزم"ئامادەی کردبوون بەلاّم تەمەن بۆ نووسینی ئەمەکداری پیشان نەدا.

ویلیام جێمز تا دواسات یەکێك لە خەباتکارە بە ئەمەکە کانی ئاشتی بوو.





## کرۆ پۆتکین (١٨٤٢ ـ ١٩٢١)

### گەشتەکەی لە گەورەییەوە بۆ زەلیلی

**گوێ بۆ بایۆگرافیی ئەم دوو منالّە رادێرن:**

١ـ شازادەیەکی ساوا بە قژێکی لوول و لووتێکی سەربەرەوژوور، بە تزار نیکۆلای ئیمپراتۆری روسیا ناسێنرا (١٨٤٩). هۆڵی پان و بەرینی پێشوازیکردنی کۆشکی ئیمپراتۆر لێوانلێو بوو لە میوانان هەرکە چاوی ئیمپراتۆر کە لەسەر جێگایەکی بەرز دانیشتبوو بە میوانان کەوت، هەموویان وەکو نیشانەی ئەدەب و رێز سەر دادەنوێنن.

یەکێك لە بەردەستەکان کە جلی فەرمیی زریچداری لە بەردایە ئەم شازادە ساوایە هەڵدەگرێت و لە سەر ئەژنۆی ئیمپراتۆر دادەنێت. ئیمپراتۆر بە ئاوازێکی باکانە و خۆشەویستانەوە دەپرسێت:

"کەواتە تۆ پێترو کرۆپۆتکینی؟"

منالّەکە بە خورتی وتی: "بەڵێ خاوەن شکۆ"

حەز دەکەی لێرە بژی؟

زۆر، خاوەن شکۆ.

بەمەش بە خۆیەوە دەینوسێنێت و دەڵێت: "ئەگەر منالێکی باش بی بە پلەوپایەی بەرزت دەگەێنم و ئەوها هەڵسوکەوت لەگەڵدا دەکەم" و دەستێك بە روومەتیدا دێنێت و نەوازشی



دەکات "بەڵام ئەگەر کاری چەتونانە ئەنجامبدەی هەڵسوکەوتم لەگەڵ تۆ ئەوها دەبێت" و دەستی خۆی بە گوشارەوە بە روومەتیدا دێنێت و لووتی دەگوشێت.

ئاو لە چاوانی کرۆپۆتکیندا کۆ دەبێتەوە و بە فکریدا دێت کە ئەگەر سەرپێچی لە فەرمانەکانی ئیمپراتۆر بکات کاری نالّە و گریان دەبێت .

٢ ـ جووتیار زادەیەکی فەرانسەوی بە تاوانی بەشداریکردن لە شۆرشی نهێنیی (١٨٧١) بە لە سێدارەدان مەحکووم کراوە و فەرمانەکە لە سەر لێواری جێبەجێ کردنە. سەربازان ئامادەی تەقە کردنن. جووتیار زادەکە داوا لە ئەفسەری فەرماندە دەکات رێگەی پێبدرێت سەعاتە زیوەکەی خۆی بداتە دایکی کە لەو نزیکانە دەژی و بگەرێتەوە. ئەفسەرەکە کە هەستی بەزەییەکەی جوولاوە رێگەی پێدەدات کە بروات رەنگەش بەو نیازەی کە ئیتر نەگەرێتەوە. بەڵام کوریژگە کە پانزە خولەك دواتر دەگەرێتەوە و لە بەرامبەر جێبەجێکەرانی حوکمەکە بە پێوە رادەوەستێت و دەڵێت: "من ئامادەم" و دوانزە گوللە ئەو نەمامە تازە پێگەیشتووەی خستە سەر زەوی.

ـ ٢ ـ

لەو یادەوەریانەی کە لە زەینی کرۆپۆتکیندا شێوەی خۆی گرتبوو، رێورەسمی بەخشینی نیشانە بوو بە باوکی کە بە بۆنەی رزگارکردنی منالێك لە خانوێك کە گڕی گرتبوو پێی دەبەخشرا.

کرۆپۆتکین لە باوکی پرسی: لەوەی کە خۆت خستە ناو زاری بڵێسەکانی ئاگر نەترسای؟

ـ پیتەر، من خۆ نەچوومە ناو ناخی ئاگرەکەوە، بەڵکو نۆکەرەکەم خۆی لەناو ئاگرەکەدا و منالّەکەی رزگارکرد.

ـ ئەی بۆ نیشانە (مەدالیا) بە تۆ دەدە؟

ـ چونکە نۆکەرەکەی من بوو ئەو دلێریەی لە خۆی پیشاندا.

پیتەر بەبیرکردنەوەدا رۆچوو بەخۆی گوت: دونیاییێکی سەیرە. نۆکەرێك کارێکی ئابرودارانە و مرۆڤانە دەکات، کەچی پاداشتەکە بە ئاغاکەی دەدرێت، بەڵام بەهۆی کاری گەمژانەی ئاغاکەوە نۆکەرەکەی سزا دەدرێت!





باوکی کرۆپۆتکین هەزار و دووسەد نۆکەری هەبوو و هەرچەندە لە چاو ئاغاکانی تر و بە گوێرەی ئەو سەردەمە مرۆڤێکی خراپ نەبوو بەڵام لەگەڵیان توند بوو و لە بەرامبەر چەوتییەکانیاندا بە توندی سزایانی دەدا. ڕۆژێکیان باوکی لە نۆکەرێکی دا ئەویش بەهۆی ئەوەی کە وادیار بوو بڕێکی کەمتر ئالفی بۆ کۆگا بردبووی و نۆکەرەکە بە پێداگریەوە دیگوت "خاوەن شکۆ سەهو دەکەن" ئاغا دووبارە بە حیسابەکاندا چووە و بینی کە تەنانەت زیاتر لە بڕی ئاسایی ئالف بە کۆگاکەدا کۆکراوەتەوە بەمەش هاواریکرد: "سەگباب، کەواتە وا دیارە لە ئالفی ئەسپەکانت بڕیوە!" و بۆ فەرمانگەی پۆلیسی نارد تا بە تاوانی "لاساری سەد لێدانی قامچی لێی بدرێت" کرۆپۆتکین دەنووسێت: قامچی لێدان و ئازاردان[*] ی نۆکەرەکان یەکێك لە ئەرکە فەرمییەکانی فەرمانگەی پۆلیس و فەرمانبەرانی فەرمانگەی ئاگرکوژاندنەوە بوو لە ساڵی ١٨٦١ کە بە فەرمانی تزار فەرمانی ئازادیی نۆکەرەکان دەرچوو، هەلومەرجی ژیانیان تەنانەت دژوارتر و بەرگە نەگیراو تر لێهات چونکە ناچار بوون کە غرامەی ئاغاکانی پێشوو بە نرخێك بدەنەوە کە لە توانایان بەدەر بوو و بەم چەشنە ببوونە دیلی زەوی. هیچ ڕێگا چارەیەکیان نەبوو جگە لەوەی کە بەرهەمی خۆیان بە تەواوەتی بفرۆشن تابتوانن پارەی کرینەوەی خۆیان بدەن و بەو هۆیەوە کۆمەڵێکیان لە برسان فەوتان و ژمارەیەکیان کە دانەوەی قستەکانیان دوا کەوت بوو بۆ سیبری دوور خرانەوە تا لەوێ لەسەرمان بمرن کرۆپۆتکین لە ناوەندێکی سیاسی ئەوها، ڕۆژگاری لاوێتی بەسەر برد.

لە یەکێك لە نامەکانیدا بۆ ئەلێکساندەری برای نووسیویتی: "دواجار ئامانجێکی بۆ ژیانی خۆم دۆزییەوە کە بریتییە لە یارمەتی دانی ئەوانەی کە لە سیستمی سروشدا لاواز و بن پێ کەوتوون." لەو کاتەدا خوێندنی ئەو لە قوتابخانەی عەسکەریدا کۆتایی پێهاتبوو. داوایان لێکرد لە یەکێك لە بەشەکانی، لە ناو سوارانی عەسکەریدا، تۆپخانە، لە ناو قەزاقەکان[*] یان لە گاردی پاشایەتیدا پیشەیەك هەڵبژێرێت و هەر کوێیەکی پێ خۆشە لەوێ دەست بەکارببێت.

---

[*] ئەم وشەیەم لەبری وشەی (Serf) بەکارهێناوە کە وشەیەکی فەرەنسییە و بەو جووتیارانە دەگوترێت  کە لە کێڵگەکانی ئاغاکاندا کاردەکەن و ماڵ و گیانی خۆیان دەدەنە دەست ئاغاکان. و. کوردی

[*] ناوی کۆنی سەربازانی روسی کە کلاوی گەورەی چەرمی و جبەیەکی درێژیان لەبەر دەکرد.





بەڵام ئەو لەناو سەرسامی و واقە وڕمانی فەرماندەکاندا "گۆڕستان"ی ئومێد و ئارەزووەکانی ئەفسەرە لاوەکانی هەڵبژارد و رای گەیاند: "دەمەوێت بۆ سەربازگەی سیبری رەوانەم بکەن."

وای دادەنا کە لەوێ زەمینەیەکی لەبار بۆ بەکاربردنی بیروڕاکانی دەدۆزێتەوە و لە کەمکردنەوەی دەردو خەم زیادکردنی شادییەکانی هاونەژادەکانیدا کاریگەر دەبێت. بەم چەشنە لەناو گاڵتە پێکردن و تیزە بزەکانی هاوخولەکانی نیفۆرمی تایبەت بە عەسکەرەکانی دەوامکەر لە سیبریی لە بەرکرد کە بیرتیی بوو لە شەڵوارێکی خۆڵمێشی، کراسی رەش و کڵاوی چەرمی، بۆ بەکژداچوونەوەی توندوتیژی و دڕندایەتی و ستەم و زۆرداریی ئادەمیزادان بەرامبەر بە هاونەژادەکانی خۆیان، کەوتە رێ.

## - ٣ -

بۆ ماوەی پێنج ساڵ لە سیبری ژیانی بەسەربرد. ئەو خۆی ئەو ساڵانەی بە "سەردەمی راستەقینەی خوێندن و بەدەستهێنانی تایبەتمەندییە مرۆڤییەکان" ناو بردووە. لەوێ بینیی کە دیموکراسی و ئۆتۆکراسی کەوتوونەتە پاڵ یەکتر، ئەنجوومەنەکانی شار لەو کەسانە پێکهاتوون کە بەو پەڕی ئازادییەوە لەلایەن خەڵکی گشتییەوە هەڵبژێردراون. بەڵام فەرمانبەرانی دەوڵەتی کەتەنیا لای سزار خۆیان بەبەر پرسیار دەزانن، فەرمانڕەوایەتی ئەو ئەنجوومەنانەیان لە دەست دایە. هەندێك لەفەرماندە عەسکەرییەکان لە بەکاربردنی هێزدا بە تەواوەتی بەبەزەیی و دڵۆڤانی نامۆ بوون. سەربازان و خەڵکیان بەرامبەر بە بچووکترین تاوان بۆ کوشتن قامچی باران دەکرد. جارێکیان ژنێکیان ئەوەندە خستە بەر لێدانی قامچی و ئەشکەنجەیاندا کە تەنانەت لە سیبریش بەکارێکی ناڕەوایان زانی.

کرۆپۆتکین بڕیاریدا لەبارەی ئەم رووداوە هەنگاوێك بنێت و ئەنجامی لێکۆڵینەوەکانی خۆی راستەوخۆ بەسزا رابگەینێت. ئەم لێکۆڵینەوەیە کارێکی هێندە سادە نەبوو.

گوندییەکانی ئەم پەندە کۆنەی رووسیان لەبیر بوو کە "خوا و سزار گەلێك دوورن، بەڵام سەرۆك دراوسێی دیوار بە دیواری تۆیە." تەنانەت خودی ئەو ژنەش لە واژووکردنی ئەو روونکردنەوەیەی کە ئامادەکرابوو دەترسا.

کرۆپۆتکین دواجار توانی بە بەدەست خستنی بەڵگەی پێویست ئەو فەرماندەیە لە سەرکار لاببات.

بەڵام چیرۆکەکە لێرەدا کۆتایی پێنەهات. چەند مانگێك دواتر کرۆپۆتکین ئاگادار بووە کە فەرماندە کە پلەی بەرزبووتەوە و ئەرکێکی گرنگتر و مووچەیەکی زیاتری پێدراوە. ئەو دەنوسێت: "سەرەنجام فەرماندەکە بە سامانێکی زۆر و زەبەندەوە بۆ سانت پێترێزبۆرگ گەڕایەوە و لەو رۆژنامە کۆنەپەرستەکاندا گۆتارگەلێکی بلاوکردەوە کە گوزارشتیان لە نیشتمان پەروەری و دەوڵەت دوستی دەکرد."

کرۆپۆتکین کە رقی لەم جۆرە ئۆتۆکراسییەت "تاك رەهەندی"ە بوو پەیوەندی بەگرووپی نەهلیست "پوچگەرا" کانەوە کرد کە هەوڵیاندەدا "دونیایەکی باشتر" دروستبکەن. هەروەك کە کرۆپۆتکین ئاماژە پێدەکات وشەی نەهلیست تێگەیشتن و گوزارشتێکی خراپی بۆ کراوە و نابێت لەگەڵ تیرۆریست تێکەڵی بکەین. کرۆپۆتکین خۆی یەکێك لە پیاوە ئێجگار ئارامەکان بوو و نەهلیستە یەکەمییەکان لایەنێکی هاوبەشی زۆریان لەگەڵ تیرەی کوەیکەرەکاند هەبوو. سەربازگەلێك بوون کە شمشێریان نەبوو چاکساز گەلێك بوون کە هەوڵی پاکژکردنەوەی ئاکار و هێنانەکایەوەی ئاشتی و تەباییان دەدا. کرۆپۆتکین و تۆرگنیف لەو کەسانە بوون کە لە خۆبەدەستەوەدان بۆ ئەو خورافات و دەمارگیری و داب و نەریت و رێورەسمانەی کە ئەقڵیان پەسەندی نەدەکرد، خۆیان لادەدا. کرۆپۆتکین بڕیاریدا دەست بە توێژینەوەی ئەو حەقیقەتە بکات کە درووە نەریتییەکانی کۆمەڵایەتی فڕێیدابووە کونجێك. ئەو فەیلەسووفێك بوو کە گەورەیی و مەزناهیی ئەو جۆرە ژیانەی کە تیایدا چاوی بە دونیا هەڵێنا بوو گێژ و سەرسامی نەکردبوو و بۆی دەرکەوتبووکە نهێنیی ژیانی راستەقینە و ژیانی چاك و بەرهەم "لەسەر بنەمای یەکێتی و پەیوەندی مرۆڤ بەسروشتەوە" بەندە. یەکێك لە کارەکانی ئەو لە سیبری ئەوە بوو کە سەرزەمینگەلێکی نوێ بدۆزێتەوە و بەناو رووبارەکانی سیبریدا باژوویت تا رێگەی نوێ بەرەو دەریا بدۆزێتەوە و رێگای شاختسانی نوێ دەستبخات تا بەو هۆیەوە سیبری بە هۆی رێگە بازرگانییە نوێیەکان لە رێگەی مەنچورییەوە بە شوێنەکانی تری ئاسیا بگەیێنێت. کارە



فەرمییەکەی ئەو لەسوپادا، دۆزینەوە جوگرافیاییەکان بوو. دەبێت بە مارکۆپۆلۆی* سەدەی بیستەم ناوببرێت کە هزرێکی فەلسەفی و گیانێکی شاعیرانەی هەبوو.

ئەو بە هۆی ئەو بەسەرهاتانەی کە لە باوەشی سروشتدا هەیبوو و بەزۆری ژیانی دەخستە مەترسییەوە، بیروڕاییەکی ناوەکی (باتنی)ی بەدەستهێنا کە لەسەرەتادا بە شێوەیەکی گشتی و ناڕوون بۆ ناو زەینی تەشەنەی کرد بریتی بوو لەوەی کە "رێکخراوی سروشت لەگەڵ ئیلهامە مرۆڤیەکاندا تەبایە (هاو ئاهەنگە). بەڵام کرۆپۆتکین بۆ ئەوەی بتوانێت ئەم بیروڕایە بەروونی و ئاشکراییەکی زۆر ترەوە پێناسە بکات، پێویستی بە خوێندنەوە و لێکۆڵینەوەی زیاتر هەیە و پێویست بوو زیاتر بە ناو نهێنییەکانی جیهان و هێماکانی ژیاندا بگەڕێت.

ـ ٤ ـ

دوای پێنج ساڵ خزمەتکردن لە سیبری لە سوپا کشاوە و بۆ سانت پێترێزبورگ گەڕاوە. پێشنیاریی ئەندامێتی ئەنجوومەنی جوگرافیای روسیای پەسەند نەکرد، چونکە وای دادەنا کە ئەرکێکی گرنگتری هەیە. "چ لە دۆزینەوەی ئاسۆیە نوییەکان بکەم لەبەشی زەویناسی و جوگرافیادا؟ نووسینی پەرتووکە نوێکان بۆ خەڵکێك کە موحتاجی نان و ئاون چ کەڵکێکی دەبێت؟ هەر برە پارەیەك کەمن بۆ لێکۆڵینەوەکانم خەرجی دەکەم دەبێت لە بژێویی مەمرە و مەژیی ئەو کەسانە وەربگیرێت کە بۆ خەڵك خواردن ئامادە دەکەین، بەڵام خۆیان و منالەکانیان برسینە" کرۆپۆتکین هەستیکرد کە بۆی نییە دەستبداتە کاری" رابواردنان"ی ئەو جۆرە دۆزینەوانە، "جووتیاران پێویستیان بەمن هەیە کە لەگەڵیان بژیم و لە دابینکردنی ژیانێکی ئازادتر و ئاسانتردا یارمەتیان بدەم" بەمەش دەستبەرداری پیشەی بەسوود و پلەی شازادەیی خۆی بوو و پەیوەندیی بەو خەڵکە عامەیە کرد کە لە هەموو شتێك بێ بەش بوون. کاتێك بوو بە کەسێکی "شۆڕشگێڕ" لە فەزلە بۆ ماوەکان بێبەش بوو. پەیوەندی کردن بە جەماوەرەوە، بوو بە دروشمی کرۆپۆتکین و کۆمەڵێك لاوی خانەدان کە لە پێناو خەڵکدا دەستیان لە پلەو پایە هەڵگرت.

* Marco Polo (١٢٥٤ ـ ١٣٢٤) گەشتیاری ئیتالیایی





کرۆپۆتکین بۆ ئەوەی ئازاتربێت و بۆکارەکانی کاتێکی بۆشی زیاتری هەبێت، چووە سویسرا و ماوەیەك لەوێ مایەوە. لەوێ بوو بە تاسەخوازی ئەو بزووتنەوەیەی کە بۆ هێنانە کایەوەی "برایەتی جیهانی لە نێوان کرێکاران و بەکارهێنانی هۆیەکانی ئاشتی لە بری هەڵگرتنی چەکی شەڕ و پێکهاتنی فیدراسیونێك لە گشت خەڵکی جیهان و پێکهێنانی دەوڵەتێکی جیهانی" هاتبوو ئاراوە.

بەڵام هێنانەکایەوەی ئەم جۆرە گۆڕان و وەرچەرخانە کۆمەڵایەتییە لە سەدەی نۆزدەهەمدا بەکارێکی ناکردە دەهاتە پێش چاو. کرۆپۆتکین دەستی لە کارێکی پراکتیکیتردا کە بریتیبوو لە فێرکردنی جەماوەری خەڵك لە ڕێگەی گوتاردان، چاپ و بڵاوکردنەوەی بەڵاوۆکەکان و گۆڤارەکان، لەم کارەدا جگە لە خودی خەڵك کە لە هەژاری و دەستکورتیدا دەژیان هیچ پشتیوانێکی نەبوو. بە باشی دەتوانرێ وێنابکرێت کە کرۆپۆتکین خۆی بەزۆری ناچار بوو بێ خواردن بمێنێتەوە، بەڵام هەوڵێدەدا گۆتارەکانی خۆی لە کاتی خۆیاندا بڵاوبکاتەوە، "هەر ڕووداوێك ڕووبدات فێرکاریی جەماوەری خەڵك دەبێت" هەروەها زانیارییەکانی خودی ئەویش پێویست بوو زیاد بن. بۆیە بە توندی بووبە تاسەخوازی فەلسەفە. دانراوەکانی بیرمەندە گەورەکانی خوێندنەوەوە و بیردۆزەکانی خۆی بە مەحەکی ئەو ژیانە بێ سەروبەرەی کە لە بەردەمیدا بوو هەڵدەسەنگاند. لە ئەنجامی ئەم تاقیکردنەوانەوە زیاتر لە پێشو بڕوای بەوە هێنا کە لە نێوان نەخشەی سروشت و شادی و بەختەوەریی مرۆڤدا زنجیرەیەکی لە پچڕان نەهاتوو و لە ناچوون بە دەربوونی هەیە.

بەڵام ئاخۆ چ نهێنییەك لەم زنجیرەیەدا شاردراوە و چۆن کار دەکات، پرسیارێکە کە کرۆپۆتکین تا ئەوکاتە وەڵامێکی ڕاستی بۆی نەبوو.

لەم کاتەدا هێشتا کاری پراکتیکی دیکە هەبوون کە ئەنجامدانیان زەرووری بوو، بەڵام هەڵبەتە مەترسی گەلێك لە بۆسەدا بوون. ڕێبازە نەهلیستییەکەی بوو بە ئانارشیزم ـ وشەیەکی تر کە کرۆپۆتکین لەو بڕوایەدایە کە بەتوندی کەوتووەتە بەر بەد گوزارشتی ـ ئانارشیزم یان بیردۆزی نەبوونی دەوڵەتی پرودون* بە پێی گوزارشتی کرۆپۆتکین لەسەر ئەو بیردۆزە بەندە کە گشت

* Proudhon (١٨٠٩ ـ ١٨٦٦) نوسەری کۆمەڵایەتی و سیاسی فەرانسەوی.



ڕۆڵەکانی مرۆڤ بە گوێرەی سروشتیان باشن و خۆتێ هەڵقوتاندنی دەوڵەت یان گوشاری حکوومەتە کە دەیانکاتە کەسی خراپ. لەو ڕووەوە، ئەرکی ئێمەیە کە بە شێوەیەکی بنەڕەتی حکوومەت لابەین، بەڵام نەك لە ڕێگەی شۆڕشەوە، بەڵکو لە ڕێگەی گۆڕانێکی ئارام و ئاشتیانەوە، لەڕێگەی تێگەیاندنێکی بەرەبەرە و ڕووناك کردنەوەی زەینی پێشەوا (فەرمانڕەوا) کان و خەڵك. ئاشناکردنی خەڵك بەو حەقیقەتەی کە هاوکاریی دۆستانە و ئاشتی ئامێز لە شەڕ و ڕکابەری دوژمنکارانە باشترە.

کرۆپۆتکین دوای چەند ساڵ کە بە ویستی خۆی "خۆی" بۆ سویسرا و فەرەنسا دوورخستبووە، بۆ سنت پێترزبورگ گەڕاوە، چونکە ئەو هێشتا وەکو کارە کۆمەڵایەتییەکان تامەزرۆی لێکۆڵینەوە زانستییەکانیش بوو و بە نووسینی پەرتووکێك لە بارەی دۆزینەوە جوگرافیاییەکان دەستی پێکرد. رابەرە زانستییەکانی وڵاتەکەی جارێکی تر پلەیەکی گرنگی بۆی پێشنیاریکرد و ئەو بە سەرۆکی ئەنجوومەنی جوگرافیایی ناوبراو. بەخشی ئەم پلەیە بەر لە وڵات ڕوویداو کاتێك گەڕایەوە نیشتمان دوو دڵ بوو لەوەی کە ئەم پلە پڕە لەو شانازییەی کە حکوومەت پێی بەخشی بوو قبوولبکات یان ڕەفز بکاتەوە کاتێك جەندرمەیەك ڕێگەی پێگرت و رای گەیاند: "شار کروپوتکین) فەرمانی دەزگیرکرانتان دراوە.

ـ ٥ ـ

داوای لێ پێچانەوەیەکی سەرچڵانە ڕەوانەی بەندیخانەی سانت پیتەرو سانت پۆلیس کرا ـ دۆزەخێکی ئازار و ئەشکەنجە کە لە ڕووی گاڵتەجارییەوە ناوی دوو پیری مژدەهێنەری شادی خرابووە سەریان ـ؛ "کاتێك بە قەراغ ڕووباری نێڤا (Neva) یاندا دەبردم، دیمەنێکی جوان سەرنجی ڕاکێشام... ڕۆژ لە باری ئاوابووندا بوو. هەورە چڕ و ڕەشەکان، ئاسمانی ڕۆژئاوایان داپۆشی بوو... هەورە سووك و کراوەکان بە ژوور سەرمدا دەرباز دەبوو و جار ناجارێ گۆشەیەکی ئاسمانیان بەردەدا. گالیسکەکە بۆ لای دەستە چەپ پێچی کردەوە و چووە ناو ڕاڕەوەیەکی تاریك کە بە زیندان کۆتایی دەهات... من دەبوایە هەموو جلەکانم، تەنانەت ژێرکراسی ئاوریشمینی خۆمێش داکەنم و یونیفۆرمی بەندکراوەکان لەبەربکەم کە بریتی بوو لە ڕووپۆشی فانیلەی خۆڵەمێشی، گۆرەوی ئەستووری خورەوی و ساغەرێیەکی زەردی ئێجگار گەورە کە لەکاتی بەڕێ ڕۆیشتندا بە خورتی دەمتوانی لە پێی خۆمدا ڕایانگرم و لە پێیان





کەم... پاشان بۆ بەندیخانەیەکی یەك نەفەریی کۆن و بۆن شێ گرتوو فرێیاندام و دەرگا قورسەکەی داربەڕوویان لەسەر داخستم. کلیلێك خولایەوە و من لەو شەوەدا بە تەنیا مامەوە."

دوو ساڵی تەواو ئەویان لە کڕی و بێ دەنگییەکی ڕەهادا لەوێ هێشتەوە. پاسەوانان فەرمانیان پێدرا بوو کە کاتێك خواردنی بۆ دەبەن لەگەڵی نەدوێن، بەڵام ئەو لە زیندانێکی تاکەکەسی تر کە لە ژێر پێیدا بوو. دەنگی نائاسایی و شێتانەی دەبیست. یەکێك لە زیندانییەکان وردە وردە کەوتبووە باری شێتییەوە. تەندروستیی ئەویش لەو شوێنە شێگرتووەوە کەوتە مەترسی. ڕێگەیان پێدا بۆ نەخۆشخانەی بەندیخانە بگوێزرێتەوە و هەندێك جار لە چوار دەورەکەییدا هاتوچوو بکات.

ڕۆژێکیان کاتێك ئێزنگ بۆ سووتان بە دەرگا گەورەکەی بەندیخانەدا ڕەتکران، کرۆپۆتکین سوودی لەم دەرفەتە وەرگرت و تێی تەقاند.

هەر شوێنێك کە گومانی لێدەکرا بێئاکام بە شوێنیدا گەڕان، بەڵام لەبەر یەك هۆ نەیانتوانی بیدۆزنەوە. ئەو بە جلێکی جوانەوە کە لەلایان هاورێکانیەوە ئامادە کرابوو و بە ردێنێکی درێژ و ڕێك و پێك لە چێشتخانەی ئێجگار بە شکۆی دۆنۆن (The Donon) لە سانت پێترێزبورگ دەژیا ـ شوێنێك کە بە هیچ شێوەیەك گومانی ئەوەی لێنەدەکرا کە پەناگەی بەندکراوێك بێت ـ هاوڕێکانی پێیان گوت: "کەس بە شوێن دۆزینەوەی تۆدا نایێتە ئەم چێشتخانەیە" و ڕاستیشیان دەکرد.

ڕۆژی دواتر لە ڕێگەی سوێدەوە بۆ ئینگلتەرا هەڵهات و جەندرمەکان ڕایانگەیاند: "شا کرۆپۆتکین ون بووە" بەڵام سزار ڕایگەیاند: "سەرباری هەموو ئەمانەش دەبێت بدۆزرێتەوە" و سیخوڕگەلێکی ناردە گشت شارەکانی ئەورووپا تا ئەو ڕاکردووە "ترسناك"ە دەستگیر بکەن یان بیکوژن.

بەڵام کرۆپۆتکین توانی چەندەها ساڵ لە دەستیان هەڵبێت و بە ناوی خواستراوی لیاشۆف (Leyashoff) هەروا سەرقاڵی یارمەتیدانی "خەڵکی کەوتوو و چارەڕەش" بێت.





ـ ٦ ـ

کرۆپۆتکین ئەو بنەمایەی لەبەر چاو گرتبوو کە“ "خەڵك بە ئاگابێتەوە. ئازادی و ڕزگاریان وەکو پێویست کراوێك لە خۆیانەوە پەیدا دەبێت." "من شێوەیەکی نوێی کۆمەڵ دەبینم کە لەناو نەتەوە شارستانییەکاندا لە باری گەشەدایە... کۆمەڵگایەك کە تیایدا یەکسانی باڵادەستە و خەڵك ناچار نینە بەرهەم و دەستکەوتی هزری خۆیان بە فیڕۆ بدەن و بە هیچ بدەن. بەڵکو دەتوانن گشت زانیاری و توانای خۆیان لە ڕێگەی بەرهەم هێناندا بەکار بهێنن... پێکهاتەیەك کە گشت ئەم هەوڵ و چالاکیانە دەخاتە ڕێگەیەکەوە کە زۆرترین سوود بە خەڵکی گشتی بگات لە کاتێکدا کە ئازادییەکی تەواو بۆ کەوتنەکاری هێزی نوێگەری و داهێنانی خەڵك هەیە... ئیتر پێویستی بە حکوومەت نامێنێت. چونکە هۆی شەڕ و ململانێ بە کەمترین ڕادە گەیشتووە ئەو کێشمەکێشانەی کە دێنە پێش و هێشتاماون لە ڕێگەی داوەرییەوە یەکلا دەکرێتەوە" داوەرێك کە لەلایەن خەڵکەوە و لە بەرژوەندی خودی ئەواندا ئەنجامیدەدرێت بەم چەشنە دەبینین کە ئانارشیزم یان بیروڕای "نەبوونی حکوومەت"ی کرۆپۆتکین لە ڕاستیدا هەمان حکوومەتی خەڵك و لەلایەن خەڵك و بۆ خەڵکە. کرۆپۆتکین شۆڕشگێرێکی توند نەبوو. بەڵکو تەنیا ئەڤینداریکی دلۆڤانی ڕەگەزی مرۆڤ بوو.

هەر ئەو دۆستی و ئەڤینە جیهانییە بوو کە توانای ئەوەی بە کرۆپۆتکین بەخشی کە فەلسەفەی خۆی بە ناوی "هەرەوەزیی بەرامبەرانە" بە باشی پێشان بدات (بخاتەڕوو). سەیر لەوەدایە کە ئەو بیروڕای "هەرەوەزیی بەرامبەرانە"ی لە بیردۆزی (ململانێی)ی داروین وەرگرت و لە بڕی بێ بەزەیی و دڵڕەقی، پێشنیاری هەرەوەزی هاوکارییکرد. چونکە هەروەك کە کرۆپۆتکین بۆی دەرکەوت و گەلێك لە پیاوانی زانست لە ئاست تێگەیشتنی دەستەوەستان بوون، بنەمای هەرەوەزیی بەرامبەرانەش وەکو ململانێ بەرامبەرانە یەکێك لە بنەماگرنگەکانی سروشتە. ململانێ بۆ مانەوە تەنیا لە نێوان تاکەکانی جۆرە جیاوازەکانی گیانەوەراند باوی هەیە و لەناو تاکەکانی جۆرێك گیانێکی هەرەوەزی هاوکاری بوونی هەیە.

کرۆپۆتکین وەبیر دەخاتەوە کە داروینیش بڕوای بە بنەمای مانەوەی ڕێژەیی هەبوو، واتا مانەوەی جۆری کە باشتر توانیویەتی هەرەوەز و هاوکاری لە نێوان تاکەکاندا بێتە ئاراوە.

ئەمە ئەو بناغەیە کە کرۆپۆتکین فەلسەفەی ئاکاری خۆی لەسەری بەندکردووە (قایم کردووە)" "ئیلهامە مرۆڤییەکان لەگەڵ یاساکانی سروشت هاوڕێ و هاوگونجاون پەرەسەندنی جۆری مرۆڤ لەسەر بنەمای تەعەدا و دەستدرێژی تاکەکەسی نییە بەڵکو لەسەر بنچینەی یەکرێزیی کۆمەڵایەتی بەندە.

کرۆپۆتکین سەرەتا ئەم بیر و ڕایەی لە پەرتووکی "هەرەوەزی بەرامبەرانە" وەکو هۆکاری پەرەسندن دەربڕی و پاشان لە پەرتووکی "ئاکار"ی خۆیدا کاملی کرد ـ پەرتووکێك کە بەداخەوە ئەجەل بواری نەدا تەواوی بکات ـ.

سەرباری هەمووو ئەمانەش، بنەماکانی بیردۆزەکەی لەم دوو پەرتووکەدا بە شێوەیەکی بەرچاو ئاشکرایە. کرۆپۆتکین ڕایگەیاند کە کۆمەڵەی ئاکارەکانی مرۆڤ لەسەر بنەمای پشتیوانیی بەرامبەرانە بنیاتنراوە کە لە گیانەوەرە نزمترەکانەوە بۆمان ماوەتەوە، چونکە "یاسایەکی سروشتی ئاکار" هەیە کە پشتیوانی لە پەرسەندنی نەژادی مرۆڤ دەکات و دابینی دەکات.

بەم شێوەیە کرۆپۆتکین هەوڵدەدات ئاکاری بکاتە زانست و دەڵێت ئەو ئامۆژگارییە ئاکارییەی کە بەو جۆرە لەگەڵ خەڵك هەڵسوکەوت بکە کە چاوەڕێ دەکەی خەڵك لەگەڵت هەڵسوکەوت بکەن، تەنیا فەرمانێکی خوایی نییە، بەڵکو یاساییەکی سروشتییە کە پارێزەری جۆری مرۆڤە.

کرۆپۆتکین دەستنیشاندەکات کە ئەم یاسایە نەك هەر لە ناو نەژادی مرۆڤ، بەڵکو لەناو گیانەوەرە نزمەکانیش جێبەجێ دەبێت. لەناو ئالف خۆر و باڵندەکاندا وەکو ئادەمیزادەکان هەرەوەز و هاوکاری هەیە. ئەمە غەریزەیەکی جیهانی و گشتییە و سروشت بۆ پاراستنی جۆر لە ناو هەمووو جۆرەکاندا بە ئەمانەت دایناوە. ئەوانەی کە دەتوانن ئەم هەستەی هەرەوەز و هاوکاری بخەنەکار دەمێننەوە و ئەو گرووپەی کە توانای بەکارهێنانیان نییە دەمرن و لە ناو دەچن. کرۆپۆتکین بۆ سەلماندنی ئەم بیردۆزە نموونە و گەواهی گەلێك لە هاوکاری و هەرەوەزی گیانەوەرە نزمەکان و هۆزە کێوییەکان دێنێتەوە کە لێرەدا چەند نموونەیەك باس دەکرێن:

کاپتەن ستانسبەری (Captain Stansbury) لە گەشتەکەیدا بۆ یوتا (VTah) یادداشتی کردووە کە چۆن باڵندە ماسیخۆر (پێلیکان)ەکان بۆ پێلیکانێکی کوێر لە دووری و مەوداییەکی پەنجا کیلۆمەترییەوە ماسیان دەهێنا و خواردنیان پێدەدا.





ئەویش بینراوە کە مەیموونەکان دەوەن و دڕکە لە لەشی یەکتردەکەنەوە و پشتیوانیکردن لە ئەندامە لاوازەکانی "کۆمەڵگا"ی خۆیان لە بەرامبەر سەرمای دژوار و لە بەرامبەر دوژمنان و هەروەها بۆ دابەشکردنی ئازووقە چەند ڕێکخستن و دامەزراوەیەکیان لە بەرژەوەندی گشتیدا هەیە.

تەنانەت لە ناو گیانەوەرە ڕاوەکەرەکاندا یاساییەك ڕۆڵ دەگێڕێت کە هیچ کامەیان هێرش ناکاتە سەر تاکەکانی گرووپی خۆی.

ڕەوە ئاسك و بزنەکان کاتێك خەریکی لەوەڕانن ژمارەیەك پاسەوان هەڵدەبژێرن تا نزیك کەوتنەوەی گیانەوەرە دڕندەکان ڕابگەیێنن و کاتێك دەکەونە بەر هێرش ڕەگەزە مێ و نێرەکان لە دەوری بێچووەکان ئەلقەیەك پێکدێنن تا ئەوان ـ تەنانەت ئەگەر پێویست کرابە بەهای گیانی خۆشیان بێت ـ بپارێزن.

"لە ناو باڵندەکانیشدا ئەم غەریزەیەی هاوکاری و پاراستنی بەرامبەرانە دەبینن" کرۆپۆتکین لەم بارەوە چیرۆکێك کە ئەکێرمەن (Eckermann)ی گیانەوەرناسی ئەڵمانی هێناوەتەوە دەگێڕێتەوە کە: "جوجکەی باڵندەیەك دوای ئەوەی کە دایکەکەیم بەگوللە پێکا، لە هێلانە کەوتە خوارەوە، بەڵام باڵندەیەکی تر یەکسەر هەڵی گرت و لە ناو هێلانەکە داناوە. کرۆپۆتکین دەڵێت نموونەی تر لەلایەن گەلێك گیانەوەرناسەکانی تر. لە بواری ئەم هەرەوەزە کۆمەڵایەتییەوە لە بابەت باڵندەکان باسکراوەن "بۆیە دەبێت هەرەوەزی بەرامبەرانە بە هۆکارێکی بەرجەستەوە زاڵ دابنرێت لە سروشتدا... ئەم هۆکارە لە گۆڕەپانی ململانێی ژیاندا باشترین چەکە.. کەواتە دەبینین کە لە دیدێکی گشتییەوە سروشت بە هیچ شێوەیەك شایەتی سەرکەوتنی توانای جەستەیی نییە... بەڵکو بە پێچەوانەوە ئەو جۆرانەی کە ئێجگار لاوازن، وەکو مێروولە و زەردەواڵە، کۆتر، مراوی، مشکی چیایی، ئاسك و خەزاڵ هیچ جۆرە قاوغ (زرێ) و دەنووك و چرنۆکی بەهێزیان نییە بۆ بەرگری لە خۆکردن... لە گۆڕەپانی ململانێی ژیاندا لە سەرکەوتنێکی تەواو بەهرەمەند، کرۆپۆتکین ڕای وایە کە ئەم "غەریزە کۆمەڵایەتییە" هەرەوەزی بەرامبەرانە یەکە توانای ئەوەیان پێ دەبەخشێت دوژمن و ڕکابەرە ئێجگار بەهێزەکانی خۆیان لەسەرڕێ لابدەن.

هێز و توانا لە یەکێتیدایە، تەنانەت لە ناو گیانەوەرە نزمەکان و لەم جیهانەشدا "یەکێتیی گشتی کە جێگیر و هەتا هەتاییە لەسەر بنەمای ئاکار راوەستاوە.

بەم شێوەیە کرۆپۆتکین پەرتووکی "ئاکار"ی خۆی لەسەر بنەمای بیردۆزی پەرەسەندن دادەمەزرێنێت. کاتێك مرۆڤ چووە ژوور پلەی گیانەوەرە نزمەکانەوە بە گوێرەی ئەو نموونەیەکەی کە لەگیانەوەرە گرووپخوازو کۆمەڵایەتییەکانی دەوری خۆی بینبوو لاسایی کردەوە و پاشان خۆی لەگەڵ یاسای نایابی مانەوە واتا وابەستەیی کۆمەڵایەتی گونجاند، ئەو بەرەبەرە بۆی دەرکەوت کە هەر تاکێك لە ڕێگەی خزمەتکردن بە هاوجۆرەکانی خۆیەوە باشتر دەتوانێت خزمەتی خۆی بکات و تێگەیشت کە نهێنی مانەوەی لە دەستدرێژی کردن و تەعەداکردن لەوانی تردا نییە، بەڵکو لە دەربڕینی خۆشەویستی و ئەڤینداریيە بەرامبەر بەوان. ئەم غەیزەیەی خۆشەویستی بەرامبەرانە کە کرۆپۆتکین بە "غەریزەی کۆمەڵایەتی" ناوی بردووە، میراتێکە کە لە باو باپیرانی ئێمەوە، بەرلەوەی بە قوناغی مرۆڤانە بگەن، بۆمان ماوەتەوە و ئەمە "بنەما و سەرەتای هەر جۆرە تێگەیشتنێکی ئاکاری و ئەنجام و دەستکەوتی هەرجۆرە زانستێکی ئاکارییە" کاتێك ئاکاری گەیشتە بەرزترین رادەی پەرەسەندن (تەکامل)ی خۆی بە داد و مروەت ناوی دەبەین.

کرۆپۆتکین دەڵێت بمانەوێت یان نەمانەوێت دەبێت ئەوە قبوولبکەین کە ئێمە بە شێوەیەکی غەریزیانە هەستدەکەین کە هەموو تاکەکانی ئادەمیزاد یەکسانن. ئایین فێرمانیدەکات و زانست دەیسەلمێنێت. ستەمکاری و بێمروەتی و نەبوونی یەکسانی و دەست درێژییەکانی تاکەکان بەرامبەر بە ئەوانی ترە کە بەشەڕ و کینە و مەرگ کۆتایی دێت. بەڵام بەرهەمی داد و مرووەت و یەکسانی واتا هەرەوەز و هاوکاری لە قازانجی گشتی و هاو ئاهەنگی و دلۆڤانی و ژیاندایە.

لەو رووەوە، کاتێك دوو کەس بە جەنگ هەڵدەستن تێك چوونێك لە مافی یەکسانیاندا کە یاسای سروشتیی ژیان بە گومان هەڵنەگری داناوە، دێتە ئاراوە و یەکێك یان ڕەنگە هەردووکیان هەوڵبدەن کە فەزلی زیاتر بە دەستبێنن. لەم بارەدا دەبێت عەدالەت دەستبخاتە ناو کارەکە و ئەو تێکچوونە لاببات کە لە بنەمای یەکسانیدا پەیدا بووە" کرۆپۆتکین دەڵێت ئەمە وانەی بنەڕەتیی پەرەسەندن“ "هێمای ژیان و مانەوەی ئادەمیزاد لە یەکێتی و



یەکگرتوویی ئەودایە لەگەڵ جۆرەکەی خۆی" دونیا تەنیا سەحنەی بەرەنگاری و مل ملانێ نییە کە لاواز بەهۆی بەهێزەوە لەناو بچێت، نەرم رەو لە دەست توندڕەودا زەلیل ببێت و ساویلکە سەر شۆڕێك بێت لە دەست خاوەن هۆشەوە و کەسی خاوەن شەرم بەهۆی کەسێکی بێشەرمەوە لەناو بچێت. قوتابخانەی گەشە پێدەر و بالابەریش هەن کە لەوێ بنەماکانی ژیان لە ڕێگەی لە گەرخستنی هۆش و جۆرخوازی، فێری مرۆڤ دەکرێن. پەرەسەندن تەنیا فێرمانناکات کە چۆن بژین، بەڵکو فێرمان دەکات کە چۆن پێکەوە بژین. کرۆپۆتکین مێژووی ژیانی جۆری مرۆڤ بەپەرسەندن و کاملبوونی بەرەبەرەی دڵبەندی و دەربەستییە چیایەکەی مرۆڤ دەزانێت بۆ ڕێکخستنی ژیانی خۆی لەسەر بناغەی خزمەتی دوولایەن کە لە شێوەی گەورەوە بۆ هۆز و لە هۆزیشەوە بۆ نەتەوە و لە نەتەوەشەوە بۆ سەر شێوەی وڵاتە یەکگرتووەکانی جیهانەوە گۆڕاوە، چونکە مرۆڤ بەرەبەرە فێربووە کە نە تەنیا پەی بە یەك ئاراستەی گشت ئامانجە مرۆڤەکان بەرێت، بەڵکو وەك یەکی و یەکسانیی سروشتیانەی هەموو ژیانە ئادەمیزادییەکانی ناسیوەو بۆی دەرکەوتووە.

## ـ ٧ـ

ئەمە بوو ئەو ئیدالییەی کە کرۆپۆتکین ژیانی خۆی بۆ تەرخانکرد“ "گونجاندنی ئیلهامە مرۆڤییەکان لەگەڵ یاساکانی سروشت" بەڵام بۆ ئەورووپای ئۆتۆکراسیی ئەو رۆژگارە کرۆپۆتکین شۆڕشگێڕێکی ترسناك بوو کە دەبوو بخرێتە بەر راوەدوونان. سەرەنجام سیخوڕەکان ئەویان لە فەڕەنسا دۆزییەوە و سەرلەنوێ دەزگیریان کرد و لە بەندیخانەیان هاوێشت "ئەو کەسەی کە دەچێتە ریزی پێشەنگەکان و جلی ڕێبەرەکان لەبەر دەکات، دەبێت خۆی ئامادە بکات تا بەشی هەرە زۆری تەمەنی خۆی لە زینداندا بەسەر بەرێت" دوای ئەوە ئازاد بوو و وای بۆ دەچوو کە شۆڕشی کۆمۆنیستەکان ئازادیی گشت خەڵکی رووسیا دابیندەکات.

کرۆپۆتکین دوای دوورخستنەوەیەکی چل ساڵانە گەڕایەوە زێدی خۆی و بۆی دەرکەوت کە خەڵکی نیشتمانەکەی جۆرە ئوتوکراسییەت (تاك رەهەندی) ێکیان لەگەڵ جۆرێکی تر گۆڕیوەتەوە. سەیریکرد کە حکوومەتی رووسیا "جەستەیەکی هەیە و گیانی نییە."

فەرمانڕەواکان یەکسانییان لە نێوان هەمواندا چەسپاندووە و خەڵکیان بە یەکسانی کردووە بەکۆیلە. دیکتاتۆرەکە هەمان سزار بوو و تەنیا ناوێکی تری هەبوو. دروشمەکان نوێ بوون،





پەیمان و بەڵێنەکان نوێ، ئەریستۆکراسییەکی نوێ لە رووتییەکان هاتبووکایەوە، بەڵام بەهەمان ستەم و بێ عەدالەتیی کۆن، بە هەمان ئەو دەست درێژیانەوە و بە هەمان شەهوەتی تاکە کەسیانەوە بۆ دەستخستنی دەسەڵات لەسەر حیسابی بەرژەوەندییگشتی.

کرۆپۆتکین کەلەم رووداوە و واقیعانە غەمبار ببوو، پەنای بۆ گوندێك برد لە نزیك مسکۆ و تا کۆتایی تەمەنی (١٩٢١) لەوێ مایەوە و کاتی خۆی بە تەواوکردنی پەرتووکی "ئاکاری" بەسەربرد و خۆی پاکنووسی کرد، چونکە توانای دامەزراندنی سکرتێری نەبوو.

کرۆپۆتکین دواین رۆژەکانی تەمەنی بە دژواری و لەدەست کورتیدا بەسەر برد وەسیەتی خۆی بۆ خەڵکی جیهان کرد کە، "بەبێ مروەت و ئینساف هیچ عەدالەتێك بوونی نییە و بەبێ عەدالەتیش هیچ ئاشتێك نایبێتە ئاراوە"







# کرۆجە

## ئەو فەیلەسووفەی

## کە لە بوومەلەرزەدا لە مردن رزگاری بوو

## (١٨٦٦ـ ١٩٥٢)

لە ساڵی ١٨٨٣ بەڕێز کرۆجە کە یەکێك لە ئاغا (خاوەن زەوی) یە دەوڵەمەندەکانی ناپل بوو بەهاوڕێیەتی خێزانەکەی لە دورگەی ئیسکیا (Ischia) پشووی خۆی بەسەر دەبرد کاتێك بوومەلەرزەیەك روویدا و بەڕێز کرۆجە و ژنەکەی و تاکە کچەکەی بۆ جیهانی عەدەم نارد و تەنیا هەردوو کوڕەکەی، دوای ئەوەی دوانزە کاژمێر لەژێر دار و بەرد دابوون، لەم رووداوە رزگاریان بوو.

یەکێك لەو دووانە کە لە مەرگێکی هێندە نزیك رایکرد بوو، ناوی بێنێدێتۆ ( Benedette Croge) بوو و هەڤدە ساڵ لە تەمەنی بەسەر چوو بوون. لەم رووداوەدا، لووتی شکاو تەندروستییەکەی چەندەها ساڵ تووشی تێکچوون بوو. بەڵام ئەو لاوازیی میزاجی بە بەهێزکردنی گیانی خۆی قەربوو کردەوە.

ماوە درێژخایەنەکەی چاك بوونەوە دەرفەتێکی تەواوی پێ بەخشی تا سەبارەت بەو شۆڕشانە بخوێنێتەوە و بیربکاتەوە کە نەزمی ژیان پەرێشان دەکەن.





قەدەر وابوو کە ژیانی بێنێدێتۆ کرۆجەش بە شۆڕشە دەروونییەکان و زریانە سیاسییەکان بارگاوی بێت. لە دایکبوونی ئەو لە ساڵی ١٨٦٦، لەگەرمەی شۆڕشی گەورەی کۆمەڵایەتی واتا لە ساڵە پڕ لە ئاژاوەکانی خەباتەکانی ماتزینی* و گاریبالدی** و کاڤور*** روویدا. لە ناپل رژێمی پاشایەتی رووخابوو و ئیتاڵیا خۆی لە ژێر دەسەڵاتی نەمسا رزگارکردبوو و دەسەڵاتی کلێسا بە تەواوەتی لەناو چوو بوو و خەڵك چاوی ئومێدیان بڕیبووە ئیتالیای یەکگرتوو و وڵاتێکی کرۆجە لەو سەردەمەدا دەستی لەم وەرچەرخانە گەورەیدا نەبوو، بەڵام ئامۆزاکانی (سپاونتا) بە دڵ و گیانەوە بەشداری ئەم چالاکیانە بوون و بێنێدێتۆ دوای مەرگی خێزانەکەی لە ماڵی یەکێك لەم ئامۆزایانە مایەوە.

لەو ساڵانەدا، بێنێدێتۆیان، کە لە دووێلە جەستەییەکاندا بەپێچەوانەی خەباتە هزرییەکان، هێندە چالاك نەبوو، بەکورپێژگەیەکی "تێکۆشەر و شڕانی" دەناسی. ئەو بیروباوەڕی خۆی بە خوایەکی بەتوانای رەها لەدەستدا و ئەم بێ بڕوایی و بێ بیروباوەڕییە شێوازی ژیانی تێکدا" "ئەو ساڵانە لە تاریکترینس و غەمبارترین ساڵەکانی تەمەنی من بوون- لەو ساڵانە بوون کە کاتێك بەشەو سەرم لەسەر سەرین دادەنا لە ناخی دڵەوە خۆزگەم دەخواست کە ئیتر سەر هەڵنەبڕمەوە-" کرۆجە ناوی خۆی لە زانکۆی رۆما نووسی بەڵام لە ساڵی ١٨٨٦ بەبێ وەرگرتنی بڕوانامە بەجێی هێشت و لە راستیدا چەند ساڵێك لە دونیا دوورە پەرێز بوو و بەخوێندنەوە و بیرکردنەوە ژیانی بەسەربرد و لە چاوەڕوانی وەرچەرخانێکی رۆحی (دەروونی)دا مایەوە.

بەڕاستیش چاوەڕوانییەکەی گەیشتە ئەنجام. یەکێك لە ئوستادە پیرەکانی بە ناوی لابریولا کە هاتبووە سەردانی ئامۆزاکەی، لە کاتی قسەکردندا ئاشکرای کرد کە سەرقاڵی ئامادەکرنی پەرتووکێکە لەبارەی کارل مارکس. کرۆجە دەنوسێت ئەم پەرتووکێکە لەبارەی کارل مارکس. کرۆجە دەنوسێت: ئەم پەرتووکەم لێوەرگرت و خوێندەوە. بلێسەیەك لەگیانمدا بڵاوبووەوە و

---

* Matzzini (١٨٠٥ ـ ١٨٧٢) چاکسازی ئیتالیایی .

** Garibaldi (١٨٠٧ ـ ١٨٨٢) نیشتمانپەرستی ئیتالیایی.

*** Cavour (١٨١٠ ـ ١٨٦١) سیاسەتوانی ئیتالیایی.





گشت بیروباوەڕە ئاکاری و ئەبستراکتەکانی منی لەناو خۆیدا سووتاندا و ئەو بیروڕایە بۆ ناو زەینم تەشەنەی کرد کە مێژوو لە ڕەوتە جەبرییەکەی خۆیدا بەرەوپێش لێ دەخوڕێت و تاکە کەس بیەوێت و نەیەوێت دەبێتە قوربانی جۆر (نەژاد)" بەڵام "ئەم جۆش و زەوقە سیاسییە و ئەم بیروڕا نوێیە زۆری نەخایاند" کرۆچە لە دژی ئەو بیروڕایەی کە "مرۆڤێك بکوژین تا ئازاد ببێت" ڕاپەڕی. شۆڕشی توند، وەکو بوومەلەرزە توند و وێرانکەرە. گۆڕانگەلێکی ڕووکەش و زوو تێپەڕ دێنێتە ئاراوە، بەڵام دەبێتە هۆی ڕەنج و نارەحەتییەکی زۆر. فەلسەفەی کارل مارکس فەلسەفەیەکی تێکدەرە و کرۆچە بەدوای فەلسەفەیەکدا دەگەڕا کە لەبری هەڕەشە و تێکدان، ڕزگاریی نەژادی مرۆڤ مسۆگەربکات.

لەو ڕووەوە کرۆچە بڕیاریدا کە فەلسەیەکی تایبەت بە خۆی هەڵبژێرێت. کۆتایی سەدە نزیك بوو و مرۆڤ دەیتوانی بەچاو خشاندنێك بە درێژایی سەدەدا نرخێکی تەواو لە فیکرە و بیروڕا و ئومێد و ئارەزووەکانی ئادەمیزاد بەدەستبێنێت.

کرۆچە لەوبڕوایەدا بوو کە ئەم نرخاندن و بینینە ڕاستە بەکەسێك دەکرێت کە خۆی لە ناو ڕەوتی کاروبارەکاندابێت. فەیلەسوفێك کە هەنگاوی لە جیهانی خەیاڵ ژوورتر لە ناوە بە بە تەواوەتی لەزریانەکانی کات خۆی لاداوە، هیچ لە تێکشکانی کەشتییەکان و ترس و پەشۆکاوی و بوێری و هیمەتی مرۆڤ نازانێت و تێ ناگات. ئەو ئێجگار تاسە خوازی ئەوە بوو کە خۆی فڕێبداتە ناو باوەشی زریانەکان و هەوڵ خەباتی مرۆڤ لە نزیکەوە و بەچاوی خۆی ببێنێت.

کرۆچە کاری خۆی بەبڵاوکردنەوەی گۆڤارێکی نوێ بەناو "لاکتریتیك" دەستپێکرد و هەر لە ژمارەی یەکەمەوە کردی بەبنکەیەك بۆ بەرنگاربوونەوەیەکی هزری دژ بەشەڕخوازان و لەژمارەی یەکەمدا نووسی: مەبەستی ئێمە ئەوەیە کە لە پێناو هێنانەکایەوە تەکووزییەکی تەواو لە ژیاندا خەباتبکەین... و ئەو گیانە. بورووژێنین کە بەداخەوە دوای شۆڕشی ئیتالیا لەساڵی ١٨٦٠ ڕووی لە لاوازی کردووە"

هاوکارەکەی لەکارە مەترسیدارەکەی گەڕاندنەوەی تەندروستی بۆ جیهانێکی ناخۆش، فەیلەسووفێکی لاوی تر بوو بەناوی جۆڤانی جێنتیلە (Giovanni Gentile)، کەسێکی زیرەکی خاوەن هۆشی واکە



(هەروەك کرۆچە دواتر بۆی دەرکەوت) زیاتر سووتانەوە و گەرم و گوڕی لە بوونیدا بوو تا ڕووناکی و ڕۆشنایی.

کرۆچە و جێنتیلە لەوکاتەدا بۆ بەرنگاربوونەوەی ترۆیی و بێ سەروبەرەکانی جیهان دەستی یەکتر یان گرت. کرۆچە ئامانجە سەرەکییەکەی خۆی بە نەیاری کردن و هەنگاونان دژبە نووسەرە شەڕخواز و بەفیزەکانی وەك گابریل دانونزیو (Gabriel Dannun Zio) و نیشتمان پەرستە توندڕەوەکانی تر دا دانا کە خەڵکی وڵاتیان بۆ هەڵگیرساندنی ئاگری شەڕە نوێکان دەورووژاند.

هەر لەوکاتەدا ئاگری جەنگی جیهانی یەکەم بڵاوبووەوە و ئیتاڵیاش وەکو وڵاتانی تر بە ناو خوێندا گەوزا. بەڵام هەرکە ئاگری شەڕ دامرکایەوە دەرفەتێك بۆ بیرکردنەوە هاتە ئاراوە و پیاوێك نەرم ڕەو و بەویقار و ئاشتیخوازی بەناوی جولیتی ڕێبەراتی حکوومەتی لە ئیتالیا گرتە دەست و کرۆچە وەکو وەزیری ڕۆشنبیری هەڵبژارد (١٩٢٠). فەیلەسووفەکە هیوای وابوو کە بتوانێت گۆڕانێکی قووڵ لە هزر و بیروڕاکانی خەڵکدا بێنێتە ئاروە.

بەڵام ئەم ئومێدە درێژەی نەخایاند و تەمەنی وەزیریی کرۆچە زوو کۆتایی پێهات دوو ساڵ دواتر موسولونی سەرۆکایەتی حکوومەتی گرتەدەست و جێگیری کرۆچە کەس نەبوو جگە لە هاوکاری پێشووی ئەو واتا جۆڤانی جێنتیلە.

کرۆچە، تەنانەت بەر لە جەنگی ١٩١٤، چیتر پەیوەندیی لەگەڵ جێنتیلە نەبوو و لەبەر ئەوەی پێشتر مەترسی داخل بوونی ئیتاڵیا بۆ ناو جەنگ، بۆی دەرکەوتبوو دەنگی خۆی بەرزتر کردبۆوە و بۆ چەسپاندنی ئاشتی و ئاسوودەیی بە توندی دەستی بەچالاکی کردبوو. بەڵام جێنتیلە چوو بووە ڕیزی عەسکەرییەکانەوە. سەرەنجام ئەویش تووشی هەمان ئەو نەخۆشییە بوو کە چەندەها ساڵ تەمەنی خۆی لە بەرەنگاربوونەوەیدا خەرجکردبوو. ئەو شەڕی بە "جیهادی پیرۆز" ناودەبرد و کاتێك شێتایەتیی شەڕخوازی بۆ فاشیزمێکی بەرەڵڵا گۆڕا، جێکتیلە وەکو بیناسازی "سیستمی نوێی ژیان" پەیوەندی بە فاشیستەکانەوە کرد. کرۆچە هەستیدەکرد ڕۆژبەڕۆژ لەو کەسە دوورتر دەکەوێتەوە کە سەردەمێك یەکێك لە خەباتکارانی ئاشتی بوو و کاتێك جێنتیلە لە ژێر دەسەڵاتی ڕژێمی ترسناکی مۆسۆلیونی پلەکەی ئەوی وەرگرت و بوو بە وەزیری ڕۆشنبیری دابڕانیان لە هەرکاتێك زیاتر بوو. ئەوەی کە بەتوندی کرۆچەی لە دژی ئەو





ورژاند بەرژەوەندییە گشتییەکان بوون نەك ئیرەیی شەخسی“ "جگە لە گومراکردنی لاوان، بەد ڕەفتاری لەگەڵ کەسانی پیریش بەشی خۆی مایەی داخە"

کرۆچە لەو هێرشەدا کە کردییە سەر فاشیزم، نە تەنیا تووڕەیی جێنتیلە، بەڵکو دوژمنایەتی مۆسۆلیونیشی دژبەخۆی وروژاند. بەڵام دیکتاتۆر خۆی لێ تێ نەگەیاند. چونکە کرۆچە زیاتر لەوە ناوبانگ و خۆشەویستیی لەناو خەڵکدا هەبوو کە بتوانرێ بەیەکجار لابدرێت. مۆسۆلیونی کە نەیتوانی بوو فەیلەسوفەکە تەمێ بکات پەنای بۆ بیانوویێکی باڵاتر لە گوناهێك برد وای خۆدەرخست کە لەبنەڕەتدا نایناسێت و گوتی: "من هیچ بابەتێکی ئەوم نەخوێندووتەوە" لەکاتێکدا کە کرۆچە بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە مۆسۆلیونیی زۆربەی جار دەربڕینەکانی ئەو دەگێڕێتەوە ـ هەڵبەتە ڕەنگەش مۆسۆلیونی لەسەرحەق بێت چونکە بەیاناتەکانی هی خۆی نەبوون و ئەوانی تر بۆیان دەنووسی مۆسۆلیونی وازی لە فەیلەسووف هێنا، بەڵام هەندێك لە ڕابەرە فاشیستەکان ئەشکەنج و ئازاردانی ئەویان بە ئەرکی خۆیان زانی. بەمەش هێرشیان کردە سەر پەرتووکخانەکەی، پەرتووك و نووسینەکانیان لە ناو برد و ئەویان لە ماڵەکەیدا زیندانی کرد و هەر کەس کە بوێرابایە بە بینینی بڕوات مۆری ناپاکی بەرامبەر بەنیشتمانیان لەنێوچاوانی دەدا.

ـ ٣ ـ

بەڵام کرۆچە هەروا ئەو ئەرکەی بەجێ هێنا کە بۆ خۆی دیاری کرد بوو و ملی دایە بەر پڕۆپاگەندە کردن و بڵاوکردنەوەی فیکر و بڕوای وابوو: "حەقیقەت کە لە پانتایی زەوی باری کردووە دووبارە دەگەڕێتەوە" ئیتر لە کۆبوونەوە و ئەنجوومەنەکاندا ناوی نەدەبرا بەڵام، هزر و بیروڕاکانی بەرەبەرە بۆ ناو زەینی خەڵك تەشەنەی کردبوو. بەڵام کرۆچە "تەواو کەوتبووە خزمەت کردنی خۆیەوە" بێ ترس و سام و بە ئارامی و سەرسەختی، پەرتووکێکی زۆری لە بواری مێژوو، ئەدەبیات، فەلسەفە، زانست و هونەردا نووسی کە هەموویان بۆ بینای نوێی کۆمەڵایەتی کە شۆڕشەکان لێیەوە سەریان هەڵبڕیبوو، پێویست بوون. ئەو کە لە دورگەی ئیسکیا لەژێر دار و بەرددا ڕووبەرووی مەرگ ببووە، ئیتر لە ڕووداوە سروشتییەکان و شۆڕشەکان و تووڕەیی ئادەمیزادەکان نەدەترسا. کاتێك بە شەقامەکانی "ناپل" تێپەڕ دەبوو،



خەڵك بەگوێی یەکتردا دەچرپاند، چونکە دەترسان بەدەنگێکی بەرز قسەبکەن -: "ئەو ئەوپیاوە دلێرەیە کە بەدژایەتی کردنی میر هەڵساوە"

ئەم دژبەرییە لەلایەن کەسێکەوە بوو کە لەناو ئەو هەموو گلاوی و خراپیانەدا، لە دڵی هەرشتێکدا چاکە و جوانیی دەبینی و بڕوایەکی قایمی بە جوانیی چاکە و چاکەی جوانی هەبوو و ئەوەی لە زنجیرەیەك دانراوی خۆیدا کە ژمارەیان دەگاتە پەنجا، وەسف ڕوون کردووتەوە.

کرۆچە فیکرە و بیروڕاکانی خۆی بە کۆمەڵەیەکی پەرتەوازەی تێبینییە بەرێکەوتەکان و بیردۆزە نارێك و پێکەکان دەناسێنێت و خۆی لەناونانی بە فەلسەفە بەواتا تایبەتییەکەی دەپاراست. ئێستا جێی خۆیەتی سەیرێکی ئەو گوڵە حیکمەت ئامێزانە بکەین کە لە گیانێکی ئارامەوە سەریان دەرهێناوە.

کرۆچە لە یەکەمین پەرتووکیدا بەناوی "مەتریالیزمی کارل مارکس" دەستنیشاندەکات کە بیردۆزە ئابوورییەکەی کارل مارکس نە فەلسەفەیەکی باشە، و نەش زانستێکی باشە ئابووری گۆڕەپانی ململانێ و کێشمەکێشی چین و توێژەکان، سەرمایەدار و کرێکار، فرۆشیار و کڕیار، دەوڵەمەند و هەژار نییە،، بەڵکو زۆر لەوە گرنگترە. ئابووری بیردۆزی بەها مرۆڤییەکانە، گەوهەری بنەڕەتی و هێزی ژیانە.

لەڕاستیدا کرۆچە وشەی "هێزی ژیان" دەکاتە جێگیرەوەی وشەی ئابووری. لە نێوان کڕیار و فرۆشیاردا هەم شمەك مامەڵە دەکرێت و هەمیش چاکەکاری و نییەت پاکی. لە مامەڵدا لە نێوان، خۆخوازی و جۆرخوازی، چەوتی و دروستکاری، بەدگومانی و متمانەدا دەبێت یەکێك هەڵبژێرین. بەمەش بنەمای زانستیی باڵادەست لە ئابووریدا هەمان مەسەلە بنچینەییەکانی فەلسەفە واتا چاکە و جوانی و حەقیقەتن. ڕێك و پێکی ئابووریی کۆمەڵگا لە ڕێگەی ڕەنگار بوونەوە و ململانێی نێوان چینەکانەوە پەیدا نابێت بەڵکو لەڕێگەی متمانەکردن بەیەکتر و لێك حاڵی بوونی تاکەکانی کۆمەڵگاوە بەدەستدێت.

بەم چەشنە کرۆچە بەها ماددیەکان دەکات بە شوێنکەوتەی بەها مەعنەوییەکانی ژیان و قازانج و بەرژەوەندی دەخاتە خزمەتکردنی جوانی و چاکە. ئەو بیردۆزە کۆنەکەی ئەفلاتوون لەبابەت عەدالەتەوە، بەهاوسەنگی و هاوگونجاویی ئابووری و کۆمەڵایەتی گوزارشت دەکات.





لە فەلسەفەی کرۆچەدا ئابووری وەکو یەکێك لە لقەکانی زانستی جوانی (جوانیناسی) کە زانستی ناسینەوەی هونەرە و زانستی ئاکار کە لێکۆڵینەوە لەخولق و سروشتی مرۆڤ دەگرێتە ئەستۆ، سەیر دەکرێت.

رەنگە کرۆچە لە پەرتووکی جوانیناسیدا باشتر توانیبێت خۆی بناسێنێت. بەبڕوای ئەو هونر دایکی زانستەکانە. زانستەکانی وەکو کیمیا و فیزیا و بیرکاری، ئێمە لەحەقیقەت تاکەکەسی و زانستییەکان دوور دەخەنەوە و بەرە و جیهانی ئەبستراکتەکان رامان دەکێشن. بەڵام هونەر بەپێچەوانەی ئەوانەوە، ئێمە لە دونیای ئەبستراکتەکانەوە بۆ جیهانی کەس و شتە دیاریکراوەکان دەگەرێنێتەوە و لەگەڵ کردەوەکانی تاکە کسەکاندا ئاشنامان دەکات.

کرۆچە دەڵێت: هونەر واتا توانای نوێگەری و دروستکردنی وێنە" "هونەر دەستکەوتی وێنایەکی بەهێزە کە کاروبارەکانی جیهان دەنرخێنێت. هونەر وەسف و پێناسەی کاروبار و شتەکان ناکات، بەڵکو تەنیا کار ئەوەیە کە دەرك و هەستیانی پێبکات و پاشان لە گۆڕەپانی دەرکەوتندا بیانخاتەڕوو" بناغە و بنچینەی هەر هزرێك وێنایە. لەو رووەوە دەبێت هونەر بە بنەمای گشت زانستەکان دابنرێت. رەنگە لیونارد و داویچی کە گەورەترین هونەرمەندی زانای جیهانە پەی بەو حەقیقەتە بردبێت کاتێك گوتی: بەرلەوەی بیربکەینەوە یان دەست بۆ کارێك ببەین، دەبێت بیر بکەینەوە""مێشکی بلیمەتەکان لە نوێگەری و ئافراندنی بەرهەمەکاندا، کاتێك کەمتر بەکارە دەرەکی و زنستییەکان هەڵدەستێت، چالاکترە" ئەوان بەرلەوەی جیهان بەوشە و رەنگ و ئاوازەکان وەسفبکەن، سەرلەنوێ لە زەیندا دروستی دەکەنەوە. مایکل ئانژیلوش ئاگای لەم حەقیقەتە بوو کاتێك گوتوویەتی: "نیگارکێش بەر لەوەی بەدەست نیگار بکێشێت بە مێشك ئەم کارە دەکات"

کرۆچە ئەم بیروڕایەی بە بنەماو بنچینەی فەلسەفەی خۆی داناوە: "کاتێك ئێمە دەستمان بەسەر جیهانی دەروونیدا گرت، کاتێك تابلۆیەکی نیگار کێشان یان وێنەیەکمان بەروونی و ئاشکرایی دەرك پێکرد، کاتێك باش لەپارچە موسیقایەك گەیشتن، روونکردنەوە و دەربڕین خۆبەخۆ لەدایکدەبن و کاملدەبن. ئیتر پێویستی بەهێچ شتێك نییە و کاتێك دەم بۆ قسەکردن. بکەینەوە یان گۆرانی بڵێین... ئەگەر پەنجەکانی خۆمان لەسەر دوگمەکانی پیانۆ بگۆشین هەر کاتێك پێنووس بە دەستەوە بگرین و دەست بەنیگارکێشان بکەین ئەوا تەنیا کارێك کە دەکەین



ئەوەیە کە ئەوەی بە جوانی و بە توندی بە زەینماندا تێپەڕبووە بە دژواری و رەنج و زەحمەتەوە جێ بەجێی بکەین و بهێنینە ناو گۆڕەپانی دەرکەوتنەوە"

دەتوانین ئەو کەسانەی کە توانای ئافڕاندن و نوێگەریان نییە بە شێوەیەك پەروەردە بکەین کە توانای وەرگرتن و تێگەیشتنیان بەهێز ببێت تابتوانن "خۆیان لەگەڵ مۆسیقای جیهاندا بگونجێنن" دەبێت لە ئاڵوگۆڕە داراییەکانیشدا وەکو تێگەیشتنە هونەرییەکان فێرببین پەیوەندییەکانی خۆمان لەگەڵ هاونەژادییەکانی خۆمان لەسەر وێنە راست و دروستەکان رابگرین (مکوم بکەین) عەدالەتی ئابووری و ئەو جوانییەی کە بابەتی جوانیناسییە، تاکە ئەنجام و دەستکەوتی بلیمەتیی هونەرمەند نییە بەڵکو توانا و زیرەکیی ئەو پیاوە ئاساییەش کە وێناگەلێکی راست و دروستی لەبارەی جیهانی هاوگونجاو و هاوئاهەنگ هەیە و دەتوانێت بەباشی دەریانببڕێت، دەستی لە دروستکردنیدا هەیە ـ دونیاییەکی هاوگونجا و هاوئاهەنگ کە تیایدا، عەدالەتی ئابووری و ئەو جوانییەی کە بابەتی جوانیناسییە و گیانێکی ئاکاریانە بۆ ڕەچاو کردنی داد و مروەوت، لە روکنەکانیەتی ـ هەر هێندە بەس نییە کە وێنایەکی راست و دروست بەدەستبێنین، بەڵکو بەکارهێنانەکەی گرنگە.

تەنیا کارێك دەتوانێت لۆژیکی و بە سوودبێت کە لە ناخی دڵەوە و بەنیەتێکی پاکەوە ئەنجامبدرێت. کرۆچە هەرچەندە رەخنە لە زۆربەی ئایینە باوەکان دەگرێت، خۆی دینداریکی راستەقینەیە.

ئەو بڕوای خۆی لە گوتارێکدا لە ژێر ناونیشانی "بۆچی ناتوانین هیچ شتێك ببین جگە لە مەسیحی؟" بەباشی ئاشکرا دەکات. دەڵێت: "مەسیحییەت گەورەترین شۆڕشی مێژووە" چونکە رێگەیەکی نوێی لە ژیانی مرۆڤدا کردەوە ـ رێگەیەك کە مرۆڤ لێیەوە لە عەدالەتەوە بە بەزەیی و دلۆڤانی و لەوێشەوە بە ئەڤین و خۆشەویستی دەگات ـ لەراستیدا مەسیحیەت برەوە بە دیموکراسیەت دەدات چونکە کەسایەتێکی یەکسان بۆ گشت تاکەکانی مرۆڤ دادەنێت و جەخت لەسەر رەچاوکردنی دەکاتەوە. راستە کە ئایینی مەسیح بەدرێژایی مێژوو "تێکەڵ بە ئەفسانە و بابەتە چەوتەکان بووە" بەڵام لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا حەقیقەتی خۆی پاراستووە. ئێمە لەبڕی ئەوەی بە هۆی خەوشداری و ئارایشتە چەوتەکانیەوە سەرکۆنەی بکەین دەبێت





لەپای ئەو حەقیقەتەی کە هەیەتی ستایشی بکەین"ئێمەچیرۆکی هومێر لەبەر ئەو حەقیقەتانەی کەتیایدا حەشاردراون دەخوێنینەوە نەك لە بەر بابەتە چەوتەکانی "

بەهای راستەقینەی مەسیحیەت و تەواوی ئایینە گەورەکانی جیهان لەوەدایە کە لەناو زریانە جەستەیی (فیزێکی) و هەیەجانە دەروونییەکاندا، خاڵێکی پشت پێبەستن بۆ مرۆڤ دێنێتە بوونەوە کەواتە وا باشە کە دەستبەرداری رەخنەگرتن بین لە رێورەسم و پێکهاتەکانی چونکە تەنانەت فەلسەفە و زانستیش بە تەواوەتی لەو ئارایشتانە بێبەش نینە. ئەو یاسا و رێورەسمە ئایینیانەی کە لەلایەن کۆمەڵە ئایینییەکانەوە دانراون و برەویان پێدراوە، کاریگەریەکی گرنگیان لە فێرکردن و پەروەردەکردنی نەتەوە سەرەتاییەکاندا هەبووە و بەگژ فەلسەفە و گیانی رەشبینی رۆژهەڵاتیدا چووەتەوە و هەردەم بنەما ئاکارییەکانی خستووەتە پێش رێوشوێن و بەرژەوەندییە سیاسییەکان.

ئاشکرایە کە جارجارە گەندەڵی بۆ ناو دەزگای کلێسا تەشەنەی کردووە، بەڵام هەردەم کلێسا هەوڵیداوە کە خۆی لە خەوشداری و پیس بوون بێ بەری بکات و هۆی بوونەکەیشی ئەوەیە کە هێشتا هۆکارێکی کاریگەرە لە ژیانی مرۆڤدا.

"دامەزراوێك بە هۆی ئەو کەم و کورتیانەی کە تیایدا دێنە کایەوە لە ناو ناچێت، بەڵکو کاتێك لە ناو دەچێت کە نەتوانێت پێداویستییە گشتییەکان پڕبکاتەوە"

بەم شێوەیە تێبینی دەکرێت کە پروپاگەندەکەرانی ئایینی هەوڵ بۆ بەهێزکردن و پشتیوانی کردن لە سیستەمی رابووردوو دەدەن لە کاتێکدا کە فەیلەسووف و پیاوانی زانست هەوڵدەدەن سیستەمێکی نوێ بۆ دوارۆژ دابمەزرێنن و بەپێی حوکمی لۆژیك نابێت خانووی کۆن بەر لە تەواوبوونی خانووی نوێ وێران بکرێت.

"کەس ناتوانێت بڵێت کە دین یان ئایینێکی تری هاوشێوەیان یەکێکی باشتر لەوەی کە هەیتمان، لە دوارۆژێکی نزیکدا لە ژیانی خەڵکی جیهاندا دەردەکەوێت. چونکە هیچ نیشانەیەك لێی دیار نییە.

بۆیە تا شانسێکی ئەوها دێتە پێش "دەبێت ئەو ئایینە بپارێزین کە هەیتمان"





کەواتە ئەوەی بەجێیە ئەوەیە کە لە نێوان پاریزەرانی سیستەمی کۆن و پێشڕەوان و دروست کەرانی دونیایەکی باشتر لێك حاڵی بوون و ئاشتی بچەسپێت. لەبڕی ئەوەی لەدژی یەکتر بەخەبات هەڵبستن، چەند باشترە کە لە درامای ژیاندا هەر دووکیان وەك دووهاوکاری یەکگرتوو ئەرکەکانی خۆیان بەجێ بهێنن و پارێزوانی یەکتربن و درێژە بەقسەکانی یەکتربدەن و کاتێك نۆرەی ئەوی تردێت بە رەزامەندی و کەیفخۆشییەوە سەکۆکە بەجێ بهێڵن و شوێنەکە بۆ ئەو چۆڵ بکەن.

ئەم هاوئاهەنگی و پێکەوەگونجانەی نێوان سیستەمی کۆن و نوێ، نێوان ئایین و فەلسەفە، نێوان وەستان و رەق بوونەوەی نەریتەکان و جووڵەی هزرە نوێیەکان، بەشێکی ئەو هاوگونجاوانە گشتی و جیهانیەیە کە کرۆجە ئومێدەوار بوو لە پەیوەندییە ئاکارییەکانی نێوان تاکەکانی مرۆڤدا ببینین، کرۆجە گۆتار گەلێکی لە هەژمار نەهاتووی لە بارەی ئاکار نووسی کە هەموویان لەسەر بنەمای تێبینییە شەخسییەکانی ئەو لە سروشت دامەزرابوون.

خۆت لەگەڵ دونیا لۆژیکەییەکەی واقعییەت بوگونجینە و لە دونیا نالۆژیکەیەکەی خەونە پەشۆکاوەکان مەژی، خۆت لە کارە بێ ئەنجام و بێسوودەکان بپارێزە و بۆ هەڵاتن لە ناڕاحتییەکاتییەکان خۆت فڕێ مەدەرە ناو ئاگری نەفرەت و بێزاری. ئایا پێت وایە کە بە بینینی مەرگی ناوەختی دوژمنی خۆت خۆشحاڵ دەبی؟ لەم بارەدا تۆ لە دوژمنەکەت هەڵنە هاتووی، بەڵکو تەنیا ئیرادەی خۆت لاواز کردووە و نەتتوانیوە سوود لە ئەگەری گۆڕانی دوژمنایەتییەکەی ئەو بۆ دۆستایەتی وەربگری.

بانموونەیەکی تر بێنینەوە: دڵت بەهەر کەسێکەوە بەندبێت بێگومان لەبەردەم مردن و لەناو چووندایە. کاتێك خۆشەویستەکەی خۆت لەدەستدەدەیت ئایا کاردانەوەی تۆ هەروەك کەمۆنتنی دەڵێت ئەوە دەبێت کە لە بڕی ئەڤینەکەی خۆت کەم بکەیتەوە؟ دەڵێت: نەخێر. بەپێچەوانەوەیە ئەڤینی راستەقینە واقیعیەتی خەم و دەرد بەگیانێکی شادەوە قبووڵدەکات، "شادی و بەختەوەریی راستەقینە کاتێك بەدەستدێت کە ئەڤین گۆڕانێکی ئەوها لە گیان و ناخدا ببێتە ئاراوە کە ئادەمیزاد بۆ بەرنگاربوونەوە و بەرگرتنی دەرد و رەنج بەهێز بکات"

ئامانجی ئەڤین لە ئاکاردا بریتییە لە بەهێزکردنی ڕۆڵەکانی مرۆڤ بۆ بەگژداچوونەوەی لاوازییەکانی و پەروەردەکردنی بە شێوەیەك کە لە ژیانێکی ئەقڵانیدا ببێتە توخمێکی گونجاو و لەبار.

- ٤ -

کرۆچە نەیاری هەرجۆرە یاخیبوون و شۆڕشێك بوو کە بەلایەن نازیزم و فاشیزم و کۆمۆنیزمەوە ئەنجامبدرێت و دەیگوت کی ئەو دەبێتە هۆی لەبەریەك هەڵوەشانەوەی ئەم نەخشە بنچینەییە. تا دوا ساتی ژیانی ترس و رقی بەرامبەر بە تەقینەوە و بۆمەلەرزە هەبوو. تامەزرۆی بوو هیچ شەڕ و ململانێیەك نەهێتە پێش تا لە ئاشتی و تەباییدا ژیان بەسەر بەرێت. لە گەرمەی سەردەمی شێتایەتی فاشیزمدا، هەوڵیدا زەینی خەڵك بۆ دروستکردنی حکوومەتێکی ئەقڵانی ئامادە بکات.

کرۆچە سەری بۆ (ڤیکتور ئیمانوێل)یش دانەنواند کە دوای روخانی مۆسۆلوینی هاتە سەرکار، چونکە حکوومەتەکەی ئەویش وەکو فاشیزم پێ گەندڵ و ناڵەبار بوو و پەیوەندی بە کۆمەڵێکەوە کرد کە پێداگریان لەسەر لەکار لابردنی دەکرد. سەرباری هەموو ئەم پەشێوی و جەنجاڵی و بێ تەکۆزییە، کرۆچە لەو بڕوایەدا بوو کە چاخی تەندروستی و ئاشتی و تەبایی دەگەڕێتەوە.کاتێك جێنتیلە بە دەستی کەسانێکی فاشیستەوە کوژرا، کرۆچە لەم کوشتنە کارەساتبارە هەستی بە ترس کرد و رای گەیاند:"من لەپایی هاوڕێیەتیی رۆژگاری رابردوو، هیواداربووم ئەو لەم بەڵایە رزگار بکەم و ئەو بەرەو درێژەدان بەو خوێندنەوانەی کە وازی لێ هێنابوو، رێنمایی بکەم".

لێرەدا رووبەرووی شیرە (گوشراو)ی فەلسەفەی کرۆچە دەبینەوە کە هەردەم دەیگوت:"هەوڵبدە کە دوژمنەکانت بێنیتە ناو ریزی هاوڕێکانت و رێنماییان بکەی کە دەست لە شەڕ و دوژمنایەتی هەڵگرن و روو لە ئاشتی و سەفا بکەن" دوای لەسەرکار لاچوونی ڤیکتۆر ئیمانوێل، کرۆچە خۆی لە قبوڵکردنی پلەی سەرۆك کۆماری لادا کە بە پێداگرییەوە بۆی پێشنیارکرا. ئەو باش ئاگای لەوە بوو کە " ئیتالیا لەو سەردەمە پەشێوەدا پێویستی بە پیاوێکی بەهێز و کرداری هەیە نەك فەیلەسووفێکی ماندو پیرۆز".



سەرەڕای ئەمە، دەبێت ئەوەش بگوترێت کە کرۆچە تا دواسات هێزی فیکریی خۆی لەدەست نەدا.لە تەمەنی ٨٠ ساڵیدا (١٩٤٦) دەستی بە وانەگوتنەوە کرد بە فێریارەکان (قوتابیانی زانکۆ) تا بەقسەی خۆی بتوانێت ئەو قەروە بداتەوە کە لە سەردەمی فاشیزمدا بە ناچاری لە فێرکردنی نەوەی نوێ دواکەتبوو.

لە تەمەنی ٨٤ ساڵیدا نەخۆش کەوت و کەوتە باری مردنەوە، بەڵام لەم بارەش رزگار بوو. دوو ساڵی تریش بە وانە گوتنەوە و نووسین و درێژەدان بەژیانێکی بە سوودی تێکەڵ بە ئیمان، هەستا.

کاتێك ماڵئاوایی لە دونیا کرد هاوولاتییە بە ئەمەکەکانی، لە پیر و لاون لە رێورەسمی ناشتنی تەرمی بێنێدێتۆی ئازیزی خۆیان (پیاوێك کە روخسارێکی توندوتیژ و پڕ لە جەبەروتی جەنگاوەرێك و چاوە پڕ لە هەست و پڕ لە بەزییەکانی پیرێکی پێکەوە هەیبوو) کۆبوونەوە و لەسەر مەزاری فرمێسکیان هەڵڕشت.





# جۆن دیویی (١٨٥٩ ـ ١٩٥٢)

## دروستکەری دونیای باشتر

لە جەژنی لەدایکبوونی هەفتا ساڵەیی جۆن دیویی (Jahn Dwey) (١٩٢٩) پرۆفیسۆر هێربێت شنایدەر (Herbert W. schnieder)ی ئوستادی زانکۆی کۆلۆمبیا لە ستایشیدا چیرۆکێکی دڵگیری باسکرد. ئوستاد گوتی کاتێك یۆنانی کۆن رووی لە وێرانی کرد خواکان لە چیایی ئۆلمپیا پەرش و بلاّو بوون تا شوێنێکی باشتر بۆ خۆیان بدۆزنەوە."پان"ی خوای گەورە، چەندەها سەدە وێڵ بوو. سەرەنجام لەسەر لوتکەی شاخستانی "گرین مونتن" لە مونت نیشتەوە لەوێ رووبەرووی خوایەکی تر بوو بە ناوی لۆگۆس کە پێشتر لە لوتکەکانی چیاکانی نیو ئینگلەند نیشتەجێ ببووە.

لێرەدا هەردوو خوای دژبەیەك ـ خوای کارەبا نامووەدەکان و خوای ئەقڵ و حیکمەت ـ دەستیان بەژیانێکی نوێ کرد و هەریەکەیان لە بەشێکی شاخستانەکەدا جێێ خۆی کردەوە.

یەکێکیان دۆڵەکانی رۆژهەڵاتی خستبووە ژێر چاودێری خۆی و ئەویتریان دۆڵەکانی رۆژئاوا لە ژێر چاودێریەکەیدا بوون کاتێك بە یەك دەگەیشتن بە شێوازێکی ناخوایانە شەڕ و جەنگ لە نێوانیاندا روو دەدا، چونکە هەریەکەیان سووربوو لەسەر ئەوەی کە تەنیا لە روانگەی ئەوەوە دەتوانرێ وێنەی راست و تەواوی جیهان ببینرێت تا رۆژێکیان بڕیارياندا خوایەکی سێیەم بدۆزنەوە و جیهان بۆ بەهەشتێك بگۆڕن. لەو رووەوە لە چیا دابەزین و کەتنە گەڕان بەدوای خوای سێهەم تا رەنگە ئەو جیاوازی و یەك نەگرتنەوەیەی لە رای هەردووکیاندا هەیە لاببات.





دوای وێڵبوونێکی زۆر بە ناو چیا و دۆڵەکاندا، سەرئەنجام هەردووکیان لە بێرلینگتون نیشتنەوە و لەوێ بڕیارێکی گرنگیان دا، واتا بڕیارياندا کە لە بڕی ئەوەی بە شوێن دۆزینەوەی خوای سێیەمەوە بن کە دەکرێ هەرگیز لەم کارەدا سەرنەکەون، هەردووکیان بچنە ناوگیانی ساوایەکی تازە لەدایکبوو. لۆگۆس کە خوای ئەقڵ و حیکمەتە، گوتی "دەترسم ئەم کارە ببێتە هۆی لە ناوچوونی هەردووکمان " پان (خوای کاروبارە نامۆەکان) وتی:"رەنگە وابێت، بەلاّم لە بڕی ئەمە مرۆڤێکی ژیر و تەواو لەدایکدەبێت و مرۆڤایەتی دەگاتە پلەیەکی بەرزتر."

بەم چەشنە لە رۆژی (٢٠)ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٨٥٩ جۆن دیویی لە بێرلینگتون چاوی بە دونیا هەڵێنا ـ بوونێك کە ئەقڵ و حیکمەت و ئەڤینداری بۆ کاروباری نامۆ، بت پەرستی و رێورەسمزانی و حەقیقەت و مەجاز (ناحەقیقەت) پێکەوە لە خۆیدا کۆکردبووە.

ـ ٢ ـ

جۆن دیویی لە نیوئینگلەند گەورە بوو. لە زانکۆکانی مینە سوتا و میشیگان و شیکاگودا وانەی گوتەوە، لە ئەوروپا و چین کەوتە خوێندنەوەو وتاردان، گۆڵبژێرترین هزرەکانی دونیای کۆن و سەدەکانی ناوەڕاستی کێشکرد و سەرئەنجام بەرپێوەبەرایەتیی بەشی فێرکاری و پەروەردەی زانکۆی کۆلۆمبیای گرتە ئەستو و رێك و پێکییەکی پێ بەخشی.

بەم چەشنە جۆن دیویی بەو زانیارییە گەورە و لێوڕێژانەی کەدەستەبەری کردبوون دەیتوانی فەلسەفە لە بەرفراوانترین هەرێمبەرە کردارییەکەیدا ببینێت. ئەو دەیگوت فەلسەفە لەگەڵ تەواوی بەسەرهاتە مرۆڤییەکان لە بیابانی بووندا، گونجاو و هاوڕێ (هاوشان) یە.

فەلسەفە زنجیرە هزرێکی بێ جووڵە و ئارام نییە. بەڵکو زەوقە و هەیەجانێکی ئارەزوومەندانەیە. هەوڵ بەدوادا گەڕانێکی بەردەوامە کە سەرتاپای تەمەنی مرۆڤ بۆ دۆزینەوەی رێگەی راست تەنیوەتەوە (ئابلوقەی داوە). هەریەکەمان دەبێت خۆی بەرێگای راست بگات. رێگەیەك کە بۆ هەمووان لەبار بێت بوونی نییە. رێگاباوەکانی دوێنێ رەنگە بۆ ئەمڕۆ کۆن و رەفزکراو بن، چونکە کات هەموو شتێك ئاوەژوو دەکات.

دەبێت کلیلی تێگەیشتنی فەلسەفەی دیویی لە وشەی "گۆڕان" دا بدۆزینەوە. فەلسەفە بەهۆی دیدێکی تایبەتییەوە کە ئەو بۆ ژیان هەیبوو، لەبێ جووڵەیی و وەستانەوە کەوتە

جوولّە و بزاوتن. لە روانگەی ئەوەوە فەلسەفە زانستی کارە و دەیگوت ئەو وێنایە راست نییە کە فەلسەفەی بە زنجیرەیەك هزر و بیرورِا دادەنا لە بارەی کاروباری جیهان. فەلسەفە بریتییە لە جوولّە و بزاوتنی هزرێك کە بۆ گونجانی تاك لەگەڵ ناوەندی ژیانی خۆیدا روودەدات و دەبێت ئەم گونجاندنە هەردەم لە گۆڕاندابێت هەروەك کە ناوەکەش بەدرێژایی کات بەردەوام لە گۆڕاندایە.

لە راستیدا ژیانی دیویی بریتی بوو لە گونجان و هەڵکردنێکی بەردەوام لەگەڵ هەلومەرجە گۆڕانبار (ناجێگیر)ەکانی ناوەندی ژیانی. ئەو کە خاوەنی پێنج منالّی چەتون و نائارام بوو ئەو توانا دەروونییەی بەدەستهێنابوو کە بۆ هەرجۆرە پێشهاتێکی لە ناکاو ئامادەبێت. ژووری خوێندنەوەی رێك دەکەوتە ژێر گەرماوەوە. رۆژێکیان دیویی سەرقالّی شیکردنەوەی کێشەیەکی فەلسەفی بوو کاتێك هەستی بە رژانی دلۆپە ئاوەکان کرد بۆ سەرپشتی. بەشپرزەییەوە چووە نهۆمی سەرەوە و بینی کە حەوزێ سەرشۆشتنی گەرماوە کە (bath tut) بووە بە رووبارێکی هەڵچوو و دەستەیەك بەلەمی چاروگەداری منالانە بە سەر ئاوەکە کەوتوون و منالّە ساواکەی بە نا ئومێدییە و هەولّدەدات شێرەی ئاوەکە بگرێتەوە. هەرکە دیویی دەرگای کردەوە، کەسێك هاواری کرد:"جۆن، تورِەمەبە، جارێ بیر لە رێگەچارەیەك بکەرەوە!"

ئەم رستەی "تورِەمەبە و بیر لە چارەیەك بکەرەوە" دەتوانێت نیشانەی فەلسەفەی دیویی بێت ـ فەلسەفەیەکی کرداری بۆ ئەمریکا و هۆیەکی ژیرانە بۆ پێشرِەو و چاکە خوازان.

ئەمە ئامانجی دیویی بوو کە فەلسەفە بکات بەزانست ـ زانستێك کە سەروکاری لەگەڵ کردەوە گەلی تاکەکەی و رۆژانەی ژیاندابێت نەك پەسەندکردنی حەقیقەتە گشتییەکان.

جۆن دیویی رایگەیاند کە حەقیقەتی گشتی بوونی نییە. ئەوەی کە لە دیدی یەکێکەوە راست بێت رەنگە لە پێش چاوی ئەوەی تر راست نەبێت ئەوەی کە دوێنێ راست بوو رەنگە ئەمرِۆ چیتر راست نەبێت. چونکە ژیان بریتییە لە پەردەیەکی پرِ نەخش و نیگار کە بەردەوام لە باری گۆڕاندایە. گونجاندنێکی بەردەوام لە نێوان تاکەکەس و ئەو ناوەندەی کە خۆی لە بەردەم گۆڕاندایە لەباری ئەو رووداوانەیە. ئەمە ئەرکی فەلسەفەیەکە رێنماییمان بکات کە چۆن لەم هەنگاوەیەدا خۆمان لەگەڵ ناوەندەکە بگونجێنین- بە واتایەکی تر فەلسەفە بریتییە لە فێربوونێکی بەردەوام یەکبینە رێکەوت نەبووکە دیویی بووبە یەکێك لە پێشرِەوانی هونەری



فێرکاری و پەروەردەی نوێ لەو برِوایەدا بوو کە هێزی ئەقلانی هەر لە پۆلە سەرەتاییەکانەوە دەکەوێتە کار نەك لە قۆناغەکانی فێرکاریی بالا. ئێمە دەبێت منالانی خۆمان فێری بنەما بنچینەییەکانی فەلسەفە بکەین و شێوازی هەڵکردن لەگەڵ یەکتر (پێکەوە گونجان) یان فێربکەین. قوتابخانەی پێشەکیی ژیان نییە، بەڵکو خۆی بەشێکی ژیانە ـ ژیانێکی هاورِێ لەگەڵ هاوکاریی کۆمەلایەتی بۆ پرِکردنەوەی پێویستییە تاکەکەسیەکان ـ ژیانێك کە بەرپرسیارێتیی هاوبەشی تێدایە. هەمووان دەژین و لێدەگەرِێن ئەوانی تریش بژین و لە دەستەبەرکردنی هۆیەکانی ژیاندا یارمەتیدەری یەکترین.

ـ ٣ ـ

هەرئەم گیانە کۆمەلایەتییە بوو کە پالّی بەدیوییەوە نا تا بەفێرکاریی فەلسەفەکەی هەلّسێت. ئەو نەتەنیا چەندین پەرتووکی لە بواری فێرکاری و پەروەردەدا نووسی کە لەکۆماری ئەفلاتوون بەولاوە دەتوانرێ بە هەڵگر و لەخۆگری بیرکردنەوە هەرە نایابەکان دابنرێن لە بواری فێرکاری و پەروەردەدا، بەڵکو لە شیکاگو قوتابخانەیەکی مومتازی "فێرکاری بۆ کردار"ی دامەزراند. لەم قوتابخانەیەدا قوتابی دەبێتە مایەی سەرنج و لێوردبونەووەیەکی تایبەتی و فێر دەکرێت کە دەبێت چ بکات و چۆن کارەکان بە گیانێکی نەژاد خوازی و بەهاوکارییەوە کۆتایی پێ بێنێت. ئامانجە بنچینەییەکەی قوتابخانە ئەوە بوو کە لە منالّدا زەوقی داهێنانی فەردی هاورِێ لەگەڵ غەریزەی کۆمەلایەتی و هەستی خێرخوازی و چاکەکاری بئافرێنێت.

بەلام ئەم پەرەسەندنە تاکەکەسی کۆمەلایەتییە دەبێت لە منالّ خۆیەوە سەرچاوە بگرێت و مامۆستا نابێت بە سەر قوتابیدا بیسەپێنێت. دیویی لەو برِوایە دایە کە: "فێرکردن لەدەرەوەرِا ناچێتە ناومنالّ، بەڵکو لە ناخی خودی ئەوەوە چروو دەدات" بەواتایەکی تر، زانیاری شتێکی هاوشێوەی پارچە بەرد و دار نییە کە لە ئاواکردنی بیایەکدا لەسەر یەکدی دادەنرێن، بەڵکو زیاتر هاوشێوەی گەشەی گولّ و دەوەنە.

ئامانجی فێرکاری و پەروەردە ئەوەیە کە توانای ئەوە بەمنالّ ببەخشێت کە گەشەی خۆی زیاد و کاملبکات. فێرکاری و پەروەردە بەواتا وەردەکەی مانای پەروەردەکردن و بەدیارخستنی هێز و زیرەکیپە هزرییەکانی مرۆڤ دەگەیێنێت. ئەمەیە تێگەیشتنی جۆن دیویی بۆ فێرکاری و پەروەردە و برِوای وایە: "کە ئەوەی کە قوتابخانە دەتوانێت دەبێت لە ئەستۆی خۆی بگرێت





ئەوەیە کە توانای بیرکردنەوەی قوتابیان پەرەپێ بدات (بەرەبەرە کاملبکات)." بیرکردنەوە گرنگە نەك پاشەکەوتکردنێکی پەتیی لە بەرکراوەکان لە مێشکدا. لەدیدی دیوییەوە بیرکردنەوە واتای چارەسەرکردنی پرسەکان دەگەیێنێت لە ژێر رۆشناییا ئەزموونەکانی رابردوو ئەم روویە کردارییەی زانیارییەکان بەقەد ئەوەی بۆ گەورەکانی جێی بایەخە هەروەها بۆ منالآنیش گرنگە، چونکە قوتابخانەش لە "راستیدا بەشێکی کۆمەڵگایە. هەرکاتێك قوتابخانە منالْ وەها پەروەردە بکات کە لەو کۆمەڵگا بچووکەدا ئەرکەکانی خۆی بناسێت و گیانی خزمەتکردن بەهاورەگەزەکەی تیایدا بەهێز بێت و بە شێوەیەکی کاریگەر توانای بەرێوەبردنی خۆی هەبێت، دڵنیادەبین کە کۆمەڵگایەکی ئابرومەندانە و دڵخواز و هاوگونجاومان دەبێت"

بەم شێوەیە دەبینین کە سیستەمی پەروەردەییی دیویی لە سەر "پەروەردە کردن" بەندە (دامەزراوە) ـ پەروەردەکردنی کەسانێکی لێهاتوو کە خاوەنی گیانێکی کۆمەڵایەتی و پشت بە خۆبەستن و ئازاردانە و لە کۆمەڵگایەکی دیموکراتیدا لە رێگەیەکی کردارییەوە بۆ دروستکردنی ژیانێکی باشتر زانیاری بەدەستدێنن ـ قوتابیانی خوێندنگەی ژیان، سەرەڕای فێربوونی خوێندنەوە و نووسین کە دەستووری کارپێکردنی پەروەردەی کۆنە، مێشك و دەستی خۆشیان بە شێوەیەکی کردایانە دەخەنەکار کە ئەمەش خۆی لە خۆیدا شایانی گرنگێکی زۆرە.

- ٤ -

جۆن دیوییش وەکو گشت پێشەنگە هزرییەکان ناچاربوو بەرەنگاری دژواری و بەدحالّی بوون و دژایەتییەکانی و بایەخ پێنەدانەکان ببێتەوە. ئەویش وەك "ئەتلەس ـ پالّەوانێکی ئەفسانەیی ـ هەولێدەدا جیهان بۆ ژوور هەوەرەکان بەرزبکاتەوە" و تارادەیەکی زۆر لە ئامانجەکەی خۆیدا سەرکەوتوو بوو. فێرکاری و پەروەردەی کۆن وەردە وردە رێگەی بۆ شێوازی نوێ کردەوە. زۆربەی قوتابخانە مۆدێرنەکانی ئەمڕۆ ئیلهامیان لە هزر و بیروڕاکانی ئەو وەرگرتووە. ئازادی کردار خزمەتی بەرامبەرانە (دوولایەنە) و هەوڵێکی وشیارانە بۆ پڕکردنەوەی پێداویستییەکانی ئەو دونیایەی کە منالّیش تیایدا ئەرکێکی لە ئەستودایە و هاوئاهەنگی و هەرەوەزی نێوان سەرۆکەکان و قوتابیان و خزمەکان و سەرنجدانی پەروەردەکاران بەوەی کە قوتابخانەش خۆی قۆناغێکی ژیانی کۆمەڵایەتییە، واتا بەرکورتی جێگرتنەوەی قوتابخانە نوێکانی کە لەسەر بنەمای فێرکاریی زانستی بەندن، بەو قوتابخانە کۆنکرێت (جامد)و بێ جوولّە کۆنانە کە جگە



لە کەڵەکەکردنی لەبەرکراووەکان ئامانجێکیان نەبوو، زیاتر لە هەمووان قەرزاری فەلسەفەی فێرکاری و پەروەردەی (جۆن دیویی) یە.

جۆن دیویی ئەم فەلسەفەیەی لە قوتابخانەوە بۆ ناو ناوەندی گەورەی کۆمەڵگا راکێشا، چونکە هەروەك چەندین جار ئاماژەی پێداوە قوتابخانە خۆی بەشێکی بچووکی کۆمەڵگایە ئێمە لەسەرتاپای تەمەنماندا لە قوتابخانەی گەورەی ژیاندا، لە رێگەی کارەوە خەریکی فێرکارینە،"زانین خۆی بە شێکی کردەوەیە"

جۆن دیویی تەنانەت لە ویلیام جێمزیش زیاتر پێناسەری فەلسەفەی کرداریی ئەمریکایە.

فەلسەفەی ئەمریکایی هەوڵدەدات، لەناو ئەو هەلومەرجە سنووردارەی کە پێویستییەکانی تاکەکانی کۆمەڵ هێناوەتە ئاراوە، سنوورێك بۆ ئازادیی تاك دیاری بکات و کۆمەڵگایەکی دۆستانە بۆ ئالّوویّر دابمەزرێنێت. ئەم "فەلسەفەیەی دنیای نوێ" لە پەیوەندییەکی مێژووییەوە لە پرسە پەیوەندیدارەکان بە دونیای "کۆن" بۆ نموونە سوڵتان و خەڵکی جووتیار (رایەت)، ئاغا و کۆیلە، حاکم. حکم لەسەر دراو، دەڕوانێت نەك بە نیگایەکی کوێرکوێرانە. تاکێکی ئەمریکایی ئەندامی ئازادی کۆمەڵگایەکە کە کەسانی تریش بەهەمان رادە ئازادییان هەیە.

ئەم بڕواهێنانە بە ئازادی کە لەسەر بنەمای پێویستیی کرداریانەی ژیان ـ فەلسەفەی پراگماتیزم ـ جێی خۆی گرتووە لەگەڵ جۆن دیویی یان ویلیام جێمز لە دایك نەبووە و هەرچەندە وشەی "پراگماتیزم" لەم ساڵانەی دواییدا کەوتۆتە سەر زمان، بەڵام خەڵك لە رۆژگاری بەر لە شۆڕشی ١٧٧٦ی ئەمریکاش لەگەڵ حەقیقەتیدا ئاشنا بوون و دەبێت بە شیرە و گوشراوەیەکی ئەمریکاییزم دابنێن.

لەساڵی ١٧٥٠ دکتۆر ساموێل جۆنسۆن کە یەکەمین سەرۆکی ئەوقوتابخانەیە بوو کە ئێستا بە زانکۆی کۆلومبیا ناونرا رایگەیاند کە فەلسەفە "زنجیرەیەك بیرکردنەوەی سەیر و بێکەڵك نییە، بەڵکو دەبێت بە بنەماکردارییەکانی سیستەمێکی هزری دابنرێت کە دڵ و ناخ داگیردەکات و بەردەوام بۆ ناو ژیانی مرۆڤ پەل دەهاوێژێت."

ئەمڕۆکە ئەم بیروڕایەی سەبارەت بە فەلسەفەی "پراگماتیزم" واتا "هزرێك کە قابیلی پراکتیزە بوون" بێت بە باشی جێی خۆی کردۆتەوە و قابیلی پراکتیك بوونی هزرێك خۆی یەکێکە لە





پێوانەکانی ڕاستبوونی ئەم هزرە. ئەم پێوانەیەی هەڵسەنگاندنی هزرەکان، واتا توانای کردەیی بوونیان لە قوتابخانە و کۆمەڵگادا بەکاردەهێنرێت و تاکە ڕێگەی سەلماندنی کردەیی بوونی هزرێك، ئەزموونە.

ئێمە نابێت وەکو مۆزەخانەیەکی "ڕابردووی بێگیان" سەیری جیهان بکەین، بەڵکو دەبێت وەکو ئەزموونگەی "کاتی ئێستا" لێی بڕوانین کە لەجووڵە دایە و گیانی هەیە. ئێمە دەبێت بەردەوام بکەوین و هەستینەوە تا فێری ڕێکردن بین. تاکە ڕێگەیەك کە فەلسەفە، وەکو هۆکارێکی دروستکەری ژیان، پێشکەشدەکات ڕێگەی ئەزموون و سەهو و چەوتییە."فەلسەفە شایستەی ئەوەیە کە لە خەبات و ململانێکانی ژیاندا بە شێوەیەکی کردارییانە بەشدارییبکات، خۆی لە ڕوودا و بۆ بەربەرەکانی سەردەمی خۆیدا هەڵقورتێنێت و تووشی سەهوو چەوتی بێت نەك ئەوەی وەك ڕاهیبەکان بخزێتە کونجێکەوە و خۆی لە هەر جۆرە گوناهێك دوور ڕابگرێت. بۆ ئەوەی کێشە و پرسگرێکەکانی ژیان لە بیر بکەین واباشە خۆمان بەو پرسیانەوە سەرقاڵ بکەین کە بابەتی بیر لێکردنەوەی کەسانی ڕابردوو بوو نەك ئەوەی کە کاروبارەکان لەوبارەدا وازی لێبێنین و زەین بە تەواوەتی لە بیرکردنەوە ڕابگرین"

بەم شێوەیە دەبێت دەنگی جۆن دیویی بە دەنگی بەرز و بیستراو (audible)ی ئەمریکای نوێ دابنرێت ـ دەنگێك کە بانگی خەڵك دەکات بۆ کاری بە کۆمەڵ و گەشەی فەردی لە ڕێگەی عەدالەت و مروەت کە گیانی دیموکراسییە، مسۆگەر دەکات ـ دیویی لەو بڕوایەدایە کە دیموکراسیەتی ڕاستەقینە "واتای ژیانێکی ئازاد دەگەیێنێت کە تیایدا پەیوەندی و یەکێتی بە توندی بوونیان هەیە... لە ژیاندا هیچ شتێك بەقەد ئازادی گرنگ نییە. ئەو جۆرە ئازادییەی کە لە سایەیدا بیروڕا و ئەزمونەکانی خەڵك بێ هیچ ڕێگری و لارییێك لە نێوان تاکە کەسەکاندا ئاڵوگۆڕ بێت و هیچ جۆرە پشکنین و هەڕەشەیەك لە ئارادا نەبێت."

دیویی سوورە لەسەر ئەوەی کە دەبێت خەڵك هەر لە سەرتای ژیانەوە بخرێتە بەر فێرکردن و پەروەردەیەکی هاوبەش و ئازاد و بەماف و ئەرکەکانی خۆی و ئەوانی تر ئاشنا بێت و لە ڕاستیدا. ئەمە کاری دەوڵەتێکی دیموکراتییە، واتا ڕاستی (reality) یەکی هەرە باشی سیاسی کە ئەمڕۆکە لە ئەمریکادا دەیبینین. دەبێت لە بیرمان بێت کە دیویی بڕوای بە حەقیقەتێکی



ڕەها نییە کە بۆ هەموو گەلان و لە سەردەمە جیاوازەکاندا یەکسان بێت، بەڵکو دەڵێت حەقیقەتکان بە لەبەر لە چاوگرتنی گەلانی جیاواز و سەردەمە جیاوازەکان ڕێژەیینە.

بابگەڕێینەوە بۆ فەلسەفەی دیموکراتیی دیویی. بەبڕوای ئەو دیموکراسی بریتییە لە "حکوومەتێك کە تێڕوانینێکی ڕێك و پێك و ڕێکخراو" ڕێبەرایەتیی بکات. لە ئەستۆی ئێمە دایە کە هەمان ئەو شێوازە زانستییەی کە لە زانستدا جێی خۆی کردۆتەوە و مکوم بووە، لە حکوومەتیشدا جێگیر بکەین "گەرچی زانست لە پەرەسەندنەکەی خۆیدا وابەستەی داهێنان و نوێگەری و لێکۆڵینەوە تاکە کەسیەکانە، هێز و دەسەڵاتی زانستی لە چالاکی گرووپی و پێکهاتە هاوگونجاو و ڕێك و پێکەکانەوە پەیدا دەبێت و پشتی پێدەبەستێت"

هەر ئەم بنەمایە دەبێت لەپەرسەندنی کاروبارە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکاندا بکەوێتەکار. ئێمە دەبێت فێربین کە چۆن ئامانج و مەبەستە تایبەتی (شەخسی) یەکانمان لەگەڵ بەرژەوەندییە گشتییەکاندا بگونجێنین. ئێمە دەبێت بتوانین بیروڕاکانی خۆمان بە ئازادی ئاڵ و گۆڕبکەین و ئەمە خۆی پارێزەری ئاسایشی کۆمەڵگایە.

بەم چەشنە تێبینی دەکەین کە دیموکراسی، واتا شێوەی ئەو حکوومەتەی کە لەسەر بنەمای دڵبەندی و ئارەزووەکانی خەڵك قایم بووە و هەمووان بەئازادی دەتوانن دەریببڕن، شتێکی زیاتر لە فەلسەفەی سیاسی شێوازی ڕاست ژیانە چالاکییێکی بەردەوامە بۆ فێربوونی شێوازی پێکەوەژیان ئەمە تەنیا جۆرە حکوومەتێکە کە دەکرێ تیایدا فەرمانڕەوایی لە دڵی گەلان بکرێت. دیموکرسی بەو حەقیقەتە گەیشتووە کە "هیچ تاکێك یان ژمارەیەکی کەم لە خەڵك ئەوەندە چاك و ژیر نییە کە حوکم لەوانی تر بکات بەبێ ڕەزامەندیان" تێڕوانینی مرۆڤانە لە تێڕوانین ودیدی هەر تاکێك بەرزترە ئەو بابەتە.

(کە زۆربەی جار لە قازانجی حکوومەتە نادیموکراتییەکاندا باس دەکرێت) ڕەنگە ڕاستبێت کە زانیاری تاکەکانی چینی خوارەوەی کۆمەڵگا لەوانە کەمترە کەسەر بە چینەکانی سەرەوەن بەڵام نابێت ئەم حەقیقەتەش لەبەرچاو نەگرین کە جەماوەری خەڵك لە بنچینەدا لە هەر کەسێکی تر زیاتر دەزانێت و تێدەگات و "شوێنی ئێش و ئازار هەر لێرەدایە."





لەو رووەوە بۆ زانینی پێداویستە گشتییەکان پێویست بەڕای گشتی دەکات. لێکۆڵینەوە لە شێوازی هاوکاری و پێزانینە هاوبەشەکانی تاکەکان، تاکە ڕێگەی راستی ئاگاداربوونە لە حکوومەتێك کە لە کۆمەڵگادا چەسپاوە. ئەو هزرەی کە گوایە کەسانێکی کەم بە هۆی بۆمانەوە (ویراسەت) یان سامان یانیش تەنانەت بە هۆی هەبوونی زانیارییەوە خاوەنی توانایەکی سەرو ئاساییـنە و دەتوانن ژیانی خەڵکانی تر ڕێکبخەن، بنەمایەکی راستی نییە. هەرکەس زیاتر ئاگای لە پێداویستییەکانی خۆی هەیە و تەنیا بەم ڕێگەیە، واتا بەهۆی بە دیارخستنی ئازادانەی خواست و پێداویستییەکانەوەیە کە جۆرە یەکێتییەکی هاوگونجاو دەتوانێت خۆی دەربخات- ئەو یەکێتییە هاوگونجاو و لەبارەی کە لەسەربنەمای یەکسانیی گشت تاکەکانی مرۆڤ راوەستاوە. دیویی دەستنیشاندەکات کە مەبەستی ئەو ئەوە نییە کە زیرەکی و هێزێکی یەکسان بە تاکە جیاوازییەکان بەخشراوە، بەڵکو لەو بڕوایەدایە کە هەموو تاکەکان خاوەنی مافێکی یەکسانن و دەبێت یەك یاسا هەموویان بگرێتەوە، رای یەکسانیان هەبێت و بە ئیمتیاز و دەرفەتگەلێکی یەکسان بەهرەمەند بن، هەرچەندە لە ئەقڵ و تێگەیشتنندا یەکسان نین، یان ناتوانن بە یەکسانی سوود لەو دەرفەتانە ببینن کە بۆیان دێتەپێش لە حکومەتی دیموکراسیی راستەقینەدا، بنەمایەکی بنچینەییی تریش هەیە کە بریتییە لە گەشە و بەهێزبوونی هەستی مرۆڤدۆستی و گەیشتن بەو حەقیقەتەی کە هەر تاکێك بۆ باشتر بوون و بەختەوەریی ئەوانی تر ئەرکێکی گرنگی لە ئەستۆدایە.

بەهۆی توانا پەرش و بڵاوەکانی تاکەکانەوەیە کە هێزێکی تاك دروستدەبێت و لەکۆی ئەم هۆش و زیرەکیانەوەیە کە ئەقڵ و هوشێکی یەکگرتوو پەیدا دەبێت. بە گوێرەی ئەم وەسفە دیموکراسی بریتییە لە "دیدێکی ئازاد"ی ڕێك و پێك و ڕێکخراو کە بتوانێت بوونی جۆرە "ئازادییەکی کرداری"ی ڕێك و پێك مسۆگەربکات.

ئەم ئازادییە "مافی ئەوە بەخەڵك نادات کە هەرچییەك بیانەوێت بکەن" بەڵکو مافی ئەوەیان پێدەدات کە هەرچییەك بیانەوێت بڵێن و بەو هۆیەوە لە رایەگشتییەکان و دڵبەندیە هاوبەشەکاندا بەشداری بن.

دیویی دەڵێت ئەم جۆرە دیموکراسییە هەتاکو ئەمڕۆ وەدی نەهاتووە و هێشتا لە شێوەی ئامانجێکدایە کە بەرەو رووی دەخولێین. دەتوانرێ بگوترێ کە حکوومەتی ئەمریکا لە بەشی



سیاسیدا تاڕادەیەك لەم ئامانجە نزیك کەوتوۆتەوە، بەڵام نەك لە بەشی کۆمەڵایەتی و ئابووریدا. لە کۆمەڵگای ئێمەدا هەم رای گشتی باڵادەستە و هەمیش "سامانی تایبەتی" لە رۆژی دەنگداندا هەمموومان یەکسانین، بەڵام لە رۆژانی دیکەدا ئەم یەکسانییە نامێنێت. دەسکەوت و داهاتێکی ڕێك و پێکمان هەیە، بەڵام دابەشکردنی خەوشدار و نارێك و پێکە. ژمارەیەکی کەم خاوەنی هەموو شتێکن و کۆمەڵێکیش هیچ شتێکیان نییە. ژمارەیەك خەڵك بە توندی و دژواری لە رکابەری و ململانێیدان و خەڵکێکی زۆریش لە بارێکی بەزیی بزوێندا خۆیان بە دەستەوەداوە. ئەوەی کە ئێمە بۆ وەدیهێنانی دیموکراسییەکی نموونەیی پێویستمانە "جۆرێکی تری تێگەیشتن و هۆش و هەست و تاکەیەتییە"

دیویی ئاشکرادەکات کە تەنانەت ئەو ژمارە کەمەش کە لەسەرکارن بێ ئامانج بۆلایەك تورهەڵدراون و خۆیان نازانن کەوتۆتە کوێ.

رەنگە ئەوان خۆیان بەڕابەرانی دونیای پیشەسازی دابنێن، بەڵام "ڕێبەری گیانی خۆیان، نین لە بەختەوە وەری و شادومانی بێ بەری بوونەوە، چونکە خۆیان باش ئاگایان لەوەیە کە هەوڵ و تەقەلاکانیان ئامانج و ئاراستەیەکی دیاریکراویان نییە و زەوقە و جۆشی مرۆڤ لە بەرژەوەندیی کەسی و تایبەتیدا نییە، بەڵکو لە قازانجی گشتی و کۆمەڵگادایە. بەم چەشنە ئێمە کۆمەڵگایەکمان دەبێت کە تیایدا تاکایەتی لە ناوچووە.

رابەرە ئابوورییەکانی ئێمە هیچ ڕێگاچارەیەکیان نییە جگە لەوەی کە خۆیان بپالێون و بخوازن و نەخوازن بەدوای ئەوەوەبن کە وازلە شێوازی تاکایەتیی ئابووری بێنن و بیکەن بە چالاکییەکی سیاسی و کۆمەڵایەتیی گرووپیانە.

ئەوان لەوە بەدوا خوازیاری حکوومەتێك دەبن کە تیایدا مێشك کە تاکە بەشی ئافرێنەری بوونی ئادەمیزادە بە کارێکی گرنگتر لە کاری ماندووکەرانەی هەژماردنی پارچە پارەی نزاکان هەڵدەستێت.

خەڵکی ئاسایی. لەم بارەی خۆبە دەستەوەدان و رەزامەندی و لەو داتەپین (یان وەستان) و دەستەوەسانیە دێنە دەرەوە ئازادیی دەربڕین و ئازادیی فێرکاری و پەروەردە و ئازادیی چاپەمەنی بەرهەمەکانی خۆیان پێ پێدەگەیێنن موچە خۆرانیش ئیتر گرێدراو و پابەندی





ماشینەکانی خۆیان نین. ئەوانیش هەڵێکیان بۆ دەرەخسێت تا هەناسەیەکی ئاسوودەیی هەڵبکێشن و سەیرێکی دەوروبەری خۆیان بکەن. ئەو کرێکارەی کانگەش وەکو فەیلەسوفی ئەفلاتوونی لەناو ئەشکەوتدا، ئەو ئامادەییەی هەیە کە سەیرێکی ئەو زەوییە سەوزە بکات کە لە بەر رووناکی خۆر راکێشاوە و داوای بەشی خۆی بکات لە جیهان. ئێمە هەموومان لە جوولەو بزاوین، بەڵام نەك بەرەو ئەو شارە باڵایە کە پاشایەکی فەیلەسووف حوکمی لێدەکات، بەڵکو بەرەو حکوومەتێکی دیموکراسیی کە پیاوانی بیرمەند فەرمانڕەوان- ئەو حکوومەتە دیموکراسییەی بەبێ سنووردارکردنی تاك، توانا ئەخلاقی و سیاسی و کۆمەڵایەتییەکانی بەهێز دەکات تا تاك بەو پەڕی پەرەسەندنی دەروونی خۆی بگات.

چونکە کۆمەڵگایەکی تەندروست، حکوومەتێکی تەندروست، دنیایەکی تەندروست لەسەر بنچینەی "هاوبەشیی هەوڵە دۆستانەکانی هەموو تاکەکان" بندە، واتا دبێت هەموو خەڵك دڵبەندی و بەرژەوەندییە کەسی و تایبەتییەکانی خۆیان لە پێناو باشترکردنی رەوشی گشتی بخەنە کار.

لە حکوومەتێکی ئەوهادا کە رەچاوکردنی رێزی بەرامبەر (دوولایەنە)ی نێوان تاك و کۆمەڵ. بە بنەماییەکی قایم ناسراوە، بێگومان تاکیش لە ناو ناچێت و "هەرکاتێك بەدرێژایی کات، تاکێك لە مافەکانی خۆی بێ بەش بمێنێت، بە هۆی ئەوەوەیە کە ئەو شانی نەداوەتە بەر بەرپرسیاریەتییەکانی) بەپێچەوانەوە تاکە هەرە بە تواناکان ـ بە توانایی تەنیا بە ماڵ و سامان نییە- ئەو کەسانەن کە بەرپرسیارێتییەکی زۆر تریان لە ناو کۆمەڵدا لە ئەستۆ گرتووە.

ئەم کەسانەن کە دەتوانن لە حکوومەتێکدا کە ئازادیی سیاسی و کۆمەڵایەتی و هاوبەشیی هەوڵەکان لەکاروباری داراییدا و عەدالەت و ئاشتییەکی بەردەوامی تێدایە، تاکی هەرەباش و نموونەی هەرە بەرزبن بۆ تاکەکانی تر.

"هەتا شێوازێکی ئەوها دێتەدی، ئێمە دەبین بە قوربانی پێشهاتە ناخۆشەکان و بەنارحەتییەوە لە چەرخێکدا ژیان بەسەر دەبەین کە بەتەعدا و رووبەڕووبوونەوە و شەرخوازی کۆتایی دێت و بە سەرکەوتنە کاتییەکانی ئەولایەنە دوایی دێت کە هێزی چەکداربوونی زۆرتری هەیە"



دیویی، رێك بە گوێرەی گیانی فەلسەفەی خۆی کە بەتوندی خوازیاری کردەوەیە و پشتی لە نیگەتیڤزمە، بێ باکانە هەوڵدەدات کە شەڕ و ململانێ لە ناوببات و خێرخوازی و لێك تێگەیشتن لە نێوان حکوومەتە جیهانییەکان بچەسپێنێت.

- ٥ -

فەلسەفە کرداریەکەی دیویی نە تەنیا لە سیاسەتدا، بەڵکو لە بواری ئاکاریشدا بەکاردێت. ئەو گۆڕەپانی "حوکمەدەبییەکان" فراوان دەکات و راناوی تاکی "تۆ" دەیکات بە "ئێوە" و لە تاکەوە بەرەو کۆ دەبێتەوە. دەڵێت ئێمە دەبێت تێگەیشتنی ئاکاریانەی خۆمان بەراددەیەك بەرفراوان بکەین کە هەموو ئەو کاروبارانە بگرێتەوە کە برەو بە ژیانی ئادەمیزاد دەدات و سوودی پێدەگەیێنێت.

دیویی ئاماژە پێدەکات کە ئەم گۆڕانەی ئاکاری تاکانە بۆ ئاکاری کۆمەڵایەتی راگەیێنەری ئەوە نییە کە ئاکار لە شێوەی فەردی هاتۆتە دەرەوە و بە تەواوەتی بووەتە ئاکارێکی بەکۆمەڵ، بەڵکو لەو جۆرە پرسە کۆمەڵایەتیانەدا کە تاك دەبێت بە ناچاری رووبەڕووی ببێتەوە، هەروا بە تاکەکەسی دەمێنێتەوە و پێویستەش بەم شێوەیە بمێنێتەوە.

بەپێی بچوك بوونەوەی جیهان پەیوەندییە مرۆڤییەکانیش بەرفراوانتر بوونە. مرۆڤ ئەرکی سەرشانیەتی کە لە دنیای هەنووکەییدا لەگەڵ ئەم چەمکە ئاشنا ببێت و خۆی لەگەڵێدا بگونجێنێت و دۆستی و هاوکارییەکی ئاشتیانە نەتەنیا لە نێوان خۆی و ئەو کۆمەڵگایەی کە تێدا دەژیت، بەڵکو لە نێوان کۆمەڵگا ئادەمیزادییەکانی تریشدا بەرقەرار بکات.

شەڕی جیهانی دووەم پێشانیدا کە دانیشتوانی دوورترین دورگەی ئۆقیانووسی ئارام رۆژە رێیەك زیاتر لە ئێمەوە دوورنین و ئومێدەکانیان پەیوەندییەکی نزکیان بە ئومێدەکانی ئێمەوە هەیە. برسێتیی ئەوان برسێتیی ئێمەیە و خۆشی ئەوان خۆشی ئێمەیە دەبێت هەردوولامان لە پێناو مسۆگەرکردنی بەرژەوەندییە تاکانە و کۆمەڵاتییەکاندا هاوکاری یەکتربین. دیویی ئەوە روون دەکاتەوە کە "بۆ کۆمەڵێك خەڵك ئێستا ئەو بابەتە لە رۆژەڤدانییەکە ئایا دەتوانن دەست بەسەر ئەو ماڵ و سامانەدا بگرن کەهی ئەوانیترە، بەڵکو بە تەمانە بزانن کە ئایا ئەو پێکهاتە فراوانە ئابووریانەی کە هەن" ـ وەکو پاوانگەلێ نەتەوەیی یان رێکەوتنە نێونەتەوەیی یان رێکەوتنە

نێو نەتەوەیەکان "بەدوای ئەوەوەن کە بە دابەشکردنی دادوەرانەی سامان هەڵسن یان نە و ئەگەر بەدوای ئەوەوە نین ئەوان بە شێوەیەکی فەردی دەتوانن چ لەوبارەوە لە واتایەکی تر ئەوەی پێویستمان پێیەتی جۆرە "پەیوەندی و دڵبەندییە هاوبەش و گشتییەکان"ن کە خۆی جۆرێکی نوێی ئازادییە و بەو ئازادییە ئابورییە بەرلایە تاکەکسی و نەتەوەییە ناچێت کە ئێستا باڵادەستە. ئێمە پێویستمان بەو جۆرە ئازادییە تاکەکەسی و نەتەوەیە هەیە کە گشتی و هاوبەش بێت و کۆنترۆڵێکی کۆمەڵلایەتی، بۆ چاکە وقازانجی گشتی، چاودێریکەر و ڕێنماییکەری بێت.

بەڵام دیویی رادەگەیێنێت کە ئەم ئازادییە، پێکەوەبەستران و پەیوەندییانەی تاکەکەس و نەتەوەکان لەگەڵ یەکتر ناتوانێت زادەی شۆڕشێکی توند بێت، بەڵکو ئەم بابەتە لە ڕێگەی گەشەی بەرەبەرە و پەرەسەندنی ئەقلانییەوە دێتەدی. ئامانجی ژیان بەدەستهێنانی کاملبوونێکی دەم و دەست و لە ناکاو نییە، بەڵکو ژیان بریتییە لە "گەڕانێکی بەردەوام بەرەو کاملبوون، پاڵاوتنێکی بەرەبەرە و بەردەوام"

کەواتە نابێت بۆ گەیشتن بە سەردەمی زێڕین پەلە بکرێت ڕێگەی بەهەشت بە دیکتاتۆرێتی و شەڕ تەی ناکرێت.

دەبێت هێواش هێواش هەنگاو بنرێت و لەهەر هەنگاونانێکدا ئاگادارین، دەبێت ئەزمون پاشکەوت بکەین و لە سڕینەوەی گلاوی و پەسەندکردنی چاکەدا بە ئاگابین و ڕێوشوێنی پێویست بگرینە بەرخۆ دەکرێ داوەریی ئێمە چەوت بێت. کەواتە نابێت خێرا هەنگاو بنرێت، بەڵکو دەبێت ئاگامان لێ بێت لەکاتی خۆیدا هەنگاوبنرێت.

بەدوای ئەوەدا مەگەڕێ کە دونیا بە یەکجاری بە چنگ بێنی، بەڵکو هەوڵبدە دونیا بکەیت بە بەهەشتێك کە بە تاسەخوازییەوە لەناو خۆیدا جێت بۆ بکاتەوە. بەدوو ئەو جۆرە ئازادییەدا بگەڕێ کە ئامادە دەکات بۆ ئەوەی کەسانی دیکەشت بە ئازادی بوێن و بەئازادی بیانهێڵییەوە.

ئازادیی تاکەکەسیانە بۆ دروستکردنی دونیایەکی باشتر. دیویی دەڵێت لە قوتابخانەی ژیاندا بەرەبەرە بۆمان دەردەکەوێت کە جۆرە پەیوەندییەکی لەبار و هاوگونجاو لە نێوان بەشەکان و گەشتیدا هەیە جووڵەی بەکۆمەڵی ئەستێرەکان دەکرێ شایەتێکی دیار و نمونەیەکی کامل بێت



بۆ ژیان بە کۆمەڵی ئادمیزدەکان. دەبێت ژیانی تاکەکەسی لەناو جووڵە گشتییەکەی بوونەوەرەکاندا بەدوو رەوتی خۆی بکەوێت. دیویی بەتێکەڵکردنی رای فەلسەفی و ئەقڵی گوزەرانی خۆجێی (رەمەکی) خۆی، ڕێگەی خۆی دۆزییەوە. ئەو ڕۆژگارەی کە لە کۆلۆمبیا بەوانە گوتنەوە سەرقاڵ بوو لە کێڵگەی لونگ ئایلند دەژیا و بە پەروەردەکردنی سەوزیجات و دابینکردنی هێلکەوە خەریك بوو و بەهاوسێکانی خۆی دەیفرۆشت. چەند ساڵێك بەهۆی داهاتی مەزرای خۆیەوە "بەسەری برد" رۆژێکیان ژنێکی دەوڵەمەند کە کڕیاری هەمیشەیی ئەو بوو تەلەفۆنی کرد و داوای ژمارەیەك هێلکەی کرد. لەبەرئەوەی هەموو منداڵەکانی لە قوتابخانە بوون، بۆیە دیویی خۆی هێلکەکانی گەیاندە بەر دەرگای ماڵیان. زەنگی دەرگاکەی لێدا، بەڵام بە توندی و تیژییەوە پێی گوترا کە زەنگی دەرگای داوە لێ بدات. چەند هەفتەیەك دواتر بۆ ژمارەیەك خانەدان دەدوا (گوتاری دەدا) هەرکە چووە پشت مێزی گوتاردانە ژنە کڕیارەکە بەهەیەجانەوە لە ژێر لێوەوە گوتی:"ئۆخ، چەندە لە هێلکە فرۆشەکەمان دەکات!"

## ـ٦ـ

دیویی تا دوا ڕۆژی ژیانی هەروا وەکو "فەیلەسۆوفێکی هێلکە فرۆش"

لە ژیانی کرداریدا مایەوە. لە تەمەنی هەشتا ساڵیدا وەکو سەرۆك شاندێك ئەو ئەرکەی پێ سپێردرا کە بچێتە روسیا و سەبارەت بە لەسێدارەدانی بەکۆمەڵی ئەو کەسانە لێکۆڵینەوە بکات دەگوترا "خیانەتیان لە حکوومەتی سوشیالیستی کردووە" ڕاپۆرتەکەی دووپاتی دەکردەوە کە ئەو حوکمدەرەی کە حوکمی لە سێدارەدانی دەکردووە چەوت و ساختەکارانە بووە و ستالین دیکتاتۆرێکی خوێنڕێژە.

کۆمۆنیستەکان بە توندی ڕاپۆرتەکەی دیوییان خستەبەر رەخنە و بە خەیاڵە پووچەکانی مێشکێکی پیر و نەخۆشیان ناوبرد، بەڵام دیویی تەندروستی هزری خۆی بەبڵاوکردنەوەی پەرتووکێك لە تەمەنی ٨١ ساڵیدا سەلماند ـ پەرتووکێکی ئێجگار گرانبەها لەبارەی لوژیك کە زۆربەی هەوادارانی بە گرنگترین پەرتووکی دەزانن.

ئازادیی و دلێرییە جەستەییەکەی زیاتر لە توانا دەروونییەکەی مایەی سەرسامی بوو. لە تەمەنی ٧٨ ساڵیدا دوای مردنی هاوسەرەکەی لەگەڵ ئافرتێکی تردا گرێبەستی مارەیی گرێدا





و ساڵێك دوای ئەمە ئەم ژن و مێردە پیر و لاوە دوو منداڵیان هەبوو کە لە خۆیانەوە نەبوون، بەڵکو وەکو منداڵ لە پەنابەرانی شەڕ وەریانگرتبوون.

دیویی لە تەمەنی ٩٠ ساڵییدا، لە ئاهەنگێکدا کە بۆ ڕێزگرتن لەو بەرپارکرابوو یەکێك لە بە جۆشترین و ئومێد بە خشترین وتەکانی تەواوی ماوەی تەمەنی خۆی، پێشکەشکرد. کاتێك ماڵئاوایی لە دونیاکرد تەمەنی ٩٢ ساڵ بوو (١٩٥٢) و لەکاتێکدا خەرمانەیەك لە حیکمەت و زانست چواردەوری لە خۆی تەنیبووە و هاوڕێ ستایشکەر و منداڵە قسەخۆش و زیتەڵکان لە چواردەوری بوون، دوای قۆناغی ژیانی ئەوەندە بە تاسەخوازییەوە بڕی کە گوایە بۆ پێشوازی یەکێك لە ڕووداوە بەجۆشەکانی ژیانی دەڕوات







# نیچە (١٨٤٤ـ ١٩٠٠)

## پیاوی باڵا یان شێت؟

فەلسەفەی نیچە (Friedrich nietche) بەرهەمی مێشكێكی ناهاوسەنگە و وەكو دیمەنی گڕگرتنی دارستان كە شكودارە، بەڵام لەناوبەرە، هەم سیحرلەخوێنەر دەكات و هەمیش ترس و سام دەخاتە دڵییەوە. نیچە نووسیویەتی:"دەبێت مرۆڤ (یان خوێنەر) بەتایبەت بۆ فەلسەفەی من دروست كرابێت وەگەرنە دەكرێ هەمان شت ببێتە هۆی مردنی"نزیكەی هەفتا ساڵ دوای ئەوەی كە فەلسەفەكەی نووسرا، نەوەی ئادەمیزاد كەوتە سەرلێواری تەفروتونابوون و مەترسیی لە ناوچوون هێشتاش هەڕەشە لە جیهان دەكات.

بە سەرهاتی شێتانەی نیچە لە جیهانی فەلسەفەدا، بەشێكی بۆ نشوستی هێنانی لە خۆشەویستیدا دەگەڕێتەوە. دەروونە ئێجگار هەستیارەكەی كاتێك تێكشكا كە ئەو ژنەی كەوا هاوسەرێتی هەڵیبژاردبوو، بە نیگەتیڤی وەڵامی داخوازییەكەی دایەوە. ئەو كینەیەی كە نیچە لەو ژنەوە هەڵیگرت بۆ رق و وەڕزی ئەو لە رەگەزی ژن گۆڕاو دژایەتی ئەو لەگەڵ مافەكانی ژنان بوو بە هەوێنی بنەرەتی راپەڕینی ئەو دژ بە مافەكانی مرۆڤ.

نیچە گیانێكی لاواز و بێتوانای هەبوو و وەكو زۆربەی خەڵك، ستایشی هەر شتێكی دەكرد كە خۆی لێ بەری بوو. بەڵام ئەم پەسن دان و ستایشە سەبارەت بە خودی ئەو رووی لە زیادەڕۆی كرد. لەبەر ئەوەی كە بە یەكجاری لەو تایبەتمەندیانە بێبەری بوو كە بۆ خەبات و بەدەستهێنانی سەركەوتن پێویستن بۆیە لەوەسفی ئەم تایبەتمەندیانە لای ئەو كەسانەی كە سەركەوتنیان بەدەستهێنابوو و بەپلەبەرزەكان گەیشتبوون، رێگەی زیادەبێژی گرتەبەر لەگەڵ





ئەوەشدا كە لە رووی جەستەییەوە بێ تواناو دەردەداربوو، كەچی بەهێز و توانایەكی دڕندەییەوە هێرشیكردە سەر ئایین و هەرچەندە خۆی بەلاوازی كەم خوێنی گەورەببوو كەچی پڕۆپاگەندەی بۆ شەڕ و خوێنرێژی دەكرد و برەوی پێدەدا. لەبەر ئەوەی بەدرێژایی ژیانی لەسە یەشە و چاوئێشە ئازاری دەچەشت، بۆیە رۆحێكی چەوت و لادەر و لەشێكی لەڕ و لاوازەوە لە دنیا دەڕوانی. شاعیرێكی گەورە بوو كە توشی شێتایەتی هاتبوو و لەگەڵ خودا شەڕبوو كە بۆچی مرۆڤە لاواز و بێ تواناكانی ئافراندوو،"ملیونەها كەسی دەردار و كەم و كورت لەناوبەرن تا مرۆڤێكی باڵا دروست بێت."ـ هەمان ئەو پیاوە بێ بەزەیی و بەهێزەی كە  نیچە تاواتەخواز بوو كە خۆی وەها بێت. چونكە ئەو خۆی حەسرەتێكی گیانپڕوكێنەوە خۆی بە یەكێك لە هەمان ئەو كەسە بێتوانا و كەم وكورتانە دەبینی.

ـ ٢ ـ

نیچە لە ساڵی ١٨٤٤ لەپروس كە وڵاتێكی بچووك  بوو وەكو نیچە بۆ گەورەبوون بێ ئۆقرەی دەنواند، چاوی لە دونیا هەڵێنا لە منالێدا لە سەرپەرشتی باوك، كە قەشە بوو، بێ بەش بوو و دایكی مرۆڤێكی كۆنە پەرست و خاوەن بیرو رای دەمارگیرانەی لێدروست كرد. نیچە تا تەمەنی ١٨ ساڵی دەمارگیرێكی كۆنە كۆنەپەرست بوو. لەوە بەدوادا رووی لەلایەنی توند رەوی كرد و بووبە مرۆڤێكی بێبرواو گوێنەدەر بە بیروڕا و پەسندكراوەكانی خەڵكی عامە (رەمەكی)، بەڵام هەروا بە خورافی كۆنەپەرست مایەوە نیچە بۆ بە نەیارێكی پەروپاقورسی مەیسح و بیروڕاگەلێكی چەور بۆ ناو زیینی تەشەنەیان كرد. والدادە كە چارەنوس ئەوەی دژبە مەیسح وروژداندووە و هەورەك كە یەحیای زەكەریا هەنگاوپێشخەری مەیسح بوو و مەسیحی لە ئاو هەڵكێشا،  پێیوابوو كە مەكیاڤێلیش بەر لە ئەو هاتووە تا رێگە بۆ هاتنی ئەو تەخت بكات. نیچە بەو هزرە نەخۆش و نا تەندروستەی كە هەبوو خۆی بە پێغەمبەری ئاینییێكی نوێ دادەنا ـ ئایینێك كە خوا هیچ شوێمنێكی تیایدا نەبوو و لەسەر بنەمای رق و كینە راوەستا بوو نەك ئەڤین و خۆشەویستی.

نیچە سەرباری ماكیاڤێلێ، شوپنهاوەریشی بە پێشەوای هزری خۆی هەڵبژارد. لە تەمەنی ١٩ ساڵیدا پەرتووكی (جیهان وەكو خواست و بیرۆكە)ی ئەوی خوێندووە. ئەم پەرتووكە ئەوی

بەمستیکێکی لێوانلێو لە خۆهەڵکێشیێ و غروردا رووکرد، "... گوایە شوپنهاوەر بەمەبەست بوو..." لەم پەرتووکەدا "خولق و خووی خۆی بە گەورەیەکی ترسێنەرەوە بینی".

لە تەمەنی ٢٣ساڵیدا بۆ راژەی عەسکەری بانگکرا، بەڵام ژیانی سەربازی بۆ ئەو ئێجگار ئەستەم و دژوار بوو، بەو هۆیەوە هەر زوو لە خزمەتی عەسکەری عەفو کرا. لەوە بەدوا سەربازی بوو بە بابەتی پەسندان و ستایشی ئەو:"بۆ یەکەم جار بۆم دەرکەوت کە خواستی باڵا بۆ ژیان تەنها شەڕ و دەستخستنی هێز و سەروو هێز (یان دەسەڵات) دا خۆی دەخاتە روو نەك لە ژیانێکی چارەڕەشانەدا".

بەڵام ئیرادەی ئەو بۆ  دەست خستنی هێز، لە ژیانە گۆشەگیرەکەیدا تێکشکا. لەزانکۆی بازل کورسیی مامۆستایەتی زمانە کلاسیکەکانی پێ سپێردرا. لەوێ بڕوای بەو بنەما کۆنەی سپارتەکان هێنا کەوا گەورەترین ئامانجی ژیان هێزی تێکدان ولەناوبردنە.

زەینی بە گەورەیی و زیادەخوازی سیخناغ بوو، بەڵام سەرباری ئەو قسە ستایش ئامێزانەی کە لەبارەی خۆیەوە دەیهێنا سەر زمان ، لە رۆحی خۆیدا هیچ شوێنەوارێکی لەو گەورەیی و شکۆوە نەدۆزییەوە، ئەم تایبەتمەندیانەی لەبوونی ریشاردواگنەردا کە پیاوێکی خۆپەرست بوو دۆزییەوە و لە مۆسیقای پڕ دەنگەدەنگ و بێزاری خولقێنیدا مەعنەویاتێکی گونجاو بەحاڵی خۆی پەیدای کرد .لایەنگرانی قوتابخانەی فرۆید مسۆگەر ئەم دۆخەی نیچە بۆ گرێی سووکایەتی دەگەڕێتەوە و دەڵێن ئەم روو لە ڤاگنەرکردنە بەهۆی ئەوەوە بوو کە خۆی لە گەیشتن بەپلەیەکی بەرز و گرنگ بێبەش مایەوە ونەیتوانی لە گۆڕەپانی ئەو مرۆڤە باڵایەی کە ئاواتەخوازی بوو نزیك بکەوێتەوە . ماوەیەك چووە ناو ئەڵقەی هەوادارانی ڤاگنەر، بەڵام کاتێك ڤاگنەر لە پارچە مۆسیقای (پارسیڤاڵ)دا بە گوزارشتی نیچە "خۆی بەدەست لە ناوچوون و پەستیی مەسیحییەتەوە دا" بە توڕییەوە بەجێی هێشت. ئەم جۆرە "دلۆڤانی و زاهیدییەتە" لەگەڵ "گیانی سپارتی" نیچەدا ئێجگار ناتەبابوو.

ـ ٣ ـ

لەوە بەدوا نشوستییە ئەڤینییەکان وشکستە دەروونی و جەستەییەکان روویان تێکرد و ئەو تەنیا توانی پشتی لە ژێرباری هەندێك لەو بەڵایانە راست بکاتەوە و زیاتر لە پێشو بێت بە





کۆنەپەرست. بۆ چاك بوونەوەی حالی خۆی سەفەرێکی ئیتالیای کرد و لەوێوە بۆ ئالپ بەرێکەوت و لە ئالپ لە دنیای خەون و وەهمەلێڵ و نادیارەکاندا کەوتە گەشت و گەڕان.

نیچە بۆ دەبڕینی نوییێ خۆی، زەردەشت ـ پێغەمبەرێکی کۆنی گەلانی ئێران ـ ی کردە وەسیلە و بەزمانی ئەو دوا.

پەرتووکی "زەردەشت ئەوهای گوت" یەکێك لە خەونە ئێجگار گەورەکانە کە مێشکێکی نەخۆش تا ئێستا توانیویەتی وەسفیبکات، یان هەروەك خۆی گوتەنی:"دەڵاندنەکانی گیانێکە کە سنووری خۆی تێپەڕاندووە و هەنگاوی ناوەتە دەرەوەی حەدی خۆی."

نیچە کە نغرۆی خەیاڵی پووچی گەورەیی و مەزناهی خۆی بوو دەڵێت:"ئەم پەرتووکە بێهاوتا دەبێت. واباشە چیتر باس لە پەرتووکێکی تر نەکەین. هەتا ئێستا هەرگیز پەرتووکێك بەم هێز و گەورییەوە نە خولقاوە."

بێگومان پەرتووکەکە پەرتووکێکی گەورەیە بەڵام لەبڕی هزر و بیروڕا، بە هەست و سۆز لێوڕێژ بووە. ئەم پەرتووکە تەعلیماتە سارد و بێ گیانەکانی ماکیاڤێل بۆ بنەماگەلێکی پڕ لە جۆش و هەیەجان دەگوڕێت و مێشکە خاوەکانی وەکو مێشکی هێتلەر و مۆسۆلیونی، بە بەهای وێرانکردنی جیهان، لە شەوق و خۆپەرستێکی لە رادەبەدەردا نقووم دەکات. نیچە هاوار دەکات: "لەگەڵ مەترسیدا بژی و هەردەم لە شەڕێکی بەردەوامدا ژیان بەسەر ببە" ئەوەی کە دەیەوێت بنیاتنەر و دروستکەربێت پێویستە یەکەم جار تێکدەر و وێرانکەر بێت. دەبێت هەموو بەها دێرینەکان لەناو ببات. خواکۆنەکان مردوون. خۆیان بەدیار مەرگەوە پێکەنیوون (زەردەیان هاتووتێ) ئیتر هیچ خواییێك لە جیهاندا بوونی نییە، ئەوەی هەیە تەنیا مرۆڤی باڵایە."پیاوی باڵا هۆیە نەك ئامانج، وێرانکەرە نەك دروستکەر..." بۆ ئەو تەنیا یەك بنەمای قایلکەری ئاکاری بوونی هەیە کە بریتییە لە بنەما ئاکارییەکانی چینەکان کە پێچەوانەی بنەما ئاکارییەکانی جەماوەری خەڵکە. لە راستیدا جەماوەر یان کۆمەڵانی خەڵك بۆیە دەژین تا ببنە مایەی سوود لێوەرگرتنی چینەکان. دەبێت ملیۆنەها خەڵك لە ناوبچن تا مرۆڤێکی باڵا بتوانێت درێژە بە ژیان بدات. ئەم دەربڕینەی نیچە لە زیادەبێژی و پێوەنانێکی شاعیرانە زیاتر نەبوو، بەڵام بۆ کەسێکی وەك هیتلەر حەقیقەتێکی پیرۆز بوو بۆ چوونی نیچە بەوەدا کە خۆی وەك جەنگاوەرێکی دڕندە دەبینی کە بە گەورەیی باڵا مرۆڤی گەیشتووە، خەیاڵێکی پووچ بوو،

بەڵام هیتلەر ئەم ئەندێشە بێ بنەمایانەی کە وەکو موتەکەیەکی سامناك بوون، هێنایەدی. چونکە فەلسەفەی نیچەش وەك فەلسەفەی ماکیاڤیل، دەستووری کار پێکردنی دیکتاتۆرەکانە. ئەو کەسانەی کە دەوکەنە ژێر کاریگەری و کۆنترۆلی ئەم جۆرە هزرانە، گوایە ئاوێنەیەکی زەرەبینییان لە بەردەمدایە و خۆیان گەلێك لە واقیع گەورەتر دەبینن خۆیان لە خەڵکانی تر بەرزتر دەبینن  پیاوی باڵانە.

واتا هەمان ئەو گیانەوەرە دڕندە بۆرەی کە بە بۆچوونی نیچە لەبەرزییەکاندا بازبازێن دەکات و ئەو "مێگەلە زەلیلانە" دەخاتە ناو ترس و سامەوە کە لە دوڵکان و داوێنی چیاکاندا پەرتەوازەنە.

نیچە ڕەنگە لەو کاتەدا کە نقومی خەیاڵە شیرین و پڕ لە نەخش و نیگارەکانی خۆی بوو ئاگای لێ نەبووبێت کە چ چارە ڕەشێك دێنێتەوە. گوایە تامەزرۆیەکی زۆری بۆ هێنانە کایەوەی ترس و سام و سەرسامی هەبوو نەك بۆ فێرکردنی خەڵك. بەم جۆرە وەڵامی ئایدیالیستەکانی دەدایەوە کە دەیانگوت ئێمە لە ڕابردوودا شەڕ و جەنگێکی زۆرمان هەبووە: بە پێچەوانەوە ئێمە ئاشتییێکی درێژ خایەنمان هەبوو "شەڕ بەراددەیەك کە ڕۆحمان بەهێز بکات ڕووی نەداوە" نیچە بە دەستەواژەیەك دیارن ڕادەگەیێنێت بۆ ئەوەی لەرادەبەدەر باش بی دەبێت ئێجگار خراپ بی.

"ئایا فێرکاریی من هەموو ئەو حەقیقەتانە تێك و پێك دەدات کە بە بڕوا پێکراوت زانیبوون؟ لێگەڕێن باوابێت- وەهای گوت زەردەشت" و ئەم قسانەی زەردەشت، لێرە و لەوێ بە شێوەی جۆراوجۆر لە هەموو پەرتووکەکانی نیچەدا دووبارە دەبێتەوە. لەبەر ئەوەی کە بە هۆی نەخۆشی چاوە وە توانای بینینی روناکی خۆری نەبوو، بۆیە خۆی لە ژووری ژێر بنمچی جەمەلوندا حەبسدەکرد و پەردەکانی پەنجەرەی دادەدایەوە. لەم ناوەندە تاریك و خەمگرتووەدا بوو کە نیچە مادده ژهراوییەکانی خەونە شەڕاوییەکانی خۆی لە بۆتەی هزردا لێدەنا. مەبەست و مەرامی سەرەکیی ئەم خەونە "لە ناو بردنی بنەمائاکارییە دێرینەکان و "پتەوکردنی بنەما نائاکارییە نوێکان" بوو. هێزی سەروەر لە پایەپەرستی و ڕق و قین و بێ بەزەییدایە و لاوازیی کۆیلە لە دلۆڤانی و جوامێری و ئەڤینداریییە.



بەڵام هەندێ جار لە ساتە روناك و ئارامەکاندا پەردەکان لە پێش ڕۆحی نیچە لادەچوون و ئەڤینی لە ژێر تیشکی رووناکییە جۆراوجۆرەکاندا دەبینی و دەیگوت: نەرم و نیانترین قسەیەك کە بە گوێم گەیشتووە ئەم دەربڕینە فەرەنسەوییەیە:

"لە ئەڤینێکی ڕاستەقینەدا ئەمە گیانە کە لەش لەباوەش دەگرێت" بەڵام ساتگەلێکی ئەوها کە گوزارشت لە ڕوانینێکی ڕاستەقینە دەکەن، بەدەگمەن لە نیچە دەهاتنە پێش.

پەرتووکە بەقەبەکانی بۆ ئەو بابەتە تەرخانکراوە کەوا هێز و توانا تاکە حەقێکی بەڵگەنەویستن. مرۆڤی باڵا بەشوێن ئەوەوە نییە کەوا حەزی هێزپەرستی بە ماقوول و بەڵگەدار پێشانبدات، بەڵکو تاکە بەڵگە و پاساوی ئەو ئەوەیە کەوا:"ئەمە خواست و ئیرادەی منە"

نیچە دەڵێت ئاغا نەك هەر نابێت لە بڕیاری خۆپەرستانەی خۆی بۆ فەرمانڕەوایی شەرمەزار بێت، بەڵکو بە پێچەوانەوە دەبێت بەو هۆیەوە هەست بە شانازی و سەر بڵندی بکات. نیچە بە یارمەتیی لۆژیکی ورەد و ئاڵۆزی خۆی هەموو بەهاکان هەڵاوگێڕ دەکات. رووناکی بە تاریکی نەحەقیش بە حەق پیشاندەدات: "ئەوەی لە دیدی ئاغاوە عەدالەت و دادە بۆ کۆیلەش هەر عەدالەتە."

لەو ڕووەوە کاتێك کۆیلەیەك گلەیی لە باوردۆخی بێ سەروبەری خۆی دەکات لە ڕاستیدا دەژوێن بە عەدالەتی نایابی جیهان واتا مافی فەرمانڕوایەتی ئاغا دەدات. کەواتە دەبێت بێهێز بە ناچاری باری "فەزلە ئەهریمەنییەکان"ی بەهێز قبوولبکات و لە کۆلێ بکات. "دەبێت هەموو بنەما ئاکارییەکان بەناچاری سەری ڕێز لە بەرامبەر پلە و پایە دابنوێنن" دەبێت هەستی پلەپەرستی مرۆڤ باڵا بە بنەمایەکی ئاکاری جیهانی بناسرێت.

دەبێت مرۆڤی باڵا خۆی پتەو و پۆڵایین بکات و خۆی لە نەرم و نیانی بپارێزێت. دەبێت هەمیشە ئەو ئامانجەی لە پێش چاوبێت کە دەبێت "باشتر و خراپەکارتر لێ بێت" واتا بۆ ئەو بێ بەزەییە و توندوتیژییە بگەڕێتەوە کەمایەی شادی و خۆشحاڵی مرۆڤی دێرین بوو ئەم شادیە توندوتیژ و بێ بەزەییەی مرۆڤی باڵا "وەکو توندوتیژییەی ڕۆژگاری ناپلیۆن، گەورەترین بەختەوەری و بەرەکەتێکە کە دەکرێ روو لە مێگەلی بێ نرخی مرۆڤ بکات." چونکە "وا ئامانج و مەبەستی بوون، مرۆڤی باڵایە نەك بوونی مرۆڤ. جیهان لە ڕوانگەی نیچەوە وەکو





تاقیگەیەکی گەورەیە کە تیایدا چەندین تەنی ماددە بێ بە هاکان بەفیڕۆدەچن تا مسقاڵێك زێڕلێیەوە بەدەستبێت. خۆت لە پشتیوانی کردن لە کەسانی ئاسایی و بەزەیی هاتنەوە بە کەسانی کەوتوو (چارەرەش) بپارێزە. هەموو ئەمانە وەکو ئەو ماددە و کەرەستانەن کە سروشت بۆ دروستکردنی مرۆڤی باڵا دەنێرێتە تاقیگە. ئەوان وەکو ئەو زەویەن کە دەبێت پەیین بکرێت تا تووی مرۆڤایەتی تیایدا گەشە بکات و گوتی بان مرۆڤی بەرهەم بینێت".

کەواتە دەبێت "نەرم و نیانیی مەسیحییەت" بخرێتە لایەکەوە چونکە پروپاگەندەکەری بنەمای سست و ناجێگیری یەکسانی مافە لە نێوان رۆڵەکانی مرۆڤدا.جەماوەری بەرفراوانی مرۆڤ تەنیا ئەرکێکی یەکسانیان هەیە و ئەویش ئەوەیە کە لە خۆیان لە لاساری و شۆڕشکردن دووربخەنەوە و لە سەروەرەکانی خۆیان گەڕێن تا درێژە بە کردەوە بێگوناهەکانی گیانلەبەری دڕندە بدەن و خۆیان لە دروستکردنی هەرجۆرە بەربەستێکی کۆمەڵایەتی لەسەر رێگەیان، لابدەن"

ئەم "بێگوناهییەی گیانەوەری دڕندە" و خانەدانییەتییەی مرۆڤی باڵا، هەروەك كە نیچە بە ئاگاییەوە دانی پێدادەنێت، بڵاوبوونەوەی دیموکراسی دەکەوێتە مەترسییەوە.

نیچە نواندنی رەفتاری یەکسان لەگەڵ هەموو خەڵك و بەیەك چاو سەیرکردنیان بە شێتایەتییەکی پەیوەندیدار بە ئایینی جوولەکە و مەسیحییەت دەزانێت. "ئێمە دەبێت ئەم بنەما ئازادیخوازییە باوەی ناو مەسیحییەت بەر لەوەی زۆر درەنگ دابێت، لەناو ببەین" و جێگەی داخە کە کەسانێکی وەکو هێتلەرو مۆسۆلینی قسەکانی ئەویان بە جیددی وەردەگرت. (مرۆڤی باڵا)ی نیچە مرۆڤێکی سووك و ناشیرین و خۆپەرست و کەم ئەقڵە کە بە تەمایە ئیحتبار لە گشت بەها مرۆڤییەکان بستێنێتەوە.

ئافرێنراوێکی ئەوها کەم وکورت کە وەکو ئیلهامێك بۆ زەینی نەخۆشی نیچە هاتووە، هەوڵیدەدا و هێشتاش تەقەلاَّ دەکات کە بەسەر جیهاندا زاڵببێت. سەرنجی ئاخاوتنی بدە سەبارەت بە ئەو وڵاتە ئیدیالەی کە دەیەوێت سەقامگیربێت کە وێنەیەکی کاملی نازیزم و فاشیزم یان کۆمۆنیزم بەرجەستە دەکات:

"حکومەتێك لە گیانەوەرە دڕندە موو بۆر راوکەرەکان، نەوەیەك لە سەرکەوتووەکان و سەروەرەکان بەستراکتورێکی عەسکەرییەوە... کە بەوردییەکی زۆرەوە چنگە سامناکەکانی خۆیان لە گەرووی نەفسەکان (خەڵك) گیرکردووە"



"مرۆڤی باڵای فەرمانڕەوا"ی وڵاتێکی ئەوها هیچ پێویستییەکی بە رەزامەندیی جەماوەری خەڵك نییە و لە بنەڕەتدا پێویستی بە لێك تێگەیشتنێکی رێکەوتنانە نییە لەگەڵ گەلانی وڵاتەکەیدا.

"ئەو کەسەی کە بە شێوەیەکی سروشتیانە بە سەروەری و ئاغایی گەیشتووە و دەتوانێت لە کردەوەکانی خۆیدا بە توندی و کینەوە فەرمانی بکە و مەکە دەر بکات، چ پێویستییەکی بە رێکەوتن هەیە؟"

نیچە لەو بڕوایە دابوو کە گونجاوترین سەرزمین بۆ دروستکردنی ئەم وڵاتە باڵایە روسیایە. چونکە خەڵکی ئەوێ لە چەندین نەوەی بەرترەوە بڕوایان بە قەدەر و چارەنووس هەبووە و خۆیان بە دەستییەوە داوە و بە ئاسانی دەچنە ژێر باری توندوتیژی و ستەمکاریی سەروەرەکان کە گیانەوەرە بۆرەکانی ئەورووپایین.

نیچە پێشبینی ئەوەدەکات کە ئەم گیانەوەرە بۆرانە، هەوڵدەدەن جیهان لە بوونی "ئازادیخوازەکان و مەسیحییەکان و گاوەکان" کە بە واتایەکی تر بە "مەڕ" ناویان دەرکردووە خاوێن بکەنەوە.

ئامانجی گشت ئەم کردەوانە چییە؟ رووخاندنی کۆمەڵگای دێرین و دامەزراندنی کۆمەڵگاییەکی نوێ.

نیچە دەڵێت: " دەبێت ئەم کۆمەڵگانوێیە هاوشێوەی هەرەم بێت و لە سەر بناغەیەکی پتەو جێی خۆی بگرێت" چینە ناوەندییەکان لە خوارەوە و فەرمانداریێتی بەرز لە لوتکەیدا بێت، چونکە تەنیا شتێك کە گرینگ بێت هەمان "منی باڵا و پیرۆز و خۆپەرستیی پیرۆز"ە.

## - ٤ -

ئەمە بوو خەونە ئەهریمەنییەکەی ئەو فەیلەسووفی کە ئەقڵی خۆی لە دەستدا. دەربڕینی شاعیرانەی بە قەد رەوانیی تاڤگەی (نیاگارا)یە و خەیاڵ و ئەندێشەی نایابەو تێبینییەکانی لەبارەی لاوازییەکارییەکانی مرۆڤ بە قەد تیژیی دەمی شمشێرە. بەڵام سەرباری هەموو ئەم درەوشاوەییە ئەمرۆ کە خوێندنەوەی بەرهەمەکانی (بە تایبەت کاتێك کە کارەساتە پەژارە بزوێنەکانی پەنجا ساڵی دوایی کە بەشێکیان بەرهەمی مێشکی نە خۆش و خەڵك ئازاردەری ئەون، دێنینە بەر چاومان) کارێکی بێزارکەر و قێزەوەنە. لەم قۆناغەدا، فەلسەفەی نیچە وەکو تیشکی خۆر لەسەر رووی دەریاچەیەکی خوێن دەبریقێتەوە. گەلێك خۆمان ماندوو کرد تا





بتوانین وێنەیەکی گیانەوەرەی بۆر یان (مرۆڤی باڵا)ی نیچە بکێشین. چونکە (مرۆڤی باڵا)ی نیچە شێتێکە وەك خودی ئەو. هەرچەندێك زیاتر گەشە بکات زیاتر هاوسەنگە دەروونییەکەی خۆی لێ دەستدەدات. نیچە خۆی لە ڤاگنەر و ناپلیۆن و مەسیح بە گەورەتر دەزانێت و پێیوایە کە پەرتووکەکانی "نایابترین ئەدەبیاتە کە لە تەواوی چاخەکاندا هاتۆتە کایەوە". بۆ رەخنە گرتن لەو کەسانەی کە بایەخیان بە ئەو و بەرهەمەکانی نادەن هاوار دەکات: "زەمانی من ئەمڕۆ نییە، سبەی موڵکی منە."

بە خۆ هەڵگوتنی نیچە بە تەواوەتی لەگەڵ ئەو هەستەی شەرمەزاری و زەلیلییەدا دەگونجا کە بەرامبەر بە خۆی هەبوو. هەرچەندێك زەمان بەرەوپێش برۆیشتایە نیچە زیاتر لە پێشو گاڵتەی بە مرۆڤایەتی دەکرد و بەرامبەر بە خۆی ئەستەمکارتر دەبوو. لە راستیدا گاڵتە پێکردنی ئەو لە ئەستەمکاری و ژیانتاڵی خۆیەوە سەرچاوەی دەگرت.

نیچە لە یەکێك لە کاتەکانی بێدەنگیی خۆیدا نووسی: "رەنگە من باشتر بزانم کە بۆچی ئادەمیزاد تاکە گیانەوەرێکە کە پێدەکەنێت. تەنیا مرۆڤە کە بە دژواری رەنج و ئازار دەچێژێت و ناچارە کە پێکەنین بئافرێنێت"

بەم چەشنە نیچە هەروا پێدەکەنێت و کەم و کورتی دەدۆزێتەوە و بە هەیەجان و تامەزرۆیەوە شیعری حەماسی دەخوێنێتەوە و لەشی لەژێر باری دەرد و پەنجەدا تێکدەگوشرێت. رووناکی چاوی بەرە بەرە کەم دەبێتەوە بەرادەیەك کە تەقریبەن کوێر دەبێت و لە کاتی شێتیدا دەنەرِێنێت و دەڵێت کەوا ئەو خوایەکە کە لە خاچی گەمژایەتی مرۆڤایەتی دراوە.

یەکێك لە رۆژەکانی زستانی ١٨٨٩ شێتایەتییەکەی پەرەی سەند بۆیە بۆ شێتخانە بردیان و ماکس نوردو* (نووسی : "مرۆڤێکی گونجا و بۆ شوێنێکی گونجاو!"

دوای ماوەیەك لەسەر داواکاری دایکی کە پەرستیارییەکەی گرتبووە ئەستۆ لە شێتخانە دەرهێنرا، بەڵام نیچە بە تەواوەتی لە پەل و پۆ کەوتبوو. چیتر توانای نووسین و تەنانەت توانای بیرکردنەوەشی نەمابوو. تەنیا رستەگەلێکی ناپەیوەندار دەهاتنە سەر زاری. جارناجارێ

---

* Max nardau (١٨٤٩ ـ ١٩٢٣) نوسەری مەجارەی.



رستەیەکی کورتی گوتەکانی خۆی لە زەینە تەم گرتووەکەیدا زیندوو دەبووەوە لە یەکێك لەم بارانەدا گوتی: "قسەکەی خۆت بکەو لە ناو چوو."

تا سەرەنجام لە ساڵی ١٩٠٠ مردن پارچە تێکشکاوەکانی بوونی ئەوی کۆکردەوە و لەسەر لاپەڕەی گێتی هەڵیگرت. بەڵام خراپەییەکەی کەوتبووە قۆناخی جێبەجێ کردن.

بەدوازەکانی دنیا بەرگریکارێکی بەهێزیان دەستکەوتبوو و مرۆڤایەتی هێشتا بە دەست پەندە فیکرەییە لە ناو بەرەکانییەوە ئازاری دەچەشت.

چونکە شێتێك کە پێنووسی بە دەستەوە گرتبێت ترسناکترە لەو شێتەی کە شمشێری بەدەستەوە گرتووە.



